# سەردەم

گۆڤارێکی تایبەتە بە وەرگێڕان و کەلتووری بیانی
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم دەریدەکات
ژمارە (5) ت1. 1999 - ساڵی یەکەم



ناونیشان:
سلێمانی - قولکەی یەکگرتن
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
تەلەفۆن: 29839
بۆ پەیوەندی کردن لەدەرەوەی وڵاتەوە
سەنتەری سەرچنار
Tel: 00873 761 477 268 – 00873 682 040 391
Fax: 00873 682 040 392 – 00873 761 477 269

بەرگ: ئۆفسێتی ملیر

# سەردەم

ژمارە (5) ت1. 1999 ساڵی یەکەم

# فیکرو فەلسەفە

- ناسیۆنالیزم وەك هێزێكی ئایدیۆلۆژی
- زەمەنی عەرەبی و مێژووی جیهان
- قوتابخانەی فرانكفۆرت
- مۆدێرنیتی و قەیران
- وتووێژخوازترین رۆشنبیری ئەڵمانیا
- محەمەد ئەرگون و بیریارانی ئەوروپا

# ناسیونالیزم وەك هێزێکی ئایدیۆلۆژی

# ((یەکالاکردنەوەی ناسیونالیزم))

• فاروق رەفیق

لەم وتارەدا هەوڵ دەدەم کە میتۆدێکی جیاواز بەکاربهێنم بۆ خوێندنەوەو تاقیکردنەوەی ناسیونالیزم وەك هێزێکی ئایدیۆلۆژی‌و ناسیونالیزم وەك گوتار.

سەرەتا ئەوە روون دەکەمەوە کە مەبەستم لە ناسیونالیزم چی‌یە، واتە وێنەیەك لەمەڕ ناسیونالیزمەوە دەخەمەڕوو، دواجار هەوڵ دەدەم ناسیونالیزم وەك هێزێکی ئایدیۆلۆژی یەکالا بکەمەوە بۆ توخمەکانی، بۆ ئەو توخمانەی کە ناسیونالیزم پێك دەهێنن. ئەمەش بەگەڕانەوە بۆ جینالۆجیای ئەو توخمانە، بەواتایەکی دی بەگەڕانەوە بۆ ریشەکانی ئەو توخمانە لەسەردەمی مۆدێرن‌و لە پرۆژەی مۆدێرنەتیدا.

لەم هەوڵدانەشدا مەبەستی من نیە کە نە مێژووی ناسیونالیزم بنووسمەوەو نە ئەو مێژووە بخوێنمەوە بەڵکو نیازی من لەم وتارە دوو ئامانجە؛ یەکەم ئاشنایەتی پەیداکردن لەگەڵ ئەو توخمانەی کە ناسیونالیزم وەك هێزێکی ئایدیۆلۆژی پێك دەهێنن‌و ناساندنی توخمەکانی گوتاری ناسیونالیستی. دووهەم، کێشانی وێنەیەکی فەلسەفی‌یە دەربارەی ناسیونالیزم. کێشانی وێنەیەکی فەلسەفی یا تێڕوانین لە ناسیونالیزم لەدیدێکی فەلسەفی‌یەوە بە پێویست دەزانم چونکی لەو باوەڕەدام کە ناسیونالیزم دیاردەیەکی ئاڵۆزەو زانایانی زانستی سیاسی یا کۆمەڵناسی‌و لێکۆڵینەوە کۆمەڵایەتیەکان بەتەنیا

ناتوانن وێنەیەکی ڕەزایەت بەخشمان بخەنە بەردەم. هەروەها ناسیونالیزم تەنیا دیاردەیەکی سیاسی نیە، بەڵکو ناسیونالیزم لەشێوەی ژیان یا مۆدێلێکی چۆنێتی بوونو چۆنێتی پێکەوە ژیانی خەڵکی دەدوێو وەك مۆدێلێکی بوونیش ناچارمان دەکا کە غەمی ئەوە بخۆین چ جۆرە پەیوەندیەك لەگەڵ "ئەوان"ی دیکەدا بەرکەماڵ بکەین. دیارە ئیدی پێویست ناکا کە بڵێین ئەم دوولایەنە، شێوەی ژیانو مۆدێلێکی بوون، هەردووك بە سروشت بابەتی فەلسەفەن بۆ لێکۆڵینەوە.

هەروەها دەبێت ئەوە بڵێم مەبەستی من نیە لەم وتارەدا باس لەدروست بوونی دەوڵەتی نەتەوە بکەم یاخود باس لەجۆرەکانی ناسیونالیزم بکەم بەتایبەت ئەو دابەش کردنەی ناسیونالیزم بەسەر ناسیونالیزمی مەدەنیو ناسیونالیزمی ئیتنیکی کە بەڕای من ئەم دابەش کردنە ئیشکالیەتی زۆری تێدایە بگرە کەڵکەڵەیی ترسناکیش لە پشت ئەم دابەش کردنەوە خۆی مەڵاس داوە.

من لەم باسەدا سێ فەیلەسوفو بزووتنەوەیەکی ئەدەبیو سیاسیم هەڵبژاردوە بۆ لێکۆڵینەوە. لێرەدا لەیەك یا دوولایەنی فیکری ڤیکۆو ڕۆسۆو هێردەر دەدوێم لەگەڵ باس کردنی چەند لایەنێکی بزووتنەوەی ڕۆمانتیك. بەهانەشم بۆ ئەم ستراتیژیەتە ئەوەیە کە لەفیکری هەریەك لەو فەیلەسوفانە لە بزوتنەوەی ڕۆمانتیکەکاندا دەتوانین پەنجە بخەینە سەر یەك یا چەند توخمێك کە دواجار لە ناسیونالیزمدا خۆیان نیشان دەدەن.

لێرەوە لێکۆڵینەوەی هەندێ ڕەهەندی فیکری ئەو فەیلەسوفانە یارمەتیمان دەدەن کە ناسیونالیزم بناسینەوە، پێناسەی بکەینەوە وەك هێزێکی ئایدیۆلۆژی، وەك دنیابینیەك. هەروەها لێکۆڵینەوەیەك لەم جۆرە، واتە مامەڵەکردنێکی فەلسەفیانە لەگەڵ ناسیونالیزم، ڕەنگە ببێتە مایەی داڕشتنی جۆرە سەیرکردنو ئایدیایەکی باڵاتر لەمەڕ ناسیونالیزمەوە، یاخود بەلانی کەمەوە ئومێدی من ئەوەیە کە قسەکردن لەسەر ناسیونالیزم لەرۆژنامەنووسەکان وەربگرینەوە تا مامەڵەیەکی فەلسەفی لەگەڵدا بکەین. شایانی باسە کە من لێرەدا بانگەشەی ئەوە ناکەم کە هەموو ئەو فەیلەسوفانەی ئاماژەیان بۆ دەکەم نەتەوەپەروەر بوون، بۆ نمونە ڤیکۆ نەك ناسیونالیست نەبوو بەڵکو لەسەردەمی ئەودا هەواڵێ لەناسیونالیزم نەبوو. ڤیکۆ وەك بیریارێکی کۆنسەرڤەتیڤ دووکاری کرد، یەکەم ڕەخنەیەکی قورسی لە عەقلانیەتی دیکارتی گرتو بەم کارەش لەڕووی فەلسەفیەوە ڕێگای بۆ ناسیونالیزم خۆش کرد، دووهەم، ڤیکۆ یەکەم کەس بوو کە سەرنجی هەمووانێ بۆ لای ڕۆڵە گرنگەکەی فەنتازیا ڕاکێشا لەڕێگەی چەمکو بیرۆکەکانی وەکو "کۆی خەیاڵی" "ئەفسانە" "فەنتازیای گەردوونی"،

"حیکمەتی شیعری"... هتد، هەردوو چەمکی "خەیاڵ" و "ئەفسانە" ئەو توخمەن کە من لە ناسیونالیزمدا بەبنەڕەتیترین توخمیان دەزانم هەر ئەویشە بەهانەی من بۆ قسەکردن لەسەر ڤیکۆ. دوا خاڵێك کە پێویستی بەروون کردنەوە هەبێت ئەوەیە کە من لەناسیونالیزم لەرەوتە ئەوروپیەکەیدا دەدوێم. وێڕای ئەوەش من باوەڕم وایە ناسیونالیزم زادەی ئەوروپایەو بەشێکە لەپرۆژەی مۆدێرنەتی، هەمان ئەو توخمانەش دەتوانین لە بزووتنەوە ناسیونالیستیەکانی دەرەوەی ئەوروپاشدا ببینینەوە. ناسیونالیزمێك نابینینەوە بێ نوێنەرایەتی کردنی سومبولی، بێ سەرمایەی ڕەمزی، بێ ئەفسانە، بێ بیرۆکەی "خەڵك" یا "گەل" مێژوو.. هتد. لەگەڵ ئەوەشدا ناسیونالیزمی دەرەوەی ئەوروپا خاسیەتو تایبەتمەندێتی خۆی هەیە. لەپەراوێزی

قسەکردنەکانمدا لەسەر ڤیکۆ ئاماژەش بۆ
مۆنتسیکۆ دەکەم وەك رێگە خۆشکردنێ بۆ
قسەکردن لەسەر ناسیونالیزمی سیاسی لای
رۆسۆ، هەروەها لەپەراوێزی قسەکردنیشدا لەسەر
رۆسۆ ئاماژە بۆ کانت دەکەم وەك زەمینە خۆش
کردنێ بۆ باس کردنی هێردەر کە یەکێکە لە
رەخنەگرەکانی کانت.

1-وەك خاڵی دەست پێکردن دەبێت جەغد
لەسەر ئەوە بکەین کە ناسیونالیزم بەرهەمی
پرۆسەیەکی درێژخایەنە، پرۆسەیەك کە رەگو
ریشەی لەسەردەمی مۆدێرندا داکوتیوە.
مەبەستیش لەسەردەمی مۆدێرن ئەو سەردەمەیە
کە بە رینیسانسو ریفۆرمی ئایینی دەست
پێدەکا. پرسیاری من ئەمە نیە کە چۆن ئەم
دیاردەیە /گوتار/ هێزە ئایدیۆلۆژیە هاتە بوون،
بەڵکو پرسیاری من ئەوەیە ناسیونالیزم چ
گوتارێکە، چ هێزێکی ئایدیۆلۆژییەو توخمەکانی
چین کە لێی پێك هاتوە؟

ناسیونالیزم ئایدیۆلۆژیایەو ئایدیۆلۆژیاش
سەرقاڵی ئەوەیە کە بارودۆخێ، کاروبارێك،
حاڵەتێك لە کۆمەڵگادا بگۆڕێو بارودۆخێکی نوێ
دامەزرێنێ. ناسیونالیزم ئایدیۆلۆژیایەکەی
مۆدێرنە کە خۆی وەك وەڵامێك هاتە ئاراوە بۆ
ئەو حاڵەتەی کە هەندێ بیریاری ئەورووپی
بەحاڵەتی شپرزەییو پاشاگەردانی مرۆڤایەتی
لەدنیای مۆدێرندا ناوی دەبەن، شپرزەییەك کە
هەموو بوارەکانی بوونو ژیانی گرتەوە، شپرزەیی
لەنێوان فەرمانڕەواو فەرمان بەسەرداکراودا،
شپرزەیی رۆحی ئینسانەکان، جیاوازی یا
شپرزەیی نێوان سەرو دڵ، عەقڵو هەست، عەقڵ
کەوەك بەشێك Faculty کە تەنیا کاری پۆلێن
کردنو ژماردنەو ناتوانێ لەهەستو رۆح قسەبکاو
ئەمەش لەزۆر حاڵەتەدا بوو وە دەبێتە مایەی
ووشك بوونەوەی کانی خەیاڵو خاوبوونەوەی
شەپۆلەکانی داهێنانو دروست بوونی بارودۆخێ
لێوانلێو لە غوربەت، غوربەتی مرۆڤ لەخۆی،
غوربەتی مرۆڤ لە مرۆڤ، غوربەتی مرۆڤ لە
سروشتو کۆمەڵگا. ئایدیۆلۆژیاکان، لەوانە
ناسیونالیزمو سۆسیالیزم، وەکو بەرهەمی
مۆدێرنەتی وەڵامێك بوون بۆ ئەو پاشاگەردانیەو
ئەو غوربەتە قووڵە. ناسیونالیزم وەك
ئایدیۆلۆژیایەك هاتو پێی وابوو کە مرۆڤایەتی بە
سروشت بەسەر نەتەوەکانو ئێتنیکەکاندا دابەش
بوەو هەر نەتەوەیەش دەبێت یەکێتیەکی سیاسی
گونجاو دروست بکا بەپێی ئەو دابەش بوونە
سروشتیە.

ناسیونالیزم هێزێکی ئایدیۆلۆژییە، واتە
لەلایەکەوە بریتییە لە چەپکێ ئایدیا کە
پەیوەندی ناوکۆییان لەگەڵ یەکتردا هەیە،
چەپکێ ئایدیا لەمەڕ مرۆڤو کۆمەڵگاو
سیاسەتەوە، لەلایەکی ترەوە ناسیونالیزم
سەرقاڵی ئەوەیە کە چۆن حاڵەتێکی شتەکان،
مەسەلەکان بگۆڕێو حاڵەتێکی تر لەکۆمەڵگادا
دامەزرێنێ. هەروەها وەك ئایدیۆلۆژیایەکی
سیاسی، وەك ئاماژەم بۆ کرد، وەڵامێك بوو بۆ
ئەو شێواویەی کە لە سەردەمی مۆدێرندا کەوتە
ناو شێوازە باوەکانی ژیانو ئەو سیستەمە
فیکرییەی کە بۆ ماوەیەکی زۆر بوو باڵی بەسەر
کۆمەڵگاکانی ئەورووپادا کێشابوو، ئەو
پاشاگەردانیەی کە دوای لێڵ بوونی هەموو
دڵنیابوونێك هاتە ئاراوە.

ریسکە مەعریفیە یەك لەدوا یەکەکانیش بوونە
مایەی خولقاندنی نائارامیەکی گەورەو هەر
خۆشیان رووبەڕووی ئەو نادڵنیاییە گەورەیە
بوونەوە. هەنگاوی یەکەم ئەو ئیرادەیە بوو کە
دەتوانین ناوی بنێین "ئیرادەی زانست" هەروەها
هەنگاوی دووهەم ئەو ئیرادەیە بوو کە دەتوانین
ناوی بنێین "ئیرادەی گۆڕین". ئیرادەی زانست
هەوڵێك بوو لەچوار دەورگرتنی هەموو بوارەکانو
دیاردەکانی ژیاندا بەنیازی دەرخستنو

دۆزینەوەی پێك هاتوەكانیان، ئیرادەی گۆڕینیش هەوڵدانێكە بۆ گۆڕینی واقیع كە لەگەڵ خواستەكانی مۆدێرنەتیدا بگونجێ. لە ڕێگەی ئیرادەی گۆڕینەوە، كە ناسیونالیزم بەشێكە لەو ئیرادەیە، دینامیكیەتێكی تازە لەكۆمەڵگادا هاتەكایەوەو هەوڵی ئەوە درا كە دەروازە لەبەردەم ئیمكانیاتو خەونەكاندا بخرێتە سەرپشت.

پێش ئەوەی باس لە ناسیونالیزم بكەین لەشوێنی خۆیدایە كە بەرئەنجامەكانی مۆدێرنیزم لەم چەند خاڵەدا كۆبكەینەوە:

1-بەعەقڵی كردنی فیكری زانستی (عقلنه الفكر العلمی) مۆدێرنەتی وەك پرۆژەیەك نەدەبوو بێ بەعەقڵانی كردنی فیكرو بێ جیاكردنەوەی عەقڵی زانستی لەویژدانی ئایینیو زانستەكان نەدەهاتنە ئاراوە گەر زانست شوێنی سەربەخۆی مسۆگەر نەكردایە.

2-بەعەقڵیكردنی گوتاری ئایینی: ئەم پرۆسەی بەعەقڵیكردنە ڕێگەی بۆ خویندنەوەیەكی عەقڵی تێكستی ئایینی خۆش كرد، شیكردنەوەی تێكستی ئایینی لەڕێگەی دراوەكانی هاوچەرخەوە (معطیات العصر). ئەم پرۆسەیەش لە ڕینسانسەوە دەستی پێكردو مارتن لۆسەر درێژەی پێداو تاگەیشتە هیومو كانت كە خۆی بانگەوازێك بوو بۆ گەڕانەوە بۆ تێكست. لێرەدا ناچارم ئاماژە بۆ كتێبەكەی كانت بكەم بەناوی "ئایین تەنیا لەچوارچێوەی عەقڵدا"[1]. ناونیشانی ئەم كتێبە دروشمی سەدەی هەژدەو نۆزدە بوو لەمەڕ مامەڵەكردن لەگەڵ ئایین، ئایین تەنیا لەچوارچێوەی عەقڵدا.

3-بەعەقڵیكردنی فیكری سیاسی: زانستی سیاسی لای ماكیاڤیللی جەغدكردنە بۆ سەر دوو خاڵ، یەكەم جیابوونەوە لەبیركردنەوەی میتافیزیقی لەكاروباری دەوڵەتدا، واتە سیاسەت خاوەنی مەعقولیەتی خۆیەتی لەچارەسەركردنی كێشەكاندا، دووهەم، جیابوونەوە لە جیهان بینی ئایینی، واتە دەستەڵاتی سیاسی بەپلەی یەك كۆمەڵایەتییەو نابێت پشت بەڕەوایەتیەكی دەرەكی ئایینی ببەستێ. بەعەقڵیكردنی بۆ عەقڵانیەتێكی تازە خۆش كرد بەئازادكردنی عەقڵ. لەجیاتی چۆك دادان بۆ قەدەرو واقیع، عەقڵ كەوتەسەر كەڵكەڵەی ئەو قەناعەتەی كە دەتوانێ سنورێ بۆ توندوتیژی سروشتو توندوتیژی مرۆڤو زۆرداری میری دا بنێ. هەر یەك لە شۆڕشەكانی ئینگلیزی -ئەمەریكی- فەرەنسی پێداگرتنێ بوو لەسەر ئازادی كۆمەڵانی خەڵك لەدیاریكردنی چارەنووسیاندا.

لێرەوە ناسیونالیزم وەك بیروڕایەك هەوڵدەدا كە سەرچاوەیەك، شوێنێك بۆ شوناسی تاكەكەس بدۆزێتەوە لەنێو "خەڵك" داو مەبەستیش لەخەڵك یا گەل ئەو كیانەیە كە هەڵگری دەستەڵاتداریە (Sovereignty)، بابەتی كۆنترۆڵیكەری وابەستەییە، گەل سەرچاوەو بناغەی هاریكاری دەستەجەمعیە، ئەمەش یەكەم توخمی ئەو ئایدیۆلۆژیە سیاسییەیە، واتە ناسیونالیزم. هەروەها بناغەی ناسیونالیزم بریتییە لە ئایدیا. ناسیونالیزم وەك هێزێكی دینامیكی تایبەتی یاخود وەك شێوازێكی بیركردنەوە مرۆڤایەتی دابەش دەكا بەسەر نەتەوەكاناو گروپە ئیتنیكیەكاندا، هەر نەتەوەیە یا جڤاتە (Community) چەند خاسیەتێكی خۆی هەیە یا ڕۆحی میللی خۆی هەیە. نەتەوە یا خەڵك لێرەدا ڕۆڵی گشت دەبینێو ئازادی تاكەكەسیش كە بریتییە لەجێبەجێكردنی خودو بەخودگەیشتن، ئەم ئازادیەش ئەوكاتە بەركەماڵ دەبێت كە تاكەكەس تەماهی بكا لەگەڵ "گشت"دا.

هەروەها گشت دەشێ دەوڵەت بێ، لێرەدا ئازادی تاكەكەس كە بریتییە لە بەخۆگەیشتن شایانی وێناكردن نییە جگە لە چوارچێوەی هۆشیاریەكی گەردوونی یاخود دەوڵەت، ئەویش

رای هیگڵ. لێرەوە تاکەکەس بەشێکە کە ماناو مەبەست لەگشتەوە وەردەگرێو مەبەستیش لەگشت یا گەلە یا دەوڵەت. بەپێی ئەم سیستمی ئایدیایە رۆحی ئەو نەتەوەیەش زمانە. زمان رۆحی نەتەوە رادەگرێو رۆحی نەتەوەش بریتییە لەمێژووی نەتەوە. لەکتێبەکەیدا فینۆمینۆلۆجیای رۆح هیگڵ پێی وایە کە رۆح دەبێتە ئەوەی کە هەیە یا بەو حاڵەتەی دەگا کە هەیە لەرێگەی مێژووەوە، کەواتە رۆح هیچ نیە جگە لەم مێژووە، رۆح بریتییە لە هۆشیاری رۆح بەرانبەر بەخۆی لەمێژووی خۆیدا. نەتەوە "ئەو رۆحەیە کە دەدرەوشێتەوە، بەرزدەبێتەوە، خۆی پەخش دەکاتەوە لەمێژوودا تا خۆی بدۆزێتەوە "[(2)]

رەوایە گەر بڵێین بزووتنەوە ناسیونالیستیەکان مەستن بە ئایدیای مێژوو، یا لە مێژوودا غروری نەتەوە دەدۆزنەوە یاخود وا لەمێژوو دەڕوانن کە کانگای هەموو ئەو زوڵمانەیە، ناعەدالەتیانەیە کە بەرانبەریان کراوە، یاخود بزووتنەوە ناسیونالیستیەکان هەوڵ دەدەن مێژوو دروست بکەن، مێژوو بەمانای یادەوەری مێژوویی نەتەوە، مێژوو فەنتازیا دەکەنو بەو شێوەیەی کە لەخزمەتی ئێستاو داهاتوودا بێت، یاخود لەخزمەتی نیازە ئایدیۆلۆژیەکانیاندا بێت. بۆ نمونە رووداوێکی وەك تێك شکانی شای سیربەکان لە 1389دا لەسەردەستی عوسمانیەکاندا لای ناسیونالیزمی سیرب تەفسیرێکی ناسیونالیستانەی بۆ دەکرێو نەك ئەلبانیەکان لەو مێژووە فرێ بدرێنە دەرەوە کە ئەو کاتە ئەلبانیەکان موسوڵمان نەبوونو لەپاڵ سیربەکاندا دژی عوسمانیەکان بوون، نەك ئەوەندە بەڵکو ئەلبانیەکان دەکەنە نیشانەی رقو دوای حەوت سەد ساڵ دەیانکەن بە لێپرسراو لەو تێکشکانەیان لەبەردەم عوسمانیەکانداو کاری دەکەن کە ئەمڕۆ ئەلبانیەکان باجی ئەو مێژووە بدەنەوە.

بیرۆکەی دروست کردنی مێژوو پەیوەندی بەتوخمێکی تری ئەو هێزە ئۆرگانیکەوە هەیە، ناسیونالیزم، کە بریتییە لە ئەفسانە.

لەناسیونالیزمدا ئەفسانە رۆڵێکی نکوڵی لێنەکراو دەبینێ. ئەفسانە خەڵکی لەدەوری یەکتر گرد دەکاتەوەو هەستی وابەستەبیان لا بەهێز دەکا. هەروەها ئەفسانەکان رەوایەتی دەبەخشن بە وەزعی هەنووکەیی لەسەردەمانی ئارامیو جێ بەخۆگرتوودا، لەحاڵەتی ئاشوبو نائارامیشدا ئەفسانەکان نەخشەی گۆڕانکاریەکان دەکێشن. بۆ ئەوەی تەبایی بەرکەماڵ بێت بزووتنەوەیەکی ناسیونالیستی دەبێت چەند رێگایەکی هەبێت بۆ خۆ نوێنەرایەتی کردنو خۆنیشان دان، دەبێت ئەو رێگایانەی لەبەر دەمدابێت تا بتوانێ شوناسێکی تایبەتی داتاشێ، بەهۆی هۆکارەکانی وەکو ئەفسانەو سرووتەوە. ناسیونالیزم بانگەشە بۆ ئەو ئەفسانانە دەکا کە لەرەگو ریشەو مەبەستە نەتەوەییەکان دەدوێن، لەهەمان کاتدا سەرگەرمی پراکتیکی سومبولی دەبێت تا لە ئەوانی دی، ناسیونالیستەکانی دی جیایان بکاتەوە.

لەزۆربەی حاڵەتەکاندا ئەفسانەکان جەغد لە باڵادەستی جڤات دەکەنو یەکێ لە ئەنجامەکانیش ئەوەیە کە جڤات واخۆی نیشان دەدا کە یەکەیەکی پتەوەو هاریکاری باڵادەستە.

وەك ئێرنست کاسێرەر جەغدی لەسەر دەکا "لەسیاسەتدا ئێمە هەمیشە لەسەر خاکێکی بورکانی دەژین"[(3)]. کەواتە ئێمە دەبێت ئامێرو هۆکاری گونجاومان بەدەستەوە بێت تا رووبەڕووی تەقینەوەی بورکانەکان ببینەوە. کۆمەڵانی خەڵکی هەمیشە لەژێر رەحمی توندوتیژترین سۆزدان، کاتێك ئەم سۆزانە بەدوا پلەی خۆیان دەگەن، کۆمەڵانی خەڵکی لەگەڵ

ناعەقڵانیترین حاڵەتدا دەڕۆنو هەڵدەکەن وەك ڕەنگدانەوەیەکی ناعەقڵانیترین ئارەزووەکانیان. ئەوەش بەو مانایە نایەت کە تەواو عەقڵیان پشت گوێ خستوە یا پێویستیان بەعەقڵ نیە، بەپێچەوانەوە بۆ ئەم جۆرە سیستمە لەباوەڕ پێویستیان بەعەقڵە، مەبەستم لەم خاڵە ئەوەیە کە لە حاڵەتێکی وادا عەقڵ دەچێتە خزمەتی سۆز، یا غەریزەکانەوە، عەقڵ دەچێتە خزمەتی کۆمەڵێ رازو نیازی ئایدیۆلۆژی، کاری عەقڵ دەبێت بەعەقڵەنە rationalization بەمانە داتاشین بۆ کۆمەڵی بیرۆکەو هەندێ هەڵوێستو هەڵسو کەوتو مامەڵەکردن، بۆ نمونە خستنەگەڕی عەقڵ لەخزمەت لایەنگیریو جیاخوازی (تمیز)و دەمارگیری. گرنگە سەرنجتان بۆ ئەوە رابکێشم کە من دەربارەی ئەفسانە سیاسیەکانی مۆدێرن قسە دەکەمو ئەوەمان لەیاد بێت کە مەبەستی من لە ئەفسانە هەم مانا تەقلیدیەکەی ئەفسانەیەو هەم مانا نا - تەقلیدیەکەی ئەفسانەیە- مەبەست لە ئەفسانە بەمانا تەقلیدیەکەی ئەوە دەگەیەنێ کە ئەفسانە بەرهەمی چالاکیەکی عەفویانەیە، بەرهەمێکی سروشتییە. بەڵام هەندێ لە ئەفسانە سیاسیەکانی مۆدێرن خود بەخود گەشە ناکەن یا سەر هەڵنادەن بەڵکو دروست دەکرێن، دادەتاشرێن لەلایەن ئایدیۆلۆژیاکانەوە لەسەر بناغەیەکی پتەوی پلان دانان. لێرەو لەڕێگای بەکارهێنانی میتۆدی مۆدێرنەوە، ئەفسانە دەشێ دابهێنرێ هەر وەك بەرهەمەکانی تر، ئەوەی پێویستە بۆ ئەم چالاکیە تەنیا یەك ئایدیۆلۆژیاو هۆکارەکانی راگەیاندنی وەکو رۆژنامەو رادیۆو بنکەیەکی بڵاوکردنەوە. هەروەها لە ناسیونالیزمدا ئەفسانەکان پەیوەندیان هەیە بە نوێنەرایەتی کردنیسومبولیەوە، پەیوەندیان هەیە بە سرووتو سومبولەکانەوە. لەیادمان بێت کە نەتەوە بوونێکی کۆنکرێتی نیە لەدەرەوەی سومبولیزمەوە، لەدەرەوەی سومبولەکانیەوە کە بەهۆیانەوە نەتەوە خۆی نیشان دەداو شایانی ناسینەوەو دەرك پێکردنە. هەروەك مایکڵ والزەر دەڵێ "دەوڵەت نادیارە، دەبێت بەکەس بکرێ پێش ئەوەی بتوانرێ ببینرێ، دەبێت چواردەوری بە سومبول بگیردرێ پێش ئەوەی شایانی خۆش ویستن بێت"[4].

مادامێك خەڵکی لەڕێگای چاویلکەی سومبولەکانەوە لەجیهان دەڕوانن، سەختە بۆیان کە هۆشیار بنو ئاگادارین لەوەی کە ئەو سومبولانە لەچی پێك هاتوونو چ کاریگەریەکیان هەیەو دەبێت. بەکورتی، خەڵکی بەتەنیا دروست کەرو داهێنەری شمەکو بابەتە ماتەریاڵیەکان نین بەڵکو داهێنەرو بەرهەمهێنەری سومبولیشنو سومبولیش مەسرەف دەکەن، مرۆڤ بوونەوەرێکە بە سومبول دەژی. لەڕێگای سومبولەکانەوەیە کە خەڵکی مانا بەژیانیان دەبەخشن، مرۆڤەکان خۆیان دروست دەکەن، واتە وێنەی خودیان وێنا دەکەن لەڕێگای تەماهیکردنی سومبولیانەوە Symbolic identificatiomn لەگەڵ نەتەوە، گروپ، جڤات یا دەوڵەتدا. ئەو نوێنەرایەتی کردنە سومبولیە تەنیا لەبابەتی بێگیان پێك نەهاتووە وەك ئاڵا، بەڵکو ئەو تاکەکەسانەش دەگرێتەوە کە سومبولی ئەو یەکە سیاسییەن، قارەمانو پاڵەوانەکانی نەتەوەو شەهیدان.. و هتد. هەوڵەکانی دامەزراندنی دەوڵەتی نەتەوە لەدوای کۆلۆنیالیزمەوە بە نمونە بهێنینەوە کە هەرهەموو پرۆسەی دروست کردنی مێژوو و قارەمانە سیاسیەکانو دارشتنی کۆمەڵێ ئەفسانەیان لەخۆگرت. تا ئێرە ئەو توخمانەی کە ئاماژەمان بۆ کردن ئەمانە بوون، بیرۆکەی خەڵك یا گەل، زمان، ئەفسانەو سومبولو خەیاڵ، بوونی یەك مێژوو وەك هەڵگری رۆحی نەتەوە.

2-ڤیکۆ کۆ خەیاڵیەکان Imaginative Universals

ڤیکۆ پێی وابوو کە "یەکەم زانستێ کە دەبێت فێری بین زانستی میتۆلۆجیایە یاخود راڤەکردنی خوراڤە"[5] لەم رێگەیەوە تێگەیشتن لەزەینی (زهنیەتی) مرۆڤ دەشێ لەو شوێنەوە دەست پێبکا کەزەینی مرۆڤ لێوەی دەست پێدەکا واتە ئەفسانەکان. ڤیکۆ ئەفسانە وا پێناسە دەکا وەك "پۆلێ لە چەمکە خەیاڵیەکان". ئەفسانەکان بریتی نین لەرازاندنەوەی رووداوە راستەقینەکان یاخود کەسایەتیە مێژووییەکان. ئەم بۆچوونە رۆڵی ئەفسانەمان دەهێنێتەوە یاد لە رەوتی ناسیونالیزمدا. وەك ئامارەم بۆ کرد ناسیونالیزم هەوڵ دەدا کە ئەفسانە بخاتەگەرو مێژوو لە بەرگێکی ئەفسانەیی بگرێ، رووداوەکان ئەفساناوی بکا.

کۆی خەیاڵی چیە؟ کۆی خەیاڵی وەزیفەی مانابەخشین دەبینێ، واتە رێگایەکە کە لێوەی مەعقولیەت یا مانا دروست دەکرێ، وێناکردنێکە دەربارەی چۆنێتی دروست کردنی مانا لەسەرەتاکانی زەینی مرۆڤدا یاخود سەرەتاکانی جیهانی مرۆڤدا. ئەفسانە کە پشت بەتوانای فەنتازیا دەبەستێت ئەو هۆکارەیە کە لە رێگەوەی مرۆڤ دەتوانێ شێوە بە جیهان ببەخشێ.

کۆخەیاڵیەکان شێوەی فیکرن بۆ دوو سەردەم لە سێ سەردەم کە ڤیکۆ پێی وایە مێژووی مرۆڤایەتی پێك دەهێنن، سەردەمی خواکانو سەردەمی قارەمانەکان. کۆی مەعقولیش Intelligible Universal شێوەیەکی تری فیکرە کە خاسیەتی سەردەمی سێهەم کە سەردەمی مرۆڤەکانە، کۆی مەعقول بریتییە لە چەمکێکی گشتی لۆژیکی ئەرستۆیی. سەردەمی خواکان سەردەمێك بوو کە تێیدا مرۆڤ جیهانی خۆی بەپێی وێناکردنی بۆ خواکان رێکخستوە. سەردەمی قارەمانەکانیش ئەو سەردەمە بوو کە ئینسان جیهانی بەپێیوێناکردنی بۆ قارەمانەکان رێکخستوەو شێوەی بەجیهان بەخشیوە. بەرای ڤیکۆ خەڵکانی سەرەتایی توانیویانە رێکو پێکیەك بە ئەزموونەکانیان ببەخشن نەك لەرێگەی کوتکردنەوە یا بینینەوەی کۆمەڵێ خاسیەت کە کۆمەڵێ بابەت تێدا بەشدارن، بەڵکو لەرێگای دروست کردنو داهێنانی وێنەی ئایدیاڵەوە ideal Portrait، و ئەم وێنەیەش شێوەی ئەفسانەی بەخۆوەدەگرت، وەك وەسفێکی واقیعێکی تایبەتی.

ڤیکۆ دەنووسێ:

"خەڵکانی سەرەتایی رەگەزی مرۆڤایەتی، منداڵانیش، بێتوانا لەوەی کە پۆلێ لە چەمکە مەعقولەکان دەربارەی شتەکان دروست بکەن، پێویستیەکی سروشتیان هەبوو کە داهێنانی کاراکتەری شیعریەکان، واتە چەپکێ لە چەمکە خەیاڵیەکان یا کۆخەیاڵیەکان، بۆ هەندێ مۆدێل یاخود وێنەی ئایدیاڵ، بەنیازی کورتکردنەوەی ئەو بەشانەی کە لێیان دەچن"[6]

کۆی خەیاڵی سەردەمی یەکەم، واتە سەردەمی خواکان، بریتییە لە گەڵاڵەکردنی ئەزموونە راستەوخۆکانی هێزە سروشتیەکان، بۆ نمونە ئامادەبوونی خودا وەك بروسکە. قارەمانەکانی سەردەمی دووهەمیش شێوە بە کاراکتەری مرۆڤ دەبەخشن، بۆ نمونە ئەکسیلی (لە ئەلیادەی هۆمیرۆسدا) نوێنەری "کرداری هەموو جەنگاوەرەکانە"[7]. و یولیسیس بەرجەستەبووی "هەموو مرۆڤە زیرەکەکانە". بیرکردنەوەی مرۆڤە سەرەتاییەکان لەشێوەی دەربرینی شاعیرانەدا بوو وە ئەو جۆرە بیرکردنەوەیە هەوڵێك بوو بۆ مانا بەخشین بەجیهان. لەکۆ خەیاڵیدا کە خاسیەتی دوو سەردەمە، سەردەمی خواکانو پاڵەوانەکان، زمان

هەمیشە وەك میتافۆر کاردەکا، هەمیشە لە سومبولیزمی خۆیدا بەشەکان لە ڕێکخستنێکدا دەپارێزێ. لێرەوە ئەفسانە یا کاراکتەری شیعری واقیعی ترە لە تاکەکەسو تاکەکەس هەقانیەتی بوونی خۆی لەکۆی خەیاڵی یا کاراکتەری شیعرییەوە یا ئەفسانەوە وەردەگرێ. بۆ نمونە، ڤیکۆ دەڵێ "ڕاستەقینەترین سەرکردەی جەنگ ئەو گەدفری Godfreyیەیە کە تۆرکاتۆ تاسو فەنتازیای کردوە، لێرەوە هەموو سەرکردەکان کە لەگەڵ وێنەی گەدفریدا تەبا نایەنەوە سەرکردەی ڕاستەقینەی جەنگ نین"[8]

تاك ئەوەیە کە هەیە چونکی بوونی بریتییە لەبوونی تایپ/ نمونە لەلایەن عەقڵی شیعرییەوە کاراکتەری شیعری لەڕێگای ئەبستراکت کردنی بەشەکانەوە دروست ناکرێ، کاراکتەری شیعری خۆی واقیعەو واقیعی فیزیکی دەبێت خۆی لەبەردەم ئەو واقیعە شیعرییەدا بگونجێنێ. واتە کاراکتەرە شیعریەکان هەلو مەرجن بۆ واقیع لەجیاتی ئەوەی کە ئەبستراکت (ڕووت کراوە) بن یاخود کۆمەڵی بەگشتی کردن بن لەتاکە ئیمبریکیەکانەوە. کەواتە تاك ناشێ بیری لێ بکرێتەوە، وەك ئەوەی کە خۆی لەخۆیدا واقیعەتی هەبێت جودا لە کاراکتەرە شیعرییەکە، تاکەکەس ئەوەیە کە هەیە تەنیا لەڕێگای شوناسیەوە لەگەڵ کاراکتەری گشتی. لەدیدی ڤیکۆوە خاسیەتی سەرەکی بیرکردنەوەی ئەفسانەیی یا بیرکردنەوەی شیعری بریتییە لە دەستەڵاتی ئەو بیرکردنەوەیە لە جەغدکردنە سەر شوناسەکان نەك لێکچوەکان. واتە تاك لەڕێگای ئەنالۆژی (بەراوردکردن)یەوە واتە بوون وەك وێنەی ئایدیاڵ خەیاڵ ناکرێو وێناناکرێ بەڵکو تاك ئەوەیە کە هەیە تەنیا لەڕێگای شوناسیەوە لەگەڵ کاراکتەری شیعری. جەنگاوەر وا سەیری خۆی ناکا جیا لە ئەکیلی، بەڵکو جەنگاوەر ئەوەیە کە هەیە، ئەو و ئەکیلی یەك واقیعیان هەیە. بیرکردنەوەی شیعری لەشوناس دەدوێ، نەك لەیەك چوون، تەنیا کۆی مەعقول لەجیاوازیو لێك چوون دەدوێ لەڕێگای توانای ئەبستراکت کردنەوە. بیرکردنەوەی شیعری دەتوانێ پڕپەماناوە جەغد لەسەر ئەوە بکا کە هەر ئەندامە لە پۆلی پیاوە حەکیمەکان لەڕووی حەرفیەوە ئۆلیسیسە، ئەوە نا کە هەریەکە ئۆلیسیسێکە، یاخود لە ئۆلیسیس دەچێ، بەڵکو هەریەکە ئۆلیسیسە بۆخۆی، یاخود یەك شوناسیان هەیە لەگەڵ ئۆلیسیس. مەبەستی ڤیکۆ ئەوەیە کە لەڕێگای فەنتازیاوە بەش وەك گشت، کۆشێوە وەردەگرێو وێنا دەکرێ.

هەرچی پەیوەندی بە کۆ مەعقولەکانەوە هەبێت بریتین لە شێوەی فیکر کە خاسیەتی سەردەمی سێهەمە، سەردەمی مرۆڤەکان. چەمکەکان لە لۆژیکی ئەرستۆیدا لەلایەن دەستەڵاتی عەقڵەوە دروست دەکرێن تا لە هەمە چەشنی بەشەکاندا ئەو خاسیەتانە هەڵبژێرن کە هەر هەموو هاوبەشن تێیدا، کەواتە بابەتەکان پۆلێن دەکرێن لەڕووی هەبوونی چەند خاسیەتێکەوە. وەزیفەی فیکر ئەمەیە کە بەراورد بکاو جیاوازی بخاتە ناو خاسیەتەکانی بابەتەکانەوە، کۆیی گشت بریتییە لەو خاسیەتانەی کە هەموو ئەندامانی پۆلێکی تایبەتی تێیدا بەشدارن. لەڕەوتی کلتوری مرۆڤایەتیدا کۆ خەیاڵیەکان لەبەردەم کۆ مەعقولەکاندا پاشەکشەیان کردو ئەمەی دوایان کە خاسیەتی سەردەمی مرۆڤەکان، بوە باڵادەست.

بابزانین کۆی خەیاڵی چۆن کاردەکا ! ڤیکۆ قسە لە پرنسیپێك دەکا کە کاری ناوخۆیی کۆی خەیاڵییە ئەویش پرنسیپی ڤێرم- فاکتیۆم Verum- Factum کە دەتوانین بەم شێوەیە بەکوردی دایبڕێژینەوە دروست کراو ڕاستی. پرنیسیپی دروست کراو/ ڕاستی ئەو پرنسیپەیە

کەدەڵێ "ئەو شتەی راستە یەکسانە بەو شتەی کە دروست کراوە". هەروەك چۆن خودا جیهان دەناسێ چونکی خودا خۆی دروستی کردووە، ئاوهاش مرۆڤ دەتوانێ جیهانی کۆمەلایەتیو کلتوری بناسێ لەبەر ئەوەی دروست کراوی خۆیەتی. بۆ یەکەمین جار ڤیکۆ لە کتێبەکەیدا (کۆنترین حیکمەتی ئیتالیەکان) باس لەم پرنسیپە دەکا. ڤیکۆ پرنسیپی ڤێرم/ فاکتیوم، دروست کراو/ راستی وەك دژە پرنسیپێکی دیکارتی گەلالە دەکا، دژ بە چەمکێکی دیکارتی چەمکی "ئایدیا ئاشکراو جیاوازەکان". Verum بریتی‌یە لە مەعقول/ دروست کراو، مەعقول بۆ دروست کەرەکەی. ئێمە دەتوانین هۆکانو شێوەکانی شتە مرۆڤیەکان بناسینو بزانین لەرێگای جارێکی دی گەڕانەوە بۆ ریشەکانیان، لەرێگای یادەوەری‌یەوە، وە بیرهێنانەوەی سەرەتاکانیان. ئەمەش زانستێکی راستەقینەو جیاوازە لە کۆنشێنسیا Conscientia یاخود هۆشیاری کەلای دیکارت بریتی‌یە لە دڵنیابوون لەبابەت. پرنسیپی "راستی بریتی‌یە لە دروست کراو" لەئایدیای کۆی خەیاڵیدا بەتەواوی ئاشکرا دەبێت. لێرەدا تێگەیشتنێکی دی هەیە سەبارەت بە ریشەکانی بیرکردنەوەی مرۆڤ لە میتافۆرە دروستکراوەکانی مرۆڤەوەو رێگا ئەفسانەییەکانەوە بۆ دروست کردنی چەمك کە کارێك دەکا بیرکردنەوە شیاوبێت. کۆی خەیاڵی بریتی‌یە لەدارشتنێکی ئەفسانەیی‌و لێرەوە رۆڵە بنەڕەتیەکەی بریتی‌یە لە رۆڵی شوناسی. لەکۆی خەیاڵیدا بەشەکان تەماهی دەکەن لەگەڵ وێنەی ئایدیاڵدا، جیهان وا وێنا ناکرێت وەك ئەوەی پێك هاتبێت لەبەشە جیاوازەکان بەڵکو یەکێتیەکە لەلایەن هێزێکی گەردوونی‌یەوە پێکەوە گرێدراوە. کاسیرەر لەکتێبەکەیدا (بیرکردنەوەی ئەفسانەیی. بەرگی دوو. فەلسەفەی شێوە سومبولیەکان) دەنووسێ "لەدیدی ئەفسانەییەوە گشت بەشەکان نیەو ناشێ وورد بکرێتەوە بۆ سەر بەشەکان، بەشی راستەوخۆ گشتەو وەك گشت فەرمان دەکا"(9). کەواتە بەشی تەنیا نوێنەری گشت نیە بەڵکو گشت بەیان دەکاو پەیوەندی گشتو بەش سومبولی نیە، عەقڵی نیە بەڵکو پەیوەندیەکی راستەقینەیەو بەش لەرووی ئەفسانەییەوە هەر هەمان شتە وەك گشت.

لەپاڵ کۆ خەیاڵیەکانیشدا، ڤیکۆ لە زانستی نوێدا فەنتازیا بەمانایەکی تریش بەکاردەهێنێ. مانای دووهەمی فەنتازیا تێگەیشتنی وەبیرهێنانەوە ئاسا لەخۆ دەگرێ، واتە تێگەیشتنێ کە پشت بە توانای یادەوەری دەبەستێت لەمەڕ گەشەکردنی مرۆڤانە بەدرێژایی مێژوو، لێرەدا ڤیکۆ بیرۆکەیەکی نوێ بەکاردەهێنێ "مێژووی سەرمەدی ئایدیاڵ (مثالی) idealeternal history" کە بریتی‌یە لەمێژووی بازنە ئاسای نەتەوەکان. مادە خامەکانی مێژووی سەرمەدی ئایدیاڵ لەلایەن فیلۆلۆجی‌یەوە دەخرێتە بەردەم فەلسەفەو فەلسەفەش دامەزراندنەوەی خەیاڵی توخمە گەردونیەکانە. ئەرکی فەلسەفە ئەوەیە کە لەو دراوە فیلۆلۆجیانە وردبێتەوەو ئەوە دیار بخا کە حیکمەتی خودایی چی کردوە لەمێژوودا لەرێگای توانای مرۆڤەوە بۆ دروست کردنی مێژوو. مێژووی سەرمەدی ئایدیاڵ پەیوەندی بەزانستی نەتەوەکانەوە هەیە، زانستی نەتەوەکان یاخود مێژووی جیهانی مرۆڤ ئەوە دەخوازێ کە راستی دروست بکرێ بەرێگەی دڵنیابوونەوە. ئەو شتەی کە لەبنەڕەتدا لەلایەن مرۆڤەوە دروست کراوە، ترادسیۆن، زمان یاسا لەرەوتی ژیانێکی تایبەتی کۆمەڵە خەڵکێکدا دەبێت جارێکی دی دروست بکرێتەوە لەلایەن بیرکردنەوەی فەلسەفی‌یەو دەبێت ئەوە نیشان بدا کە چۆن ئەو مێژووە نەك تەنیا هەلو مەرجو مێژووی ئەو خەڵکەیە بەڵکو پرنسیپی جیهانی مرۆڤایەتی‌یە.

گوتمان ڤیكۆ باس لە سێ سەردەم دەكا، سەردەمی خواكانو سەردەمی قارەمانەكانو سەردەمی مرۆڤەكان. بەڕای ڤیكۆ سەردەمی مرۆڤەكان كە لە ڕێگای كۆمەعقولەكانەوە حوكم دەكرێت خاسیەتێكی سەرەكی هەیە ئەویش پەروازەبوونی مرۆڤەكان لەیەكترو داڕزانی ژیانی سیاسیو كۆمەڵایەتی. ڤیكۆ ئەم سەردەمەی دوایی بەبەربەریزم لەقەڵەم دەدا، سەردەمی بەربەریزمی عەقڵ، بەڵام ڤیكۆ پێی وایە كە لەسەردەمی مرۆڤەكاندا كە سەردەمی كۆمەعقولەكانەو سەردەمی پووكانەوەی فەنتازیا، پرۆسەیەك هەیە كە ڤیكۆ ناوی دەبا بە پرۆسەی جارێكی دی دۆزینەوەی فەنتازیا یاخود سەرهەڵدانەوەی فەنتازیاو هەر ئەمەشە هۆی ناونانی كتێبەكەی بە زانستی نوێ كە زانستێكە لەیادهێنانەوەی فەنتازیا دەدوێو هەر ئەم یادهێنانەوەیەی فەنتازیاشە كە دەبێتە مایەی ئەوەی شوناسی مرۆڤەكان مسۆگەر بكا. مرۆڤەكان لەڕێگای وەبیرهێنانەوەی فەنتازیاوە دەتوانن خۆیان وێنا بكەنەوە زیاتر لەو بۆچوونە تەختو راستەی دیكارت كە بۆچوونێكی زانستییەو دەبێتە مایەی بەگەڕخستنی سروشتو مرۆڤەكانو دەبێتە مایەی داڕزانی ژیانی كۆمەڵایەتیو سیاسی جڤات. فەنتازیا، لەڕێگەی هەردوو بیرۆكەی كۆخەیاڵیەكانو ریشە ئەفسانەییەكانو مێژووی گەردوونی ئایدیاڵ، ئەو شتەیە كە پێویستە تاكو مرۆڤەكان لەسەردەمی مرۆڤەكاندا بتوانن ببن بە مرۆڤو بزانن كێنو تابتوانن شوناسیان هەبێت، بەخەبەر هێنانەوەی فەنتازیایە كە دەبێتە مایەی دەرك كردن بە نزیكی ژیان. كەواتە فەنتازیا یارمەتیمان دەدا وەك جڤات، وەك گروپ دوورە پەرێزی بكەین لەسەرەولێژ بوونەوەی تراژیدی بەرەو بەربەریزمی زیاترو لەسەر ئاستی تاكەكەسیش فەنتازیا یارمەتیمان دەدا تا زیاتر ببینە مرۆڤ.

هەرچی پەیوەندی بەفیكری سیاسی مۆدێرنەوە هەبێت، ئەوەی ئاشكرایە ئەوەیە كە عەقڵانیەت ناتوانێ ئایدیایەكی گونجاو و وێنەیەكی پشت پێ بەستراومان دەربارەی جیهان بدا بە دەستەوە، جیهانێ كە هەمیشە لەگۆڕاندایەو شێوەیەكی نەگۆڕی نیە. جیهانێ لەوجۆرە خۆی نادا بەدەست جیهان بینیەكی تەختو رێكی وەك جیهان بینی عەقڵی كە تەنیا پشت بەعەقڵ دەبەستێ. لای ڤیكۆ ئەو شتەی كە زۆر بنەڕەتیە بیزانین ئەوەیە كە ratio عەقڵ ناتوانێ یارمەتیمان بدا لە سیاسەتدا، لەبەر ئەوەی عەقڵ عەوداڵی چارەسەرێكە تەنیا چارەسەرێك بۆ هەموو گیروگرفتەكان. هەروەها لەبەر ئەوەی سیاسەت لەسەر یاسای سروشتیەوە نەهاتۆتەوە ئاراو بەڵكو لەسەر یاسای مرۆڤییەوە هاتۆتە ئاراوە، لەبەر ئەوەی فیكری سیاسی رووبەڕووی جیهانی ئەم یا ئەو نابێتەوە بەڵكو رووبەڕووی جیهانێك دەبێتەوە كە پێك هاتوە لە كۆمەڵێ رەهەندو كۆمەڵێ ئەلتەرناتیڤ، مرۆڤ ناتوانێ پشت بە عەقڵ ببەستێ. بێگومان گووتاری عەقڵانی- لۆژیكی خاوەنی دەستەڵاتی خەیاڵ نیە تابتوانێ چارەسەرەكان بۆ ئەو جیهانە سیاسیە بدۆزێتەوە، كە هەمیشە لەگۆڕاندایە. لەیادمان بێت كە لەسەرەتای فەلسەفەی مۆدێرندا دیكارت ریتۆریك (رەوانبێژی) و بابەتەكانی تری وەكو ئەو كە گونجاون بۆ سیستەمی پەروەردە لە فەلسەفە كردنیە دەرەوە. غەمی دیكارت ئەوە بووكە "راستی بنەڕەتی" بدۆزێتەوەو لەو راستیەوە دەسكەوتە میتافیزیقیەكان هەڵبهێنجێ. بەڵام بەكردنە دەرەوەی رەوانبێژی لە فەلسەفە، فەلسەفەی رەخنەگرایی چادرێكیدا بەسەر چالاكیەكی گرنگی مرۆڤداو ئەنجامەكانیشی چارەنووس سازن. بۆ نمونە ڤیكۆ لەو باوەڕەدا بوو كە قوتابیانی لاو ناتوانن لەگەڵ ژیانی جڤاتدا، ژیانی خەڵكدا دەرگیرین،

ناتوانن ڕێنومایی خۆیان بکەن لە ڕێگەی حیکمەتێکی گونجاوەوە. ڤیکۆ لە کتێبێکی تریدا دەڵێ: "ئەو شێوەی مامەڵەکردنە زیان بەخشە (پشت گوێ خستنی ڕەوانبێژی- فاروق)، لەبەر ئەوەی مەشق کردن لەبواری هەستی هاوبەشدا جەوهەرییە بۆ پەروەردەکردنی مرۆڤە کامڵەکان، گەر وا نەبێت لادەدەن بەلای هەڵسو کەوتی غەریبو لوت بەرزانەدا"[10]

لەشوێنی گوتاری عەقڵانی-لۆژیکی جەستەی سیاسی دەبێت پشت گیری بکرێ لەلایەن هەستی هاوبەشەوە Comonsense. هەستی هاوبەش ریشەکانی خۆی لەنێو چالاکی خەیاڵدا داکوتیێو دەشێ وا سەیر بکرێ وەك سووربوونێکی ئەزموونێکی بنەڕەتی لەنێوان پێویستیەکانو سروشتدا. هەرچی پەیوەندی بەسیاسەتەوە هەبێت، هەستی هاوبەشی بریتییە لە حوکمدانێکی سیاسیانە کە ئیجرادەکرێ لەگەڵ هاونیشتمانیەکاندا لەڕێگەی زمانو عورفو عاداتو ڕێك کەوتنەوە. وەك شوێنی باوەڕبوو لای ڤیکۆ، جیهانی لەو توخمانە سەرهەڵدەدا کە لەلایەن خەڵکەوە داخوازی کراون، لێرەوە پێویستی بوونی بەمرۆڤایەتی کردنی سروشتو دامەزراندنی داموو دەستگا مرۆڤیەکانو ڕێك خستنە سیاسیەکان سەرهەڵدەداو ئەوەی لەنێو ئەم بونیادەدا خۆی مەڵاس داوە بریتییە لە هەستی هاوبەش.

"هەستێك کە هاوبەشە لەلایەن هەمووانەوە بریتییە لە حوکمێك بێ تێڕامان. هەستێ کە بەگشتی لەلایەنی هەمووانەوە هەستی پێکراوە، لەلایەن هەموو گروپەوە، سەرتاپای خەڵکەوە، هەموو نەتەوەو یاخود سەرجەم مرۆڤایەتی"[11]

شوێنی گرنگی پێدانە کە بزانین ڕەنگدانەوەی حیکمەتی شیعریانە لەفیکری سیاسیداو بەتایبەت ناسیونالیزم لەو ڕاستیەدا خۆی دەبینێتەوە کە زمان، فیکر، خەیاڵی داهێنەرانە، میتافۆرو تایپەکانی تری قسە، وەڵامی گۆڕانکاریەکانی جیهان دەدەنەوەو لە ئەنجامیشدا جیهان دەگۆڕن. بەواتایەکی دی حیکمەتی شیعری جیهان دروست دەکا، حیکمەتی شیعری واقیع تاقیدەکاتەوە، ریسك دەکا، جیهان تەی دەکا تا گەیشتن بە ڕێکەوتنێك، تا تەقلیدێك جێگیر دەبێت. ئەم بۆچوونەشی پەیوەندی هەیە بە پرنسیپی دروست کراو/ ڕاستییەوە کە ئاماژە بۆکرد، ئەو پرنسیپەی کە دەڵێ مرۆڤ دەتوانێ ئەو شتە وەك ڕاستی بزانێ کە تەنیا خۆی دروستی کردوە. بەپێی ئەم پرنسیپە، مەعریفە بریتییە لە ڕێکەوتن Conventional، و لەجەوهەریشیدا لەودیو خودێتییەوەیە. گرنگترین ڕەهەندی پرنسیپی دروست کراو/ ڕاستی بریتییە لەوەی کە زمانی سیاسی ڕەنگدانەوەی واقیعی سیاسی نیە بەڵکو خۆی واقیعی سیاسی دروست دەکا. زیاتر لە مەعریفە بریتییە لە ئەنجامدانی کار، ئەنجامدانی فەرمان، و دروست کردن، هەروەها شوناسی کەسی زانیارو شتی زانراو لەشوناسی دروست کەرو دروستکراودا خۆی دەبینێتەوە. سروشتی هاوبەشی میللەتانی جیهان ئەوەیە کە "ئاوەڵایە بۆ زانستی مرۆڤ، ئەمەش لەو ڕاستیەوە هاتوە کە جیهانی نەتەوەکان لەلایەن مرۆڤ خۆیەوە دروست کراوە"[12]

بەپێچەوانەی ڤیکۆوە کە لەو باوەڕدابوو نەتەوە بەرهەمی پرنسیپی دروست کراو/ ڕاستییە، مۆنتسیکۆ لەو باوەڕەدا بوو کە کۆمەڵێ هۆکار لەدروست کردنی نەتەوەدا ڕۆڵی خۆیان دەبینین. سەرەتا، یاسا بەشێوەیەکی گشتی بریتییە لە "عەقڵی مرۆڤ تا ئەو شوێنەی کە حوکمی هەموو خەڵکی سەرزەوی دەکا، و یاسا سیاسیو مەدەنیەکانی هەر نەتەوەیەش دەبێت حاڵەتی تایبەتی بن کە تێیدا عەقڵی مرۆڤ دەچەسپێ"[13] یاسای هەر نەتەوەیە دەشێ

پەیوەست بێ بە شێوەی حکومەتەکەیەوە، بەهەلو مەرجە فیزیکیەکەیەوە (واتە ئاو هەوا، جوگرافیا) و هەلو مەرجە کۆمەلایەتیەکەیەوە (واتە ئازادی عورفو عادات، بازرگانی، ئایین). بە پلەی دووهەم، هەموو پەیوەندیە یاساییەکان پێکەوە رۆحی نەتەوە پێك دەهێنن. ئەوەی بۆ ئێمە گرنگە چەمکی رۆحی نەتەوەیە لای مۆنتیسکۆ، هەروەها کاراکتەری نەتەوەیە، چەمکی رۆحی نەتەوە یەکێکە لە سەرەکیترین باوەڕەکانی کتێبی "رۆحی یاساکانی"و یەکێکە لەو چەمکانەی کەلە فیکری کۆمەلێ بیریاری ئەورووپیدا کاریگەری خۆی دادەنێ. مۆنتسیکۆ پێی وا بوو کە کارلێك کردنی هۆکارە فیزیکیو ئەخلاقیو کۆمەلایەتیەکان لە ناویەکتردا رۆحی نەتەوە بەرهەمدەهێنن. ئەو لەو باوەڕەدا بوو کە رۆح یا کاراکتەری نەتەوەیەك بەرئەنجامی زنجیرەیەکی بێکۆتایی هۆو هۆکارەکانەو کاتێك گەلاڵە بوو باڵ بەسەر کۆمەلگادا دەکێشێ. لەسەروو ئەوەشەوە مۆنتسیکۆ پێنج هۆکار دیاریدەکا کە رۆحی نەتەوە پێك دەهێنن، ئایین، شێوەی حکومەت، یاساکان، ئەخلاقو ترادسیۆن، لەپاڵ ئەو کاریگەریەی کە هەیبوو لەسەر بیریارەکانی وەکو رۆسۆو هیگلو هێردەروکانت، چەمکی "رۆحی نەتەوە"ی مۆنتسیکۆ خۆی لەخۆیدا بوە توخمێکی بنەڕەتی لە ناسیونالیزمدا وەکو هێزێکی سیاسی. وەزیفەی ئەم چەمکە ئەوەیە کە ئەم نەتەوە لە ئەوی دی جیا بکاتەوەو شوناسی نەتەوە دەولەمەندبکا.

3-ناسیونالیزمی سیاسی

بەشێوەیەکی گشتی رێك کەوتنێك هەیە لەنێوان کۆمەلێ لێکۆلەرەوەدا لەسەر ئەو خالەی کە ناسیونالیزمی سیاسی دەگەڕێتەوە بۆ رۆسۆ. رۆسۆ سەرجەم نەتەوایەتی یەکسان کرد بە دەربڕینی ئیرادەی خەلك. لەگەل رۆسۆدا هێزێکی نهێنی بەلام ئەم دنیایی، دەستەلاتێك لەدایك بوو کە پێی دەگووترێت "خەلك". لەم رووەوە کامۆ دەلێت "پەیمانی کۆمەلایەتی لەرووی دۆگماوە تەفسیری ئاینێکی تازە دەکا کە خواکەی عەقلە، تێکەل کراوە لەگەل سروشت، و نوێنەرەکەشی لەسەر زەوی، لەجێگای شا، بریتیە لەخەلك وەك دەربڕینێکی ئیرادەی گشتی، تا ئەو شوێنەی دەلێ "ئیرادەی خەلك بوە جێگرەوەی خودی خودا""[14].

بەڕای رۆسۆ زمان خاسیەتێکی سەرەکی نەتەوەیەو لە نەتەوەکانی دی جیا دەکاتەوە. بنەچەی زمان، بەڕای رۆسۆ، ناشێ بگەڕێتەوە بۆ پێویستیە فیزیکیەکانی تاکەکەس بەلکو دەگەڕێتەوە بۆ سۆزو پێویستیە رۆحیەکان. زمان تەنیا جومگەیەك نیە کە خەلکی پێکەوە دەبەستێتەوە بەلکو شێوە بە رۆحی نەتەوەو کاراکتەری خەلك دەبەخشێ. ئەوەی گرنگە سەرنجی بدەین ئەوەیە کە کاراکتەری نەتەوە بەرئەنجامی مێژوویەکی ناخودئاگای نەتەوە نیە بەلکو کاراکتەری نەتەوە زۆر جاران دەبێت دروست بکرێتو بەسەر نەتەوەدا بسەپێنرێ. لێرەدا هەم رۆشنبیرانو هەم یاسادانەران رۆلی بنەڕەتی دەبینن و هەر ئەمەشە ئەو پرۆژەیەی کە رۆسۆ لە پەیمانی کۆمەلایەتی‌دا سەر رێگای دەخا لەم رێگەیەوە رۆسۆ هەول دەدا گیروگرفتێ کە بەرئەنجامی مل ملانێی تاکەکەسو دەولەتە چارەسەر بکا، گیروگرفتی بەرژەوەندیە خودیەکانو ئەرك. بەم جۆرە کرداری دامەزراندنی کۆمەلگای مەدەنی یەکسانە یا هاوشێوەیە لەگەل دامەزراندنی ئەخلاق یا ئیلتیزام بەرانبەر بەیەکتر.

لەمەڕ کۆمەلگای مەدەنیەوە ئەو سەختیە هەیە کە چۆن شێوەیەك لەشێوەکان رێکخراو، چ جۆرە رێکخستنێ دامەزرێنرێ کە هەم داکۆکی لەسەرجەم جڤات بکاو بیپارێزێ، و هەم داکۆکی لە تاکەکەسو مولکیەتی هەر دەستەو تاقمە بکاو

بـەم شـێوەیەش تـاك لەگـەڵ گشـتدا پێکـەوە گرێبداو تاك کە پێویست بێ سەرشۆڕبکا بۆ یاسا هەست بکا کـە سەرشۆڕ دەکا بۆ خۆی، و ئـەو پێکـەوە گرێدانـەش ئـەو هەسـتە بەتاکەکـەس ببەخشێ کە هـەروەك پێش دروست کردنی ئـەو رێکخستنە ئـازاد، کلیلی چارەسـەرکردنی ئـەو کێشـانەش چـەمکی "ئـیرادەی گشـتی"یـە (General Will).

**ئیرادەی گشتی. General Will**

چەمکی ئیرادەی گشتی رۆڵێکی گرنگ دەبینێ لە فەلسەفەی سیاسی رۆسۆدا. لـە "پـەیمانی کۆمەڵایەتیدا" ئەوکاتەی رۆسۆ ماناکانی پـەیمانی کۆمەڵایـەتی روون دەکاتـەوە، بۆ یەکـەمین جـار قسە لە ئیرادەی گشتی دەکا لە کتێبی یەکەمدا:

"لەڕاستیدا هـەر تاکەکـەس دەتوانـێ، وەك مرۆڤ، کـە ئیرادەیـەکی تایبـەتی هـەبێت کـە پێچەوانەی ئیرادەی گشتی بێت کە هەیەتی وەکو هاونیشتمانیەك"[15].

لەڕێگەی چەمکی ئـیرادەی گشتیەوە رۆسـۆ هەوڵ دەدا کە کۆمـەڵگای مـەدەنی تەفسیر بکا. ئەو لەو باوەڕەدایە کە ئیرادەی گشتی لەخزمەتی چاکەی هاوبەشدایە، تـا ئـیرادە گشتی تـر بێت عادلانـەتر دەبێـت. هـەروەها ئـیرادەی بـەردی بناغەی مافە سیاسیەکانە. ئیرادە تەنیا توخمێکە کـە لـەقۆناغی سروشتیدا هـەبوەو تـا ئێسـتاش هەموو مرۆڤەکان تێدا بەشدارن.

جومگـە کۆمەڵایەتیـەکان پشـت بـە رێـك کەوتنێك دەبەستن کە کرداری ئیرادەیە لەلایـەن هـەر تاکەکەسـەوە. لەلایەکـەوە، هـەر هاووڵاتیـە، وەك تاکەکـەس، بریتیـیە لـە خودێکـی ئـازادی جڤاتی سیاسی، و لەلایەکی دیکەشەوە جەستـەی سیاسـی کە هـەموو هاووڵاتیـان پێـك هـاتوەو، چاکەی گشتی دەخوازێ.

بەپێی رۆسۆ، هـەروەك چۆن ئـیرادەی تـاك وێڵی چاکەیە، ئیرادەی گشتیش هەمان مەبەستی هەیە. لـە جەسـتەی سیاسیدا. بۆ ئـەوەی ئەمـە روویـدا پێویسـتە کـە هـەموو کردارێکـی ئـیرادەی گشتی یەکسانی هاووڵاتیان بچەسپێنێ.

ئیرادەی گشتی دەبێـت دوو پرنسیپ بـەخۆی بگرێ. یەکەم دەبێت بخوازرێ یاخواستو ویستی هەموو ئەندامانی کۆمەڵگا بێتو وەك یەك بەسـەر هەموو لایەکدا بچەسپێنرێ، دوو، ئیرادەی گشـتی بۆ ئەوەی بەڕاستی ئیرادەی گشتی بێـت، دەبێـت گشتی بێت لەبابەتەکانیداو لەجەوهەریدا، دەبێـت لەهەمووانەوە بێـتو بـۆ هـەموان وەك یـەك بێت. کەواتـە کردارەکـانی ئـیرادەی گشـتی، واتـە یاسـاکانی، جیـاوازی ناخاتـە نێـوان تاکـەکانی کۆمەڵو بەم شێوەیەش هەر هاووڵاتیە دەتوانرێ وا سـەیر بکـرێ کـە ئـازادە هـەروەك قۆنـاغی سروشتی لەبەر ئەوەی سـەردانەواندنی بـۆ یاسـا، ئەو لەڕاستیدا سەر بۆ ئەو یاسایە دادەنەوێنێ کە بەرهەمی ئیرادەی خۆیەتی. پەیمانی کۆمەڵایـەتی کەسێکی صنـاعی artificial دروست دەکـا، واتـە دەوڵەت کە ئیرادەی هەیە، ئـەوەی وا دەرکـەوێ پێویستە بۆ دەوڵـەت ئـەوە دەخـوازێ لەلایـەن دەوڵەتـەوەو ئـەوەش کـە خـوازرا لەلایـەن هەموانەوە ئەوە دەبێتە یاسا.

لێرەوە یاسا بەرهەمی ئیرادەی گشتیە. هەر تاکە کە لە یاسادانانـدا بەشداری دەکا بەڵام یاسـا گشتیەو تاکەکـەس وەك یاسادانەر دەبێت ئـەو یاسایانە دابڕێژێ کە بۆ هـەموو ئـەندامانی جڤات دەست بـدا. (ئـەم ئـەو مەقولەیـەی -کانت- مان بیردەخاتـەوە کـە دەڵـێ: بـەپێی ئـەو پرنسـیپە هەڵسو کەوت بکـە کـە دەبێت ببێتـە یاسایەکی گەردوونی). ئیرادەی گشتی دەوڵەت، کـە گشتی تـرە لـەئیرادەی گشـتی کۆمـەڵگای نـاو ئـەو دەوڵەتە، دەبێت زاڵ بێـت، لەبـەر ئـەوەی چاوی لەچاکەی گشتی گـەردوونی تـر بریـوە. کەواتـە یەکـەم بەرئـەنجامێکی گرنگ کـە لـەم دیـدەوە بەدەسـتمان دەکـەوێ ئەوەیـە کـە رۆڵـی

حکومەتێکی رەوا لەوەدایە کە بۆ هەموو شتێ پەیڕەوی ئیرادەی گشتی بکا. مرۆڤیش وەك یاسادانەر دەتوانێ تەنیا ئەوە بخوازێ کە هەموو دەخوازن. وەك هاووڵاتیەکیش سەر بۆ ئەو یاسایە دادەنەوێت کە خۆی وەك یاسادانەرێك خواستویەتی. یاسا بەرهەم دەهێنرێ لەلایەن ئیرادەی هەر یەکێکەوە کە بیری لەهەموان کردۆتەوە. کۆمەڵگای مەدەنی رێك کەوتنێکە لەلایەن دەستەیەك لە خەڵکی کە هەریەکە بتوانن ببنە بەشێك لەئیرادەی گشتی. لەئەنجامدا هەریەکە وەك پێش چوونە ناو ئەو رێکەوتنەوە. ئازادە لەبەر ئەوەی تەنها مل کەچ دەکا بۆ ئیرادەی خۆی کە ئێستا بەرزکراوەتەوە بۆ ئاستی گشتی.

قسەکردنی رۆسۆ لە سەر ئیرادەی گشتی پەیوەندی بە کێشەیەکی تریشەوە هەیە ئەویش کێشەی ئازادی. رۆسۆ لەو باوەڕەدایە کە مرۆڤ بەسروشت ئازادەو ئازادیش بەهایەکە شایانی پێوانە نییە. ئەرکی رۆسۆ لە پەیمانی کۆمەڵایەتیدا ئەوەیە کە نیشانمان بدا کە لەگەڵ سەرهەڵدانی دەوڵەتو کۆمەڵگای مەدەنیدا، لەجیاتی لەدەست دانی ئازادی، مرۆڤ بە ئازادیەکی باڵاتر دەگا. لەرێگای پەیمانی کۆمەڵایەتیەوە ئازادی سروشتی ئاڵوگۆڕی پێدەکرێ لەگەڵ ئازادی مەدەنیدا. ئازادی مرۆڤ جەوهەری بۆ بەختیاری خۆیو تەندروست بوونی کۆمەڵگا. کەواتە رەتکردنەوەی ئازاد یەکسانە بەرەتکردنەوەی مرۆڤ بوون، ئەو هێزەی ئازادیمان لێ زەوت دەکا دەیەوێت بوونی مرۆڤانەمان پەیامال بکا. ئازادی مەرجێکی بنەڕەتیو پێویستە بۆ بەختیاریو ئەخلاقو ژیانمان. رۆسۆ پێی وایە کە ئازادی مرۆڤ تاکە سەرچاوەی ئەخلاقە.

بەپێی تیوریەکەی رۆسۆ گەر مرۆڤێ هەر بەردەوام بێت لەوەی کە بەپێی ئیرادەی تایبەتی خۆیو خواستی تاکەکەسیانەو بەرژەوەندی تاکەکەسیانەی خۆی بجولێتەوە، ئەوە دەشێ پێی بگووترێ کە لە پلەو پایەی خۆی هێندە کەمکردۆتەوە تا پلەی ئاژەڵ. لەحاڵەتێکی لەو جۆرەدا ئەو مرۆڤە دەست بەرداری ئازادی بوە بەو مانایەی تەنیا بۆتە ئامێرێ بەدەست سۆزەکانیەوە، ئا لێرەدایە کە بۆچوونە ترسناکەکەی رۆسۆ قووت دەبێتەوە، مەبەستم لەو بۆچوونەیەتی کە دەڵێ، لەو سیناریۆیەی سەرەوەدا واتە کاتێك مرۆڤ دەستەبەرداری ئازادی بوو وە تەنیا لەخزمەتی سۆزدا کاریکرد، ئەوا کۆمەڵگا هەقیەتی کە زۆر لەو تاکە بکا تا ئازادبێ، واتە بەزۆر بیکاتەوە بە کەسێکی ئازادو بەزۆر رازی بکا بە شێوەیەکی گونجاو مەشق بەئیرادەی بکا. سیستەمی پەروەردەو سزاش ئەو دوو ئامێرەن کەلە رێگەوەی تاکەکەس دەهێنرێتەوە سەر رێگا، بەناچاری ئەو بۆچوونە سیستەمی تۆتالیتاری کۆمۆنیزمو فاشیزممان دەهێنێتەوە یاد لە سەدەی بیستەمدا، هەر بۆیەشە هەندێك لەو باوەڕەدان کە رۆسۆ باوکی فەلسەفەی تۆتالیتاریزمە.

رۆسۆ لەو باوەڕەدایە کە بوونی حکومەت پێویستیەکی نکۆڵی لێنەکراوەو مافی حوکم کردنیشی لەخەڵکەوە وەرگرتووەو سەرچاوەی هەموو رەوایەتیەك خەڵکە، هەر ئەمەشە مەبەستی رۆسۆ لە Soverign دەستەڵاتداریتی یەکێتیەکە کە ناشێ دابەش بکرێ، گەردابەش کرا لە دەستەڵاتداریتی دەکەوێو هەموو ئۆتۆرەتیەك لەئەمەوە سەرچاوە دەگرن.

میری فەرمانەکان لەئیرادەی گشتیەوە وەردەگرێو ئۆتۆرەکی خۆی دەخاتەگەڕ تا هاووڵاتیان لەسەر بناغەی Soverign دەستەڵاتداریتیەوە هەڵسو کەوت بکەن. کەواتە لە فەلسەفەی سیاسی رۆسۆدا، بوونی Siverign لە پێش بوونی حکومەتەوە دێت ئەمەش واتە

حکومەت دیاردەی دووهەمە لەدیدی مافەکانەوە. لێرەوە وابەستەیی بۆخەڵکە نەك حکومەت، حکومەتیش دەبێت هێندە بەهێز بێت کە زاڵ بێت بەسەر ئیرادەی تاکەکاندا بەڵام نەك هێندە بەهێز بێت کە زاڵ بێت بەسەر ئیرادەی گشتیدا. بۆ ئەوەی خەڵك پەیڕەوی لەئیرادەی گشتی بکەن دەبێت ناچاربکرێن کە ئیرادەی تایبەتیان لەگەڵ ئیرادەی گیشتیدا بگونجێنن ئەویش بەو شێوەیە دەکرێ کە کارێ بکرێ وڵاتەکەیان خۆش بوێ، واتە هەستی وڵات پەرستی تێیاندا بەهێزبێت. وڵات خۆش ویستنیش واتە تاکەکەس ئیرادەی خۆی بخاتەگەڕ لە خزمەت وڵاتەکەیداو خزمەتی وڵات بەئەرکی خۆی بزانێ، رۆسۆ ئەم پرنسیپە ناودەنێ amour Proprr.

هەروەها سیستەمی پەروەردە دەشێو دەبێت رۆڵێ ببینێ لەوەی کە تاکەکەس ناچار بکا وڵاتەکەی خۆش بوێ. لەکتێبەکەیدا ئەمیلی[16] رۆسۆ جەغد لەسەر ئەوە دەکا کە نیازی وەزیفەی سیستەمی پەروەردەی نەتەوایەتی ئەوەیە کە شێوەیەکی نەتەوایەتی بە عەقڵو ویژدانەکان ببەخشێ، بیروراو باوەڕی تاکەکان بەو ئاراستەیەدا رێنومایی بکا تا ببنە نیشتمان پەروەر بە غەریزە، بەسۆزەوەو دواجار ببنە نیشتمان پەروەر بەپێویست. بەم پێیە لە قوتابخانە قوتابیان دەبێت ناچاربکرێن ئەو یاریانە بکەن کە رەنگە هەستی نیشتمان پەروەریان تێدا زیندوو رابگرێ، هەروەها دەبێت ترادسیۆنی وڵاتەکەیان لە ئەلفەوە بۆ یێ پێ فێر بکرێ. ئەوەی ئەم ئەجێندا نەتەوە پەروەرییە تەواو دەکا بوونی میلیشیاتی هاونیشتمانیانە (شتێك وەك سوپای میللی عێراق یا سوپای بەسیجی ئێران). لەهەموو حاڵەتەکاندا مەبەستەکە ئەوەیە کە هاونیشتمانیان هەمیشەو بەرێگای جیاواز بەشداری بکەن لەم یا لەوجۆرە کەرنەڤاڵەدا کە عەشقی وڵاتیان لا هەمیشە بەهێز رابگرێ، تاکە سۆزێ کە دەبێتە مایەی پێکەوە گرێدانی هاونیشتمانیان پێکەوە. پێویستە سەرنجی ئەوە بدەین کە ئەم بۆچوونەی رۆسۆ لەمەڕ دروست کردنی ترادسیۆنەوە بۆچوونێکی ئەبستراکت یا ئایدیالیستی نیەو بگرە لە واقیعدا ئەو بۆچوونە لەگەڵ دامەزراندنی دەوڵەتی نەتەوەدا لەزۆربەی وڵاتە خۆرئاواییەکانداو تەرجومەی واقیع کرا، هەردوو سەدەی هەژدەو نۆزدە دوو سەدە بوون کە تێیدا ترادسیۆنی میللی داهێنراو داهێنانی ترادیسیۆنیش یەکێك بوو وەیەکێکە لەو ئەرکانەی کە هەربزووتنەوەیەکی ناسیونالیستی پێی هەستاوە یا دەڵێت پێی هەستێ.

یەکێك لەو فەیلەسوفانەی بە ئاشکرایی و بەپێی دان پێدانانی خۆی لەژێر کاریگەری رۆسۆدا بوو ئەمانویل کانت بوو. من لەو باوەڕەدام کە فەلسەفەی ئەخلاقیو سیاسی کانت بریتییە لە تەواوکردنی بۆچوونەکانی رۆسۆ. بۆ ئەوەی پاڵپشتی ئەم بۆچوونەم بکەم چەند سەرنجێکی خێرا لەسەر فەلسەفەی ئەخلاقیو سیاسی کانت دەردەبڕم. کانت پێی وابوو کە گەر هەردەستەڵاتێکی ئەم دنیایی وا مامەڵە لەگەڵ مرۆڤدا بکا وەك "بابەتێکی سوك بێبەها" و بەکاری بهێنێ تەنیا وەك هۆکارێك بۆ ئامانجەکانی خۆی یاخود شەڕەکانی خۆی پێ بکاو بەکاری بهێنێ بۆ کوشتاری هاوبوونەوەرەکانی خۆی، ئەوا ئەوە ئەم دەستەڵاتە دنیاییە دەیکا بریتییە لە "ئاوەژووکردنی دوامەبەستی خەڵق بوون"[17] بەپێی بۆچوونی کانت ئەخلاقو سیاسەت دەبێت پەیوەندیان هەبێت پێکەوە لەبەر ئەوەی "سیاسەتی راستەقینە ناتوانێ هەنگاوێ بنێ بێ ئەوەی پرنسیپە ئەخلاقیەکان بەسەر بکاتەوە"[18] ئەخلاق دەبێت بەسیاسەت شێوە ببەخشێ لەرێگای جەغدکردنەسەر ئاشتی

سەرمەدیو مافەکانی مرۆڤەوە بۆئەوەی ئەخلاق خۆی ببێتە پاڵنەری سیاسەت. کانت جیاوازی دەخاتە نێوان پاڵنەری ئەخلاقی (کارکردن لەتێڕوانینی ڕێزدانانەوە بۆ یاسای ئەخلاقی) و پاڵنەری یاسایی، بەم جۆرە سیاسەت پێویستە ڕەنگدانەوەی ئەخلاق بێت بەڵام ناتوانێ تەنیا پشت بە پاڵنەری ئەخلاقی ببەستێ. سیستەمی یاسایی دەبێت ژینگەیەك دروست بکا بۆ ئیرادەی چاك" و هەلو مەرجی یاسایی دروست بکا بۆ مەشق کردنی "ئیرادەی چاك" تاکو تاکەکەس ئازاد بێت ئازادبوونێکی پۆزەتیڤ. کەواتە سیاسەت دەبێت ئازادی کە جەوهەری یاسای ئەخلاقی‌یە بە دروشمی یەکەمی خۆی بزانێ. فەلسەفەی ئەخلاقی کانت پشت بە ڕۆسۆیزم دەبەستێت کە تێیدا تاکەکەس یاسا بۆخۆی دادەنێ. یاسا بۆخۆی دادەڕێژێ وەك ئەندامێکی یاسادانەری مەملەکەتی ئامانجەکان، گەر ئەم بانگەشەیە قبوڵ بکەین ئەوا دەتوانین بڵێین کانت هاوڕایە لەگەڵ ڕۆسۆدا کە مل کەچ کردن بۆ ئەو یاسایەی کە کەس خۆی دایڕشتوە تاکە ئازادیەکە کە شیاوی قسە لەسەرکردن بێت.

کانت فەلسەفەی ئەخلاقیو سیاسی خۆی بەوە دەست پێدەکا کە جەغد بکاتە سەر چەمکی "ئیرادەی چاك" کە خۆی بریتی‌یە لەنیازی ئازادی مرۆڤو ئەرکی مرۆڤ. بەڕایی کانت ئیرادەی چاك چاك نیە تەنیا لەبەر ئەوەی کە ئەنجامەکەی چاکە یاخود هەر هۆکارێکی دی، بەڵکو چاکە لەبەر خواستنی، واتە چاکە خۆی لەخۆیدا. عەقڵ وەك بەشێکی پراکتیك وەزیفەیەکی هەیە ئەویش بەرهەمهێنانی ئیرادەیەك کە خۆی لەخۆیدا چاکە. ئەم ئیرادەیەش دەبێت بالاترین چاکە بێتو هەلو مەرجی هەر کردارێکی دیو بگرە "هەلو مەرجی ئارەزووی بەختیاری". بۆ ئەوەی کەسێك بەهایەکی هەبێت وەك بوونەوەرێك دەبێت خاوەنی نواندنی هەڵسو کەوت بێت بەپێی یاسای ئەخلاقی، ئەم توانایەش پەیوەندی هەیە بە ئۆتۆنۆمی کەسەوە وەك بوونەوەرێکی یاسادانەر، یاسادانەر بۆ خودی خۆی، و لەراستیدا توانای یاسادانەری -بۆ- خود هەلو مەرجی سەرەکیە بۆ "ئەخلاق. گەر ئیرادەمان ئازاد نەبێت ئەوا ئایدیا ئەخلاقیەکانو پرنسیپەکان هەموو ڕەوایەتیەك لەدەست دەدەن". ئەم ئیرادەیە، یاخود ئەو ئیرادەی یاسادانانە بۆ خود لەهەموو مرۆڤێکدا خۆی بەیان دەکا، مرۆڤ وەکو بوونەوەرێکی ئازادی خاوەن ئەندێشە.

### 4-ناسیونالیزمی کلتوری

ئێستا دەتوانین سەرنجمان بگوازینەوە بۆ ژیانی ڕۆحیانەی نەتەوەو قسە لەسەر ناسیونالیزمی کلتوری بکەین. بیریارێکیش کە فیکری دەچێتە ئەم خانەیەو هێردەرە فەیلەسوفی ئەڵمانی. دەتوانم بڵێم کە هێردەر یەکەم فەیلەسوفی ناسیونالیستی بوو Par etcellence، ئەو کۆمەڵێ زاراوەو چەمکی بۆ قاموسی ناسیونالیزم زیاد کرد وەك زمانی نەتەوە/ مێژووی نەتەوە، ترادسیۆنی نەتەوە، کاراکتەرو ڕۆحی نەتەوە. هێردەر پێی وایە کە کۆمەڵێ تایبەتمەندیو خاسیەت لەهەر گروپێکی ناسیونالیستیدا هەیە وەك زمان/ترادسیۆن، ڕۆحی ئەو گروپە، مێژوو، وزمان. زمان ڕۆڵێکی نائاسایی‌و بگرە بنەڕەتی دەبینێت چونکی زمان ئەو ڕێگایەیە کە لێوەی ترادسیۆن دەگوێزرێتەوە بۆ نەوەکانی داهاتوو، هەروەها زمان ئامێرێکی ڕۆحی نەتەوەیە.

لای هێردەر زمان تەنیا ئاشکراترین تەعبیرکردن لەڕۆحی نەتەوە نی‌یە، بەڵکو ڕۆحی نەتەوە تەنیا لەڕێگای زمانەوە دەتوانێ خۆی ئاشکرا بکا خۆی نیشان بداو بدرەوشێتەوە. زمان شارێگەیە بەرەو شوناسی نەتەوە Volk (خەڵك)و

زمان ناشێ بێیەکترو سەربەخۆ لەیەکتر وێنا بکرێن.

لەسەر ئەم بۆچوونەوە دەتوانین بڵێین کە دەشێ کۆمەڵێ رەهەند، کۆمەڵێ بابەت لەژیانی Volk خەڵکیدا لەبەین بچن، لەوانە بگرە دەستەڵاتی سیاسی نەتەوەش، بەڵام گەر زمانی نەتەوە پارێزرا ئەوا جەوهەری نەتەوە پارێزراوەو نەتەوە درێژە بەژیانی دەدا. بەڵام دوای لەدەست دانی زمان ئەستەمە بتوانین لەنەتەوە بدوێین. زمان دەرروونی نەتەوەیەو کلتوریش تەعبیرکردنە لەرۆحی نەتەوە، نەتەوەش لەدیدی هێردەرەوە یەکێتیەك پێك دەهێنێ، بەواتایەکی دی یەکێتی کلتوری نەتەوەیەك لەسەر بناغەی مێژوو و زمانو ئەدەبو ئاینو هونەر خەڵکێك دروست دەکا کە وەك یەکەیەك خۆی دەنوێنێ، جەستەیەك کەرۆحی خۆی هەیەو فاکولتیو هێزەکانی خۆی. نەتەوایەتی لای هێردەر بریتی‌یە لە "خەڵکێك کە کلتوری نەتەوەی هەیە، هەر وەك چۆن زمانی خۆی هەیە"[19] لێرەوە هێردەر وا ناسیونالیزم دەبینێ وەك ئەوەی کە بریتی‌یە لە چڕبوونەوەیەکی رۆحانی، ریشە داکوتینێك لە کلتورێکی تایبەتیدا. زاراوەی ناسیونالیزم بەمانا هێردەریەکەی تەنیا یەك مانای هەیە ئەویش خۆگرێدانو خۆ بەستنەوە بە کلتوری نەتەوەی خۆوە، گرێدانێك کە دەبێت بپارێزرێت لەبەرانبەر کۆ سمۆپۆلیتانیزم (کەڵکەڵەی جیهانگەرایی)، و توانەوەی کلتوری.

گرنگە کە سەرنجی ئەوە بدەین کە هێردەر پێی وا نیە نەتەوەکان بەرهەمی مرۆڤەکان بن، وەك ئەوەی لای ڤیکۆو رۆسۆ دیمان، بەڵکو نەتەوەکان کاری هێزێکی ئۆرگانیکی زیندووە کە ژیان بەگەردوون دەبەخشێ، هەناسە بە بەری گەردوندا دەکا. کەواتە نەتەوە بریتی‌یە لەژیانو سروشتیش بەهەر نەتەوەیە زمانێکی تایبەتی بەخشیوە کە رۆحی ئەو نەتەوەیەیە. لەم دیدەوە گەشەکردنی کۆمەڵایەتی پرۆسەیەکی ئۆرگانی‌یەو وەك "گەشەکردن" لەلایەن هێزێکی ناوەکی یا دەستەڵاتێك Kraft (jnner Force) وە وزەی بەبەرداکراوە. بەهەمان شێوە دەوڵەتی ئۆرگانێك بریتی‌یە لە جڤاتێك کە لەرووی رۆحیەوە تواونەتەوە لەیەکترداو سەرقاڵی ئەو چالاکیانەن کە لەسەر پرنسیپی هاریکاری نەك کێشمەکێشمەوە دەنوێندرێن. بۆ ئەوەی کە دەوڵەتێکی -ئۆرگانیکی State- Volk (خەڵك-دەوڵەت) دابمەزرێندرێ ئەوەی کە پێویستە ئەوەیە لەلایەکەوە بوونی هەستی لێپرسراوی کۆمەڵایەتی‌و هاریکاری نەتەوەیی لەلایەن تاکەکەسەکانی نەتەوەوە، و لەلایەکی دیکەوە بوونی هەستی ئەخلاقی جیهانگەرا لەلایەن نەتەوەوە. بەرای هێردەر ناسیونالیزمو جیهانگەرایی دوو شەپۆل نین کە بەدوو ئاراستەی جیاوازی دژ بەیەکدا لە جولاندا بن، بەڵکو هەردووکیان پرۆسەیەك پێك دەهێنن سەرچاوەی عاتفی ئەم باوەڕە لای هێردەر لەیەك بیرۆکەدا خۆی دەبینێتەوە ئەویش بیرۆکەی مرۆڤایەتی Humanitatیە. هێردەر ئەم چەمکەی چەمکی مرۆڤایەتی، لەدوا دوو دەیەی ژیانی فەلسەفی خۆیدا گەڵاڵەکردو کاتێ کە بەدوای پرنسیپێکدا دەگەڕا کە لە رێگەوەی بتوانێ تێگەیشتنی رۆحانیانەی خۆی لەمەڕ ژیانی مرۆڤەوە داببڕێژێت، بە جۆرێ کە هەمەچەشنەیی‌و فرە رەهەندیەکانی ژیان لەو پرنسیپەدا تەعبیریان لێ بکرێ‌و ئەو چەمکە هەمەچەشنەیی‌یە بێ سنوورەکانو جیاوازی لەخۆبگرێ. چەمکی مرۆڤایەتی کە ریشەکانی لەمێژوودا داکوتیوە. بریتی‌یە لە "ئامێزگرتنی مرۆڤایەتی بەهەموو مانیڤێستەکانیەوە"[20]. لەئامێزگرتنی ژیان بەهەموو رەهەندەکانیەوە لێرەوە گرنگی فیکری هێردەر دەردەکەوێ لەمێژووی ئایدیاکاندا، هێردەر یەکەم فەیلەسوفەکە لەجیاوازی‌و

هەمەچەشنەیی دەدوێ، بۆچوونەکانیش دواجار لەو باڵە فەلسەفیەدا ڕەنگ دەداتەوە کە بە فەلسەفەی ژیان دەناسرێ (ڕۆمانتیکەکانو نیچەو دیلتایو هایدگەرو برگسۆنو گادامیر..).

بەلام ئەوەش بڵێین کە مرۆڤایەتی وەك باڵاترین ئایدیاڵی کۆمەلایەتی، زیاد لەچەمکێ بوو لای هێردەر. هێردەر وا سەیری مرۆڤایەتی دەکرد کە بریتییە لە "Summum bonum" چاکەیەکی بەشکۆی ئەم جیهانەیە".

هەروەها مرۆڤایەتی ئەو هێزەیە کە مرۆڤایەتی بەخەڵکانی دنیا دەبەخشێو بانگی هەموو نەتەوەکانو تاکەکەسەکان دەکا بۆ چارەنووسی مرۆڤانەیان، بۆ جێبەجێکردنی بوونە مرۆڤ بوونیان. ئەوەشمان لەیادبێت مرۆڤایەتی بوون بەهێزە نەك بوون بەکردەوە، واتە شیماتە (ئیحتمال)ی ئەوەش هەیە کە ئەم بیرۆکەیە، ئەم چاکەیە لەبوون بەهێزە وە هەرگیز نەبێتە بوون بە کردەوە، هەر ئەمەشە سەرچاوەی کارەساتەکان.

من وای دەبینم کە چەمکی مرۆڤایەتی بەمانا هێردەریەکەی توخمێکی ئایینی لەخۆدەگرێ کە غەم خواردنە بۆ هەلو مەرجی مرۆڤەکان لەکۆمەڵگادا، و سۆزێکی ئایینییە کە غەمی پۆتاسیۆن، شیماتەکانی ئازادی مرۆڤانە دەخوا، و هەروەها مانای ئەخلاقی وانەکانی ئایین بەمانا فراوانەکەی لەخۆدەگرێ. مرۆڤایەتی وەکو بیرۆکەیەك ڕێنومایی مرۆڤەکان دەکا بەرەو ئازادییەکی پۆزەتیڤ، یاخود بەزمانی ئینرایا بەرلین قسە بکەین، ڕێنومابیان دەکا بەرەو ئازادی بۆ-...، نەك ئازادی نێگەتیف کە ئازادییە لە-...، مەبەست لەئازادی پۆزەتیڤ ئەنجامدانی کۆمەلێ کردەوەی کۆنکرێتییە بەنیازی بەخۆگەیشتنو جێبەجێکردنی خودی مرۆڤو گەیشتن بەکەرامەتی مرۆڤی هەنگاوێ لەمە بەولاوە، بوونە مرۆڤو بوونی مرۆڤی راستەقینە واتە تێگەیشتنو هوشیاربوون لەو رۆڵەی کە کەس دەبێت بیبینێ لەدیاریکردنی چارەنووسی خۆیدا.

لەم دیدەوە ناسینو دان پێدانانی ئازادی مرۆڤی پێك نەهاتوە لە ناسینەوەی بوونی ئەلتەرناتیڤەکان تا دواسنوور، بەڵکو تێگەیشتنو هۆشیار بوون لەو راستیەی کە سنوورێك هەیە، حەدێك هەیە، لێرەوە هەنگاوی یەکەم بەرەو ئازادی تێگەیشتنە لەو راستیەی کە تاکەکەس ئازاد نیە لەوەی هەرچی بوێ بیکا، ئارەزووی هەموو شتێ بکا کە دڵی دەخوازێ، بەڵکو مرۆڤ ئازادە تا ئەو شوێنەی کە دەتوانێ لە سنووردار بوون بگاو لەو سنوورداریەتیەشدا خۆی بگونجێنێو بەخۆی بگا. ئەم هۆشیاریەش بەرانبەر بەسنوورداربوونی تواناو ئەلتەرناتیڤەکانمان وەزیفەی زەمینەیەك دەبینێ کە لەسەریەوە دەتوانین شێوە بەژیانمانو بوونمان ببەخشین، لەسەریەوە دەتوانین ڕێڕەوی کردارەکانمان دیاری بکەین. هەروەها ئازادی واتە هۆشیاری خود، هۆشیاری خودیش واتە دیاریکردنی چارەنووسی خۆبەدەستی خۆ. (گەر سەرنج بدەین دەبینین کە هێردەر بە تەواوی لەژێر کاریگەری سپینۆزادایە، بۆ ئەم مەبەستە بروانە وتارێکی نووسەری ئەم چەند دێرە لەژێر ناونیشانی "رەهەندی ئایینی فیکری هێردەر".)

وێڕای ئەو سەرنجانەش، مرۆڤایەتی Humanitat بریتییە لە هێزێکی چالاك، هێزێك کە. لێوانلێوە لەدەستەلاتی ئەرێ گووتنو جەغد کردنی پۆزەتیڤانە، هێزێکە جەغد لەسەر هەموو رەهەندەکانی ژیان دەکا، هەموو رەهەندەکانی بوون دەناسێتەوەو لەخۆی دەگرێ، بگرە لایەنە تراژیدیاکەی ژیانیش، هێشتا ئەم پرسیارە لەبەردەمماندا نەڕەوبوەتەوە کە چۆن مرۆڤایەتی پێناسە بکەین؟ هەروەك چۆن چەمکی هێردەریانەی Kraft (دەستەلات یا هێزێکی

ناوەکی) ئاسان نیە پێناسە بکەین ئاوهاش چەمکی مرۆڤایەتی بەئاسانی پێناسە ناکرێ. وەك دیمان چەمکی Kraft لەلایەکەوە مانای هێزێکی دەروونی– فیزیکی دەگەیەنێت یاخود وزەیەکو هێزێکی ناوخۆ کە لە گەردووندا کاردەکا، لەلایەکی دیکەوە Kraft کرافت چەمکێکە لەپرۆسەیەك دەدوێ، پرۆسەیەك لە زنجیرەی کاتداو لەڕووباری گۆڕانکاریە هەمیشەییەکان دەدوێ. بەهەمان شێوە، مرۆڤایەتی بەردەوام دەلالەت لە گەشەکردنی رۆح دەکا، لەهەنگاونانی رۆح بەرەو ئازادی، هەڵکردن (تۆلەرەیشن، تسامح) ئامانجە گەردوونیەکان، هەمەچەشنەیی، رێزدانان بۆ یەکتری لەنێوان نەتەوەکاندا. وێڕای ئەمەش دەتوانین دوو رەهەندی "مرۆڤایەتی" دیاری بکەین، رەهەندی بابەتی Objective، و رەهەندی خودێتی (Subjective). مەبەست لە رەهەندی بابەتی (مرۆڤایەتی) رێکخستنی کۆمەلایەتیانەیە، رێکخستنی سیاسیانەو کلتوریانەو حالەتە مێژووییەکان کە تاکەکان خۆیان تێیدا دەبیننەوە. ئەم حالەتە بابەتیە تاکەکەسەکان پاڵ پێوەدەنێ کە بەشێوازو رێگای جیاواز هەڵسو کەوت بکەن، وەلامی کێشەکان بدەنەوە، ئەم وەلامدانەوەو ئەم چالاکیەو ئەم جیاوازیەش رەهەندە خودێتییەکەی مرۆڤایەتیە، لەم دیدەوە، هێردەر پێی وایە کە غەریزەیەکی خۆڕسك هەیە کە لەلایەکەوە ئەو توانایە بەمرۆڤەکان دەدا کە وێنەیەك لەمەڕ هەلو مەرجە کۆمەلایەتیە بابەتیەکان دابرێژن، لەلایەکی دیکەشەوە ئەو دەستەلاتە لای مرۆڤەکاندا بەگەڕ دەخا کە چۆن لەڕووی خودێتییەوە هەڵسو کەوت بکەن، وەلامی ئەو هەلو مەرجانە بدەنەوە، هاوڕێ لەگەڵ سەختیەکانی ئەو واقیعە بابەتیەشدا هەمیشە سەرقاڵی نواندنی کردارین.

هەرچی پەیوەندی بەهەلو مەرجە بابەتیەکانەوە هەیە، هێردەر قورسایی دەخاتە سەر سیستەمی یاسایی کۆمەڵگاو دامو دەستگا سیاسییەکان، و هەروەها کردارو هەڵسو کەوتی پیاوە مەزنەکانی کۆمەڵگا وەك فەیلەسوفەکانو هونەرمەندانو زانایان. هێردەر زیاتر گرنگی بەهەڵوێستی خودیانەی تاکەکان دەدا، هەڵوێستیان بەرانبەر بەهۆکاری ژینگەییەکان، لێپرسراوی تاکەکان بەرانبەر بە دەوروبەر. لەگەڵ ئەمەشدا، ئەم لێپرسراویەی تاك دەبێت لەکۆی زنجیرەی پەیوەندیە کۆمەلایەتیو سیاسیەکاندا کاربکا لە پەیوەندیدا بە دەولەتەوە. بەلام هەرگیز بەو مانایە نا چونکە هەستی ئەخلاقیو لێپرسراوی کۆمەلایەتی مرۆڤەکان تەنیا دەبێت لەچوارچێوەی جەستەیەکی سیاسیدا خۆی بنوێنێ، بەپێچەوانەوە جەوهەری مرۆڤایەتی لەوەدا دەردەکەوێ کە چۆن ئەندامێکی کۆمەڵگایەك، نەتەوەیەك بەسەرجەم مرۆڤایەتیەوە گرێ بدرێ. گرنگە ئەوەمان لەیاد بێت کە هێردەر هۆشیارمان دەکاتەوەو پێمان دەڵێ کە دوورەپەرێزی بکەین لەوەی کە سەیری چەمکی "مرۆڤایەتی" بکەین وەك ئەوەی تەماهی identication بکا لەگەڵ فۆرمێکی موتڵەقو ئەبستراکت (رووت)و ئەخلاقێکی نەگۆڕ. مرۆڤایەتی ئایدیایەکی ئەبستراکتو نا -مێژوویی نیە، بەڵکو ریشەکانی مرۆڤایەتی لە مێژوودا خۆی داکوتیوەو ئایدیایەکە مێژوویێتی لەخۆدەگرێ. لەئەنجامدا هەر جڤاتە، هەر کۆمەڵگایەو هەر سەردەمە مێژوویییە بەشێوەیەکی تایبەتی مرۆڤایەتی وەردەگرێو نیشانی دەداتەوە، ماناکانی بەیان دەکا، مامەڵەی لەگەڵدا دەکا. وەکو چەمکێکی گەردوونی، مرۆڤایەتی دەبێتە چەمکێکی بۆش گەر ناوەرۆکێکی مێژوویی تایبەتی لەخۆنەگرێ، هەروەها چەمکی مرۆڤایەتی وەك چەمکێکی گەردوونی نە تەنیا مولکی نەتەوەیەکەو نە تەنیا خۆی لەڕەوتی شارستانیەتێکدا نیشان دەدا.

لەڕووی سیاسیەوە قسە بکەین، چەمکی مرۆڤایەتی دان بە بوونی نەتەوە جیاوازەکاندا دەنێ، لێرەوە هێردەر بەتوندی ئەو هەوڵە رەتدەکاتەوە کە لەلایەن کۆمەڵێ بیریاری خۆرئاواوە دراوەو دەدرێ بۆ ئەوەی مرۆڤایەتی بە نەتەوەیەك یا کلتوورێکی تایبەتیەوە بلکێندرێ. هیچ نەتەوەیەك یا شارستانیەتێك ناشێ ئەوەی لێ قبوول بکرێ کە بانگەشەی سەروەری بکا، یا بانگەوازی رەگەزێکی بالاو سەروەر. ئا لێرەدایە کە ئێمە رووبەڕووی توخمێکی زیندووی ئەو چەمکەی هێردەر دەبینەوە ئەویش حەماسی دژە- کۆلۆنیالیزم. رەخنەی هێردەر ئاماژە بۆ ئەو دیو کەلکەلەی کۆسمۆپۆلیتانیزمی رۆشنگەری دەکا. بۆجەوهەری ئابوورییانەی پەلهاویشتنی ئیمپریالیستی، هێردەر دژ بە کۆلۆنیالیزم بوو لەبەر ئەوەی کۆلۆنیالیزم نکوڵی کردنە لەهەمەچەشنەیی‌و بریتی‌یە لە خاپوورکردنی رێزی نەتەوە بۆخۆی. کۆلۆنیالیزم دەیەها نا بەڵکو سەدەها نەتەوەو ئیتنیکی جیاوازی لەڕووی نەك فیزیکیەوە بەڵکو رۆحی‌یەوە هەنجن هەنجن کردو رووبەڕووی دەیەها گرێی دەروونی کردنەوە لەوانە لەدەست دانی رێز بۆ خودی خۆ، هەر نەتەوەیەکیش ئەو رێزەی لەدەست دا بۆخۆی ئیدی بە هەموو ئاوازێك سەما دەکا خەباتی دژ بە کۆلۆنیالیزم لە جەوهەردا نەك بەتەنیا گەڕانەوەی توانای رێزگرتنی نەتەوەیە بۆخۆی بەڵکو رێگەگرتنیشە لەهەر نەتەوەیەك ببێتە سوڵتان بەسەر نەتەوەکانی ترەوە لەو دیدەوە کە گوایا "بالادەستەیەکی خۆرسکی" هەیە. گەر بڕیارە مرۆڤایەتی ببێتە هێزێکی زیندوو ئەوە دەبێت نەتەوەکان بەو راستیە بگەن کە گەردەیانەوێ لەڕووی رۆحی‌یەوە، بەکەماڵ بگەن ئەوا تەنیا لەچواچێوەی هاریکاریدا لەگەڵ یەکتر دەتوانن بە مەبەستە بگەن، بەپێچەوانەوەی ئەم حاڵەتەوە بەربەریزم وەك شیماتەیەك هەمیشە ئامادەیی هەیە لەوێ.

5-رۆمانتیکی سیاسی

رۆمانتسیزم دیاردەیەکی ئاڵۆز بوو کە ژیانی کلتوری‌و سیاسی هەموو ئەورووپای گرتەوە لەکۆتایی سەدەی هەژدەهەمەوە تا کۆتایی سەدەی نۆزدە[21]. لەگەڵ ئەوەشدا کە رۆمانتسیزم لەبەرگی بزووتنەوەیەکی ئەدەبیدا هاتەدەرەوە بەلام ئایدیاو بۆچوونەکانیان لەمەڕ تیوری سیاسی‌یەوە گرنگی خۆیان هەیەو کاریگەری خۆیان لەسەر بزووتنەوەی فیکری‌و فەلسەفیەکانی دوای خۆیان بەجێهێشت.

سەرەتا لەسەر ئەو رایە قسە بکەین کە پێی وایە رۆمانتیکە سیاسی‌یەکان پەیڕەوانی هێردەرن. جەوهەری رۆمانتسیزم بریتی‌یە لە رۆحێکی قەلەق‌و جێ بەخۆ نەگرتوو و سەرکەش. هەروەها رۆمانتسیزم دژە بابەتی Ontithesis عەقڵانیەت‌و رۆشنگەری بوو. ناشێ نکۆڵی لەوە بکەین کە هەندێ لەبیرۆکەکانی رۆمانتیکە سیاسیەکان لەژێر کاریگەری فیکری هێردەردا بوون لەوانە رێزێکی قووڵ بۆ رابووردوو، بەرۆمانسی کردنی سەدەکانی ناوەڕاست، سەیرکردنی مێژوو وەك هێزێکی دینامیك‌و خاوەن دەستەلات، بیرۆکەی تایبەتمەندێتی "چالاکی داهێنەرانە" وەك دوا مەبەست‌و ئامانجی بوونی مرۆڤانە، گشتی بوونی ئۆرگانی کلتوری سیاسی، کەمکردنەوە لە رۆڵی یاسا سروشتیەکان، جەغدکردنە سەر زمان وەك سەرچاوەیەکی بێوێنەی هۆشیاری "کۆ" بیبانەی نەتەوە، چ هێردەر چ رۆمانتیکەکان بەشێوەیەك لەشێوەکان هاوڕان لەم بیرۆکانەدا. بەلام ئەوەمان لەیادبێت ناوەڕۆکی سیاسیەوە لەو دیدەدا لەبەرچاو نەگرین. بۆ نمونە، رۆمانتیکەکان لەیەکێ لەقۆناغەکانی گەشەکردنی فیکریاندا، کەدواجار باس لە دوو قۆناغی فیکری رۆمانتیکەکان

دەکەین، لەو باوەڕەدا بوون کە ئایدیالترین جڤات ئەو جڤاتەیە کە لەسەر بناغەی هایەراکی Heierachy هەرەمیەتەوە دامەزراوە، ئەمەش هەلگەڕانەوەی چەمکی فرەیی Pluralism یە بۆ شتێکی تەواو جیاواز، دژ بەو بانگەوازەی هێردەر بۆ فرەییو هەمەچەشنەیی کە تێیدا تاکەکان ئەو مافەیان هەیە سەر بەگرووپی جیاواز جیاواز بن، رۆمانتیکەکان، بەلانی کەمەوە لەقۆناغێکی فیکریاندا، بانگەوازیان بۆ بیرۆکەو چەمکی حەدی بوون Firmness دەکرد لەڕووی کۆمەلایەتیەوە، و سەرشۆڕکردنی تاك سەرشۆڕکردنێکی تەواو بۆ ئیرادەی گروپ.

لەسەروو هەموو شتێکەوە رۆمانتیکیەکان وێناکردنی سەدەکانی ناوەڕاست لەمەڕ ئۆرگانیزمی کۆمەلایەتی یان لەگەل فەلسەفەی سیاسی ئۆرگانیزم ئاوێتە کرد، بەم شێوەیەش مانای هێردەری چەمکی "ئۆرگانیزم" یان تەواو گۆڕی ، بەلانی کەمەوە لە قۆناغێکی گەشەکردنی بزووتنەوەکەیاندا.

لای ئەوان ئۆرگانیزم هەرەمیەتی ئاناتۆمی لەئامێز دەگرێ. ئەم لادانەش لەمۆدێلی جڤاتی هێردەرانە خۆی لەدیدی رۆمانتیکیەکاندا بینیوە وە لە بۆچوونە ئەنسرۆپۆمۆرفیك (دانە پالی خاسیەتی مرۆڤ)ی ئۆرگانیزم. بۆ نمونە نۆڤالیس پێی وابوو کە دەولەت بریتییە لە ماکرۆ- ئەنسرۆپۆس واتە ماکرۆ- ئینسان، ئەو ئەناتۆمیەیە کە پێك هاتووە لە رێکخستنی کۆمەلایەتیانەی جیاواز[22]. بەپێی ئەم تێگەیشتنە جەستەی سیاسی، بونیادی کۆمەلایەتی ئایدیایەکی پێویستە کە پێش وەخت وێناکراوەو لێرەوە مل کەچ کردنو پەیرەویکردن بەرئەنجامی سروشتین. لەم دیدەوە مل کەچ کردن بۆ ئۆتۆرەتی (دەستەلات)، لەقۆناغی کۆتایی فیکری رۆمانتیکیەکاندا، لێدان لەکەرامەتی مرۆڤ نیە بەلکو بەپێچەوانەوە ئازادی واتە خۆبەدەستەوەدانێکی ئیختیاریو ئەوان شکۆیان دەبینی لەوەدا کە تاك مل کەچی ولاتو خاکی باووباپیران بێت. وەك دەزانین موللەر Muller و گینز Gentz بانگەوازیان بۆ گەڕانەوە بۆ فیودالیزم دەکرد لەبەر ئەوەی لەفیودالیزمدا تەباییەکی جوانیان لەنێوان میریو سەرشۆڕکردندا دەبینییەوە لە سیستەمی فیودالیزمدا ئەو پاسەوانەیان دەبینییەوە کە ئێشکی ئەو حالەتە دەگرێ کە نەهێلێ حوکمی کۆمەلانی خەلکو ئینتلجنسیا بێتە واقیع. هەرچی پەیوەندی بەدەولەتەوە هەبێت، لەقۆناغێکی گەشەکردنی فیکری رۆمانتیکدا، رۆمانتیکیەکان وا لەدەولەتیان دەڕوانی وەك گشتێکی ئۆرگانی کە بوونی مەسەلەی مانو نەمان بۆ مرۆڤ. لەم دیدەوە دەولەت دوامەبەستو دوائامانجە. بەپێی ئەم دنیا بینییە لە چەمکی دەولەتدا لەدیدی رۆمانیتکیەکانەوە تەنیا ئەرێ گووتن بۆ دەولەتو جەغدکردنە سەر دەولەت نابینینەوە بەلکو تەمجیدکردنی دەولەتو بەرزکردنەوەی دەولەت بۆ ئاستێکی بالاو سەیرکردنی وەك هێزێکی خاوەن شکۆو شکۆبەخش. بۆ نمونە Muller واسەیری دەولەتی دەکرد وەك "مەملەکەتی سەرمەدیانەی ئایدیاکان"، کەواتە دەولەت لەدیدی رۆمانتیکیەکانەوە شتێکە زیاتر لەداموو دەستگایەك کە لە خزمەتی مرۆڤو مەبەستە کۆمەلایەتیەکاندا بێت، بەواتایەکی دی ئارەزوویان دەکرد وەك کیانێکی میتافیزیقی سەیری دەولەت بکەنو لە ڕێگای زاراوە میتافیزیقیەکانەوە بەشانو باهویدا هەلبدەن. لە ئەنجامدا سروشتی دەولەت، لەم دیدەوە، سروشتێکی کۆمەلایەتیو سیاسی نیەو بەلکو سروشتێکی میتافیزیقییە کە لە خزمەتی ئامانجێکی متالی Transcem dentalدایە لەسەر زەوی. رۆمانتیکیەکان هەولیان دەدا دەولەت وەك بوونێکی تایبەتو وەك ئایدیایەك بناسێنن

ئایدیاش لەدیدی ئەوانەوە واتە هێزێکی داینامیکی، بابەتێك کە ژیانی تایبەتی خۆی دەژی. بەپێی ئەم مۆدێلە تەنیا رێگایەك بۆ بەدەست هێنانی زانینێکی دروست لەمەڕ دەوڵەتەوە بریتییە لە مەعریفەیەکی حەدسی.

لەبوارێکی تریشیدا هێردەر کاریگەری لەسەر رۆمانتیکییەکان جێهێشت ئەویش بواری مێژوونووسی بوو، بەتایبەت لەسەر شلیگڵ کە مێژووی بەرز کردەوە بۆ ئاستی زانستو پێی وابوو کە مێژوو دوا سەرچاوەی زانستە، و هەروەها قوتابخانەی "یاسای مێژوویی" ساڤیگین بەتەواوی لەژێر کاریگەری هێردەردابوو.

دەتوانین بڵێین رووداوێکی بنەڕەتی کە لەسەدەی هەژدەهەمدا رویداو کاریگەری هەبوو لەسەر سەرهەڵدانی بزووتنەوەی رۆمانتسیزم، بریتی بوو لەهەرەس هێنانی بۆچوونی تەقلیدی بەرانبەر بەخودا کە بووە مایەی دروست کردنی بۆشاییەکو نامۆبوونێك، ئنجا قووت بوونەوەی ئەو پرسیارەی کە چ شتێ دەتوانێ شوێنی خودا بگرێتەوە وەك پرنسیپێکی میتافیزیقی. دوو مونافسی ئۆنتۆلۆژی ئیدعای ئەو جێو شوێنەیان کرد، یەکەم مرۆڤایەتی یا "خودایەکی شۆرشگێڕ" کە بەشێوەی جۆراوجۆر وێناکراو لەبەرگی "مرۆڤ پەروەری"و "خەڵك"، "کۆمەڵانی خەڵك"و ئیرادەی گشتیو گشت Public "مەدەنی، گشتی"و کۆمەڵگادا نیشاندرا، دووهەم؛ "خودایەکی موحافەزەکار (کۆنسەرڤەنیڤ) کە لە کاستوورە تایبەتیە مێژووییەکاندا وێناکرا، لەترادسیۆنە گەورەکاندا، رۆمانتیکیەکان هەوڵیاندا کە ئەو دوو مودەعیە ئۆنتۆلۆژیە لەفەنتازیادا بەم شێوەیە وێنابکەن، یاخودا شوێنی گیرایەو لەلایەن تاکەکەسی رزگاربووەوەو لێرەدا ئیگۆی رۆمانتیك بوە ئەتۆرەتی میتافیزیقی، یاخود خەڵکو دەوڵەت شوێنی خودایان گرتەوە.

دەتوانین دوو قۆناغ لەبزووتنەوەی رۆمانتسیزمدا دیاری بکەین، رۆمانتیکی سەرەتاو رۆمانتیکی دوایی، ئەوەش کە ئەو جیاکردنەوەیە دروست دەکا گۆڕانە بەسەر بۆچوونی رۆمانتیکیەکاندا لەمەڕ جڤاتو دەوڵەتی باوکایەتیو تاکەکەسو ئاییندا. لەسەرەتادا رۆمانتیکیەکان لەهەوڵی ئەوەدا بوون کە چەقێ لەنێوان لیبرالیزم کۆنسەرڤەتیزمدا بدۆزنەوە، ئەوان دەیانویست خۆیان لەرەهەندێکی لیبرالیزم بپارێزن کە رەهەندێکی ماڵکاولکەرە ئەویش تەنیا جەغدکردنە سەر ئازادی تاکەکەسو بەم شێوەیەش جومگەکانی کۆمەڵایەتیو جڤات لەدوا قۆناغدا هەڵدەوەشێن، یاخود ئەوان دەیانویست خۆیان لەرەهەندێکی کۆنسەرڤەتیزم بپارێزن کە بریتییە لە جەغدکردنە سەر جڤات لەسەر حیسابی ئازادی تاکەکەسو لەو باوەڕەدا بوون کە جڤاتی راستەقینە ئەوکاتە هەقانیەتی هەیە کە ئازادی بەرکەماڵ بکا ئەمەش لەشێوەی کۆماریدا مەیسەر دەبێت، شێوەیەك کە خەڵکی دەتوانن ببنە پارچەیەك لە ئۆرگانیزمی کۆمەڵایەتیو مافی ئەوەیان هەیە کە بەشداری بکەن لەدەستەڵاتدا.

بەهۆی شۆرشی فەرەنسیو پەرەسەندنی سەرمایەدارییەوە رۆمانتیکیەکان ترسیان لەهەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵایەتیو شپرزەیی کۆمەڵایەتی پەیداکردو لێرەوە خەونیان بە شێوازی حوکم کردنی سەدەکانی ناوەڕاستەوە دەبینیو تا زیاتر ئومێدیان کز بوایە بە ئازادی عەفویانە خەڵکی زیاتر باوەشین بۆ دەوڵەت دەگرتەوەو هەر ئەمەشە خاڵی جیاکردنەوەی رۆمانتیکی سەرەتاییو دوایی، بۆ نمونە شلیگڵو شلیرماخەر لەدوایی ژیانیاندا زیاتر مەیلیان بەلای کۆنسەرڤەتیزمدا پەیداکردو، شلیگڵ گەڕایەوە بۆ کڵێسای رۆمان کاتولیك.

سەرەتا رۆمانتیکیەکان جەغدیان لەسەر رۆڵی هونەر دەکردو بەتایبەت ئەو رۆڵەی کە هونەر

لەکایە کۆمەڵایەتیو سیاسییەکاندا دەیگێڕێ. ئەوان بۆ نموونە نۆڤالیسو شێلین، لەو باوەڕەدا بوون کە باشترین دەوڵەت بریتییە لە "دەوڵەتی شیعری" کە تێیدا میر هونەرمەندەو ڕێنومایی شانۆیەکی گەورە دەکا کە هەر هاووڵاتیە بۆخۆی ئەکتەرێکە. ئەم سەیرکردنە سیاسیانەی هونەرو ئەم سەیرکردنە هونەریانەی سیاسەت پەرچەکردارێ بوو دژ بە شۆڕشی فەرەنسی. ڕۆمانتیکیەکان لەدوای 1798 وە بە توندی کەوتنە رەخنەگرتن لە شۆڕشی فەرەنسیو ئەنجامەکانی کە لە خووپەرستیو شتو مەك پەرستیو مەنفەعەت خوازی Cetilitarianismی کۆمەڵگای مەدەنیدا بینیانەوە. ئەوان وەك هۆکارێکی پەروەردە لە هونەر دەیانڕوانیو لێرەشەوە وەك کلیلێ بۆ ریفۆرم. بۆ نمونە شیللەر لە کتێبەکەیدا "چەند نامەیەك دەربارەی پەروەردەکردنی ئیستاتیکایانەی مرۆڤ" (1790). پێی وایە کە پەروەردە Bildung هەلو مەرجی سەرەتایە بۆ گۆڕانی کۆمەڵایەتیو سیاسیو هونەریش ئۆرگانێکە لە پەروەردە. تەنیا هونەرەکە دەتوانێ خەڵکی لەدەوری یەکتر گردبکاتەوەو هانیان بدا بۆ کردار. ئەوان پێیان وابوو کە عەقڵ بەتەنیا ناتوانێ خەڵك هان بدا بۆ نواندنی کار. لەم دیدەوە بەڕای من دیدی ئیستاتیکایانەی ڕۆمانتسیزم ستراتیژیەتێك بوو بۆ ریفۆرمی سیاسی ئەمەش پێچەوانەی رای کارڵ شیمتە، بیریاری ئەڵمانی کۆنسەرڤەتیڤو نازیست، کە پێی وایە ڕۆمانتیکیەکان نە تەنیا کۆمەڵێ نووسەر بوون سەرقاڵی ئیستاتیکا بوونو نەبۆچوونیشیان لەبواری تیوری سیاسیدا نرخی ئەوتۆی هەیە[23].

بزووتنەوەی ڕۆمانتسیزم پەرچەکردێ بوو دژی ڕۆشنگەری ڕۆمانتیکیەکان لەگەڵ ئەوەشدا گرنگیان بەرەخنەو ڕۆڵی عەقڵ دەدا، بەرانبەر مەترسی عەقڵیش هۆشیاربوون. ئەوان دەیانبینی کە ئازادی مرۆڤی مۆدێرن بەبەهایەکی گەورە کڕدراوە ئەویش نامۆ بوونە بەهەموو ئیمانێك. گەر رەخنە تەنیا دەستەڵاتێکی نێگەتیڤی هەبێت ئەوا هەموو ئیمانێك پایەماڵ دەکاو بە دەهلیزەکانی گومانخوازی (Skepticism)مان دەگەیەنێ. گەر عەقڵ تەنیا کاری رەخنەگرتن بێتو پێمان بڵێ کە ئەخلاقو ئاینو بیروڕا سیاسییەکان شتێك نین جگە لە کۆمەڵێ بۆچوون کە لێوانلێون لە لایەنگیری ئیدی چۆن باوەڕمان هەبێت، ئایا بێباوەڕ دەتوانین بژین؟ ڕۆمانتیکیەکان گومانخوازیان بەدەستکەوتی ڕۆشنگەری دەزانیو لەو باوەڕەدا بوون کە گومانخوازی ڕووبەرێ بۆ ئێمە ناهێڵێتەوە کە تێیدا بژین. لێرەوە دەتوانین لەپەیامی کتێبە گرنگەکەی شیلرماخەر بگەین کە لەژێر ناوی "دەربارەی ئایین" دایە کە لەهاوینی 1799 هاتە دەرەوەو بەشێوەیەك لەشێوەکان رەتکردنەوەیەکی هەموو هەوڵێکە بۆ عەقلاندنی ئاینو بەتایبەت هەوڵەکانی ماتەریالیستە فەرەنسیەکانو هەروەها پرۆژە رەخنەییەکەی کانتو بەتایبەت کتێبەکەی کانت لەسەر ئایین "ئایین بەتەنیا لەسنوورەکانی عەقڵ" شیلرماخەر لەجیاتی قسەکردن لەسەر میتافیزیقای ئاینیو پراکتیکی ئایینی قسە بکا، لەئایین وەکو کایەیەکو ئەزموونێکی تایبەتی مرۆڤیو ژیانی ڕۆحی مرۆڤ قسەدەکا، ئەو تەنانەت پرسیار لەبوونی خودا بەپرسیارێکی ئەرزۆك دەزانیو جەوهەری ئایین نە لە مەعریفەداو نە لەپراکتیکدا نابینێتەوە بەڵکو لەهەست کرندا دەبینێتەوە. هەستکردنی پەرستن بەڕای ڕۆمانتیکیەکان مرۆڤی مۆدێرن هەموو هەستێکی سەر بە سروشت بوونی لەدەست داوە ئەمەش بەرئەنجامێکی

ترسناکی رۆشنگەرییە. سروشت کەوتۆتە ژێر کۆنترۆڵی مرۆڤی مۆدێرنەو ئیدی سروشت جوانیو نهێنیەکانو ئەفسوونی خۆی لەدەست داوە. بەپێی رۆشنگەری سروشت شتێك نییە شوێنی سەرسورمان یا تێرامان بەڵکو بابەتێکە دەبێت کۆنترۆڵ بکرێت پرسیاری رۆمانتیکیەکان ئەوە بوو ئایا دەشێ لە سروشتێکی بێ ژیاندا بژین؟ ئایا دەتوانین جیهانێ بکەینە ماڵی خۆمان کە سەرتاپا عەقڵێنراوە؟

هەروەها بەڕای رۆمانتیکیەکان رۆشنگەری بوە مایەی ئەوەی کە مرۆڤی مۆدێرن هەستی جڤاتی، هەستی هاریکاری لەگەڵ گروپدا، لا بمرێتو هەرکەسە سەرقاڵی بەرژەوەندییە تایبەتیەکانی خۆی بێتو کۆمەڵگاش ببێتە "کۆی دوورگە لێك دوورەکان" هەردوورگەیە تاکە کەسێکە بۆ خۆی. کەواتە پرسیاری رۆمانتیکیەکان ئەوە بوو چۆن بتوانین ئەو برینانەی کە رۆشنگەری کردیە رۆحو جەستەمان سارێژیان بکەین؟ چۆن جارێکی دی لەسروشتدا سەرچاوەی جوانیو هەستی ئایینی ببینینەوە؟ چۆن هەستی انتماء بەرانبەر جڤات دروست بکەینەوە بێ ئەوەی هێزی عەقڵ پشت گوێ بخەین؟ وەڵامی رۆمانتیکیەکان ئەوە بوو کە تەنیا لەرێگای هونەرەوەو خەیاڵە دەوڵەمەندەکەی هونەرەوەیە کە جارێکی دی دەتوانین جیهان دروست بکەینەوە، ئەو شتەی کە عەقڵ خاپووری کرد هونەر دەتوانێ دروستی بکاتەوە، هونەر دەتوانێ جوانیو رۆحانیەت بگەڕێنێتەوە نەك بۆ سروشت بەتەنیا بەڵکو بۆ پێکەوە ژیانی کۆمەڵایەتیش بۆ بواری سیاسیش. لێرەوە چەمکی خۆشەویستی لەبواری کۆمەڵایەتیدا رۆڵێکی گرنگدا دەبینێ لای رۆمانتیکیەکانو بەتایبەت شلیگڵ، بەڕای ئەوان عەشق ئەو جومگەیەیە کە جڤات پێکەوە دەبەستێتەوە.

خەونی رۆشنگەری ئەوە بوو کە پێش کەوتنی تەکنولۆژی ببێتە مایەی زیادبوونی ئازادیو مرۆڤایەتیو زاڵ بوون بەسەر کۆسپەکاندا، بەلام بەڕای رۆمانتیکیەکان ئەم خەونە بووە کابوس. تەکنۆلۆژیا نەك بوە مایەی دەست بەسەراگرتنی سروشت بەڵکو بووشە مایەی کۆنترۆڵکردنی مرۆڤ. ئەوان لەوباوەڕەدا بوون کە مرۆڤی بۆرژوا بۆتە ماکینە، ئەو بەختیارە تەنانەت لەوکاتەشدا کە بۆتە ژمارەیەك لەنێو ژمارەکاندا. ئەوەی کە بۆرژوا ناتوانێ مەسرەفی بکا بوونی نییە لای بۆرژوا، لێرەوە هیچ بەهایەك بۆژیانو فەلسەفەو ئایینو شیعر نامێنێتەوە چونکە بۆرژوا ناتوانێ ئەم بەهایەنە مەسرەف بکا.

بۆرژوازی ئیگۆیزم (منێتی) دەکاتە بناغە بۆ دامەزراندنی رێکخستنی سیاسی لەکۆمەڵگادا، واتە بکەرە ئیگۆیستەکان لەچوارچێوەی ئەو رێکخستنەدا، یاکۆمەڵگای مەدەنیدا، دەتوانن پێش برکێ بکەن لە پێناو بەرژەوەندە خودیەکانیاندا. رەخنەی رۆمانتیکیەکان لەو پرنسیپە ئەوە بوو کە مادامێك بەرژەوەندیەکانی خوو بێ سنوورن، کەواتە لەجیاتی ئەوەی گرێدانی کۆمەڵایەتی دروست بکا هەموو جومگە کۆمەڵایەتیەکان لێك هەڵدەوەشێنێ.

من پەرستی هەموو هەستێکی جڤاتی دەکوژێو ئەو کەسانەی دەبنە کۆیلەی ئەخلاقی من پەرستی کۆمەڵگای مۆدێرن نەك تەنیا لە جڤات نامۆ دەبن بەڵکو لەمرۆڤایەتی خۆشیان دادەبڕێن.

لەبەرانبەر چەمکی میکانیکیانەی دەوڵەت لای رۆشنگەری، رۆمانتیکیەکان وەك دابڕانێ لەو دیدە چەمکی ئۆرگانێکیانەی دەوڵەتیان لەئەدەبیاتی

ڕۆمانتیکدا گەڵاڵەکرد. ڕۆشنگەریو بیریارانی ڕۆشنگەری سوودیان لە میتافۆری "ماکینە" وەردەگرت بۆ پێناسەکردنی دەوڵەت، بەو مانایە کە دەوڵەت ماکینەیەکە وەك هەر ماکینەیەکی تر دەبێت ئیش بکا بۆ بەدیهێنانی مەبەستێکی دیاریکراو، لەحاڵەتی دەوڵەتدا ئەم ماکینەیە بەرهەمهێنانی چاکەیە بۆ خەڵكو پاراستنی ئاسایشو پاسەوانیکردنی بەرژەوەندیەکانە، هەر لە هۆبسەوە تا سپینۆزاو تاوڵف Chrstion Wolff تاکانت ئەم بۆچوونە میکانیکیە سەبارەت بە دەوڵەت باڵادەست بوو. لەم دیدەوە کۆمەڵگا هیچ نیە جگە لەکۆی تاکەکەسەکانو هەر تاکەکەسەش تەنیا لەبیری بەرژەوەندیەکانی خۆیدایەو دەوڵەتیش ئەو ماکینەیەیە کە ئەو بەرژەوەندیانە ڕێك دەخا، بەڵام هەروەك چۆن ماکینە لەلایەن بکەرێکی دەرەکیەوە دەخرێتەگەڕ ئاوهاش دەوڵەت دەبێت لەلایەن بیرۆکراتەکانەوە بخرێتەگەڕ، ئەو بیرۆکراتانەی کە لەسەروو بەرژەوەندیە تایبەتیەکانەوەن. هەروەك چۆن ماکینە بەپێی نەخشەیەك داڕێژراوە ئاوهاش دەوڵەتو کۆمەڵگاش دەبێت بەپێی پلانێکی عەقڵی کاربکەنو ڕۆمانتیکیەکان دژ بەم دیدە وەستانەوەو لەجیاتی ئەو دیدە میکانیکیە بۆ دەوڵەت پێشنیاری دیدێکی ئۆرگانیکیان بۆ دەوڵەت کرد. بەپێی ئەو دیدە ئۆرگانیکیەی ڕۆمانتیکیەکان، کۆمەڵگا دەبێت لەسەر جڤاتو ڕۆحی جڤاتەوە بینابکرێ نەك تاکگەراییو ئامانجی ژیانی کۆمەڵایەتیش مل ملانێ نیە لەپێناو بەرژەوەندیە تایبەتیەکاندا بەڵکو بریتیەو لەبەخۆگەیشتنی ڕۆحانیە Spirtual self- realization، تاکەکان لەڕێگای هاوکاریەوە لەگەڵ یەکتر بەخۆیان دەگەن نەك ملا ملانێ. کۆمەڵگا ناشێ لەڕێگای یاساوە پێکەوە گرێ بدرێ، بەڵکو لەڕێگای کلتورێکی هاوبەشو ئایینو ترادسیۆنو زمانی خەڵکەوە دەشێ گرێ بدرێ. جومگەکانی کۆمەڵگا ناشێ هێزێکی میکانیکی دەرەکی بێت بەڵکو ڕۆحی نەتەوەو هەستی انتماء بۆ یەکتر.

گرنگە سەرنجی ئەوە بدەین کە دیدی ڕۆمانتیکیەکانەوە ناوەڕۆکی ژیانی خودێتیو سۆز ئەوە دیاریدەکا کەچی واقیعیەو چی واقیعی نیە.

ڕۆمانتسیزم لەڕووی فەلسەفیەوە بزووتنەوەیەکی شۆڕشگێڕانەیە چونکە ئەولەویەتی واقیعی تێك دەداو لەجیاتی ئەولەویەتی ئیحتمالە بێ سنوورەکان دادەنێ. لێرەدا گەمەی ڕۆمانتیکی ئەو گەرمەیەیە کە واقیع رادەگرێ، ئەوگەمەیەی کە ئەم واقیعە بەگژ واقعێکی بە فەنتازیا کراوو خەیاڵی تردا دەکاتەوە. لەیادمان بێت واقعێکی خەیاڵیکراو ڕۆڵێکی گرنگ دەبینێت لە ناسیونالیزمدا.

هەنگاوێ زیاتر لەمە، لەلایەن ڕۆمانتیکیەکانەوە یا واقیع پووچەڵ دەکرێتەوە بە هەڵفرین بەرەو رابووردوو، رابووردوویەکی رازاوە بەشەبەقی عیشقی یاخود واقیع یەکسان دەکرێ لەلایەن دنیای فەنتازیای سەردەمە دێرینەکانەوەو پاڵەوانبازی عەشقبازیەکانەوە. بەم شێوەیە دنیابینی ڕۆمانتیکی دەتوانین لەڕێگای سێ پرنسیپەوە پێناسە بکەین.، یەکەم، لەدیدی ڕۆمانتیکیەکانەوە جیهان دروست کراوی خەیاڵێکی زاتیە. دووهەم، جیهانە راستەقینەکەی کە تا سنوورێ بوونێکی ڕۆتین ئامێزە پووچەڵ دەکرێتەوەو بەنیسبەت گرا relativize دەکرێ لەلایەن فەنتازیاوەو جیهانێکی فەنتازی کراو شوێنی دەگرێتەوە.

سێهەم: ململانێ جەوهەریەکانی دنیای واقیعی لەڕووی ئیستاتیکاوە دەگوێزرێنەوە بۆ هارمۆنیەکی سۆز ئاسا. لێرەوە خەڵك یا مرۆڤایەتی لەدیدی رۆمانتیکیەکانەو سۆزاوی دەکرێنو وێنا دەکرێن وەك جڤاتێکی عاتفی. رۆمانتیکی کە وەك تاکەکەسێکی یاخی دەستی پێکرد بەو قۆناغە گەیشت کە زیاتر کۆپەرستە Collectivist.

لەگەڵ ئەمەشدا رۆمانتیسیزم وەك بزووتنەوەیەك. بزووتنەوەی گەنجان بوو دژ بە پیران، ئایدیای لاوێتی کۆمەڵێ بزووتنەوەی ناسیونالیزممان وەبیر دەهێنێتەوە، ناوی کۆمەڵی بزووتنەوەی ناسیونالیستی مانیڤێستی یا شاهیدی ئەو ئایدیایەن کە سەردەمێکی نوێ دەستی پێکردووە لەبەر ئەنجامی کۆششو خەباتی نەوەیەکی نوێ دژ بە نەوە کۆنەکان، بۆ نمونە ئیتالیای لاو، میسری لاو، تورکە لاوەکان، پارتی لاوانی عەرەب.

باسی بۆچوونی رۆمانتیکیەکانمان کرد لەمەڕ رابووردووەوە، ئێستا دەتوانین سەرگەرمی رۆمانتیکیەکان بە رابووردووەوە ناوبنێین نۆستالجیا بۆ رابووردوو وەك شێوەیەکی رەوایەتی بەخشین بەحاڵەتێکی دیاریکراو یاخود بیروباوەڕێك. بەهەمان شێوە لەدیدی ناسیونالیستەکانەوە، نۆستالجیا بۆ رابووردوو کۆمەڵێ شێوەی لەخۆگرت لەوانە گەڕانەوە بۆ سەردەمێك لەمێژوو، مێژووی نەتەوە، ئەوکاتەی نەتەوە لەحاڵەتی سەرکەوتنو شکۆمەندیدا بووە. تا ئێرە ئاماژەم بۆ کۆمەڵێ توخم کرد وەك مرۆڤایەتی، خەڵك مێژوو، دەوڵەت، رۆڵی ئەفسانە، رۆڵی فەنتازیا، نەتەوەیەك هێزێکی ئۆرگانێك، هەر هەموو ئەم توخمانەش ناسیونالیزم وەك هێزێکی ئایدیۆلۆژی پێك دەهێنن.

Jun1999

پەراوێزەکان:

1-بڕوانە

Immanuel Kant

Religion Within The Limits of Reaseon Alone. Translated by T. M. Greem and H. H. Hulson. 1960.

6.W.F. Hegd,

2-بڕوانە

G. W. F. Helgel

Trans, J. B. Baillie. 1967, P445

3-E. Cassirer. The Myth of the State. P. 280.

4-M. Michael,

“Ontue role of Symbolism in Political the ught,” Political Science Quar terly,82. 191-205, 1967.

5-Vico’s The New Science. Vico,G. The Newscience of Giambattista Vico, trans T. G. Beryin and M. H. Fisch. Fiftnprintiny 1994.

6-هەمان سەرچاوە، P74

7-هەمان سەرچاوە P341

8-هەمان سەرچاوە بەشی 205 لاپەڕە 74

تۆرکاتۆ تاسۆ Torquaa to Tasso

(1544-1595) شاعیرێکی گەورەی ئیتالی بوو لە کۆتایی سەدەی راپەڕیندا یەکێك لە بەرهەمە بەناوبانگەکانی بەیتی "ریناڵدۆ"یە.

9-Ernst Cassirer,

The Philosophy of Symbolic Forms V2: Mythical thought. Pua.

10-Vico, On the Studs Methods of Our Time, 13.

Trans, E. Gianturco, 1965.

11-Vico's The New Science. # 141- 142

12–هەمان سەرچاوە 331 #

13- Montesquien, The Spirit of Laws. Trans. A. M. Cohlev, 1994,P.8.

14-Al bert Camus, The Rebel.

Trans. Anthouy Bower, P115.

15–بڕوانە

Jean- Jacques Rousseau,

The Socil Contract and Discorse on the Origin of ineguality. 1967.

16–بڕوانە

Jean- Jacques Roussean,

Emile, or, on education.

Trans and notes by Allan Bloom. 1979.

17-Kant: Political writings. Cambridge, 1991, P185.

18–هەمان سەرچاوە P125

19-Herder, J.G.Outlines of a Philosophy of the History of Man, trans. T. Churchill. Book 1 x. Chapter II. P232-239.

20–هەمان سەرچاوە .Book x v

21–لەنێوان ساڵانی 99–1797 دا کۆمەڵێ ڕۆشنبیری ئەڵمانی لەدەوری یەکتر کۆبوونەوە بازنەیەکە ئەدەبیات دروست کرد کە دواجار بە قوتابخانەی ڕۆمانتیك ناوی دەرکرد. لەو ڕۆشنبیرانە،

Friedrich SchlGel (1772-1829)

F. W. Schelling (1775-1854)

E. D. Schleiermacher (1768-1834)

Friedrich Von Hardenbery (1772-1801)

کە بە نوڤایس ناوی دەرکرد

Holderlin

Ludwig Tieik.

22–بڕوانە

Novalis

Spiritual Saturnalia

Trans. John N. Ritter, P51.

23-Carl Shmilt.

Political Romanticism.

Combridge, Mass, M. I. T. 1986

# زەمەنی عەرەبیو مێژووی جیهان

جۆرج تەرابیشی

● و: رێبین هەردی

لەبەر ئەوەی هەموو تیورەیەك بەستراوە بە هەلومەرجی شوێنو کاتەوە، ئەوا پێویستە سەرەتا بەر لەوەی لەناو خودی تیورەدا بۆ دۆزینەوەی هەڵە بگەڕێین، لەناو رۆژنامەی مێژوودا بیدۆزینەوە.

هەمان یاسای پەرەسەندنی جیاوازو پێکەوەگرێدراو[1] (قانون تطور المتفاوت والمرکب) کە رێگەی خۆشکرد بۆ ئەوەی رۆژئاوای ئەوروپا کە لەسەر باڵەکانی سەرمایەداریەکی تازە پێگەیشتوو دانیشتبوو، لایەنی کەم بەچوار سەدە پێش هەرێمەکانی رۆژهەڵاتی عەرەبی بکەوێت بۆ چونە ناو ئەو سەردەمە کە لەمێژووی تازەدا بەسەردەمی تازە ناوی دەبرێ، هەمان ئەو یاسایەیە کە رێگەی خۆشکرد بۆ ئەوەی هەرێمەکانی رۆژهەڵاتی عەرەبی برێك قەرەبوی دواکەوتنی مێژووی خۆیان بکەن بە چونە ناو سەردەمی ناسیونالیزمەوە تەنها بەیەك سەدە دواتر[2].

چەند گەشەکردنی نەتەوەیی لە رۆژئاوای ئەوروپادا، گەشەکردنێکی سروشتیو خۆبەخۆو ئورگانیو سیستماتیك بوو، هێندەش سەردەمی ناسیونالیزم لە رۆژهەڵاتو سەرتاسەری جیهانی سێدا بەپلەی یەکەم بەوە دیاری دەکرێت کە سەردەمی ناسیونالیزمی ئەوروپی پێشی کەوتووە. بگرە هەندێ توێژەرەوە بڕوایان وایە لەدایکبونی ناسیونالیزم لەجیهانی سێهەمدا، لە بنەڕەتدا کاردانەوە بووە لەبەرامبەر ئیمپریالیزمدا.. ئیمپریالیزمێ کە دەرئەنجامی تەوژمی ناسیونالیزمی ئەوروپیە لەسەردەمی گۆڕانی سەرمایەداری ململانێی ئازاد بۆ سەرمایەداری پاوانکردن (احتکار).

دەکرێت دەرئەنجامی ئەم لەدایکبونە سیزاریەی چەمکی ناسیونالیزم لە رۆژهەڵاتی

عەرەبیدا لەو گرفتە زمانیەدا ببینینەوە کە ناولێنانی ئەم زاراوەیە توشی بووە: لەکاتێکدا ئەوروپای رۆژئاوا کە ناسیونالیزم بەسروشتی تیایدا لەدایك بووە، توانیوێتی ئەم پەرەسەندنە سیستماتیکە لەزمانێکی سیستماتیکی هاوشێوەدا دەربرِێ: چونکە خزمایەتی NATIONALISME لەگەڵ نەتەوە (NATION) خزمایەتیەکی راستەوخۆیەو لەیەك چاوگی لاتینیەوە وەرگیراوە کە ئەویش (NATIO)یە، ئەوا دژواری لەدایکبونی ناسیونالیزم لەخۆرهەڵاتی عەرەبیدا خۆی لەو دوولایەنیە (ازدواجیە) زاراوەییەدا دەردەخات کە بووە بە سەرچاوەی ئاڵۆزیەکی بێشومارو بۆتە هۆی پەشێوەییەکی تیوریو چەمکی کە کاریگەری نێگەتیڤی وای جێهێشتووە کە تا ئێستاش فکری سیاسی عەرەبی پێوەی دەناڵێ؛ مستەفا شەهابی ئەم دوولایەنیە بەم شێوەیە کورت دەکاتەوە: (.. لە کاتێکدا دەبوو لە "الامە"وە چاوگێکی دی دابتاشین کە (الامیە)یە، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەو وشەیە مانایەکی بەناوبانگی تری لە زمانی عەرەبیدا هەیە کە ئەویش سیفەتی "الامیە"یە کە کەسێکە نەدەخوێنێتەوەو نە دەنوسێ، ئەوا ناچار بووین لەبەر مەترسی تێکەڵکردن واز لەم وشەیە بهێنینو وشەی "قومیە" دابنێین)[3]. هەندێ توێژەرەوەی دیش سەرنجی ئەم دولایەنیەیان داوە[4]، بەڵام کەسیان ئەو دەرەنجامەیان لێ دەر نەهێنا کە خۆی دەسەپێنێ ئەویش ئەو شتەیە کە ناومان نا لەدایکبوونی سیزاریانەی چەمکی نەتەوایەتی لە رۆژهەڵاتی عەرەبیدا)[5]. بەراستیش وشەی "الامە" لەزمانی عەرەبیدا ئەم مانایەی ئەمرۆی وەرنەگرت لەسەردەمی رێنسانسەوە نەبێ[6].

هەرچەندە هیچ مشتومرێك لەسەر دێرینی دروستبوونی مێژووی نەتەوەی عەرەب نیە، بەڵام تەوژمی ناسیونالیزمی عەرەبی نوێ کە لەکۆتایی سەدەی (19)وە چاوی هەڵێنا، دەرفەتی ئەوەی بۆ نەرەخسا تا لە قۆناغی کۆرپەلەیدا لەناو رەحمی پێشکەوتنی مێژووی گشتیدا پەروەردە بکرێو هەروەها دەرفەتی ئەوەی بۆ نەرەخسا ماوەیەکی پێویست بۆ تەواوبوونی هۆکانی گەشەکردنی ئۆرگانیو سیستماتیك لەمناڵیدا، ببرِێ. بەمانایەکی دی دەبوو ناسیونالیزمی عەرەبی بە گەورەیی لەدایك بێ، واتە قۆناغی مناڵی پەراندبێ. رەنگە هەندێ کەسیش ئەمە بەشتێکی زۆرباش بۆ ناسیونالیزمی عەرەبی بژمێرن. بەڵام تێپەراندنی قۆناغی مناڵی ناسیونالیزمی عەرەبی لەو زێدەرەویو توندرەوییە بێبەش کرد کە خەسڵەتی هەموو مناڵێتیەکەو رۆڵێکی گرنگیش لە دروستبوونی کەسایەتیو پەروەردەکردنیا، دەبینێ. بۆ نموونە بۆ ناسیونالیزمە ئینگلیزەکان رەوا بوو لەسرودی نەتەوەیی بریتانیادا کە لە ساڵی 1740 دانراوە، جەخت بکەنە سەر

(نەتەوەکانی دی وەك تۆ پیرۆز نین.. چونکە ئەم نەتەوانە ملکەچی دیکتاتۆرەکان دەبن بەڵام تۆ ئازاد دەمێنێتەوەو لەرێگای سەرفرازیدا دەرۆیتو وەك درکێك دەمێنێتەوە لە چاویاندا و ئیرەییت پێدەبەن)[7].

هەروەها بۆفیختە رەوا بوو لەمەش زیاتر برِوا لە پیاهەڵدانیدا بەسەر نەتەوەی ئەڵمانیداو جەخت لەوە بکات کە (ئەگەر نەتەوەی ئەڵمانی شکستی هێنا ئەوا سەرجەم رەگەزی مرۆڤایەتی لەگەڵیدا شکست دێنێ)[8] هەروەها (رابوونی جیهان بەستراوە بە رابوونی ئەڵمانیەوە)و (هیچ نەتەوەیەك نەماوە بتوانێ جیهان هەڵسێنێتەوە جگە لە نەتەوەی ئەڵمانی)[9] بگرە تەنانەت زێدەرەوی لە شۆڤێنێتیداو رقبوون لەگەلانی دیش رەوا بوو.. ئەی ئارندت لەیەکێك لەو سرودانەدا کە رۆڵێکی مەزنی بینی لە وروژاندنی نەتەوەیی ئەڵمانیدا دژی ناپلیونی یەکەم، نالێت:

ئاسن بەخوێنی سور رەنگ دەکەین

بەخوێنی جەلاد.. بەخوێنی فەرەنسی
بەفیدات بم ئەی ڕۆژی جوانی تۆڵە
(پێدەچێ ئەمە چێژ بەخش بێ لای هەموو ئەڵمانیەکان.. ئەمە مەزنترین مەسەلەیە)[10].

هەموو ئەم شتانە ڕەوابوو چونکە هێشتا هیچ ناسیونالیزمێکی پێگەیشتوو نەبوو کە ببێ بە پێوەرێکو ئەم زێدەڕەویە منداڵانەیە تاوانبار بکات. ئەو سەردەمە بەڕاستی سەردەمی نەتەوە ئەورووپییەکان بوو، سەردەمی پێگەیشتنو پەرەسەندنی کەسایەتی نەتەوەییو پێکدادانیان بوو چ بە وشەو چ بەئاگرو ئاسن. بەڵام ناسیونالیزمی عەرەبی کە لەکۆتاییەکانی سەدەی 19و سەرەتاکانی سەدەی بیستدا لە دایکبوو، چاوی هەڵهێناو پیر بوو. ئەمەش لەکاتێکدا کە خۆری ناسیونالیزم لە ئەورووپاو بگرە لەجیهاندا بەرەو ئاوابوون دەچوو چونکە ئیدی هوشیار بوو بوو بە خراپیەکانی ئەو ناسیونالیزمەی چەکدارە بە کەڵبەودانی ئیمپریالیزم[11]. یانلەکاتێکدا کە چارەنووسی پەرەسەندنی لەپاش دووجەنگی جیهانی وێرانکارەوە بەرەو ئەوەی دەبرد لەلای باکورەوە بەرەو پاش ناسیونالیزم بچێ (یەکێتی ئەورووپا)و لەلای سوشیالیزمیشەوە بەرەو ئینترناسیونالیزم.

دیارە ئێمە نکوڵی لەوە ناکەین ناسیونالیزمی عەرەبیش لە قۆناغی دروست بوونو گەشەکردنیا برێك توندڕەویو زێدەڕەوی بینیوە، بەڵام نەك بەشێوەیەکی سیستماتیکو بەردەوام. تەنانەت ئەمەش بەردەوام لەلایەن خودی هەڵگرانی ئاڵای ناسیونالیزمی عەرەبیەوە دەخرایە بەر ڕەخنەو تانەو تەشەرو لەم ئاستەشدا ئاماژەی بە ئەزموونی کەڵکەبووی مێژوی جیهانی دەکرد. هەر ئەم ڕەخنە لەخۆگرتنەش یەکێك لەو هۆیانە بوو کە نەیهێشت زێدەڕەوی هەندێ لە ڕۆشنبیرانو توندڕەوی هەندێك بیریار، دابەزێ بۆ ناو جەماوەرێکی بەرفراوان.

ئەم نەگونجانەی میلی کاتژمێری سەردەمی عەرەبی لەگەڵ میلی کاتژمێری سەردەمی جیهانیدا جڵەوی ئیندفاعی ناسیونالیزمی عەرەبی کرد کە ناچار بوو بەردەوام ڕەچاوی ئەوە بکات هەرخۆی بەتەنیا لەمەیدانەکەدا نیەو بە تەنیا ئیرادەی خۆی بەس نیە بۆ ئەوەی چارەنوسی جیهان دیاری بکات، ئەمەش خۆی بەپێچەوانەی بزوتنەوەی ناسیونالیزمی ڕۆژئاوا لەسەدەی 18و 19دا[12]. ڕەنگە ئەم ئاگادارکردنەوەیە کە بەگشتی بیریارانی ناسیونالیزمی عەرەبی لایەنگریان دەکرد، زۆرتر لەکاری ئەو کەسانەدا ببینرێ کە بەزمانێکی بێگانەو بۆ جەماوەرێکی بێگانە دەیاننوسی. بۆ نمونە ئەو پێشەکیەی (حازم نسبیە) کە بۆ کتێبی "ناسیونالیزمی عەرەبی" نوسیوێتی و لە نیویۆرك دەرچوو، بە پلەی یەکەم پێشەکیەکی پۆزش هێنانەوەیە.

"ئەمڕۆ ناسیونالیزم تەنها لەبەر ئەوەی ناسیونالیزمە لەلایەن بەشێکی زۆر لەڕای گشتیەوە بەقێزەوە تەماشای دەکرێت.. ئەمەش لەبەر ئەو زێدەڕەویو توندڕەوی ناسیونالیزم دروستی کردو بووە هۆی کارەسات لە شوێنە جیاوازەکانی جیهاندا بۆ ملیۆنەها کەس لە ڕۆڵەکانی گەلە جیاوازەکان. لێرەوە ئەستەمە مرۆڤ لەکاتی پێشکەشکردنی مەسەلەیەکی ناسیونالیستیدا چەند پاکیش بێ، هەڵوێستێکی پۆزشخوازی وەرنەگرێ)[13].

ئاشکرایە ڕۆژئاواش کە خاوەن بەرژەوەندیەکی ئیمپریالیە هەوڵیدا بۆ خزمەتکردنی ئەو بەرژەوەندیانەی تیورەیەك بۆ جیهانی سێهەم ڕەوانە بکا (تصدیر) بەناوی "لەناوچوونی سەردەمی ناسیونالیزم"ەوە کە بەهۆیەوە مەبەستە سەرەکیەکانی لەژێر پەردەی حیکمەتو عەقڵدا شاردۆتەوە[14]. ئەوەشی جێی داخو مایە نیگەرانیە ئەوەیە ڕۆشنبیرانیش کە بەگشتی دەبێ هەڵگری بیرۆکەی ناسیونالیزم بن

بەپێی سروشتی خۆیان خێرا دەچنە ژێر کاریگەری بیرۆکە باوەکانی بازاڕی جیهانییەوەو هەر کاتێك ئەو بیرۆکانە بریقەدار هاتەپێش چاویان، هیچ دودڵ نابن لەوەرگرتنو قبوڵکردنی، تەنانەت ئەگەر لەگەڵ پێویستی ئەو قۆناغە مێژووییەشدا نەگونجێ کە کۆمەڵگاکانیان پیایدا دەڕوا. ئەگەر لەم ڕۆژانەشداو لەدەورووبەری خۆماندا کز بوونی حەماسەت بۆ بیرۆکەی ناسیونالیزم لەلای بڕێکی زۆر لە ڕۆشنبیرانی عەرەب دەبینین ئەوا دەتوانین لایەنی کەم یەکێك لەهۆکانی بگەڕێنینەوە بۆ ڕەواجی ئاینزا کۆسموپولیتیەکان لەناویاندا.. بەو کۆپیە هەڵەیەشەوە (چ لەڕوی تێگەیشتنو چ لەڕوی مەبەستەوە) لە "ئینتەر ناسیونالیزم"[15]

ئەوەی لەبارەی ڕۆشنبیرانەوە گوتمان دەرهەق بەو چینە کۆمەڵایەتیەش راستە کە هەڵگری بیرۆکەی ناسیونالیزمە (هەرچەند بەناوەڕۆکێکی جیاوازەوە). رابونی ناسیونالیزم لە ڕۆژئاوا بەستراوە بە رابونی بورجوازیەوە کە ڕێبەرایەتی فراوانترین جەماوەری نەتەوەی کرد لەپێناوی جوانترین خەباتی دیموکراتیدا دژی دەرەبەگایەتیو تاریکی کەهنوتیو پاشماوەکانی سەدەی ناوەڕاست. بورژوازیەت بەقوڵی مۆری خۆی لە بزوتنەوەی ناسیونالیزمی ئەوروپیدا. تەنانەت هەندێ لە بیریارو ئایدۆلۆژیستەکان ئەم حوکمەیان گشتگیر کردو ناسیونالیزمیان بە وتەزایەکی تایبەتی قۆناغی بورژوازی لەقەڵەمدا. هەرچۆنێك بێت بورژوازیەت ئەو چینە کۆمەڵایەتیەیە کە هەڵگری بیرۆکەی ناسیونالیزم بوو لە ئەوروپای ڕۆژئاوادا، تۆکمەیو پەرەسەندنو بەردەوامی بەم بیرۆکەیە بەخشی.. شتێك کە بۆ بیرۆکەی ناسیونالیزم لە ڕۆژهەڵاتی عەرەبیدا، نەڕەخسا. لێرە (واتە لە ڕۆژهەڵاتی عەرەبیدا) بورژوازی ناسیونالیزم دروستبونو گەشەکردنی لاوازو هوشیاریو ئایدۆلۆژیاش لاواز بوو، هیچ ڕۆژێك لەڕۆژانیش نەیتوانی ڕێبەرایەتی بزوتنەوەی ناسیونالیزم بۆخۆی قۆرخ بکات، بەڵکو گروپی جیاواز ڕێبەرایەتی ئەم بزوتنەوەیەیان دەکردو بەخێراییش دەگۆڕان. لە خێڵەکیو لادێیو سەربازیەوە بیگرە نەك هەر لەچینی بورژوازی بەڵکو لە چینی دەرەبەگایەتیو خاوەن موڵکو ئەمیرە ئەرستوکراتەکانیش تا چینی وردە بورژواو تەنانەت هەندێ گروپی چینی کرێکاریش. بۆ ئەوەی بشڵێین هەر چینێك بەناچار ئایدۆلۆژیای تایبەتی خۆی هەیە، ئەوا ئەم فرە چینیە لەفرەییو تێکەڵبونێکی ئایدۆلۆژیدا ڕەنگیاندایەوە کە ڕێگەی لەوە گرت بزوتنەوەی ناسیونالیزمی عەرەبی خاوەن تۆکمەییەکی ئایدۆلۆژی بێت کە خەسڵەتی گشتی ناسیونالیزمە لەقۆناغی بەرزبونەوەیدا. ئەگەر ڕەچاوی ئەوەش بکەین ئایدۆلۆژیا (هۆکاری سەرەکی گۆڕانی کۆمەڵایەتیە)و (ئەو فۆرمە گشتیەیە کە بەهۆیەوە گەلەکان دەستکاری مێژوو دەکەن)[16] و هەروەها ڕەچاوی ئەوەش بکەین هیچ بزوتنەوەیەکی مەزنی شۆڕشگێڕ لەمێژوودا نەیتوانیوە بێ ئایدیۆلۆژیایەکی شۆڕشگێڕی سەرتاپاگیر، فراوانترین جەماوەر ڕێك بخات)[17]، ئەوا هیچ گران نیە لەوە تێبگەین -مادام چینو ئایدۆلۆژیا پێکەوە دەبەستینەوە- کە بزوتنەوەی ناسیونالیزمی عەرەبی باجی ئەم فرە ئایدۆلۆژییەی لە توانای زاتی خۆیداوە، بەشێوەیەك نەیتوانیوە ئەو "هێزە گەورەیە" بێ کە بزوێنەری جەماوەرەو ئەو ئیرادەیەی تیا بتەقێنێتەوە کە دەتوانێ کار لە مێژوو بکات.

بەشێوەیەکی مەبدەئی دەتوانین سێ هۆی سەرەکی بژمێرین کە بۆچی بزوتنەوەی ناسیونالیزمی عەرەبی نەیتوانیوە ئایدۆلۆژیایەکی شۆڕشگێڕی سەرتاپاگیر بەرهەم بهێنێ. بزوتنەوەیەك کە بڕیارە بزوتنەوەی فراوانترین

جەماوەر بێت لەململانێیدا بۆ سەقامگیرکردنی بونی نەتەوەیی و راپەڕینی شارستانی:

یەکەم: نەبوونی چینێکی سەرکەوتوو بەدیاریکراوی بۆرژوازیەت کە هێزو ئاواتو ئامانجەکانی ئەوەندە گشتیە وادەکات توانای ئەوەی هەبێ قسەکەری چینەکانی دیش بێو لەلایەن جەماوەریشەوە ئەوەندە بڕوا پێکراوە کەلاقی ئەوە لێبدا نوێنەرایەتی سەرجەم کۆمەڵگا دەکات. بەئازاد بوونو بالادەستی ئەو، کۆمەڵگا ئازادو بالادەست دەبێ.

دوەم: جێگۆڕکێی چینەکانو گروپەکانی چینە جیاوازەکان لە رێبەرایەتی بزوتنەوەی ناسیونالیزمی عەرەبیدا.. جێگۆرکێیەك كە نەك هەر بووە هۆی فرەیی ئایدۆلۆژی وەك پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد، بەڵکو بووە هۆی ئەوەی لەنێوان لایەنگر -نەیار (خصم)دا پرۆسەیەکی ئاناتۆمێکردنو پوچەڵکردنەوە ناوزڕاندنێکی رەخنەی چونیەکو بەرابەر دروست ببێ بەشێوەیەك ئیدی ئەستەم بوو ئایدۆلۆژیایەکی باو بەو مانایەی مارکس باسی دەکات، لەدایك بێ.

سێهەم: رۆیشتنی هەرێمەکان بەهەمان یاسای پەرەسەندنی جیاوازو پێکەوەگرێدراودا. ئەم هەرێمانە کە بە قۆناغی چونیەکی پەرەسەندندا ناڕۆن، چینو ئایدۆلۆژیای چونیەکیش بالا دەست نیە لەناویاندا. ئەم فرەییو جیاوازیە هەرێمیەش کارێکی نێگەتیفی کردەسەر لەدایکبوونی ئایدۆلۆژیایەکی باو بۆ بزوتنەوەی ناسیونالیزمی عەرەبی. لە قۆناغێك لە قۆناغە دیاریکراوەکانی پەرەسەندنی هەرێمە عەرەبیەکاندا وا هاتە پێشچاو ئایدۆلۆژیایەکی لەم چەشنە دەتوانێت لەدایك بێتو ببێ بە ئامێرێکی نمونەی بۆ سازدان (یان رێکخستنی) جەماوەر لە وڵاتە عەرەبیەکاندا.. مەبەستم ئەو کاتەیە کە هەلومەرجی مێژوویی ئەوەی بۆ میسر لە قۆناغی یەکەمی رێبەرایەتی عەبدولناسردا بۆ شۆڕشی 23 یولیو رەخساند، وەك گەورەترین هەرێمی عەرەبیو بەهێزترینو پێشکەوتوترینو خۆراگرترینیان، بۆ ئەوەی بتوانێ لەیەك کاتدا بچێتە ناو جەنگێکەوە دژی ئیمپریالیزمو کۆنەپەرستانی هاوپەیمانی[18]. بێهودە نیە تاکە یەکگرتنێك کە لەمێژووی عەرەبی هاوچەرخدا هاتەدی لەسایەی ئەم جەمسەرگریە ئایدۆلۆژیو رابەرایەتیەدا بوو. یەکێك لەو هۆیانەش کە بونە هۆی ئەوەی یەکگرتنی 1958 بەردەوام نەبێت، دەگەڕێتەوە بۆ ڕزینی ئەو تۆکمەییو یەکگرتنە ئایدۆلۆژیەی لەسەری راوەستابوو.. بەهۆی پێکدادانی لەگەڵ هێزە مارکسیەکان لەلایەكو هەندێ هێزی ناسیونالیستیدا، لەلایەکی دیەوە[19].

لەسەرەتای ئەم فەسڵەدا سەرەڕۆیمان (مجازفە) کردو وێنەیەکی مەجازیمان بەکارهێنا بۆ جیاکردنەوەی ئەو چۆنایەتیەی بزوتنەوەی ناسیونالیزمی عەرەبی پێ لەدایك بوو، ئێستاش هەروا لەم وێنە مەجازیەدا بەردەوام دەبینو دەڵێین: ئەو لەدایکبونە سیزاریەی ئاماژەمان پێکرد بەبێ یارمەتی مامانێك تەواو بوو.. ئەمەش بەیارمەتی ئەو وێنە مەجازیەی دەڵێ جەنگەکان مامانی مێژوون. راستە وڵاتی عەرەبی زنجیرەیەك داگیرکردنی کۆلۆنیالی بەخۆیەوە بینی.. بەلام ئەم داگیرکردنانە جەنگی لەناو بردنێکی نابەرابەر بوو، نەك جەنگێك کە وزە ناسیونالیستیەکان بتەقێنێتەوە. ئەمە جگە لەوەی بەرگریکرنەکانیش لەزوریەی کاتەکاندا خەسڵەتێکی دینی هەبووە نەك نەتەوەیی. بەپێچەوانەوە دەتوانین بڵێین داگیرکردنی کولونیالی بووە هۆی ئەوەی ئەستەم بێت جەنگێکی ناسیونالیستی لەو شێوەیەی ئەورووپا لەسەردەمی ناسیونالیستدا بینی، بەرپا ببێ[20].

هێرشەکانی محەمەد عەلیش یەکەمو دواجەنگی ناسیونالیستی بوو کە وڵاتی عەرەبی

بەر لە نشوستی هێنانی لەبەردەم ئیمپریالیزمی رۆژئاوادا، بەخۆیەوە بینی، لەسایەی کولونیالیزمیشدا هیچ دەرفەتێك بۆ دەرکەوتنی جەنگێکی ناسیونالیستی نەبوو لەشێوەیەکی کاریکاتێریدا نەبێ: وەك ئەو جەنگەی شەریف حسین بەرپایکرد.

بەلام بالادەستی (هیمنە) ئیمپریالیزم کە بووە هۆی ئەوەی جەنگێك لەپێناو یەکێتی نەتەوەیدا لەولاتی عەرەبیدا دروست نەبێ، بووە هۆی بەرپابوونی جەنگی بەرگریو ئازادکردنو سەربەخۆیی. بەلام لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەم جەنگانە لەزوربەی ولاتانی جیهانی سێهەمدا ئەلتەرناتیڤی یەکێتی ناسیونالیستی بوون لەسەر شێوەی ئەوروپی، ئەوا ئەم جەنگانە لەولاتی عەرەبیداو بەهۆی تایبەتمەندی هەلومەرجە مێژوییەکەیەوە، هەرگیز نەیتوانی چوارچێوەی هەرێمایەتی بەجێ بهێڵێ. مەبەستمان لەم تایبەتمەندیە:

یەکەم: کولونیالیزمو دوهەم: فرەیی هێزە ئیمپریالیە بالادەستەکانو سێهەمیش: چاوچنۆکی ناسۆ تەسکیو مێژوویی بورجوازی عەرەبی بۆ دەستبەسەراگرتنی حوکمو دەسەلاتی دەولەت لەسنوری هەرێمدا. چارەنوسی جەنگەکانی ئازادکردنی نەتەوەیی لە باکوری عەرەبیدا نمونەیەکی باشمان دەداتێ بۆ چاوچنۆکی ئەم بورژوازیە بۆ دەسەلاتی هەرێمایەتیو چاوەڕوانی ئەم چینە لەسەربەخۆیی بۆ ئەوەی لەناو چوارچێوەی دەسەلاتی هەرێمدا بیکات بە ئامێرێك لەپێناوی گۆرینی خۆیدا بۆ (بورژوازیەکی ناسیونالیستی) فەرمانڕەوا کە دەسەلاتی دەولەت بەکاردەهێنێ نەك هەر بۆ پاراستنی بەرژەوەندیو سەقامگیرکردنی پایەو پلەکانی، بەلکو بۆ چارەسەرکردنی کەموکوڕی گەشەکردنو منالێتیو تێکشکانی کەسایەتی خۆی کە لە لە دایکبونیەوە مۆری پاشکۆیەتی بۆ بۆرجوازی ئیمپریالی لێدراوە[21].

لەگەڵ ئەوەشدا جەنگی ئازادیخوازی نەتەوەیی لەباکوری عەرەبیدا توندوتیژتر بوو لەهەر ناوچەیەکی عەرەبی دیو لەگەڵ ئەوەشدا کە بالادەستی یەك هێزی ئیمبریالی -فەرەنسا- بەسەر هەرێمەکانی باکوری عەرەبیدا ئەو دەرفەتەی بۆ هێزە دژ بە کولونیالیەکان خولقاند بۆ ئەوەی هەر لەسەرەتاوە خاوەن هوشیاریەکی قولی یەکگرتن بن[22] و لەگەڵ ئەوەشدا کە زوربەی ئەو بزوتنەوانە هاوکاتی یەك بوون (1953-1954)، بەلام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا بورژوازی کە تینووە بۆ نەتەوەیی بوون (تقومن) لەرێی دەسەلاتی دەولەتەوە، ئەو نەخشە کۆلونیالیەی قبولکرد کە دەیویست جەنگی ئازادیخوازی باکوری عەرەبی دابەش بکاو لەگەڵ حکومەتی فەرەنسیدا پەیمانی سەربەخۆیی جیاجیای مۆرکرد کە لە دەرئەنجامە نزیکەکانی ئەوە بوو هێزەکانی داگیرکەری فەرەنسی توانیان خۆیان بۆ جەنگی جەزائیر تەرخان بکەن کە هەشت سالی خایاندو بووە مایەی قوربانیدانی زۆر لە جەزائیریەکانو دەرئەنجامە دورەکانیشی سەقامگیر بوونی دابەشکردنی باکوری عەرەبی بوو تا داهاتویەکی نادیار.

ئەمە سەبارەت بە قۆناغی پێش سەربەخۆیی بەلام سەبارەت بە قۆناغی پاش سەربەخۆیی ئەوا جەنگەکانی عەرەب- ئیسرائیل نمونەی جەنگێکمان دەدەنێ کە بەناوەرۆك ناسیونالیستانەیەو بەفۆرمیش هەرێمایەتیە. ئەم دەستنیشانکردنەش هەر لەرووی شکلیەوە نیە چونکە فۆرمی هەرێمایەتی تاڕادەیەکی زۆر دەستنیشانی دەرئەنجامە سەربازیەکانی جەنگی کرد.[23] سەرەڕای ئەمە دەرئەنجامی مەیدانی جەنگەکانی عەرەب -ئیسرائیل (جگە لە جەنگی 1973) کە دەرئەنجامێکی نائومێدکەرانەیەو

خەسڵەتی بروسکەئاسای ئەم جەنگانەو ئاستی تەکنەلۆژی وەرگیراوی، هەموو ئەمانە ڕێگەی لەم جەنگانە گرت سیفەتی جەنگی خۆسازدان (تعبئە) نەتەوەیی وەربگرێو بەمانای وشە ببێ بە جەنگی نەتەوەیی: واتە جەنگی یەکگرتنی نەتەوەیی.

بزوتنەوەی ناسیونالیزمی عەرەبی لەبەر ئەوەی خاوەن جەنگێك نیە وەك فۆرمێك لەفۆرمە نیشتمانەکانی وەدیهێنانی خۆی، ئەوا یەکێك لەو ئامێرە بنەڕەتیانەی دۆڕاندووە کە بۆ یەکێتی نەتەوەیی پێویستە، مەبەستمان لەو ئامێرە توندوتیژیە کە لەگەڵ جەنگدا هاوشانی سەرجەم بزوتنەوەیەکی ناسیونالیستیە لەمێژوودا. ڕێکەوتیش نیە سەردەمی ناسیونالیزمی ئەوروپی کە لەکۆتایی سەدەی 18 دا دەستپێکردو بەکۆتایی سەدەی 19 کۆتایی پێ نەهات، سەردەمی جەنگەکانو دەستبەسەراگرتنو پێکەوەلکاندنە زۆرەکیەکانە. بێگومان لێرەدا مەبەستمان هەڵسەنگاندنی ئەخلاقی جەنگو ئاشتی نیە چونکە کەس نیە ئەمڕۆ نکوڵی لەوە بکات لە ئاسمانی ئەبستراکتی ئەخلاقیدا، ئاشتی پێش جەنگ دێت[24]. هەروەها ناتوانین نکوڵی لەوە بکەین یەکێتی نەتەوەیی لەڕێی دیموکراتیەوە باشترو نزیکترە لە نمونەی بالاوە (مثل الاعلی) کە هەرگیز ناپێورێ بەو یەکێتیەی لەڕێی زۆرداریەوە بەئەنجام گەیەندراوە. بەڵام نکوڵیش لەوە ناکرێت پێکەوە لکاندنی زۆرەکیانە فۆرمێکی بنەڕەتیە لە فۆرمەکانی بەدیهێنانی یەکێتی نەتەوایەتیو توندوتیژیش یەکێکە لەئامێرە سەرەکیەکانی یەکگرتنی نەتەوەیی. ڕەنگە لەهەندێ هەلومەرجی دیاریکراویشدا جگە لەو فۆرمو ئامێرە، هیچ فۆرمو ئامێرێکی دی لەبەر دەستدا نەبێ بۆ بەدیهاتنی یەکێتی نەتەوەیی. لێرەوە ئەو بزوتنەوە ناسیونالیزمەی لەسەرەتاوە خاوەنی چەکی توندو تیژیو پێکەوەلکاندن نەبێ، هەر لە سەرەتاوە مەحکومە بەوەی ئەو دەرفەتە مێژووییە زۆرانە لەدەستبدات بۆ بەدیهێنانی ئامانجە یەکێتیخوازەکانیو ڕەنگە تاکە دەرفەتێکی هەتیویش هەر بدۆڕێنێ.*

ئەمە لەکاتێکدا بزوتنەوەی ناسیونالیزمی عەرەبی نەك هەر بۆ جێبەجێکردنی خەونی یەکێتی، خاوەن ئامێری توندوتیژی نەبوو، بەڵکو بیرۆکەی نا توندوتیژیشی چالاکانە بەکارهێنا بۆ سەقامگیرکردنی جیابونەوەی 28ی ئەیلولی 1961 کە پشتی ئەو یەکێتیە هەتیوەی شکاند کە عەرەب لەمێژوی هاوچەرخدا بەدیهێنابوو. کاتێکیش کۆماری عەرەبی یەکگرتوو بەکودەتایەکی سەربازی واتە بەتوندوتیژیو هێز ڕوخا، ئەوا نەك هەر هەندێ بیریاری ناسیونالیزمی بەلەهجەی بەهانە هێنانەوە پێیان گوتین ((عەبدولناسر جەنگی دژی جیابونەوە نەکرد چونکە بڕوای بەشێوازی هێزو زۆرداری نیە بۆ بەدیهێنانی یەکگرتن))[25] بەڵکو ئەم حوکمەی گشتگیرکردو بەرزیکردەوە بۆ ئاستی تیوریزەکردن ((شێوازی لکاندنو داگیرکردن بۆ دامەزراندنی یەکێتی نەتەوەیی کە شێوازێکە لەسەدەی 19دا لە ئەڵمانیاو ئیتالیاو وڵاتانی دی بەکارهات، چیدی لەگەڵ سروشتی پەرەسەندنی جیهانی هاوچەرخدا ناگونجێ))[26].

کێ گوێی لەم قسانە بێت وا دەزانێ پەیوەندی نێوان دەوڵەتەکان چیدی لەسەر بنەمای توندوتیژیو هاوسەنگیەکانی هێز[27]، ڕانەوەستاوەو جیهانی عەرەبیش بەپێی ((پەرەسەندنی جیهانی هاوچەرخ)) دەڕواو جیهانیش بووە بە بەهەشتێکی دیموکراسیو پێکەوەگونجانی نێونەتەوەیی. لەکاتێکدا ئەمە ڕاست نیە. چونکە سەردەمی عەرەبیو **سەردەمی جیهانی** چونیەك نین. مادام جیهانی عەرەبیش بەمانایەك لەماناکان سەدەی نۆزدەهەمی خۆی دەژی کەوابوو مافی خۆیەتی لەرووی

مەبدەئیشەوە بێ، شێوازی سەدەی 19 بەکاربهێنێ**. ئەگەر عەرەبیش ئەم شێوازە بەکار ناهێنێ لەبەر ئەوە نیە پێ بەپێی ((سروشتی پەرەسەندنی جیهانی هاوچەرخدا)) دەڕوا، بەڵکو ئەمە دەرئەنجامی ملکەچیەتی بۆ هاوسەنگی هێزە جیهانو ناوچەییەکانو تەسلیمبوونی بە لۆژیکی دەسەڵاتە هەرێمایەتیەکانو ڕەوایەتی ئەو هەرێمانەو ملکەچی بۆ ئەمری واقع: واقعی چونەژێر ڕکێفی دەسەڵاتی هەرێمەکان بۆ ژێر دەسەڵاتی هێزە جیهانیەکان.. بگرە خودی ئیسرائیل کە هەندێ ناوچەی نفوزی لە سنورەکانی تەنیشت خۆیەوە بۆ خۆی پەیداکرد، زیاد لەجارێك بەراشکاویو ناڕاستەوخۆ رایگەیاندووە کە بەپشت بەستنی بەتوانای سەربازی خۆی نەك هەر دژی هەموو هەوڵێکی پێکەوەلکاندن دەجەنگێ، بەڵکو دژی هەموو هەوڵدانێکیشە بۆ گۆڕینی ڕژێمی دەسەڵاتی هەرێمە عەرەبیەکان.

بەڵام ((دیموکراتیەتیش)) لەپەیوەندی نێوان دەسەڵاتە هەرێمایەتیەکاندا جگە لە باقو بریقێکی ئایدۆلۆژی هیچی دی نیە کە بۆ شاردنەوەی بێتوانای لەکارکردنە سەر واقعو سەقامگیربوونی دەسەڵاتە هەرێمەیەتیەکان هاتووە.

بەدیهێنانی یەکێتی دەسەڵاتە هەرێمایەتیەکانە، گەورەترین دەستکەوتی دیموکراتیە کە نەتەوەی عەرەب بتوانێ بەدەستی بهێنێ. چونکە دیموکراسیەت فۆرمی باڵادەستی نەتەوەیەو بۆ ئەوەی نەتەوەش باڵادەست بێ، دەبێ سەرەتا لەچوارچێوەی کۆمەڵگایەکی سیاسیدا، بونی هەبێ.

نەتەوەیەکی دابەش بوو بە پێناسە نەتەوەیە کە هێشتا شۆڕشی دیموکراسی ئەنجام نەداوە. لەبەر ئەوە لەڕوی لۆژیکیەوە هەرگیز دیموکراسی وەك فۆرمێك نابێ بە بەربەست لەبەردەم چونە ناو شۆڕشی دیموکراسیەوە وەك ناوەڕۆکێك لەبەردەم نەتەوەدا.

کاتێکیش دەردەکەوێ کە ((ڕێگەی دیموکراسی)) بۆ گەیشتن بەیەکێتی نەتەوەیی، ڕێگایەکی داخراوە، ئەوا گرتنەبەری ((ڕێگای پرۆسی)) دەبێ بەباشترین خزمەت کە پێشکەش بەدیموکراسیەت بکرێ، گرتنەبەری ڕێگای نادیموکراسیش بۆ یەکگرتن هەرگیز دژی ناوەڕۆکی دیموکراسی نیە تا ئاستی سڕینەوە.

گومانی تیا نیە ئاواتی هەموو دیموکراتیخوازێك -ئەرکی سەرشانیشی- ئەوەیە هەوڵی چارەسەرێکی دیموکراسیانە بۆ مەسەلەی یەکێتی، بدات، بەڵام ئەگەر چارەسەری ((پرۆسی)) خۆی سەپاند، ئەوا هیچ ڕێگەیەك لەبەر دیموکراتیخوازدا نیە جگە لە تەسلیمبوونی بەم هەلومەرجە تازەیەو بەردەوامبوون لە خەباتکردندا.[28]

مەبەستمان ئەوە نەبوو بچینە ناو وتوێژی تیوریەوە، بەڵام کاتێ هەندێ ڕۆشنبیری عەرەبی دەبینین کەوا وێنەی کۆمەڵگاکانی دەوڵەتە عەرەبیەکان دەکەن وەك ئەوەی بەهەشتێکی دیموکراسیی بێت -کە شتێکە لەڕێی ئەو بایەوە بۆنی کردووە کە لە ڕۆژئاواوە دێ، بێ ئەوەی تامی بکات- و کاتێ دەبینین ئەم ڕۆشنبیرانە لەسەرەتاوە ئەو گریمانەیەیان سەپاندووە کە هەموو شتێ لەژیانی عەرەبیدا دیموکراسیە، بەشێوەیەك تەنانەت نکوڵی لەیەکگرتن دەکەنو دژیو دێتە بەرچاویان ئەگەر بەتەواوی لەڕێیەکی پاکی دیموکراسیەوە نەیەتەدی، ئەوا مرۆڤ ناتوانێ ئەو هەستە وەلاوەنێ کە ئەنتەلجەنسیای عەرەبی هەڵەیەکی تازە بۆ لیستەی هەڵە بێشومارەکانی زیاد ئەکات. چونکە داوا لەوڵاتی عەرەبی دەکات لە زەمەنێکی جیا لە زەمەنی ڕاستەقینەی خۆیدا بژیو خۆی بەپێوەرێك بپێوێ کە لەگەڵ پێویستیەکانیدا ناگونجێو هەروەها

بێتوانای خۆی بشارێتەوە بۆ چونە ناو دیموکراسیەوە لەدەرگا گەورەکەیەوەو راکردن لە پەنجەرەی ((ئاخاوتنۆلۆجیا))ی دیموکراسیەوە لێی.

هیچ کاتێکدا مەزراندنی دیموکراسیەت هێندەی سەردەمی جیابونەوەی 28 ئەیلول (سپتمبری 1961ی لە ولاتە عەرەبیەکاندا وەك بەهانەیەك بۆ ئەو جیابونەوەیە، رەواجی نەبوو. بەلاّم ئابڕوچونەکەش زۆر بەگەورەی دەنگیدایەوە: چونکە سەبارەت بە جەماوەر دەرئەنجامی کۆتایی جیابونەوە بریتی بوو لە دەستدانی یەکێتی بێ وە دەستهێنانی دیموکراسی. ئەمەش خۆی رێکەوت نیە: چونکە مادام ئەو یاسایەی حوکمی بیرۆکراتیە هەرێمیەکان دەکات، یاسای گەشەسەندنی هەلّئاوسانە، ئەوا بەردەوام دیموکراسیەت ونبوی گەورەی دەبێ لەشانۆی عەرەبیدا.

تەنانەت ئەگەر یەکێتی هەلّگری ئومێدی رابونی دیموکراسی نەبێ -لەکاتێکدا کە ئەم رابونە شتێکی دورنیە چونکە هەموو یەکێتیەك وزەی جەماوەری سەرکوتکراو لەسایەی دەسەلاّتی بیرۆکراتیانەی هەرێمەکاندا، دەتەقێنێتەوە- ئەوا بێ لەمەش یەکێتی سەدانجار لە دابەشبوون باشترە. وەك چۆن یەکێتیەکی دەرەبەگایەتی باشترە لە دابەشبوونی دەرەبەگایەتیو یەکێتی بورژوازی باشترە لەدابەشبوونی، هەرواش یەکێتیەکی نادیموکراسی باشترە لەدابەشبونێکی نادیموکراسی.

بێئەوەی ببین بە میتافیزکی یەکێتی، ئەوا بڕوامانوایە ئەو تێزە راستە کە دەلّی هیچ کیانێکی هەرێمایەتی نیە نەتوانین قوربانی بکەین لەبەردەم یەکێتیدا. بێگومان جەماوەر هیچ نیە بیدۆڕێنێ ئەگەر دەسەلاّتە هەرێمایەتیەکان دۆڕان***. بەلاّم ئەگەر یەکێتی بردیەوە رەنگە شتێك هەبێ بیباتەوە. ئەمەش هەمووی بەپێی گریمانەیەك کەوا دەزانێ یەکێتی دەشێ وەك -دابەشبون- بیرۆکراتی بێ، لەکاتێکدا ئەو ((پەرەسەندنە بابەتیەی)) روی لە ئاراستە بە نەتەوەیکردنی (قومیەی)ی بیرۆکراتیە هەرێمایەتیەکانە، هیچ هۆکارێك بۆ یەکێتی جێناهێلّێ جگە لە هۆکاری خودیو ئیرادەیو ئەمەش خۆی شتێکە هەر لەسەرەتاوە پێویستی بە رابونێکی جەماوەریو دواجار دیموکراتیو دژ بە بیرۆکراتیا هەیە.

بەراستیش یەکێتیو دیموکراسی یەك چارەنوس کۆیان دەکاتەوە. هیچ نەبێ لەو روەوە کە یەك دوژمنیان هەیە کە ئەویش بیرۆکراتیەتی هەرێمەکانە. رژێمە هەرێمایەتیەکان کە تەنها بەهۆی ونبونی یەکێتیەوە دەتوانن بەردەوام بونیان هەبێت، هەر خودی خۆیانو بۆ پاراستنی مانەوەیان حوکمی نەفیکردنی هەمیشەییان بۆ دیموکراسیەت دەرکرد. ئەم یەکبوونی شوناسی دوژمنە ئاسۆی گەورە بۆ تێڕوانین دەکاتەوە بۆ دارشتنی بەرنامەی خەباتێکی نوێ: رێگایەکی دیموکراسی بۆ یەکێتیو رێگایەکی یەکێتیخواز بۆ دیموکراسی.

*ئەمە فەسلّی دووهەمە لەکتێبی ((الدولة القطريه و النظريه القوميه) کە لە نوسینی: جورج ترابیشیە.. چاپی یەکەم 1982 کە ((دار الطليعه للطباعه والنشر)) چاپیکردووە.

**پەراوێزەکان:**

1)رەنگە ترۆتسکی باشترین کەس بێ کە یاسای پەرەسەندنی جیاوازو پێکەوە گرێدراوی رونکردەوە (و بەسەرمێژوی روسیادا جێبەجێی کرد). خەسلّەتی یەکەمی ئەم یاسایە بە بەراوردکردن لەگەلّ میتافیزکیای تیورەی گەرانەوەی هەمیشەیی (العود الابدی) یان چەرخانە مێژوییەکاندا (الدورات التأريخيه) دیالەکتیکە. چونکە بێگومان لەسایەی

سەرمایەداریدا دەبێ هەندێ هەرێمی پێشکەوتوو هەبن‌و هەندێکی دواکەوتوش.. ئەم هەرێمە دواکەوتوانەش بەناچاری دەستکەوتە مادی‌و ئایدۆلۆژیەکانی هەرێمە پێشکەوتووەکان وەردەگرن. هەر ئەمەشە دەرفەتی ئەوەی بۆ دەڕەخسێنێ ماوە زەمەنیەکان کورت بکاتەوە واتە قەرەبووی دواکەوتنی مێژوویی خۆی بە پەرەسەندنێکی پێکەوە گرێدراو (المركب) بکاتەوە کە بەهۆیەوە هەندێ قۆناغی نێوەندی (مراحل الوسطيه) دەپەڕێنێ‌و هەندێ خەسڵەتی کۆمەڵگا دواکەوتووەکان لەگەڵ ئەو خەسڵەتانەدا کۆبکاتەوە کە بێئەندازە تازەن. ئایا هندە سورەکان فێری بەکارهێنانی تفەنگ نەبوون بێ ئەوەی بە هەموو ئەو قۆناغی پەرەسەندنانەدا بڕۆن کە دەکەوێتە نێوان تفەنگو تیرو کەوانەوە؟ ئەی ئایا روسیای قەیسەری تازەترین فۆرمەکانی نێوەندگەری (التمركن) پیشەسازی سەرمایەداری وەرنەگرت لەکاتێکدا خۆی تازە لەقۆناغی کۆیلەیەتی هاتبووە دەرێ؟ بگرە ئایا هەر ئەو نەبوو سەردەمی شۆڕشی سوشیالیستی دەست پێکرد لەکاتێکدا هێشتا پەرەسەندنی سەرمایەداری خۆی تەواو نەکردبوو؟

Leon Trotyky, Histoire de la revolution russe (Puris:le Sevil, 1976), ch-1..1.

2)تەنها لەسەردەمە تازەکاندا دەکرێ باسی جیاوازی زەمەنی گەلەکان لەپێشکەوتنی ژیاریدا بکەین. چونکە ئەوە تەنها لەسەردەمە تازەکاندا، یان بەدەربڕینێکی وردتر لەسەردەمی سەرمایەداریدایە بۆ یەکەمجار لەمێژوودا ئەو مەرجانە هاتنەدی بۆ ئەوەی یەك جیهان دروست بێ. بەڵام جیهانی پێش ئەمە چ لەسەدەکانی ناوەڕاست یان سەردەمە دێرینەکاندا پتر لەچەند دورگەیەك دەچوو کە کاریان نەدەکردە سەریەك‌و پەیوەندی نێوانیان یەکجار تەسك بوو. بۆ نمونە دەگمەن نەبوو گەر ژیارێکی کۆیلەیەتی لەتەنیشت ژیارێکی (وەرزێرییەوە)* بژی یان ژیارێکی کشتوکاڵی لە تەنیشت ژیارێکی سەرەتاییەوە بژی، لەو سەردەمەدا زەمەن خاوەن سیفەتی بەردەوامی‌و کەڵەکەبوو نەبوو، تەنانەت ئەگەر هەندێ گەلیش توانیبێتیان هەندێ داهێنان بگوێزنەوە یان بەمیرات وەریبگرن. دەکرا ژیارێك لەدایك بێ‌و هەندێ دەستکەوتیش بەدەست بهێنێ‌و پاشان لەناو بچێ بێ ئەوەی بەناچاری میراتگرێکی هەبێ. (لەسەردەمی پێش سەرمایەداریدا) رەوتە ژیاریەکان خۆیان دوبارە دەکردەوە بێ هیچ کورتکردنەوەیەکی ماوە زەمەنیەکان‌و بێ هیچ ئابوریەك لەکۆششی مرۆڤایەتیدا. بەکورتی پێش سەردەمە تازەکان لەجیهاندا **ژیارەکان** هەبوون لەکاتێکدا لەسەرەتای سەردەمە تازەکانەوە لەجیهاندا **ژیار** لەدایك بوو و بەم شێوەیەش توانرا زەمەنی ژیاری بپێورێ. یەکێك لەباشترین ئامێرەکانی ئەم پێواندنەش یاسای پەرەسەندنی جیاوازو پێکەوەگرێدراوە کە لە پەراوێزی پێشودا باسمانکرد.

3)مصطفى الشهابي، القوميه العربيه، الطبعه 3 (القاهره: جامعه العربيه، معهد الدراسات العربيه العلميه، 1961)ص4

4) ((ئێمەی عەرەب وشەی (قومیە)مان لە (قوە)ەوە وەرگرتووەو مەبەستمان لێی نەتەوەیە. وشەی ((قومیه))مان وەك بیرۆکەیەکی فەلسەفی لە وشەی )الامیه) پێ باشتر بوو لەبەر ئەو ئاڵۆزیەی (الامیه) لە زیهندا دەیخاتەوەو ئەو مانا ناخۆشەی دەیبەخشێ. بەڵام ئەم تێکەڵکردنە لە زمانەکانی دیدا بوونی نیە)) نورالدين خرطوم، دراسات مقارنه فى القوميات الالمانيه والاطاليه و الامريكيه والهنديه (القاهره. معهد البحوث والدراسات العربيه، 1966)،ص3.

5)هەندێ توێژەرەوە بەپێچەوانەی ئەمەوە دەیانڕوانی‌و بڕوایان وابوو کە فرەیی داتاشین (تعدد الاشتقاقى) نابێ بەسەرچاوەیەك بۆ تێکەڵکردن بەڵکو یارمەتی ((ئاسانکردنی شتەکان)) دەدا. بۆ نمونە عەبدولکەریم ئەحمەد، دانەری ((القوميه والمذاهب السياسيه)ص36.

دەڵێ ((بەڵام لەزمانی عەرەبیدا مەسەلە ئاسانترە چونکە ئەو زاراوانەی لەم بوارەدا بەکاری دەهێنین – القومیە، الجنسیە، الامە، ناگەڕێنەوە بۆ یەك رەگ)). ئێمە تێناگەین چۆن ئەم فرەییە ((شتەکان ئاسان دەکات)) بگرە نازانین چۆن نابێتە هۆی سەرلێتێکچونی هوشیاری، کاتێ هاوولاتی عەرەبی ناچار دەبێ ئەندامێتی خۆی بۆ نەتەوە بەزاراوەیەکی دور لەنەتەوەوە دەربڕێ کە ((القومیە))یە، و ئەندامێتی خۆی بۆ دەوڵەتی نەتەوەش بە وشەیەکی دور لە (الامە)و (القومیە)وە دەربڕێ کە ((الجنسیە))یە؟ ئەگەر زمانیش بریتی بێ لە وەرگێڕانی هوشیاری، ئەوا ئیدی چۆن ئەم دولایەنیەی نوسراو (یان دانراوەی) ((القومیە)) لەدولایەنیو سەرلێتێکچونی هوشیاری نەتەوەیدا رەنگ ناداتەوە؟ لێرەشدا پێویستمان بەباسکردنی مەترسیەکانی ئاڵۆزی (تێکەڵ بوونی) زمانی نیە لەسەر بابەتێکی وەك بابەتێکی ناسیونالیزم. چونکە پێکدادانێکی درێژخایەنو بێهودە کەنێوان ناسیونالیزمەکانو مارکسیەکاندا رویدا –کەوزە تواناى زۆری تیا بەفیڕۆ چوو– چونکە هەندێکیان سوربون لەسەر ئەوەی وەرگێڕانی وشەی NATIONAL لەبری ((قومی)) ((نیشتمانیە))و لێرەوە وازانرا کە مارکسیەکان فەرامۆشی ناسیونالیزم دەکەنو هاوکاری خەباتی نەتەوەیی گەلی عەرەبی ناکەن، ئەمەش جیابونەوەو لێکدابڕانێکە کە بۆتە هۆی ئەوەی تا ئێستاش هێزە ناسیونالیستو پێشکەوتنخوازەکان بەگومانەوە سەیری یەکدی بکەن.

6)لەماناکانی ((الامە)) کە کۆکەی (امم)) لە عەرەبی باوکاندا رێبازو ئێستاو باڵاو نەتەوەیەك لەخەڵکیو کۆمەڵێك خەڵکە. بۆ بەکارهێنانە زۆرەکانی ((الامە)) و ماناکانی لە قورئانو کەلەپوردا، دەکرێ بگەڕێنەوە بۆ: ناصیف نصار، مفهو الامە بین الدین والتأریخ (بیروت: دار الطلیعە، 1978)

7)وەرگیراوە لە: بوید شیفر، القومیە: عرض وتحلیل، ترجمە جعفر خصباك و عدنان الحمیدی (بیروت: دار مکتبە الحیاة بالمشارکە مع مؤسسە فرانکلین، 1966)، ص363.

8)وەرگیراوە لە: الحصری: آراء واحادیث في الوطنیە و القومیە. ص79

9)وەرگیراوە لە: الحصری: محاضرات في نشوء الفکرە القومیە.43

10)وەرگیراوە لە: شیفر: القومیە عرض وتحلیل، ص 350.

11)بۆ نمونە جورج برناردشو دەڵێ ((ناسیونالیزم لەسەدەی بیستدا چی دی ناوەڕۆکێکی نیەو پێویستە خەڵکی سەرنجی خۆی بگوێزێتەوە بۆ بونیادنانی رژێمێکی جیهانی)) وەرگیراوە لە: احمد، القومیە والمذاهب السیاسیە، ص265)

12)تەنانەت تا سیەکانی سەدەی بیستەمیش کە تیایدا نازیەکان توانیان ئەوە بخەنە مێشکی سەرجەم نەتەوەی ئەڵمانیاوە کە ئەڵمانیا ((لەسەرو هەموانەوەیە)).

13)حازم نسبیە، القومیە العربیە، فکرتها، نشأتها، تطورها، ترجمە عبداللطیف شرارە (بیروت: منشورات المکتبە الاهلیە بالتعاون مع مؤسسە فرانکلین، 1962). ص17.

14)روبرت ئەمرسۆن دەڵێ ((رۆژئاوا کە شەهواتی ناسیونالیزمی خۆی لەرابردودا تێرکرد ئێستا دەیەوێت بەچاوێکەوە تەماشای هەرێمە تازە دروستبووەکان بکا کە ترسو حیکمەتێکی زۆر پێکەوە کۆدەکاتەوە، ئەم هەرێمانەش ئەوانەن کە ئارەزووی ئەوە دەکەن بەهەمان رێگادا بڕۆن، بەڵام رۆژئاوا دەڵێ ئەمە ئارەزوویەکە چیدی شوێنکاتی نەماوە. پاش ئەوەی فەرەنسیەکان هندی چینیو

زوریەی ئەفریقایان لەدەستدا، ئیدی بەتایبەتی جەختیان لەسەر ئەوە دەکرد کە دەبێ ئەم سەردەمە سەردەمی هاوکاری نێودەوڵەتی بێ نەك سەردەمی جیابونەوەی نەتەوەکان، لەو وتوێژەشدا کە لە ئەنجومەنی گشتی لەساڵی 1957دا لەبارەی جەزائیرەوە کرا، وەزیری دەرەوەی فەرەنسی (کریستیان بینو) وتی ((ناسیونالیزم چیدی ئاماژەیەك لەئاماژەکانی پێشکەوتن نیە، چەند هەندێکیشتان وای ببینن)) لەکتێبی ((من الاستعمار الی الاستقلال))یدا، ترجمە نقولا الدر (بیروت: الدار الشرقیە بالاشتراك مع مؤسسە فرانکلین 1964)، ص447.

15)ئەو کێشەیەی هەموو رۆشنبیرانی عەرەبی کە خەون بەسەردەمی پاش نەتەوە دەبینن، توشی خۆیان دەکەن -لەوپەڕی راستەوە بۆ ئەوپەڕی چەپ- ئەوەیە کە نازانن مەرجی جێهێشتنی نەتەوە، هاتنەدیو بونێتی.

16)جورج طرابیشی، المارکسیە و الایدولوجیە (بیروت: دار الطلیعە، 1971، ص204.

17)تەماشای ئم سەرچاوەیە بکە:

ندیعم البیطار، الایدولوجیە الانقلابیە (بیروت، المؤسسە الأهلیە للطباعە والنشر 1964)، (ئێمە چەند رەخنەیەکمان لەتێزەکانی ئەم کتێبە هەیە بەتایبەتی ئەو بەشەی باسی مۆرفولوجیای ئایدۆلۆژیای شۆرشگێر دەکات. بۆ ئەمەش دەتوانی بگەڕێتەوە بۆ: جورج طرابیشی، ((اساطیر المثقفین)) فی الآداب، السنە 18 (ایار/مایو 1967) العدد5، ص42-46).

18)باسای ((پەرەسەندنی جیاوازو پێکەوەگرێدراو)) بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر جێبەجێی دەکرێ بۆ دۆزینەوەی ئەوەی بۆچی میسری ناسری عەرەبێتی خۆی دۆزیەوە. میسر کە بەدرێژایی نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم لە هەرێمەکانی خۆرهەڵاتی عەرەبی دواکەوتبوو لەدۆزینەوەی عەرەبێتی خۆیدا، لەگەڵ شۆڕشی ناسریدا چەند قۆناغێکی ناوەڕاستی پەڕاندو جێگەیەکی نێوەندی لەناو جەرگەی بزوتنەوەی یەکێتی عەرەبدا بۆخۆی داگیرکردو بەکردەوەش یەکەم ئەزمونی یەکێتی لەمێژوی عەرەبی هاوچەرخدا تاقی کردەوە. بەڵام پێدەچێ هەمیشە ئەم باجەی مێژو لەپەڕاندنی قۆناغەکان لێت دەسێنی مەزن بێت، وەك چۆن ئەڵمانیا لەڕێی نازیەتەوە بەهایەکی زۆریدا بۆ ئەو خێراییەی کە دواکەوتنی مێژووی خۆی لەچاو فەرەنساو ئینگلتەرادا قەرەبوو کردو وەك چۆن روسیا بەهۆی ستالینیەتەوە بەهایەکی زۆریدا بۆ گواستنەوەی بەرەو قۆناغی بونیادنانی سوشیالیزم بێ ئەوەی ماوەیەکی پێویست لەقۆناغی سەرمایەداریدا بمێنێتەوە، هەرواش پێدەچێ ئەمڕۆ میسر لەڕێی زیندوبونەوەی تەوژمی گۆشەگیری میسرایەتیەوە، باجی تێپەڕاندنی میسری ناسری بدات بۆ قۆناغی پەروەردەکردنی (حضانە) بیرۆکەی ناسیونالیزمی عەرەبی. بەراوردەکەش لێرەدا تەنها لەروی تێپەڕاندنی قۆناغەکانەوەیە نەك لەروی چونیەك کردنی نازیزمو ناسریزم یان ستالیزم.

19)لەکاتی شۆڕشی حوزەیران/ یونیوی 1967وە کۆپیەکی تازەی ((تەوژمی بابەتگەری)) یان قەدەری لەدایکبوو کە دەڵێ: مادام هەموو چینەکانی دی شکستیان هێنا لەبەدیهێنانی بەرنامەی ناسیونالیزمداو مادام ئایدۆلۆژیاکانی دی توانای هوشیارکردنەوەی ناسیونالیزمی نەبوو، ئەوا تاکە چینێك کە هیوای رزگاری نەتەوەیی لێ بکرێ بریتیە لەو چینەی لەهەموان پێشکەوتوترە لەکۆمەڵگایە: واتە چینی پرۆلیتاریاو ئایدۆلۆژیاکەی. لەکاتێکدا پەرەسەندنێکی لەم چەشنە لەڕەوتی شتەکاندا لەپێشەوە دیارینەکراوە. نشوستی هێنانی چینەکۆنەکانیو ئایدۆلۆژیاکانیشی خۆبەخۆ بەس نیە بۆ ئەوەی گرێنتی سەرکەوتنی چینێکی تازەو راستی

ئایدۆلۆژیاکەی بکات. مەرجیش نیە میراتگری نێگەتیف، پوزەتیف بێ، رەنگە ئەم سەدیمیە ناسیونالیزمیەی ئەمڕۆ لەناویدا ونبوین، بەردەوام بێتو هەروەها پرۆژەی ناسیونالیزمیش وا بەبێ جێبەجێکردن، بەردەوام بێت. بەڵام ئەو چینەی پێشکەوتوترو پێشکەوتوخوازە لەکۆمەڵگادا، رەنگە بەو دەورە وازبهێنێ کە لەچوارچێوەی هەرێمەکاندا هەیەتی، ئەگەر بێت نەگۆڕێت لە چینێکەوە - لەناوخۆیدا بۆ چینێك- بۆخۆی. ئەم گۆڕانەش بەتەنها بەهۆی ((پەرەسەندنی بابەتیەوە)) نایەتەدی، بەڵکو بەهۆی کرداری ئیرادەوی‌و هوشیاری خودیەوە دێتەدی. مادامیش ((پەرەسەندنی بابەتی)) بەرەو ئاراستەی هەرێمایەتی دەڕوا نەك یەکێتی، ئەوا دەوری هۆکاری زاتی گەورەتر دەبێ تەنانەت سەبارەت بەو چینەش کە بڕیارە لەروی بابەتیەوە، پێشکەوتووترین چین بێ. گەورەترین شتیش لێرەدا بوترێت ئەوەیە کە ئەگەر ((پەرەسەندنی بابەتی)) خەسڵەتی ناسیونالیزمی لەچینی بورژوازی سەندووە، ئەوا بێ ئەوەی بەشێوەیەکی میکانیکی ئەم خەسڵەتە بە چینی پرۆلیتاریا ببەخشێ، هێشتا ئەو دەرفەتەی لەبەردەم ئەم چینەدا (کە هێشتا بە پایە و پلە هەرێمایەتیەکان بۆگەن نەبوون- چونکە لەبنەڕەتدا بێبەشە لەهەموو پایەو پلەیە) بەکراوەی هێشتۆتەوە بۆ ئەوەی بە کردارێکی ئیرادەویانە، یەکێتیخوازیێو ئەو شتە بۆ نەتەوە بێنێتەدی کە چینەکانی دی نایانتوانیووە بیهێننەدی.

20) ((چونی خۆرهەڵاتی عەرەبی بۆ ژێر دەسەڵاتی ئیمپریالیزم لە سەدەی 19و سەرەتاکانی سەدەی بیستدا)) بووە هۆی ((کۆتایهاتنی سەردەمی چاونەترسان (المغامرین) و دروستبوونی دەوڵەتە لاوازەکان لە ویلایەتە عەرەبیەکاندا)) بووە هۆی (دیاریکردنی سنوری ئەم ویلایەتانەو هەروەها بووە هۆی دەستنیشانکردنی خەسڵەتو رژێمەکانی ئەم ویلایەتانەو کیانێکی پێ بەخشین)) حسن صبحی، العالم العربی (بیروت: دار النهضە العربیە، 1967)، ص49-50.

21) دیاردەی گەشەسەندنی خێراو هەڵئاوسانی بیرۆکراتیە هەرێمایەتیەکان لەپاش سەربەخۆبوونەوە، وەك دەربڕینێکی پێویستیەکانی بورژوازی هەرێمی بەنەتەوەبوو (المتقومنە) بۆ قەرەبوکردنی دواکەوتنی مێژووی خۆی) خی لەخۆیدا پێویستی بە لێکۆڵینەوەیەکی سەربەخۆ هەیە کە تا ئێستاش چاوەڕێی یەکێك دەکات بۆ ئەوەی پێی هەڵسێ.

22) بۆ نمونە یەکێ لەبڕیارەکانی کۆنگرەی بزوتنەوە نیشتمانیەکان لە خۆرئاوای عەرەبیدا کە لە ساڵی 1947دا لە قاهیرە گیرا، بریتیە لە ((هیچ حیزبو هیچ بزوتنەوەیەك بۆی نیە بەتەنیا دانوستان لەگەڵ کولونیالی فەرەنسیدا بکات یان بەدوای چارەسەرێکی تاکانەدا بگەڕێ بۆ مەسەلەکەی)) وەرگیراوە لە: الطاهر عبدالله الحرکە الوطنیە التونسیە: 183-1956 (بیروت: مکتبە الجماهیر 1976)، ص 83.

23) ئەو دارشتنەی ((ساطع الحصری)) بەناوبانگە کە دەڵێ: عەرەب جەنگی 1948یان دۆڕاند نەك سەرەرای ئەوەی حەوت دەوڵەتو حەوت لەشکر بوون، بەڵکو بەدیاریکراوی لەبەر ئەوەی حەوت دەوڵەتو حەوت لەشکر بوون.

24) بەڵام لەسەدەی 19دا و لەگەرمەی جەنگەکانی یەکێتی عەرەبیدا، خەڵکی بڕوای جیاوازیان هەبوو لەبارەی بەهای ئەخلاقی جەنگو ئاشتیەوە. بێئەوەیش نکوڵی لە قوڵی یان رەسەنایەتی مێژوویی تەوژمی عەسکەرتاریەتی ئەڵمانی بەردەوامەکەی: واتە نازیەت بکەین، ئەوا ئێمە وای دەبینین لە روانگەی سەردەمی نەتەوەکانو جەنگەکانی یەکێتی نەتەوەیدا، دەتوانین بەتەواوی مانای قسەکانی مارشاڵی پروسی ((هیلمۆت فون

مولتکه)) تێبگەین ((ئاشتی هەمیشەیی خەونێکە- بەڵام تەنانەت خەونێکی جوانیش نیە- و جەنگ هەمیشە رەگەزێکە لە سیستمی خوایی گەردون.. جوانترین خەسڵەتەکانی مرۆڤ لەجەنگدا بەتاڵ دەبێتەوە، ئەمەش خۆی ئازایەتی خۆ تەرخانکردنە، وەفاداریە بۆ ئەرکو سڵیش لە قوربانیدانی ژیانی ناکاتەوە. جیهان لەمادیەتدا غەرق دەبو گەر جەنگ نەبوایە)) ئێمە دەتوانین لەگەڵ ((ئارنۆلد توینبیدا)) ئەم قسانە بەوە وەسف بکەین کە ((پیاهەڵدانێکی نەخۆشانەیە بەسەر جەنگدا)). بەڵام ئەوەی ناتوانین فەرامۆشی بکەین ئەوەیە لۆژیکی مێژوو هەمیشە لەگەڵ لۆژیکی ئەخلاقدا نایەتەوە***.

لێرەوە رەنگە فەرامۆشکردنی روانگەی ئەخلاقی روت لەروانگەی مێژوی بەرجەستەوە خودی عەقڵ بێت. بگەڕێوە بۆ:

ارنولد توينجا، الحرب والحضاره، ترجمه فؤاد دايوب (دمشق: دار دمشق للطباعه النشر، د،ت) ص 26-27.

25)واحيمه الجرف، ابحاث فى المجتمع العربى (القاهره: مكتبه القاهره الحديثه، 1963-1964) ص369.

26)هـ.س.پ.ص 370.

27)ئێمە نکوڵی لەوە ناکەین دەوری توندوتیژی لە پەیوەندی نێوان دەوڵەتە ئەوروپیەکاندا لاواز بووە، بەڵام لەبنەڕەتدا هۆی ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ بەدیهێنانی گونجاندنێکی تاڕادەیەك گەورە لەنێوان نەتەوەو دەوڵەتدا کە ئەمەش خۆی زنجیرەیەکی بێکۆتایی جەنگەکانەوە بەدەست هات. لە بەرامبەر ئەمەدا هێشتا پەیوەندی رۆژئاوای ئیمپریالی بەجیهانی سێهەمەوە تاڕادەیەکی زۆر لەسەر توندوتیژی بەندە. بەڵام لەڕوانگەی یەکێتی نەتەوەییەوە، رەنگە لێرەدا سودبەخش بێ سەرنج لەوە بدەین کە ئەوە تەنها ڤێتنامە جیاواز لەهەموو ئەو نەتەوانەی دی کە کولونیالیزم دابەشیکردوون، توانی یەکێتی خۆی بەدەست بهێنێتەوە. ئەمەشی بۆ نەرەخسا لەڕێی جەنگێکی خوێناویەوە نەبێ کە لەمێژوی هاوچەرخدا دەگمەنە.

28)مارکسو ئەنگلز لە گەورەترین دیموکراتیخوازەکانی سەدەی خۆیان بوونو لەهەموان زیاتر رقیان لە ((چارەسەری پرۆسی)) بوو، بەڵام کاتێ بسمارك بەهۆی لکاندنو توندوتیژیو جەنگەوە، ئامانجی قۆناغی دیموکراسی جێبەجێ کرد: واتە ((یەکێتی سیاسی نەتەوەی ئەڵمانی)) بەدیهێنا، ئەوا مارکسو ئەنگلز بۆ ((دیموکراسیەت))و ((پەرلەمان))ی دەوڵەتە بچوکەکانی ئەڵمانیا نەگریان، بەڵکو وایاندانا کە ئەو یەکێتیەی هاتۆتەدی ئەگەرچی لەڕێیەکی جیاواز لەوەی هیوایان بۆ دەخواستو بەدەستی هێزێکی جیاواز لەوەی لایەنگری بوون هاتۆتەدی، ئەوا دەستکەوتێکی مێژووییە کە دەبێ دیموکراسیخوازەکان بەیەکێ لە بەڵگەنەویستەکان دابنێن کە پاشگەزبونەوە لێی نیەو وەك خاڵی دەرچونێکی تازە بۆ خەباتکردنیان وەریبگرن، نەك بۆ دیموکراسی رۆژگارە دێرینەکان بگرین، دیموکراسیەتی پێش نەتەوە***

* لێرە بەدواوە بەناوی بابەتی بوونەوە ترابیشی هێواش هێواش دەڕوا ئەوەی تیوریزە بۆ دیکتاتۆریەتو شێوەیەك لەشێوەکانی فاشیەت بکات. هەر ئەم لێکدانەوەو تێگەیشتنە هەڵەیەشە کە وای لەترابیشی کرد لایەنگری داگیرکردنی کوەیت لە لایەن عێراقەوە بکات، لەراستیدا ترابیشی هەریەك مێژو دەبینێ کە ئەویش مێژووی رۆژئاوایەو هەر یەك رێگەش لەبەردەم گەلانی دیدا دەبینێ کە ئەویش تەنها دوبارەکردنەوەی هەمان ئەو قۆناغە مێژویانەی رۆژئاوایە بە ورنسکاریی و کارەساتەکانیەوە.

مولتکه)) تێبگەین ((ئاشتی هەمیشەیی خەونێکە- بەڵام تەنانەت خەونێکی جوانیش نیە- و جەنگ هەمیشە رەگەزێکە لە سیستمی خوایی گەردون.. جوانترین خەسڵەتەکانی مرۆڤ لەجەنگدا بەتاڵ دەبێتەوە، ئەمەش خۆی ئازایەتی خۆ تەرخانکردنە، وەفادارییە بۆ ئەرکو سڵیش لە قوربانیدانی ژیانی ناکاتەوە. جیهان لەمادیەتدا غەرق دەبو گەر جەنگ نەبوایە)) ئێمە دەتوانین لەگەڵ ((ئارنۆلد توینبیدا)) ئەم قسانە بەوە وەسف بکەین کە ((پیاهەڵدانێکی نەخۆشانەیە بەسەر جەنگدا)). بەڵام ئەوەی ناتوانین فەرامۆشی بکەین ئەوەیە لۆژیکی مێژوو هەمیشە لەگەڵ لۆژیکی ئەخلاقدا نایەتەوە***.

لێرەوە رەنگە فەرامۆشکردنی روانگەی ئەخلاقی روت لەروانگەی مێژوی بەرجەستەوە خودی عەقڵ بێت. بگەڕێوە بۆ:

ارنولد توینجا، الحرب والحضارە، ترجمە فؤاد دایوب (دمشق: دار دمشق للطباعە النشر، د،ت) ص 26-27.

25)واحیمە الجرف، ابحاث فی المجتمع العربی (القاهرە: مکتبە القاهرە الحدیثە، 1963-1964) ص369.

26)هـ.س.پ.ص 370.

27)ئێمە نکوڵی لەوە ناکەین دەوری توندوتیژی لە پەیوەندی نێوان دەوڵەتە ئەوروپیەکاندا لاواز بووە، بەڵام لەبنەڕەتدا هۆی ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ بەدیهێنانی گونجاندنێکی تارادەیەک گەورە لەنێوان نەتەوەو دەوڵەتدا کە ئەمەش خۆی زنجیرەیەکی بێکۆتایی جەنگەکانەوە بەدەست هات. لە بەرامبەر ئەمەدا هێشتا پەیوەندی رۆژئاوای ئیمپریالی بەجیهانی سێهەمەوە تارادەیەکی زۆر لەسەر توندوتیژی بەندە. بەڵام لەروانگەی یەکێتی نەتەوەییەوە، رەنگە لێرەدا سودبەخش بێ سەرنج لەوە بدەین کە ئەوە تەنها ڤێتنامە جیاواز لەهەموو ئەو نەتەوانەی دی کە کولونیالیزم دابەشیکردوون، توانی یەکێتی خۆی بەدەست بهێنێتەوە. ئەمەشی بۆ نەرەخسا لەرێی جەنگێکی خوێناویەوە نەبێ کە لەمێژوی هاوچەرخدا دەگمەنە.

28)مارکسو ئەنگلز لە گەورەترین دیموکراتیخوازەکانی سەدەی خۆیان بوونو لەهەموان زیاتر رقیان لە ((چارەسەری پرۆسی)) بوو، بەڵام کاتێ بسمارك بەهۆی لکاندنو توندوتیژیو جەنگەوە، ئامانجی قۆناغی دیموکراسی جێبەجێ کرد: واتە ((یەکێتی سیاسی نەتەوەی ئەڵمانی)) بەدیهێنا، ئەوا مارکسو ئەنگلز بۆ ((دیموکراسیەت))و ((پەرلەمان))ی دەوڵەتە بچوکەکانی ئەڵمانیا نەگریان، بەڵکو وایاندانا کە ئەو یەکێتیەی هاتۆتەدی ئەگەرچی لەرێیەکی جیاواز لەوەی هیوایان بۆ دەخواستو بەدەستی هێزێکی جیاواز لەوەی لایەنگری بوون هاتۆتەدی، ئەوا دەستکەوتێکی مێژووییە کە دەبێ دیموکراسیخوازەکان بەیەکێ لە بەڵگەنەویستەکان دابنێن کە پاشگەزبونەوە لێی نیەو وەك خاڵی دەرچونێکی تازە بۆ خەباتکردنیان وەریبگرن، نەك بۆ دیموکراسی رۆژگارە دێرینەکان بگرین، دیموکراسیەتی پێش نەتەوە***

* لێرە بەدواوە بەناوی بابەتی بوونەوە ترابیشی هێواش هێواش دەڕوا ئەوەی تیوریزە بۆ دیکتاتۆریەتو شێوەیەك لەشێوەکانی فاشیەت بکات. هەر ئەم لێکدانەوەو تێگەیشتنە هەڵەیەشە کە وای لەترابیشی کرد لایەنگری داگیرکردنی کوەیت لە لایەن عێراقەوە بکات، لەراستیدا ترابیشی هەریەك مێژو دەبینێ کە ئەویش مێژووی رۆژئاوایەو هەر یەك رێگەش لەبەردەم گەلانی دیدا دەبینێ کە ئەویش تەنها دوبارەکردنەوەی هەمان ئەو قۆناغە مێژوییانەی رۆژئاوایە بەهەموو بەربەریەتو کارەساتەکانیەوە.

# "قوتابخانەی فرانکفۆرت" لەمڕۆدا گوتاری خۆی ئاراستەی کێ دەکات؟

جۆرج تەرابیشی
• و: شوان ئەحمەد

ئەگەر سۆسیۆلۆژیای ئەڵمانی لەچەقی سۆسیۆلۆژیای جیهانیدا بێت، ئەوا چەقی سۆسیۆلۆژیای ئەڵمانی بێچەندو چوون دەگەڕێتەوە بۆ قوتابخانەی فرانکفۆرت.

لە دەرەوە ڕای ئەم قوتابخانەیە، کە چەندین ناوی دیاری وەکی ماکس هۆرکهایمەر و تیودۆر ئەدرنۆ و ئەریك فرۆم و هربرت مارکۆزەر یۆرگن و هابرمازی تێدایە، پێ ناچێت سۆیۆلۆژیایەکی ئەڵمانی تر هەبێت لە ئاستێکی جیهانی دابێت.

گورانی قوتابخانەی فرانکفۆرت دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی 1923، کاتێك فلیکس فایل کە ئەویش کوڕی بازرگانێکی دەوڵەمەندی یەهودی بوو، لەو شارەدا کە دەکەوێتە خۆرئاوای ئەڵمانیا، یەکەمین پەیمانگای لەو جۆرەی بۆ باس و لێکۆڵینەوەی مارکسیزم دامەزراند. لە 1931 دا ماکس هۆرکهایمەر بەڕێوەبردنی پەیمانگای گرتە دەست، بەمەش ڕێساکانی ئەو قوتابخانەی دارشت کە دواتر بە ناوی قوتابخانەی فرانکفۆرت دەناسرێت.

هەرچۆنێك بێت ناونانێکی وەها لەخشتە بەرەو لە جێی خۆی دانییە. یەکەم، لەبەرئەوەی گرنگترین دەسکەوتەکانی ئەم قوتابخانەیە لە دەرەوەی فرانکفۆرت دا بەدەست هاتوون، بە تایبەت لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا، دوای

ئەوەی تـەواوی ئەندامـەكانی ڕێگای تاراوگـەیان گرتـە بـەر تالەدەست دەسـەڵاتی تۆتالیتاریانـەی نازیزم دەربازیان بێت.

دووەمیشـیان لەبەرئـەوەی ناوهێنـانی (( قوتابخانـە )) ئاماژەدانـە بـەوەی جۆرێـك لـە یەكیـەتی بیروڕا یـان میتـۆدە یـاخود توێژینـەوە لـەناو ئەندامـەكانی دا هـەبێت، ئەمـە لـەكاتێك دا هیچ (( قوتابخانەیـەك )) ئەندامـەكانی هێنـدەی فرانكفۆرتیـەكان لەناویـەكدا نـاكۆك نـەبوون، كـە هەریەكەیان دابەش بوو بوون بەسەر ماركسیستی ئەرثودەكسـی و فرۆیـدی و فرۆیـدی ماركسـی و ئەبسـتمۆلۆژی و ئـەقڵانی و ئـەقڵانی نـوێو، تەنانەت نائەقڵانیش دا.

بـەڵام سـەرەڕای ئـەم فـرە ئایدۆلۆژیـەو ئـەم دابـەش بوونـە لـە بوارەكـانی توێژینـەوە و مەنهـەجدا، لـە نێـوان پیسـكۆلۆژیاو تیۆریـای مەعریفـەو سۆسـیۆلۆژیا و ئەنسـرۆپۆلۆژیاو فەلسەفەی هونەردا، ئەوا قوتابخانەی فرانكفۆرت لەزێدی خۆی داو وەهاش لە تاراوگە، ناوبانگی بە (( تیۆرەی ڕەخنەیی )) دەركردبوو. ئەم ((تیۆرە ڕەخنەی )) یەشی لە چوارخاڵی خاڵی سەرەكیدا كۆدەبنەوە:

– تێڕوانینێكی نوێ بۆ مێژوو.

– ڕەخنـەگرتن لـە ئـەقڵ ئـامێری و لۆژیكـی باڵادەستێتی تەكنۆكراتیەت.

– سـەرلەنوێ چاوخشـاندنەوە بـە پـەیوەندی نێوان دەوڵەت و كۆمەڵگە.

– دیدێكـی نـوێ بـۆ پەیوەندیـەكانی نێـوان تیۆرەو پراكسیس.

ئەگەرچی قوتابخانەی فرانكفۆرت لەماركسیزم دا دەستبەرداری پـرۆژە ڕەخنەییەكـەی نـەبوون، بەڵام خواستی ئەوەیان هەبوو ئەو فەلسەفەیە لـە ستایشكردنی ئـەقڵ ئـامێری و بـڕوای تـەواوی بـە حەتمەیەتی بـەرەو پێشچوونی مرۆڤایـەتی ڕزگـار بكەن. بەمجۆرەش فەلسەفەی مێژووی ماركسیزم خرایە ژێر پرسیارەوە، بە گەڕانەوە بۆ فەلسەفەی مێـژوو بـەدیدگا ڕەشـبینەكەی لای هەریـەك لـە شـوپنهاوەرو كیركیگـارد. ئـەدرنۆو هۆركهایمـەر خۆشباوەڕی ڕۆشنگەری و ئایدۆلۆژیـای ڕزگـاری قۆنـاغ بـە قۆنـاغی مرۆڤایـەتیان هاوشـان لەگـەڵ بەرەوپێشـچوونی مێژوودا ڕەتكـردەوە. ئـەوەی بابەتی گەشەو پێشكەوتنە دواجار بۆتە مایەی تێ ئـاوارە بوونـی مـرۆڤ، تەنانـەت ملمـلانێی چینایـەتیش وەكـی داینـامۆو بزوێنـەری مێـژوو نـەماوە، لەبەرئـەوەی پرۆلیتاریـا وەك چینێكـی شۆڕشگێڕی دیارو دەستنیشانكەری مانای مێژوو، هیچ بوونێكی بۆ نەماوەتەوە. ئـەوەتا كۆمەڵگـەی بەرخۆری لەمڕۆدا جـەماوەری چینـی كارگـەران و بزاوتـی پرۆلیتاریـای بـە ئاقـاری چەوسـێنەرانەی خۆیەوە شـەتەك داوەو، لـە هـەموو توانسـتێكی ڕەخنەگرانە و نەفیكردنێك دایمالیوون.

لەبری چەوساندنەوەیەكی ئابووری ڕاستەوخۆ تاكە كـەس بۆتـە بابـەتی سـەودا پێكردنێكـی كۆمەڵایـەتی - تـەكنیكی لـەژێر سایەی (( ئـەقڵ ئـامێری )) دا، ئـەو ئەقڵـەی كـە تاكـە كـەس و چینـەكان تێكڕا لـە سوڕێكی بەرهـەم هێنـانی - بەرخۆری دا پێكەوە شەتەك دەدات.

جـێی خۆیـەتی بڵێـین ئـەقڵی زانسـتی - تەكنیكی بە تەنها ئامرازێك نییە بۆ كۆنترۆڵكردنی سروشت وەك ئـەوەی (( دیكـارت )) مـەزەندەی دەكرد. بەڵكو هاوكـات ئـەو ئەقڵـە بۆتـە ئـامرازی كۆنـترۆڵكردنی مرۆڤیـش. ئـەوەتا لۆژیكـی جڵەوكردنی تەكنیكیانەی سروشت هەمان لۆژیكی جڵەوكردنی بەشتكردنی مرۆڤە. ئەقڵ ئامێری، كە هەڵدەستێت بەڕێكخستنی پەیوەندیەكانی مرۆڤ بە جیهانەوە لەسـەر بناغـەی دەستگرتن بەسـەر

سروشــت دا فەزایــەکی ئەبســتراو لێکچــوو دەخولقێنێ، بەمەش هەموو ئەوانە نـەفی دەکا و دەسـڕێتەوە کـە لەگـەڵ لۆژیکـی تـەکنیکی و تـەکنۆکراتی دا ناگونجێن. لۆژیکێکی وەها هیچ جیاوازیەك ناکات، لـەمرۆڤیشدا تەنها مادەیەکی خاو دەبینـێ کـە جیـاوازی لەگـەڵ ئـەوانی دی دانییە، ئەوەندەش مامەڵەیان لەگەڵ دەکـات کـە بیانکاتـە شت و بیانکاتـە بابـەتێك بـۆ بڕیـارێکی بیرۆکراسی. لە بەرامبەر بە ئایکۆنـەکردنی شـت و سـەگدا، بـە شـتبوونی فـەردەکان و بیرۆکراسـی بوونی کۆمەڵ و بەئەقڵانی کردنـی ئـابووری دێتـە گۆڕێ. وەها ئەقڵانیەتێکیش لـە خـۆیدا هـەڵگری هیچ وەعدو بەڵێنێك نییـە بـەڕزگار بـوون، بـەڵکو بریتییە لە ئەقڵانیەتێك کە سروشـت وێراندەکـات و مـرۆڤ قــوت دەدات و ڕێگــاش لەبـــەردەم ئیستبدادیەت و تۆتالیتاریـەت داخـۆش دەکــات. وەکـــی ئـــەدرنۆو هۆرکهایمـــەر لـــە کتێبـــە هاوبەشـەکەیان دا ( دیالـەکتیکی ڕۆشـنگەری ) سـاڵی 1947 وتیـان : ( ئـەقڵ دوای ئـەوەی ئەفسـانەکانی ڕامـاڵی، ئێسـتا بۆخـۆی بۆتـە ئەفسانە و پرانسیپێك بۆ تۆتالیتاریەت ).

ئـەم تۆتالیتاریەتـەی دەرەنجـامێکی ئـەقڵ ئامێرییە، ئەو جیاکاریە هیگڵی و مارکسیەی لە نێوان دەوڵـەت و کۆمـەڵ یـان بەواتایـەکی دی لـە نێوان کۆمەڵگەی سیاسـی و کۆمەڵگـەی مـەدەنی داهەبوو دەکاتە بابەتێکی بێ بایەخ. لەبەرئـەوەی لە سایەی هەیمەنەتی وەها ئەقڵێکدا دەوڵـەت بـە فیعلی بـۆ خـۆی دەبێتـە تـەواوی دەزگـا گشـتیو تایبەتـەکان، کـە لـە ڕێگایـەوە دیسـپلین کردنـی فەردو مەسخ کردنی بە ئەنجام دەگات. بێ گومان بیرۆکراسـیەتی سـەراپاگیریش ئاکـامی بـە بەیەکداچوونی تایبەتی و گشتی دەگـات. لێرەوە خـودی سـەندیکاکان خۆشـیان، لـە گەڵیشـیدا کۆمپانیا تایبەتـەکان و دام و دەزگا پیشـەیی و کۆمەڵایەتیەکان دەبنە ئامێرو دەست وێژێك بـە دەستی دەوڵەتەوە بۆ دیسپلین کردنی تاکەکس و ڕامکردنـی. بـەناوی ئەقڵانیـەتی لێپێچینـەوەی گشتیشـەوە دەوڵـەت نـەك هـەر تەنـها دەسـت وەردەداتـە تـەواوی ژیـانی کۆمەڵایـەتی، بگـرە دەست بۆناو ژیانی تایبەتیش درێژ دەکات.

هاپرماز کە یەکێکە لەوانـەی درەنـگ وەختـێ پەیوەندی بە قوتابخانەی ڕەخنەیی فرانکفۆرتەوە کـرد، توانیویـەتی لـەڕێی لێکۆڵینـەوە و شیکاریەکانیەوە پـەردە لـە ڕووی ئـەوە هـەڵماڵێ کەتا چرادەیەك کایەی ئیداری و فـەزای بەشـتبوو دەستیان وەرداوەتـە جیـهانی ڕۆژانـە و فـەزای ئینسانیەوە. تەنانەت دودڵ نـەبوو قسـەش لـەوە بکـات کـە چـۆن چۆنـی جیهانی ئیداری جیهانی نـاوەکی و تایبـەتی مرۆڤـی پـاوان کـردووە ئـەقڵ ئامێری، کەسیاسەت بە فەرمانی ئەوو لە خزمەتی ئـەودا کـار دەکـات فـەزای مرۆڤایـەتی بـە ئۆتۆسـتردات و هێڵـی ئاسنین و تەنانـەت هێڵـی ئاسمانیش لە قاڵب دەدات و، شوێن بەشێوەیەکی دەسـکردانە بـەش بـەش دەکـات بـە پـێی پێودانگێکی تەکنۆکراتیانـەی ڕووت، کـارێك کـەوا دەکـات شـارەکان لـەناوەندەکانی خۆیـان هەڵەکەندرێن و بەرەو ناوچەکانی دەوروبەری درێژ ببنەوە تـا لـە دەوری سوپەرمارکتەکان و ناوچە بازرگانیە گـەورەکان دا گردببنـەوە و دابمـەزرێن، ئەمـەش لـە پرۆسـەیەکی ( کۆلۆنیـالی ) دا کـە لـە زانستی ئـاوەدانی شارستانی دا دەگمـەن و بـێ وێنەیـە ڕوودەدات، بـە تایبـەت پـاوانکردنی ئەوروبـەرە (( سروشـتیانەی )) چـواردەوری شـارەکانیان داوە. بـەمجۆرە ئـەقڵ ئـامێری بـە تەنها زانستێکی پسپۆڕ خوازی و نامرۆڤانـەی لێ ناکەوێتـەوە کـە لـە ڕووی ئیداریـەوە جڵـەوی

دەکات، بەڵکو هاوکات جیهانێکی میکانیکی و سارد و سڕیش بەرهەم دێنێت. هەر بەپێی بۆچوونە ووردبینەکەی هۆرکهایمەر، وەها ئەقڵێك ( کۆمەڵگە دەگۆڕێت بۆ دۆخێکی سروشتی دیکە، دۆخێك زۆر دڵڕەقتر و بەزەبروزەنگ تر لەوەی یەکەم ).

ئایا ئەمە مانای ئەوەیە کە پێش وەخت تەواوی ڕێگا چارەکان داخراون و، بیرمەندیش جگە لە بێ دەنگی یان نائومێدی هیچی بۆ نەماوەتەوە؟

فرانکفۆرتیەکان سەرلەبەر داخرانی ئاسۆیەکی وا ڕەتدەکەنەوە، پێداگرتنیشیان لەسەر ئەوەی ئاقارەکەیان (( تیۆرەیەکی ڕەخنەییە )) لەبەرئەوەیە ئەوان دەخوازن دەرگاکە بەکراوەیی لەبەردەم ئەگەری کارکردن‌دا بهێڵنەوە.

سەرلەنوێ پێداچوونەوەشیان بەمارکسیزم دا لێرەوە سەرچاوە دەگرێت، بە ئامانجی چاوخشاندنەوە بە پەیوەندیەکانی نێوان تیۆرەو براکسیس دا. قوتابخانەی فرانکفۆرت ئەو تێزە مارکسیەیان لەمەڕ ( سەرخان )ەوە ڕەتکردەوە کە بونیادە معیاریەکانی لە وێنەی ئاین و هونەر و یاسا و مۆرالیٚ وەکی ڕەنگدانەوەیەکی ژێر خانی ئابووری سەیردەکرد، بە پیچەوانەی ئەمەوە ئەوان جەختیان لەسەر ئەو دنیامیکیەتە تایبەتە دەکردەوە کە ئەم بونیادە معیاریانە هەڵگرینی. بۆ نموونە ( هونەر ) دەشێت ببێتە ئامرازێك بۆ چەواشەکردنی ( هوشیاری جەماوەر ) وەکی مارکسیزم جەختی لەسەر دەکات گەر شکڵێکی پیشەسازی کلتوری وەرگرێت، بەلام هاوکات دەشێت بشبێتە هەلگری وەعدو بەلێنێك بە گۆڕینی جیهان.

بێگومان کاری هونەری ڕەگەزی ئەفسانەیی لەخۆدەگرێت، بەلام خودی ئەم ڕەگەزانە بە حوکمی ئەو وزەی ئازادیەی لە هونەردایە ئەگەری ئەوە هەیە هەڵبگەڕێتەوە و بگۆڕێت بە مێژوو، کارێك کە واڵتەر بینامین جەختی لەسەر دەکرد. بنیامین سەر بە ئەوەی یەکەمی قوتابخانەی فرانکفۆرت بوو، لە هەوڵی ئەوەدابوو تیۆریای مارکسیزم لە خەسڵەتە میکانیکیەکەی قوتار بکات.

هەندێك وەها پێناسەی تیۆرەی ڕەخنەیی قوتابخانەی فرانکفۆرتیان دەکرد کە لیبرالیەتێکی نوێیەو داوا دەکات مومارەسەکردنی ئازادی لەسەرجەم کایەکانی فکردا دەستە بەربێت. بەلام وەها پێناسەیەك ئەو ڕایەڵە فەرامۆش دەکات کە تیۆرەی ڕەخنەیی بە مارکسیزم و بە تێڕوانینی گۆڕانخوازیی ئەو بۆ جیهان دەبەستێتەوە.

ئەوەی ڕاستی بێت تیۆریای ڕەخنەیی لە بری ئەوەی لە ڕەوتێکی ئانارشیستی فەردانی نائەقڵانی دا نقوم بێت، وەکی ئەوەی مارکسیستە نەیارەکانیان بەوە تاوانباریان دەکردن، بەر لە هەرشتێ هەوڵیان دا ڕەهەندی ئازادی لە خودی مارکسیزمدا زیندوو بکەنەوە، پاش ئەوەی لە ڕەفتاری ستالینیەت دا بە دیسپۆتیزمیەتێکی نوێ گەیشت.

تیۆرەی ڕەخنەیش دواجار تیۆریەکە دژی ئیستبدادە، ئیتر جۆری ئەم ئیستبدادە ئایدیۆلۆژی بێت یاخود ئیستبدادێکی تەکنۆکراتی بێت. تاوانبارکردنی قوتابخانەی فرانکفۆرت بە ئانار شیزمی ونائەقڵانیەت بۆ خۆی تەشەر لێدانە زیاد لەوەی ڕەخنەبێت. گەر ئەمان ئیدانەی ئەقڵ ئامێریان کردبێت لەو ڕووەوە بووە کە دژایەتی هەیمەنەت و باڵا دەستی ئەو ئەقڵەیان کردووەو، داوای ئەوەیان کردووە بخرێتە ژێر چاودێری ئەقڵی میعیاریەوە. لەبەرئەمەش هەرگیز نەگەیشتۆتە ئەو ئاستەی هەڵویستی عەدەمیانە

پەیڕەو بکات، بە تایبەت ئەوەی پەیوەندی بەمەسەلەی دیموکراسیەتەوە هەیە. ئەوەتا ماکس هۆرکهایمەر یەکێك لەدیارترین ناوەکانی ئەو قوتابخانەیە دەنووسێت و دەڵێت : ( دیموکراسیەتە ئازار دەرەکەمان چاترە لە هەر دیکتاتۆریەتێك ). هەروەها یۆرگن هاپرمازیش جەخت لەسەر ئەولەویەتی (دیالۆگی دیموکراسی) دەکاتەوە بەو پێیەی تاکە ئامرازێکە بۆ دەربازبوون و خۆڕاپسکان لەدەست ( وەهمی تەکنۆکراتی ) و دروستکردنی ڕایەڵێکی سیاسی لە نێوان هێزو توانستی تەکنیکی مرۆڤایەتی هاوچەرخ و ئیرادە عەمەلیەکانی و بەهاکانی ئەقڵی معیاریدا.بەڵام سەرەڕای ئەم تازە کردنەوانەی هاپرماز، بەتایبەت لە کایەی تیۆریای مەعریفەدا، دواجار پرسیارێك دێتە پێش دەربارەی ئایندەی قوتابخانەی فرانکفۆرت.

لەبەرئەوەی تیۆرەی ڕەخنەیی و هات و هاواری ناڕەزایی دەربڕین کە قوتابخانەی فرانکفۆرت نوێنەرایەتی دەکرد و کاری پێ پێدەکرد، دەچێت لە دوای شکستی مارکسیزم و ئەو گۆڕانکاریە نیو- لیبرالیانەی لە جیهانی سەرمایەداری دا ڕوویان داوە و ڕەواجەی نەمابێت. کەواتە لەئێستادا قوتابخانەی فرانکفورت گوتاری خۆی ئاڕاستەی کێ دەکات، بە تایبەت ئەوەی کە گوتارەکەی ئاڕاستە دەکات نەك تەنها هەر ناونیشانەکەی گۆڕاوە، بەڵکو لە بنەڕەتەوە وجودی سڕاوەتەوە و هیچ بوونێکی نەماوە؟.

**سەرچاوە :**

جورج طرابيشي : لمن توجه (( مدرسة فرانكفورت )) خطابها اليوم؟ – الحياة ( 12913 ) – الاحد 12 تموز 1998.

# مۆدێرنیتیو قەیران

بابەك ئەحمەدی

• و: رێبوار سیوەیلی

## بەشی دووەم

### مۆدێرنیتیو نەفسوونگەری

ماکس ڤیبەر لەم باسەی ئێمەدا لەسەر مۆدێرنیتی، شوێنێکی گرنگی هەیە. هەڵوێستی گشتی ئەو لەم بارەیەوە تا ئەندازەیەك وەك تێڕوانینی مارکس وایە، واتە لەهەمان کاتدا کەباسی گرنگی دەستکەوتەکانی مۆدێرنیتی ئەکا، چاویش لەکەموکوڕیەکانی ناپۆشێ. مارکس بەناوی دوارۆژەوە دەکەوتە رەخنەگرتن لەرۆژگاری نوێ بەڵام ڤیبەر ئەمکارەی بەناوی ئەمڕۆوە بەئەنجام دەگەیاند. ڤیبەر نەخشەی کۆمەڵگایەکی لەسەردا نەبوو کە بەناوەڕۆكو ماهیەتێکی ترەوە لەکۆمەڵگای ئەمڕۆ بکەوێتەوە، و لەو کۆمەڵگایەدا کەموکوڕیەکانی ژیانی مۆدێرن لەناوبچن، بەڵکو هەڵدەستا بەتوێژینەوە لەوەی کەهەیە، {خاڵە} بەهێزیو لاوازییەکانی دەژمارد.

ڤیبەر بڕوای بەوەنەبوو کەمرۆڤ لەڕێگەی گۆڕینی سیستەمی موڵکایەتیو دامەزراندنی بەرنامەرێژیەکی. چەقبەستووی (متمرکن) دەوڵەتیەوە رزگاری ببێت، و چەندین جار ئەوجۆرە بیروڕایانەی کە لەبەرهەمی مارکسو سۆشیالیستەکاندا هاتبوون بەشتی خەیاڵی لەقەڵمدان. ڤیبەر تەنیا بۆ جیاکردنەوەی تێڕوانینەکان سوودی لەزاراوەی خەیاڵیو وەرنەدەگرت، بەڵکو بەهۆی بەکارهێنانی ئەم وشەیەوە، ئەو مەترسیانەی بیردەخستەوە کە لەکردەوەدا رووبەڕووی خەیاڵچی یەکان دەبوونەوە. مێژووی هاوچەرخ بەچاکی ئەو "مەترسیانە" دەسەلمێنێ ڤیبەر واقیع بینو رەشبین بوو، هەردەم جەختی لەسەرئەوە دەکردەوە کەتێڕوانینەکانی لەسەر کۆمەڵگای

نوێ بەتێڕوانینی "پراکتیکی" بزانن. ئیشی ڤیبەر لەمەڕ کۆمەڵگای مۆدێرنەوە لەدوو لایەنەوە لەگەڵ ئیشی بیریارەکانی سەردەمی خۆی جیاوازە: 1) ئەو قسەکرنی لەسەر مۆدێرنیتی گێڕایەوە بۆ گرنگترین خاڵو ناوەڕۆکی فەلسەفیانەی، واتە بۆ عەقڵباوەڕیو عەقڵانیەت. ئەم خاڵەش لەتوێژینەوە فەلسەفیو کۆمەڵناسیەکانی کۆتایی سەدەی نۆزدەیەمدا بایەخی خۆی دۆڕاندبوو. 2) ئەو پیشانیدا کە مۆدێرنیتی دیاردەیەکی تاکو نمونەیەکی تەنیاو دنیاگرەوە، نیە، پەیڕەوی لەیاسا هەردەم چوون یەکەکان ناکات. ڤیبەر گرنگی تایبەتمەندیەکانی مۆدێرن بوونی هەر کۆمەڵگایەکی ناسی، باسی جۆرەها مۆدێرنیتیکرد. توێژینەوە گرنگەکەی خۆی کەزیاتر تایبەتە بەئەورووپای نێوەندو باکوور، بەتایبەتیش ئەڵمانیا، لەکتێبە بەناو بانگەکەیدا ئەخلاقی پرۆستانیو ڕۆحی سەرمایەداری[33] 1904–1905 هاتووە. ڤیبەر بەشێوەیەکی جوان دەیسەلمێنێ کەکارکردنی کۆمەڵایەتیو واقیعیەتی بیروڕا دینیەکان لەنیشتەجێکردنی سەرمایەداریدا هەمیشەو لەهەموو جێگایەك چوون یەك نەبووە. ئەم خاڵە هەر تەنیا بەهایەکی ڕەووشناسانەو مێژوویی نیە، بەڵکو لەقسەکردنی ئەمڕۆدا لەسەر مۆدێرنیتی وەك ئاڕاستەیەك ڕۆڵێکی گرنگ دەگێڕێ.

بۆچوونێکی سادە لەکۆمەڵناسیدا بانگەشەی ئەوە دەکات کەمرۆڤی هاوچەرخ لەدنیایەکدا دەژی بەهۆی یاسا گەلێکەوە دەچێ بەڕێوە، کەهێندەی یاسا سرووشتیەکان پتەون. یاسا گەلێك کەعەقڵی مرۆڤ توانای دۆزینەوەیانی هەیەو هەرچەندە خۆشی لەدوا ئەنجاما پەیڕەویان لێدەکاتو لەهەندێ بارودۆخیشدا دەتوانی یارمەتی گەشەکردنیان بدات. ئەو چەمکانەی تیشك دەخەنە سەر ژیانی کۆمەڵایەتی سەربەو چوارچێوە کۆمەڵایەتیەن کەبۆ خۆی بەپێی "یاسا سرووشتیەکان" ئیش دەکات، دەکرێو پێویستە ئەم چەمکانە لەو ڕووپۆشە ڕەمزاویانە ڕزگاربکەین کەشێوە جۆر بەجۆرەکانی دەستەڵاتی تەقلیدیان، بە یارمەتی دامەزراوە بەتواناکانی وەك دەوڵەتو کەنیسە دروستیانکردووە. مرۆڤی ژێر کاتێ شارەزای یاساکانی گەشەو سروشتی دەبێ، لەدژی ئەو ڕازو ڕەمزانەش رادەپەڕێت. یەکێك لەئیشەکانی ڤیبەر ئەوەبوو سەلماندی کەئەو تێڕوانینە سادەو هەڵەیە. لەسەرهەڵدانی سەرمایەداریتی مۆدێرن دا، بزووتنەوەی چاککردنی ئایینی (پرۆتستانیەت) ڕۆڵێکی گرنگی هەبووە. مۆدێرنیتی، یاخود نوێبوونەوەی سیاسی، ئابووری، فەرهەنگی، کۆمەڵایەتی بەهیچ شێوەیەك بەمانای توانەوەی ڕەهاو تەواوی "فرمانی پیرۆز" نیە. ئەو شەڕە مانەویەی عەقڵ لەگەڵ "شتی پیرۆز"دا کە ژمارەیەك لەبیریارە مۆدێرنەکان هەڵیانگیرساندبوو، و دووچاریشی ببوون، چیتر لەخەیاڵ زیاتر هیچی تری نەدەگەیاند. دەکرێو جۆرەها نوێبوونەوەی کۆمەڵگاکانو ژیانی کۆمەڵایەتی بیروڕایەکان بدۆزینەوە کەبنەما فیکریە تەقلیدی کۆنەکان تیایاندا هاوشان لەگەڵ بیروڕا تازەکان داهاتوون. لەم بارودۆخانەدا ئەو بنەمایانە بەهەمان ڕادە گۆڕاون کەئامانجو بیروڕا تازەکان جیاوازییان تێکەوتووە، واتە نەچوونەتە ژێر کاریگەری بنەماکانەوە. ئەوەی لەو کتێبە گرنگەی ڤیبەردا لەچوارچێوەی گریمانەو بەڵگەنەویستیەکی کۆمەڵناسانە خرایەڕوو، لەکتێبەکەی هانس بلۆمن بیرگ دا، واتە ڕەوایەتیبوون سەردەمی مۆدێرن (1966) درێژەی پێدراوە. لەم کتێبەدا بلۆمن بێرگ بەوردی پەیوەندی مۆدێرنیتی بەگۆڕانکاریەکانی فیکری دینیەوە شیکردۆتەوە. بەشی یەکەمی کتێبەکە (کەبەشێکی کورتیشە) لەمەڕ ڕوونکردنەوەی

چەمكی دنیاییبوون و بەرپەرچدانەوەی ئەو بەهەڵە تێگەشتنانەی لەم بارەیەوە روویانداوە، زۆر گرنگە. لەسەر بنەمای ئەم بەشەوە دەكرێ بەو دژایەتیانە ئاشنابین كە لەبیركردنەوەی مۆدێرن دا لەمەڕ دنیایی بوونەوە سەریانهەڵداوەو، نووسەر لەبەشی شەشەمدا درێژەیان پێدەدات.[34]

بەبڕوای ڤیبەر چەمكی بنەمایی‌و كلیلی لەمۆدێرنیتیدا، عەقڵباوەڕی‌و عەقلانیەتە. عەقڵباوەڕی مرۆڤ، هەرچەندە لەرێگای جۆربەجۆرو بەشێوەی جیاوازیش بێت، لەئەنجامدا بەپێی حوكمی رۆژگاری مۆدێرن بۆتە فەرمانڕەوای چارەنووسی مرۆڤی كۆمەڵایەتی. لۆژیكی سادەو بەگوتەی ڤیبەر "فۆرماڵ"ی ئەم عەقلانیەتەی مرۆڤ بریتیە لەرەوتی كردە ئینسانیەكان بەرەو رێسا ئەندازە گیراوە، چەندایەتیە هۆكاریەكان. ڤیبەر ئەوە دەهێنێتەوە یاد كە لەم نێوەندەدا رێسای سەرەكی لەمە زیاتر نیە كەئەویش: بێ موبالاتیە لەئاست تاك دا.، پێشكەوتنی زانستگەرایی‌و تەكنەلۆژی لەباوەشی ئەم موبالات نەكردنەدا بەفەلسەفەی هومانیزم رەواجی پەیدا كردووە. ئەم لایەنە وشك‌و دوور لەسۆزە، كە عەقڵباوەڕی تاوتەدا، بەمانای چاوپۆشینە لەهەر شتێكی "ناعەقلانی" و هەر رەگەزێكی پێشبینی نەكراو نهێنی ئامێز، ئەویش لەهەر شێوەیەكدا دەركەوێ، بەكورتی بەمانای خۆ رزگاركردنە لەشەڕی ئەفسوونی ناعەقلانی شتێ كەڤیبەر ناوی دەنێ Entzauberung یاخود "ئەفسانە داماڵین"

پشت بەستنی كردە ئینسانی‌و كۆمەڵایەتیەكان بەعەقڵی مرۆڤ، بەردەوام نەك تەنیا لەمێژووی هاوچەرخدا - پرۆسیسی "ئەفسانە داماڵینی كردووە". خاڵێكی گرنگ كەڤیبەر جەختی لەسەر كردۆتەوە ئەوەیە، كە ئاینزا یاخود ئەخلاقی پرۆتستانتی لەگەشەی خۆیدا، بۆ رووبەڕووبوونەوەی سەرهەڵدانی سەرمایەداریەتی مۆدێرن، "ئەفسانە داماڵینی" قبوڵ كردووە، واتە خۆی داوە بەدەستی زۆربەی پێداویستیە دنیاییەكان‌و عەقڵئامێزی. لەیەكێك لەبەناوبانگترین پارچەكانی ئەخلاقی پرۆتستانتی‌و رۆحی سەرمایەداریدا ئەمە دەخوێنینەوە:

"بەمجۆرەیە كە پرۆسیسی بەرفراوانی ئەفسانە داماڵینی دنیا، كە لەمێژووی ئاینەكاندا، بەپێغەمبەرانی ئاینزای دێرینەی یەهود دەستپێكردبوو، هاوشان لەگەڵ بیری زانستی یۆنانیدا گشت هۆكارە سیحری‌و گەیشتن بەرزگاری‌و هەموو خورافەیەك لەخۆی دوور ئەخاتەوە، دەگاتە خاڵی كۆتایی خۆی. پەیڕەوكاری رەسەنی ئاینزای پرۆیتن لەئیمانی خۆیدا ئەوەندە چووەپێش كەبەبێ هیچ دوو دڵیەك نەریتە ئاینیەكان لەكاتی بەخاك سپاردندا تووڕیدات. ئەو جەستەی كەس‌وكارەكانی بەبێ هیچ ئایەت‌و لاواندنەوەیەكی دینی بەخاك دەسپارد، تاكو مەترسی دەركەوتنی هیچ جۆرە خورافەیەك‌و تەجەللای هیچ جۆرە نرخاندنێك بۆ كاریگەری ویردو بەپیرۆزگرتن لەرزگاری رۆحی مردووەكاندا لەئارادا نەبێ"[35]

ڤارنەر سومبارت لەكتێبی سەرمایەداری مۆدێرن (1902)دا نووسیویە كەئایدیۆلۆژیای مۆدێرنیستی دەربڕی نوێبوونەوەی پەیوەندیەكانی بەرهەمهێنان‌و ئابووریە. پاشان لەكتێبی بۆرژوادا كە لەسەرەتای یەكەمین شەڕی جیهانیدا بڵاویكردەوە، حوكمی ئەوەیدا، كە ئەم ئایدیۆلۆژیە لەسەرهەڵدانی یەكەم خونچەی ئابووریی كالایی‌و بازاڕەوە هاوشان لەگەڵ سەرهەڵدانی بیرۆكەی سوودخوازیدا شێوازی خۆی وەرگرتووەو، لەگەشەی خۆیدا نیشانیدا كە دەستەلات‌و چاودێری هێزە كۆمەڵایەتی‌و سیاسیەكان بەسەر "ژیانی ئابووری"یەوە لەئارادا

نەماوە، یاخود پێویستە لەئارادا نەمێنێ. لەڕاستیدا ڤیبەر دژی ئەم تێڕوانینە بوو. ئەو لە ئەخلاقی پرۆتستانتیو ڕۆحی سەرمایەداریداو هەروەها لە ئابووریو کۆمەڵگا (1917)دا جەختی کردەوە کە ناکرێ سەرمایەداری "هەر تەنیا لەسنوری ڕەهای ئابووریدا بناسرێو پێناسەبکرێ"، چونکە ئەم دیاردەیە "فۆرمەلەکردنێکی کۆمەڵایەتیو فەرهەنگیی تازە" شە. بەبڕوای ڤیبەر کاری گرنگو پڕ زەحمەت بریتیە لەتێگەیشتنی ئەم خاڵەی کە لەناو بیروڕا فیکرییەکانو دینەکاندا، کام گروپەیان هاوشانی "دنیاییبوون" و "عەقڵانیەتی تازە"و "ئەفسانە داماڵین" دێنو کام گروپەیان ئەم "نوێبوونەوەیە" ڕەتدەکەنەوە. بەدوور لەو مشتومڕانەی کەلەنێوان کۆمەڵناسانی هاوچەرخدا لەمەڕ دەستنیشانکردنی ڤیبەر بۆ پرۆتستانیەت بەگشتیو ئایینی کالڤن بەتایبەتی، لەئارادایە، [36] ئەو خاڵەی کە بەتایبەتی لەڕوانگەی ڕەووشناسی {میتۆدۆلۆجیەوە}یەوە گرنگە بنەمای باسەکەی ڤیبەرە: زەمینی بوونو عەقڵباوەڕی بنەمای مۆدێرنیتێن، بەڵام بەپێویست نابنە دژی بیروڕاو نەریتە کۆمەڵایەتیە کۆنەکان. ڤیبەر ئەوە دەهێنێتەوە یاد کە بەهەشتی ونبووی ملیتۆن کۆتایی بەوە دێت بانگەواز دەکات بۆ کردار لەجیهاندا، ڕۆحیەتێکی ڕاستەوخۆ پێچەوانەو دژ بەکۆمیدیای خودایی دانتێ. ڕۆحیەتێك کەپێشاندەری بزووتنەوەی چاککردنی دینیو سەرمایەدارییە.

لەڕوانگەی ڤیبەرەوە پرسیاری سەرەکی بریتی نیە لەوەی کەبڕوای ئایینی بەچ شێوەیەك دەبێتە ڕێپیشاندەری ڕۆحیەتی زەمینیو سوودخواز بەڵکو ئەوەیە کەچۆن بڕوای دینی دەگۆڕێت تا بەپێیی توانای خۆی شێواز بداتە ڕۆحیەتی زەمینیو دنیایی. خاڵی بنەڕەتی تێهەڵکێشکردنی کردەی پیرۆزە لەگەڵ کردەی دنیاییدا، ڕێگەیەك نەك ئیمانی پیارۆیشت، بەڵکو "فەرهەنگی ئایینی" تەیکرد تاکو "شوێنگەی کۆمەڵایەتی" کەپاڵپشتی بڕوابوون بەخوداو ئەو دنیای تر بوو؛ بگۆڕێت، و دنیایەك دروستبکا کەتیایدا لەنێوان عەقڵو ئیماندا دژایەتیەك پەیدانەبێت، ئێستا پێویستە بزانرێت کام دامەزراوە کۆمەڵایەتیانە، بەپێی کام ڕێسایانە (قاعدە) ئەو تێهەڵکێشکردنەیان قبوولکرد. واتە ڕەزامەندیان دا لەسەر هاوکاری نێوان کردەی پیرۆزو کردەی دنیایی، ئیمانو سامان. دیارە بیرکردنەوەی ڤیبەر لەسەر مانایەکی وردو هەمەلایەنی بۆ مۆدێرنیتی چەقی نەبەستبوو، بەڵکو کێشەی سەرەکی ئەو سەرمایەدارییەت بوو، واتە ئەو دەق گرتنە کۆمەڵایەتی، ئابووریو ئایدیۆلۆژیە تایبەتەی کەپرۆتستانیەت لەپەیوەندی خۆی لەگەڵیا، کەوتە داهێنانی ئەخلاقێکی یان ethosێکی نوێ ڕەنگە بشێت پێناسەی مۆدێرنیتی لەچوارچێوەی ئەم ئەخلاقەدا بکەین، ئەخلاقێ کەڕێڕەوە بنەڕەتیەکەی بڕوابوونە بەتاك. ئەوەشمان لەبیربێت کەئەو شێوازە سەرمایەدارییەی ڤیبەر ڕاڤەیکردووە تاقە شێوازێکی ئابووری مۆدێرنیتی نیە، بەڵکو "چەمکێکی" تایبەتە لەمۆدێرنیتی کەتا ڕادەیەك بەشێوەیەکی ڕێژەیی بەندە لەسەر پچڕانی عەقڵ لەباوەڕو لەگشت شێوازەکانی دەرکەوتنی کۆمەڵایەتیانەو فەرهەنگی باوەڕ. [37]

ڤیبەر دەریخست کە چەند لایەنو ڕەگەزێکی ئەفسانە داماڵین عەقڵباوەڕی لەشارستانیەتەکانی پێشوودا، هەر لەبیرۆکراتیەتی چینی دێرینەوە تا سەرهەڵدانی یاسا لای ڕۆم؛ ئامادەبووە. بەڵام تەنیا لەڕۆژگاری مۆدێرن دا بوو کە ئەم عەقڵباوەڕییە شێوازی تەواوی خۆی وەرگرت. ئەو بەڵگەیەی کە ڤیبەر بۆ سەلماندنی ڕەهای عەقڵ لەڕۆژگاری مۆدێرن دا، هێناویەتیەوە، ئەوەیە کە لەگشت بارودۆخە مێژووییەکانی

پێشوودا بۆ ماوە تەقلیدیەکان لەگەڵ ژیانی ئابووریدا تەبابوون، جگە لەسەرەتای بزوتنەوەی چاککردنی ئایینی لەئەورووپادا لێرەوەیە ئەخلاقی پرۆتستانتی وەك گۆڕانێکی تەواوی نەریتە ئاینیەکان لەگەڵ مەبەستەکانی بەرهەمهێنانی سەرمایەداریدا جووت بوو. واتە "ئەخلاقی عەقڵگەرای کالڤن" بووە کلیلی مۆدێرنیتی لەژیانی ئابووریو کۆمەڵایەتیدا، و ڕێکخستنی عەقڵانیانەی بەرهەمهێنان و کۆمەڵگا، عەقڵانیکردنی کارکردنی دەوڵەت، قبوڵکردنی دەستەڵات لەچوارچێوەی یاسای ئابووریدا (کە هەڵبەت ئەمە لەخۆیدا شوێنگەی بۆرۆکراسی پتەو دەکات) {هەموو ئەمانە} بەفەرهەنگی پرۆتستانتی پشت ئەستوور بوون. یاسای بنەڕەتی بۆروکراسی، واتە بەرزترین ئاستی کارایی، گشت کۆمەڵگای دەگرتەوە؛ هەر لەدەوڵەتو کەنیسەو هێزی سووپاوە تاخێزانو سیستەمی فێربوون.

بەڵام دەوڵەتی عەقڵ هەمان ئەو ئازادییە نەبوو کەوادەیان دەدا. بەئاسانی دەکرێ تێبگەین کەئومێدو ئارەزووی ڕۆشنگەرەکان جگە لەخەونو خەیاڵ هیچیتر نەبوو. ئەوان ڕزگاری مرۆڤیان لەچاوی گەشەی عەقڵی زانستیو دەستکەوتەکانی تەکنەلۆژیاو بەرفراوانبوونی عەقڵباوەڕیدا دەبینی. بەڵام هەموو ئەمە نەك نەبووە هۆی ڕزگاربوونی مرۆڤ بەڵکو بووە هۆی سەرهەڵدانی ئەوەی ڤیبەر پێی دەگوت (تەشەنەکردنی بیروڕایەك کە عەقڵی بەئامێر تەماشادەکرد {عەقڵ ئامێری}، کە ئەمەش کۆنترۆڵێکی زیاترە لەسەر شێوازەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیو فەرهەنگیدا. گەشەی عەقڵباوەڕی ئامێزی نەك تەنیا هۆکاری ئازادی گشتی نەبوو، بەڵکو بەگوتە بەناوبانگەکەی ڤیبەر "قەفەسێکی ئاسنینی"ی دروستکرد، کەعەقڵباوەڕی بیرۆکراتیك دایهێنابوو تاڕێگای ڕزگاربوون لەناویا نەمێنێت [38]. "قەفەسی ئاسنین" کە لەکۆتایی ئەخلاقی پرۆتستانتیو ڕۆحی سەرمایەداریدا هاتووە، سەمبوولێکە پیشانی دەدات کە مۆدێرنیتی بەهۆی عەقڵانیەتی ئامێرەکان دەناسرێتەوە نەك بەهۆی لایەنی عەقڵانیەتی بەهاکانەوە، کە ڕووبەڕووی ئەخلاق، پەیمانو دەروەستیمان دەکاتەوە. ڕەخنەگرەکانی ڤیبەر ئەو لایەنە گرنگەی قسەکانی ئەویان لەبیرکردووە کەدەیگوت مرۆڤ زیندانیی ئەو بارودۆخانەیە کەدروستکەری بەها ئەخلاقیەکانی ژیانە کۆمەڵایەتیەکەیین. ئەم "عەقڵانیەتەی ژیانی ڕۆژانە"یە لەگەڵ تواناکانی تاك دا ناگونجێت. هەر لەبەرئەمەیشە کەهەموو شتێکی مەعنەوی دەبێتە شتێکی فەردیو ئاوێتە نابێت بەلایەنە کۆمەڵایەتیەکان. ماکس هۆرکهایمەر لەبەر هەمان هۆ بوو کەدەینووسی: "مرۆڤی هاوچەرخ تووشی نۆستالیژیای بابەتی بوون بووە" بابەتیبوونی کۆمەڵایەتی، یاخود بەدەستهێنانی عەقڵێکی بەرز تر لەچوارچێوەکانی ژیانو بیرکردنەوەی تاك، واتە لەسنوری پانتایی ژیانی کۆمەڵایەتیو گشتیدا. [39]

ماکس ڤیبەر بۆ ناسینی دوو ڕوویی مۆدێرنیتی کەوتە ڕاڤەکردنی دنیای مۆدێرن و هەر خەیاڵپلاو و ئەفسانە سازییەکی لەبارەی "ڕزگاریو خۆشبەختی"یەوە تووڕهەڵدا. ڕاستە ئەو ئاسۆی دەوڵەتی ڕەفاهو کۆمەڵگای بەرخۆری نەدیتبوو، و ڕەهەندی قووڵی، خۆشبەختی جەماوەری لەخەیاڵێك زیاتر بەهیچ نەدەزانی، ڕاستە ئەو بڕوای نەبوو بەکەمبوونەوەی ناڕەزاییو دژایەتیە چینایەتیەکان بەڵام کاری وی بۆ تێگەیشتن لە جۆرەکانی مۆدێرنیتی کارێکی پرشنگدار بوو. ئەو بەش بەحاڵی خۆی ڕێگەی خۆشکرد لەبەردەم ڕەخنەی ئایدیۆلۆژیداو دەکرێت کاریگەری بیروڕا بەهێزو پڕ بەڵگەکانی لەسەر نووسەرانی قوتابخانەی فرانکفۆرت بەدی بکەین. تیۆدۆر ئادۆرنۆ و ماکس هۆرکهایمەر

لەکتێبی دیالەکتیکی ڕۆشنگەری (1944)دا، زۆر زیاتر لەوە قەرزاریی ڤیبەرن کەتا ئێستا زانراوە، بیری ڤیبەر یەکێکە لەپێکهێنەرەکانی بیری رەخنەیی هابرماس و دەشێت ئەم خاڵەش لەکتێبی تیۆرەی کردەی پەیوەندی (1981)دا بدۆزینەوە. لەبەشی چوارەمدا دەبینین کەرەخنەی مارکیۆز لەبیروڕا سەرەکیەکانی ڤیبەر لەمەڕ مۆدێرنیتیەوە چین، بەڵام نابێ ئەوەمان لەبیر بچێ کەبیری رەخنەیی قەرزاری ڤیبەرە.

## مۆدێرنیتی و نیهیلیزم

مارکس لەگەڵ مۆدێرنیتیدا بوو بەڵام باسی کێشەکانی دەکردو داوای گەشەپێدانی پتری دەکرد، کەلەڕاستیا کردنەوەی دەرگایەکی تازەبوو بەدەستی کرێکاران. ڤیبەر مۆدێرنیتی لاپەسەندبوو، تارادەیەکیش چاوی لەکەموکوڕیەکانی (ئەنجامەکانی دەستەڵاتی عەقڵباوەڕی) دەنووقاند، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ڕێگای بۆ رەخنەلێگرتنی خۆش کردبوو. ئەمانە لەدوا ئەنجامدا لەبەرگریکەرەکانی مۆدێرنیتیبوون. بەڵام لەکۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەیەمدا فەیلەسوفێك بەرهەمەکانی خۆی بڵاودەکردەوە کەبەشێوەیەکی بنەبڕ دژی مۆدێرنیتیبوو، یەکێك لەئەرکەکانی خۆی بە"رەخنەی تەواو و بێبەزەییانە لەمۆدێرنیتی" دەزانی. فریدریش نیچە بەشێوازێکی تایبەت کتێبی لەودیوی چاکەو خراپە (1886)ی خۆی بە رەخنەگرتن لەمۆدێرنیتیو "نەء وتنی رەها" لەقەڵەمدا [40] و دەکرێت لەسەرجەمی بەرهەمەکانیشیدا، بەبێ هیچ ئاوارتنێك {استثناء} رەخنەی توند لەسەر لایەنە جۆربەجۆرەکانی ژیانی مۆدێرن و بیری عەقڵباوەڕی بدۆزینەوە.

لەکتێبی سەرلەئێوارەی بتەکان (1888)دا پارچەیەك هەیە بەناوی "چۆن جیهانی راستەقینە سەرئەنجام بوو بەئەفسانە؟ سەرگوزشتەی هەڵەیەك" [41] لەم پارچەیەدا نیچە روونیکردۆتەوە کەسەرەتا ئەفلاتوون بوو جیهانی هەستپێکراوی لەدەستدا بۆئەوەی بەپیر دنیای ئایدیاکانەوە بڕوات. ئەو لەفەلسەفەدا سنوری ئاسمانی دروستکردو ئەمەش یەکەمین رەنگدانەوەی حەقیقەت خوازی بوو لەبیرکردنەوەی خۆرئاوادا، واتە حەزی راڤەکردنی دنیا لەپەیکەری دەربڕینی ئینسانیدا، کە بەناچاری دەگەیشتە ئەوەی بڵێ: "من، حەقیقەتم!" لەهەنگاوی دواتردا دنیای ئایدیاکان گۆڕا بەخواوەند، واتە گۆڕا بە بارێکی ئەوتۆی پەی پێنەبراو، لێرەیشەوە جیهانی و مەسیحیەت سەریهەڵدا. خواوەند وەك ئەو راستیە ناسێنرا کەبڕوانەبوون و یان بڕوابوون بەهەبوونی لەسەر زەوی یەکسان بوو بەگوناه. لەپاشانیشدا ئایدیا بووە شتێکی "باکوری، کوینگسبرگ". کانت (کە لەکوینگسبرگ هاتبووە دنیاوە) دەریخست کەئێمە ناتوانین دنیا لەخۆیدا، وەك ئەوەی هەیە بەشێوەیەکی کامڵ بناسین، عەقڵی مرۆڤ و زانایییەکەی، تەنیا پەی دەبات بەدنیای دیاردەکان، ئەویش بەو شێوەیەی کە ئەو دنیایە بەپێی یاساکانی خۆی دەگەڕێ. کەواتە هەر شتێ لەسەروی عەقڵەوەیە، بەبێ هیچ پێویستییەك بەسەلماندنی عەقڵانی، تەقدیس دەکرێ. بەم شێوەیەش جیهانی راستەقینە بەنەناسراوی دەمێنێتەوە، سەرەتا وەك دنیایەکی خوایی گریمانەکراو پاشانیش تووڕهەڵدرا. بەکوشتنی خواوەند، مرۆڤ، واتە بکوژی خواش کوژرا. بەتووڕدانی ئەوەی پێیدەگوترێ "جیهانی راستەقینە"، دنیاش بەوشێوەیەی کە دێتە پێش چاومان لەدەست دەرئەچێ، لەبەرامبەر ئەمەشدا دنیای بەهاکان (جیهانی مۆدێرنیتی) دەستەڵات ئەگرێتە دەست.

کاتێ دنیای راستەقینە خرایەلاوە، دنیای بەهاکان (کەهەندێ جاریش دنیای زانستیان

پێکوتووه) بەدەستەڵاتەوە گرێدرا. نەك بەو مانا سادەیەی کە بڵێین زانین دەستەڵات بەرهەم دێنێ، یاخود دەستەڵات زانست بەکرێ دەگرێ، بەڵکو بەمانایەکی ئاڵۆزتر: ویستنی دەستەڵات، بوویە ویستی شێواز بەخشین بەشتێ: "لەئێمەدا دەستەڵاتێك هەیە بۆ سیستەماتیزەکردن، سادەکردنەوە، ناڕاست پیشاندان، دروستکردنو جیاکردنەوە" [42]. ئەوجا "زانین وەك هۆکاری دەستەڵات دەکەوێتەگەڕ" [43]. ویستنی زانست، رێکخستنی دنیایەك بەشێوەیەکی تایبەت. ئەمەش بەنیازی "بەئینسانیکردنی دنیا، واتە کردنی ئێمە بەسەروەری جیهان" [44].

مۆدێرنیتیش دەیەوێ مرۆڤ، سەروەری دنیابێت، گۆڕێنەری دنیا، بونەوەرێك کەدەبێ لەگەڵ توانا بەشەریەکاندا بۆ چەمك سازی، رێکخستنو سیستەماتیزەکردن دا بگونجێت. زانین (زانستی مۆدێرن) ئیشی نیە بەسەر دنیای راستەقینەوە، ئەو دنیایەك دەڕازێنێتەوە کەتیایدا ئەزموونی ئێمە بێتەدی، دنیایەکی قابیلی لێپرسینەوە، سادەگەرا،و ئاسان دەرك کراو [45].

ئەم ئاڕاستەیەی سادەکردنەوەیە بوو لەمۆدێرنیتیدا کەوایدەکرد نیچە بەسوکایەتیەوە بڕوانێتە رۆژگاری نوێ. هەر بەپێی هەمان خەسڵەتیش بوو کەهەندێ بەشی نەریت لەشتە تازەکاندا، وێڕای ئەو هەموو بانگەشانەش، دەمانەوە. هەستی سوکایەتیکردن بەمۆدێرنیزمو "ئایدیا مۆدێرنەکان" لای نیچە، لەراستیا بێزاربوونێتی لەشتە مام ناوەندەکان، ئەو شتانەی پێیدەگوتن "بەدامەزراوبوونی گەمژەیی لەشێوەی دیموکراسیەت دا". هەستکردنێ کەدەبێتە هۆی دروستبوونی ئەخلاقی کۆیلەکانو نیچە بەمە دەڵێ Ressentiment [46]، و لەدروشمی "یەکسانی براکان"دا دەردەکەوێ، دروشمی یەکسانی لەگەمژەییو رق دا. ئەمەیە رەگی نەفرەتی نیچە لەدیموکراسیەت: "ئەخلاق لەئەوروپای ئەمڕۆدا، ئەخلاقی ئاژەڵی گەلە" [47] و دیموکراسیش چونکە مرۆڤی وەك ئاژەڵێکی سەریەگەل دەوێ "نەك تەنیا شێوەیەکی گەمژانەیە لەرێکخراوی سیاسی، بەڵکو شێوەیەك لەتوانەوەی مرۆڤ" [48] بۆیە:

"ئەمڕۆکە، واتە لەرۆژگارێکدا کەلەئەوروپا تەنیا ئاژەڵی سەر بەگەلە رێزی لێدەگیرێو ئەویش رێزلێنانەکان دابەش دەکات، لەرۆژگارێکدا کە"یەکسانی حەق" بەئاسانی دەبێتە یەکسانی لەناحەقدا - واتە دەبێتە شەڕێکی گشتگرەوە لەگەڵ هەموو شتێکی نایابو بێگانەو نمونەیی، بەشەڕێك لەگەڵ مرۆڤی بەرزتر، دەروونی بەرزتر، ئەرکی بەرزتر، دەروەستی بەرزترو داهێنانی دەستەڵاتمەندو دەست رەنگینانە - ئەوە لەم رۆژگارەدا، بەرزیو بۆ خۆژیانو توانای جیاوازبوون لەوانیترو بەتەنیا وەستانو دەروەستبوون لەئاست ژیانی تایبەتدا، بەشێکن لەچەمکی "گەورەیی" [49]

لەکتێبی زانینی کامەران (1882)دا نیچە نووسیویە هەرچەندە ئاگایی زۆرتربێت گریمانی هەڵەکردنیش زۆر دەبێ، مۆدێرنیتی ویستن سەرکەوتنی ئاگاییە، واتە سەرکەوتنی ئەو وزەیەی لەنامۆبوونەوە هاتووە، رێگای سەرکوتکردنی ئەمەش گەڕانەوەیە بۆ ژیانو بۆ ئیرادەو دەستەڵاتو هێزی ئەفسانەیی. بۆئەوەی لە لەدایکبوونی مەرگەسات دا ناوی نرابوو سەرخۆشو کامەرانی دیۆنیزۆسیانە: غەریزە، دەستەڵات، سۆز {شور}. نەفرەتی نیچە لە ئۆپێرای پارسیڤاڵ (1877–1882)ی ڤاگنەر، وەڕسبوونیتی لەئەخلاقی کۆیلەکان، ئارامیی عارفانەی مەسیحی، دڵخۆشبوون بەژیانی ناو گەلە، و ستایشکردنو حەزی خۆبەقوربانیدانو فەنابوون. ئەم هەستکردنە مەسیحیو دینییە لەبەرامبەر یاساخترین غەریزەو عەشقی هەرچوار ئۆپێرای ئەڵقەی نیبلونگەکان (1861–1867)

دابنێـن، و دڵخـۆش پاڵەوانـە گەنجەکـەی نـاو زیگفرید بهێننەوە یادتان کاتێ شمشێرەکەی بەدەستەوە دەگرێت،و دەستەڵاتە مەلحەمیەکەی بهێننە پێشچاوتان کاتێ ئەژدیها کە دەکوژێ و بـەئاوازی سیحراوی دارسـتانەکە بەخەبـەردێت. بێگومـان لەخۆشەویستی پڕ سۆزی نیچەدا بـۆ مۆسیقای هەڵقەی نیبلونگەکان دەتوانین شتێك لەدژایەتی ڕۆمانتیکەکانی ئـەڵمانیا بـۆ عـەقڵی ڕۆشنگەری بەدی بکەین بۆ سەرچاوە دوژمنایەتی نیچە لەئاست مۆدێرنیتیدا پێویستە لەبەرهـەمی ڕۆمانتیکەکاندا بگەڕێین، و لەخۆشەویستی ئەواندا بەرامبەر بەماڵو خاك. شێوەی پارچە نووسینیش - کەبەبێ هیچ زیادەڕۆییـەك - نیچـە گەیاندیـە ئەوپـەڕی، ڕەگو ریشـەی لەپارچـە نووسـراوی ڕۆمانتیکەکاندایە. لێرەدا تـەنیا هـەر مەسـەلەی شێوازی دەربڕین مەبەسـت نیـە - کـەبێگومان گرنگی‌یەکی تایبەتی خۆی هەیە بەڵکو لەم شـێوە نووسینەدا جۆرێ لەدوژمنایەتی شـاراوە هەیـە لەبەرامبـەر سیستەمو سیستەم سـازیدا، نیچـە کـەمتر بەشـێوازێکی سیسـتەماوی نووسـیو بەردەوام وتـی: (ویسـتی سیسـتەم لەنـەبوونی توانای توانەوەوە سەرچاوە دەگرێ"[60].

لـە لـەدایکبوونی تراژیـدی (1871)دا ڕۆحـی دیۆنیزۆسی، ئـەو ئەفسانەیەی کەلـەچوارچێوەی هونـەری زینـدوو ئـازادا ڕەنـگ هـەڵدێنێ، یـاخود بەگوتەی نیچە، سەما دەکات، لەگـەڵ ڕۆحیـەتی نیهیلیسـتی ڕۆژگـاری نـوێدا بەشـەڕهاتووە. لـەم جەنگەشدا ئەوەی تاقیدەکرێتـەوە هونـەری کـۆن نیـە، بـەڵکو "هونـەری ئـەمڕۆ"یـە (و مەبەسـتی سـەرەکی نیچـەش ئۆپێراکـانی ڤاگنـەرن) کـە دەکەونە ژێر تاقیکردنەوەوە. لەم شەڕەدا مـەزنی لەوەدایـە دروشمـی جوانـی بۆ مـەیدانی جـەنگ هـاتووە، نیچـە ئـەم خاڵـەی دوایی لەشیللەرەوە فـێربوو. شیللەر بـوو کـە بـەهۆی "فـێرکردنی جوانی"یەوە دەیویست بناغەی ئـەخلاقێکی نـوێ دابڕێژێ کەتوانای هەبێ بەسەر سنوورەکانی تـاك دا زاڵ بێت. هاوشـانیش لەگـەڵ شـیللەردا بـوو کەشلینگ لەکتێبی سیستەمی ئایدیالیزمی بـەرزدا (1800) هێندە چووە پێش تابڵێ هونەر ئامـانجی فەلسەفەی تازەیە کە بەهۆیەوە دەتوانرێ بەسەر "تـاك ڕەهـەندی ڕۆحـی فـەردیدا" سـەرکەوتن بەدەست بهێنرێ.

ئـەمان "ڕۆحیـەتی سـەردەم" یـان دەربـڕی ڕۆحیـەتێك کەئـەتوانرێ لەجەختکردنـەوەی فردریش شـلیگل دا لەسـەر سـەربەخۆیی هونـەر بدۆزرێتـەوەو دەنگێکی تـری دوژمنایـەتیکردنی ڕۆشنگەری تیا ببیسرێ:

"یـەکێتی ڕاسـتی، جوانـیو چاکـە" لـەدوا ئەنجامدا بەدگومانیو دوژمنکاریەکانی دنیای نوێ تێك دەشکێنن. لـەدژی ئـەم دنیایـە دەشـێتو دەبێـت بگەڕێینـەوە بـۆ ڕەسـەنێتی ڕابـردوو. "ڕەسەنێتی ڕابردوو" ئەمە ئەو شتە بوو کەنیچە هـەرگیز پەسـەندی نـەکرد. چونکـە دوژمنایـەتیکردنی ئـەو لەئاسـت مۆدێرنیتیـدا، دەبووە هـۆی دوژمنایەتیکردنیشـی لەبەرامبـەر نـەریتدا.، ئـەو هـەرگیز لەبـەر خـاتری دنیایـەکی لەدەسـت دەرچـوو یـاخود مەعنەویـەتو ڕەسەنایەتیەکی ونبوو، نەکەوتـە ململانێ لەگـەڵ مۆدێرنیتیدا.

ئیرادەی هێز، ڕوانینە دوا ڕۆژە، بەرزە مـرۆڤ جێگـەی لەداهاتوودایـە ئـیرادەی هـێز، هێزێکـە داهێنـەرە (و بـەم مانایـەش هونـەری) کـە لەدەربڕیندا بەپێشڕەوی هونەرێ دەدرێتە قەڵەم. ڕووبەڕووبونەوەی داهێنان (شیعر) لەگەڵ زانسـت دا، دەبێتـە هـۆی سـەرهەڵدانی زانینێکـی نـوێو بیرپارانێکی تازە، واتـە فەیلسووفەکانی دوا ڕۆژ. کەسانێ کەدەبنە "داهێنەری بەهای بەرزتر". ئەو بەهایانەی هێشتا نەناسراون. نیچـە لەقسـەکردنیا لـەبارەی ئـەم "فـەرماندەو یاسـادانەرانەی داهاتووەوە" دەگاتە بڕیارێکی گرنگ:

"هەرچەند تێپەردەبێ، زیاتر بۆمان ڕووندەبێتەوە کە فەیلەسوف لەپلەی مرۆڤێکدا کەبەناچاری لەخەمی سبەی‌و دوو سبەیدایە، هەردەم خۆی لەگەڵ ئەمرۆی خۆیدا لەجەنگدا بینیوەتەوە، و دەبێ خۆی ببینێتەوە: دوژمنی ئەو هەمیشە دروشم‌و ئامانجەکانی ئەمرۆ بوون" (51)

بۆدلێر دەیگوت هەموو شتێکی مۆدێرن نەك لەگەڵ نەریتی (دوێنێ)دا بەڵکو لەگەڵ باروودۆخی (ئەمرۆ)دا دەجەنگێ. نیچە لەگەڵ مۆدێرنیتیدا بەمانای "ئەمرۆیی بوون" دەجەنگا ئامانجی ئەمرۆی بەلاوازو بێ‌بونیاد دەهاتە پێشچاو. نیچە پێی دادەگرت - رەنگە لەسەر هیچ بیرێکیش هێندە قارەمانانە پێی دانەگرتبێ کەنەریتەکان لەمۆدێرنیتیدا زیندوون، ئەگەرچی مۆدێرنیتی بانگەشەی لەناوبردنی نەریتەکانی بەرزکردۆتەوە. نەریتەکان مەسخی مۆدێرنیتی دەکەن‌و بەتاڵبوونی بانگەشەکانی دەسەلمێنێ. ئەخلاقی مۆدێرن هەمان ئەخلاقی مەسیحی، و ویستەکانی مرۆڤی مۆدێرن هەمان نیازە پووچەکانی مەسیحیەتن. ئاسۆی داهاتوو لەبەردەم مرۆڤی ئەمرۆدا هەرئەوەیە کە یەکەمین "کۆیلەکانی مەسیحی" وێنە یان کێشا.

لێرەوەیە کەنیچە ئەڵێ ئێمە لەسەر دەریاچەیەکی بەستوو وەستاوین، و جەخت دەکاتەوە (هووشیارمان دەکاتەوە) کە سەهۆڵەکە زۆر تەنکە‌و بەزوویی دەشکێ: "ئێمە کەسانێکی بێ پەناو بێ ماڵین.. ئێمەی منداڵانی داهاتوو چۆن دەتوانین لەسەردەمی خۆماندا لانەبکەین {یان نیشتەجێبین}؟ .. ئەو سەهۆڵەی هێشتا خەڵکانێکی پاراستووە زۆر تەنك بۆتەوە، ئەو بایەی سەهۆڵەکان دەتوێنێتەوە، گڤەی دێ، ئێمەش کەبێ‌ماڵین، بوینەتە هێزێ کە سەهۆڵەکان‌و هەر واقیعەتێکی "ناسك تێکدەشکێنێ" (52). فەیلەسووف سەهۆڵبەندانەکان دەشکێنێ تا پیشانیدات کەچەندە مەترسی نزیکە. لەشوێنێکی‌تردا نیچە نیهیلیزمی چواندبوو بە "فوهن"، ووشکەبایەکی گەرم کەلەپڕ لەکوێستانی ئالپەوە هەڵدەکات‌و خەڵکی شێت ئەکا.

شێتی. رزگاربوون لەعەقڵی مۆدێرن. لەزانینی کامەران دا شێتێك لەبازاڕ هاوار دەکات کە بەدوای خوادا ئەگەڕێ، و بەرزتر هاوار دەکات کەخودا مردووە، ئێمە ئەومان کوشتووە کاتێ زەردەشتیش لەبەرزایی چیاکانەوە دێتە خوار دڵنیایە کەخودا مردووە، و درێژترین مرۆڤیش لەدوابەشی زەردەشت ئاوای گوت (1885)دا دەڵێت: "ئەو خودایەی هەموو شتێکی دەدی، لەوانەش مرۆڤ، خوایەکی وا دەبا مردبا، مرۆڤ بەرگەی ئەوەی نەدەگرت کەشایەتێکی وا بەزیندوویی بمێنێتەوە." (53) دیسان لەزانینی کامەران دا هاتووە: "خودا مردووە، بەڵام وەك چۆن عادەتی مرۆڤەکانە ئەکەوێتە دروستکردنی کۆمەڵە ئەشکەوتێ تا هەزاران هەزار ساڵ سێبەرەکەی پیشاندەن" (54). ئەشکەوت‌و سێبەر. تەشبیهە ئاشناو دێرینەکەی فەلسەفە ئێستا بەشێوەیەکی دیکە بەکاردەبرێت. فەلسەفەی مۆدێرن بریتیە لەو ئەشکەوتانەو تەنانەت بێ‌دینترین ئاراستەکانیشی لەدەستی ئەو سێبەرە رزگاریان نابێت. دەتوانین ئەو سێبەرە لەئارەزووی هەر ئاراستەیەك دا بۆ دۆزینەوەی پەناگایەك لەم جیهانەدا، بدۆزینەوە.

مۆدێرنیتی سەروەری مرۆڤ‌و بەباشترزانینی عەقڵی مرۆڤ وەك پێشمەرجێ لەبەردەمی خۆیدا دائەنێ. هەرکەس لەسەر بنەمای ئەم پێشمەرجەوە کاردەکات، بەڵام هاوشان لەگەڵ هێزی ناعەقڵانی، نەخۆش، بێ دەروەست‌و دوژمنکاردا. نیهیلزم ئالێرەدایە. لەنەبینینی ئەو هێزانەدان ئەو هێزانەی لەسەر بنەمای رێگە پێدرانی هەر کارێکەوە هەن. نیهیلیزم کۆتایی

رێگـای مۆدێرنیتـی نیـە، بـەڵکو هاوسـەفەری هەمیشەییەتی. مۆدێرنیتی بڕواهێنانە بەشتێکی بیرلێنەکراوە، نرخ دانانە بۆ ئەو شتانەی بەڕاستی نرخیـان بۆ دانەنراوە. مۆدێرنیتـی کـەخۆی وەك هۆیـەك بـۆ هـەڵبژاردنی شـێوازێکی ژیـان دەخاتەڕوو، پێویستی بەهۆمەیە نیچە رونیکردۆتەوە ئێمە بـیروڕا، نەرێتـەکان، یاسـا پراگماتیکییـەکانو بنـەما ئەخلاقیـەکان قبوڵدەکەین، بەرلـەوەی لـەهۆکانیان بکۆڵینـەوە یـاخود بیانزانین هـەموو شتێ دەبێتە عـادەتی لاوەکی ئێمە بەبێ ئەوەی لامان رۆشن بێت. بەڵام ئەی شوێنی خودئاگایی لەکوێ دایە؟

خودئاگـایی، خۆناسین، بیرکردنـەوە لـەخود. ئەمانـە بانگەشـە سـەرەکیەکانی مۆدێرنیتـین، دەتوانـین فینۆمینۆلۆژیـای هیگـڵ بـە "زانسـتی ئـەزموونکردنی ئاگـایی" ناوبـەرین: هـەوڵدانێك لـەپێناوی خـود ئاگـاییدا. بـەڵام نیچـە ئـەم بانگەشەیەی بیریاری مۆدێرنیتی پەسـەند ناکـات، جینالۆجیای ئەخلاق ئەوە پیشاندەدات کـە بـەها ئەخلاقیـەکان لەگـەڵ "بیرۆکـەی ناسـنامەی سۆبژێکت" دا بوونە یەك. {جینالۆجیای ئـەخلاق} هەوڵدانێکە بۆ دۆزینەوەی "نەفسێکی نوێ" بەڵام نەك لەبەندیخانـەی بیرکردنـەوە لـەخود ئاگـاییدا. "ئێمە بـۆ خۆمـان نەناسـراوین، ئێمـەی خـەڵکانی زانـا، بـەهۆی بەڵگـەی دروسـتەوە، خۆمـان ناناسـین" [55]. بـەچی خۆمـان دەناسـین؟ زمـان. واتـە بـەهۆی کۆمـەڵێ نیشـانەو مـەجازەوە کـە هەرگیز لەگەڵ واقیعیەتدا وێك نایەنەوە. لەسەر چ بنەمایەکـەوە دەتوانـین نـاس بکـەین؟ لەسـەر بنـەمای ئـەو بـەهاو نرخانـەوە کەپەیوەندیـەکیان لەگـەڵ دنیـادا نیـە. [56] شتگەلـێ دەدەینـە پـاڵ جیهان {تثبت دادن}، بەڵام ئەی دەتوانین خۆمـان چ شتێ بدەینە پاڵ، خۆمان؟ لەڕاسـتیا، دروست لەوکاتەدا کەدەمانەوێ خۆمان بناسین (واتـە ئـەو حوکمـەی سوکرات بەکارخـەین کـە دەڵـێ خـۆت بناسە" [57]) تێدەگەین کە ناتوانین هیـچ بناسـین، هیگڵ رۆح ی داهێنـا تـا "خـود" {زات} بـاڵاتر لـەخودێتی خـۆی دابنـێ. بـەڵام ئـەم داهێنانـەی ئاژاوەیـەکی نایـەوە، و هـەموو شـتێکی بەسـەر یەکدا رووخان. نیچە دەڵێ: (بـەناچاری لـەخۆمان نـامۆین. لـەخۆمان تێناگـەین. ناچارین لـەبارەی خۆمانـەوە بەهەڵـەدا چـین. [58] هـەوڵدان بـۆ دۆزینەوەی ئاگـایی لـەخود (و نـەفس) بـەناچاری خودێکـی دەروونـی دروستدەکات (نـەك کەشـفی دەکـا). سـۆبژەی مۆدێـرن دروسـت دەکـرێ. سـۆبژەش، بەوتـەی یـەکێك لەمـەزنترین قوتابیـەکانی نیچـە، واتـە میشـێل فۆکـۆ، دادەهێنرێ، و لەهەوڵدانیشدا بـۆ دروسـتکردنی سۆبژە، تێگەیشتنێکی ناڕاست لەسەر کۆمـەڵگای مۆدێرن دروست ئەبێ.

فەلسەفەی رۆژگـاری نیچـە لەسـەر بنـەمای بانگەشـەی لـەخودفکرینو خـود ئاگاییـیەوە وەستابوو. ئەمەش بـەردەوامیدان بـوو بەنـەریتێ کە هیگڵ لەفەلسـەفەی ئـەڵمانیدا دایمـەزراندبوو. فەلسـەفەی زانسـتیش کەنیچـە بەتوانجـەوە پێیدەگـوت "فەلسـەفەی هەڵسـوڕێنەرانی فەلسـەفە" [59] بـەهۆی بانگەشـەی ناسـینی بابەتیانـەوە، کەڵکەڵـەی تێگەیشـتنی لـەخودی سۆبژێکتیشی چووبوە سەر. بەڵام بەلای نیچەوە فەلسـەفە سنورێك نیـە بـۆ یـەقینی "زانسـتی"، پانتاییەك کە تیایدا زنجیرە "راستیەکی زانستی" هاوشان بن بەکۆمەڵێ نـرخو بـەها. نیچە قبووڵـی ئـەوەی نـەدەکرد کەبشێت زانینـە فەلسـەفیەکان وەك "بنەمای رەهاو راستەقینەی شتێ" بزانرێن. ئەمە رەتکردنەوەی "خود ئەندێشی فەلسەفەیە" بەڵام بەمانایەکی تازە، جـەخت کردنـەوەی نیچـە لەسەر جیاوازی خۆی لەفەیلەسووفەکانو گرنگـی بنیادنـانی "فەلسـەفەی سـبەی" لـەخاڵێکی جیابوونەوەدا دەردەکەوێ: جیاوازی نێـوان خـود ئەندێشی فەلسەفی کەنیچە دەیخاتـەڕوو، لەگـەڵ

ئەو خودئاگایییە فەلسەفیەدا کەدەکرێ نمونە هەرە کامڵەکەی لەسیستەمی فەلسەفی هیگڵ دا بدۆزینەوە. "خودئەندێشی" یان "بیرکردنەوە لەبونیاد" چەکێکی رەخنەکارانەیە کە بەهۆیەوە دەشێت هەرێمەکانی مەعریفە بدرێنە بەر رەخنە. ئەمەش کارکردێکی تازە نیەو لەسەردەمی کانتو هیگڵەوە بەوردی راڤەکراو و ناسێنرابوو. کاتێ هیگڵ چ لەفێنۆمینۆلۆژیای رۆحو چ لەبەرهەمەکانی تریدا رەخنەی لەکانت، شلینگو یاکۆبی دەگرت، ئاگاداری ئەم کارکردە رەخنەکاریەی "خود ئەندێشی فەلسەفی"یە بوو بەڵام ئەوەی نیچە هێنابویە پێشێ تازەیە، و رەخنەگرتن نەبوو لەبیروڕای فەیلەسووفەکانی پێشتر، بەڵکو رەخنەبوو لەعەقڵی فەلسەفی یاخود چاکتر وایە بڵێم رەخنەبوو لەبانگەشەکانی فەلسەفە.

ئایا ئەو شێوانەی کەتیایاندا بیرکردنەوە مومکین دەبێ خۆیان دەتوانن ببنە بابەتی بیرکردنەوە؟ ئەگەر بابەتی بیرکردنەوە بن، ئایا ئەمجۆرە بیرکردنەوەیە بەچی بەئەنجام دەگات؟ هیگڵ پێشتر لەرەخنە گرتنیا بۆ ئەبستمۆلۆجیای کانت روونی کردبۆوە کە "هەندێ لەو شێوانەی کە کانت هەبوونیانی بۆ مەعریفە بەپێویست زانیبوو (بەڵام خۆیان نەدەناسران) لەدرێژەی باسی فەلسەفە رەخنەکاریەکەی کانت دا دەبوون بە"بابەتەکانی مەعریفە". عەقڵی فەلسەفی بەمانایەك هەوڵدانێ بوو بۆ چارەسەرکردنی ئەو ناکۆکییە لۆژیکییە بنەماییانەی کە خۆی بەهۆیانەوە "لەدایك بووبوو": لەو ناکۆکیانەوە کە خەیاڵی یۆنانیەکانی داگیرکردبوو، وەك کێ بەرکێی ئاشیلو کیسەڵ، یاخود پیاوەکەی خەڵکی کریت کەدەیگوت هەموو خەڵکی دوورگەی کریت درۆزنن،تاکو ئەو بانگەشەیەی پۆزەتیڤیزمی لۆژیکی کەدەڵێ ؟تەنیا ئەو ئەنجامانەی ئەزموون دەکرێن راستگۆن؟ -

حوکمێ کەخۆی لەڕوانگەی ئەزموونکاریەوە راست نیە. گرنگی ئیشەکانی نیچە لەوەدایە کەبانگەشەکانی فەلسەفەی بەپێچەوانەی فەیلەسووفەکانی ترەوە، نەك تەنیا وەك بابەتی زانستی تەماشا نەکردن، بەڵکو تەنانەت نرخێکیشی پێنەدان. خود ئەندێشەی فەلسەفی {تێفکرینی فەلسەفە لەخۆی} لەجیاتی هەوڵدان بۆ رزگارکردنی خۆی لەبەندی ناکۆکیەکان، دەستەڵاتی هەمان ئەو ناکۆکیانەی بەسەرخۆیدا سەپاند.

بیری زانستیانەی هاوچەرخیش بەقووڵبوونەوەی لە"بنەما پشتبەستووەکان بەدژایەتیەکانی لۆژیکی زانستی" لەرێگایەکی ترەوە، هاودەنگی نیچەیە. تەماشای بەرهەمەکانی تۆماس کوهنو پۆل فیرابند بکەن. دوو بیریار– لەرێگای کەم تا زۆر جیاوازەوە - بەڵگەی ئەوەیان خستۆتەڕوو کە زانست بەتەنیا لەرێگەی ئاراستەکانی سەلماندنی عەقڵانیەوە گەشەی نەکردوە. فیرابند هێندە دەڕواتە پێشەوە کە بڵێ، لەبنەڕەتدا شتێ نیە پێی بگوترێ سەلماندنی عەقڵانی تەواو. هەر فەرهەنگو سەردەمێ، دروستکەری نمونەو تایبەتیەکانی خۆیەتی لە"عەقڵانیەت" و "سەلماندن یان ئاراستەکردنی عەقڵانی". ئامانجی خود ئەندێشی فەلسەفیو زانستی ناشێت راکردن بێت لەناکۆکییە نەگونجاوەکان - بەڵکو لەبەر هەمان خاڵ کە لەهەر سەردەمێکدا دەکەوینە داوی ناکۆکییەکی تازەوە، ئامانجەکەش دەکاتە چەند هەوڵدانێکی سنووردار (و مێژوویی). نیچە، بەڵام وێنایەکی لەسەر دوا ئامانج لەسەردابوو، ئامانجێ کە یەکسەر فەلسەفە جێدەهێڵێ، و ئیرادەی هێز بەیانکەرێتی: بەرزە مرۆڤ. مرۆڤێ کە بەوتەی هایدگەر، لەپردی کات دەپەڕێتەوەو بەرەو ئەوپەڕ دەڕوات.

بەڵام ئەو ڕێگایەی فەرهەنگی ئەورووپی پیایدا دەڕوا، بەڕای نیچە رووی لەشوێنێکی ترە، هەندێ نووسەر باسی ئەم خاڵە وەها دەکەن کەقسەی نیچە لەمەڕ نیهیلیزمی ئەورووپییەوە رەگو ریشەی لەبونیادی ئاپۆکالیپتیکی بیرکردنەوەی رۆمانتیکەکانی ئەڵمانیادایە لەمەڕ داهاتووەوە. تەنانەت ئەو نووسەرانە دوا ئاگرگرتنی دنیای خودایی و ئینسانی یان لەئێوارەی بتەکانی ڤاگنەردا بەنمونەیەکی ئەو دیدە ئاپۆکالیپتیکییە زانیوە. بەڵام ئەگەرچی نیهیلیزم بەتەواوی لەم بنەما فیکرییەش جیا نیە، لە ڕێگایەکی ترەوە ناسکراوە. ڕێگایەك کە لەگەڵ مانا رووسیەکەی نیهیلیزمیشدا جیاوازی گرنگی هەیە. لەبەشی پێنجەمی باوکان و کوڕەکان ی تورگنێف دا، باسی بازارۆڤی قارەمان دەکرێ، گفتوگۆیەك لەنێوان ئارکادی، هاوڕێی بازارۆڤ و باوك و مامیدا: "ئەو (بازارۆڤ) نیهیلیستێکە". بەبڕوای ئەو دوو پیاوە بەساڵاچووە نیهیلیست واتە کەسێ کەبڕوای بەهیچ شتێ نیەو ڕێز بۆ هیچ شتێ دانانێ. بەڵام بەقسەی ئارکادی، نیهیلیست واتە "کەسێ کە بەچاوی رەخنەوە دەڕوانێتە هەموو شتێ". مامی لێی دەپرسێ: "باشە جیاوازی چیە؟"[60] دە ساڵ لەدوای بڵاوبوونەوەی باوکان و کوڕەکان (1862) مانای نیهیلیست لەئەدەبیاتی سیاسی رووسی و ئەورووپیدا رەهەندێکی توندوتیژتری سیاسی بەخۆیەوە گرت، بووە وشەیەك هاوبەهاو هاومانای وشەی ترۆریست.

نیچە لەدوا یادداشتەکانیا نووسی: "نیهیلیسم لەودیو دەرگاوەیە: چ کاتێ ئەم جاڕسترین میوانە دێتە ژوور؟" و ئەوەش زیاد ئەکاو ئەڵێ هەڵەیەکی گەورەیە ئەگەر هۆی نیهیلیسممان بە "ئاڵۆزی کۆمەڵایەتی یاخود نائارامی فیزیۆلۆژی" زانی [61]، ناارامی بەهیچ شێوەیەك هۆی نیهیلیسم نیە، بەڵکو هۆی نیهیلیسم بارێکی میتافیزیکییە. نیچە دەپرسێ: "بەڵام مانای نیهیلیسم چیە؟" و هەر خۆشی وەڵامدەداتەوە: "ئەوەیە کە بەرزترین بەهاکان خۆیان بێنرخ کەن. ئامانجیش هیچ روون نیە. {گەر بپرسن} باشە بۆچی؟ هیچ وەڵامێکتان دەستگیر نابێت" [62] کاتێ دەڵێین "هۆی نیهیلیسم بارێکی میتافیزیکییە" مانایەکی تازەمان لەمەڕ میتافیزیکەوە لەسەردایە. دیارە نیچە بۆخۆی زیاتر لەجارێ چەمکی میتافیزیکی لەسەر مرۆڤ رەتکردەوەو لەمەش گرنگتر، پیشانیدا کەبنەمای ئەم میتافیزیکە لەگەڵ پەیدابوونی هەرێمی ئایدیاکاندا یەك شتە. لەزانینی کامەران دا، ئەوە دەخوێنینەوە سوکرات لەسەر حەق بوو کەساڵانی تەمەنی، لەهاتنە دنیاوە تا مەرگ، بەرۆژگاری نەخۆشی زانیبوو. ئەو مرۆڤەی نەخۆشی دەناسێ، خۆی نەخۆشە. نیچە پێناسەیەکی بەناوبانگی لەسەر مرۆڤ خستۆتەڕوو: مرۆڤ واتە ئاژەڵێکی نەخۆش. ئاژەڵێ کە لەکەماڵی ئایدیاکاندا بۆ سەلامەتی دەگەڕێ. لەگەڵ راگەیاندنی مەرگی خوادا، سنوری ئایدیا ئەفلاتوونیەکانیش، واتە پانتایی سازێنەری نمایەت و چاکەکان، بەوێرانبوو رادەگەیەنرێ.

مارتین هایدگەر لەوتاری: "وتەی نیچە: خوا مردووە" (1943)دا دەنووسێ کەنیهیلیسمی نیچە بۆ خۆی لەدایکبووی دووچاربوونی فیکرە لەبەندیخانەی میتافیزیك دا [63]. میتافیزیك سەردەمێکی مێژووییە کەتیایدا قەدەری ئایدیاکان چاکە، یاسای ئەخلاقی، دەستەڵاتی عەقڵ، پێشکەوتن، زۆرترین خۆشی بۆ زۆربە، فەرهەنگ و شارستانیەت لاواز دەکات. هەموان وزەی دروستکەری خۆیان لەدەست ئەدەن و بێبەرهەم دەمێننەوە. بەم مانایە نیهیلیسم کرۆکی باڵادەستی مێژووی میتافیزیکی خۆرئاوا. و لەڕاستیا "لۆژیکی دەروونی"ی ئەیەتی. لەم مێژووەدا ئایدیاکان سەرچاوەی ئەو بەهایانەن کەئێمە دەیاندەینە پاڵ شتەکان. نیشتە

چوارچێوە تێگەیشتنی بەژیان خۆی دەزانی نەك بەئاگایی. دەكرێ ژیان تەنیا لە بوونیدا ناسبكرێ. و ئیرادەی هێز، ئیرادەكردنە بۆ دۆزینەوەی مانای ئەو بوونە كە تەواو سەربەخۆیە لەبەهاكان. بەها بەرزەكان، ئەو شتە داهێنراوانەن كە ژیان بێ‌نرخ دەكەن. ناكرێ بەهاكان لە جیهانەوە بهێنینە دەست. میتافیزیك بەها بەرزەكان دادەهێنێ كەواتە "بێ بەهابوونی بەها بەرزەكان" شەڕێكە لەگەڵ میتافیزیك دا. بەڵام نیچە لەمە زیاتر ناڕوات. ئەو بەهۆی خستنەرووی ئیرادەی هێزەوە (لەو رووەوە كە ئیرادە هێزەو ئەمەش بەمانای ئیرادەی ئیرادە مل بۆ جۆرێ لەمسیانیسم دەدات. ئەگەر مرۆڤ لەخۆی تێپەڕێ (بەرزە مرۆڤ) و ئیرادەی خۆی وەك ئەوەی كە هەیە بناسێ، دنیایەكی دی دەستپێدەكا. لەم رووەوە زەردەشت ئامۆژگاركەری گەڕانەوەی ئەبەدی، دەبێتە "مژدەدەری برووسكەی بەرزە مرۆڤ؟. هایدگەر دەنووسێ كە ئەم دوو چەمكە هەریەكەیان لەرێگایەكی تایبەتەوە چاویان بڕیوەتە ئەنجامێ كە ئەو ئەنجامەش "باشترین هیواكانە". زەردەشت/ نیشتە دەڵێ: "چونكە رزگاربوونی مرۆڤ لەكینە پردێكە بەرەو باشترین هیواكانی منو پەلكەزێڕینەیەكە لەدوای گەرداوە درێژخایەنەكانەوە"[64] دیارە نابێت بەمانا دەروونناسیەكەی لەوشەی كینە تێبگەین، بەڵكو دەبێت لەچوارچێوەیەكی میتافیزیكیدا جێگەی **بكەینەوە: لەهەر شوێنێ نایەكسانی هەبێ، سزا هەیە (یاخود دەبێ هەبێ) و ویستەكەشی هەر هەیە. ئەم خاڵە لەبنەمای خۆیدا بیرێكی ئەفلاتوونیە، تێگەیشتنێكی میتافیزیكیە لەحەقیقەت: ئایدیای یەكسانی. لەم رووەوە، نیچە لەمانای "بابەتی هەبوو {مورد موجود} تێپەڕی نەكرد. لەلای ئەو بوون هەمیشە پرۆژەیەكی مرۆڤانە بوو بوونی پایەی هەبوو {هستی مورد موجود}ە. كەواتە لەبەندیخانەی** "روانینی ئەنتیك" دا گیری خواردبوو، هەروەكو ئەفلاتوونیش بیری لە"بوونێكی باشتر" دەكردەوە: واتە ئامانجی بوون كەزامنكەرو بەهێزكەری مانای ژیانی مرۆی بێت. لەم رووەوە بنەمای بیركردنەوەی نیچە - بەو مانایەی هایدگەر دەیهێنێتە پێش - میتافیزیكی‌یە.

نیچە بەخۆی دەڵێ كە ئەو "بانگەوازخوانی مێژووی دوو سەدەی داهاتوو"ە:

ئەوەی من دەیگێڕمەوە مێژووی دوو سەدەی داهاتووە، من ئەوە وەسف دەكەم كەدێتە پێش ئەوەی كەناشێت تازە بەجۆرێكی تربێ: دەركەوتنی نیهیلیسم. دەكرێ ئەم مێژووە هەر ئێستاش بەیانكەین، چونكە ئەمڕۆ پێویستی‌یەك بەمە هەیە. ئەو داهاتووە ئێستا بەهۆی هەزار نیشانەوە دەردەبڕدرێ، ئەم چارەنوسە ئێستا خۆی لەهەموو شوێنێ دەردەخا، بۆ گوێگرتن لەم مۆسیقای پاشەڕۆژە، هەر لەئێستاوە سەرجەمی گوێچكەكان شل بوون. سەردەمانێكە كەگشت فەرهەنگی ئەوروپی بەرەو كارەساتمان دەبات، بەخێرایی‌یەكی زیادبوون لەدەیەیەكەوە بۆ دەیەی داهاتوو، بێ‌ئارام، توورە، لەسەر سەر، هەروەكو رووبارێ كەدەیەوێ بگاتە كۆتایی، و نایەوێ چیدی بگەڕێتەوە، چونكە لەگەڕانەوە زەندەقی دەچێ؟[65].

ئەو فەرهەنگەی وەڵامی خواستەكانی ئەم جیهانەو ئەو دنیاش دەداتەوە، ئەو بەهایانەش **دروست ئەكات كە لەگەڵ "وەڵامەكەدا" بگونجێن، بەڵام نەگونجاو لەگەڵ ئەو پێویستیانەی كەنایان ناسێت. ئەو پێویستیانەی هەن بەڵام نابینرێت. ئەو پێویستیانەی ئیشی خۆیان دەكەن بەڵام نەك بەشێوەیەكی ئەوتۆ كە تەنانەت بزانرێن‌و ناسبكرێن. كەواتە بەهاكان، هەموویان، بێ‌نرخ دەبن، و نیهیلیسم بێ بایەخ بوونی بەهاكانە تەرازوویەك كەچیدی بەكەڵكی كێشانەكردن نایەت، ئەو بەهایانەی كەبەهۆی هەر**

بەلگەیەکەوە "بەنرخ دەزانران، دەنێردرێنە "سنوری هیچی (Nihilo)یە وە. کەواتە لەگەڵ خوای مەسیحدا کەهیوای رزگاربوونی لەگەڵ ملکەچبوون بۆ کۆیلایەتیدا تێهەڵکێش دەکرد، بەهاکان مردوونو لەبەرئەوەی ئەم مەرگەش نەک هەر تەنیا زانراوە، بەڵکو ویستراویشە، ئەوە رۆژگاری نیهیلیزم دەستپێدەکات. شێتەکەی ناو کتێبی زانینی کامەران کاتێ ئەو خودایەی دەکردەوە کە ئێمە کوشتوومانە، باسی "فەرمانڕەوایی هیچ" ی دەکرد.

سەد ساڵ لەدوای نیچە، لەکۆتایی ئەم سەدەیەدا کەوا خەریکین دوا ساڵەکانی تێپەڕدەکەین، با سەرنجدەینە پێشبینییەکەی ئەو لەبارەی مێژووەوە: خەڵکانێك بەناوی، دژایەتی چینایەتی، نەتەوەییو رەگەزییەوەو لەپێناوی بیروڕاو لێکدانەوەی جیاوازدا یەکتریان کوشت، و کاتێ هەر کوشتارێکیش کۆتایی پێهات، ئەوانەی بەزیندوویی مابوونەوە بۆیان دەرکەوت یاسای یارییەکەیان پووچ بووە. ئەو نرخەی درا زۆر گران بوو. ئەمەش نەك هەر تەنیا لەسەر یاساو بەهاکانی داهاتوو بەڵکو لەسەر ژیانی ئەمرۆش. ئەوەی تێپەڕی، باس لە کۆیلایەتی، بێ عەقڵیو بێتوانایی دەکات. با واز لە بەرەیی بهێنین "نیچە دەیگوت بەرەیی هاتنەوە بوو بەمرۆڤدا کەخودای کوشت)، بەڵام ئەو خاڵە هێشتا دەمێنێ کە؛ لەبەرئەوەی ویستمان دنیایەکی عەقڵانی، سرووشتیو ئەخلاقی دروستبکەین، سزامان بەشێوازێکیتر بەکارهێنا. لێرەدا رەخنەکاری نیچە لەسەر مۆدێرنیتی پەیوەست دەبێ لەگەڵ کاری یەکێك لەدوایین رەخنەگرەکانی رۆژگاری تازە، واتە مێشێل فۆکۆدا، و راڤەی ئەم پەیوەندیەش هەڵدەگرم بۆ بەشی شەشەمی ئەم کتێبە.

### تاکپەرستی مۆدێرن

... یەکێك لەبنەما گرنگەکانی مۆدێرنیتی تاکپەرستییە، بنەمایەکی ئەوتۆ کە لەسەردەمی رێنیسانس بەدواوە بەردەوام باسی گرنگییە فەلسەفیەکەی کراو لەئەنجامیشدا ئابوری سیاسی کلاسیکی نرخێکی رەهای بۆ بڕیەوە. هیگڵ ئەم بەهایەی لەژێر سێبەری رۆحی سۆبژەکتیڤ دا دانا، بەڵام رۆمانتیکەکانی ئەڵمانیا لەدژی هیگڵ جەختیان لەسەر فەرد کردەوە، و لێرەشەوە رەوتی تاك خرایە ناو پانتایی فەلسەفەی نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەیەمەوە. ماکس شتایرنرو سۆرن کیارکەگۆرد بەر گریان لەتاك کردو، کیارکەگۆرد بەراشکاوییەکی بێوێنەوە نووسی "تاك لەنەوع {رەگەز} نرخی زۆرترە" [66] و رایگەیاند کەزەینیەتی تاك، و مانایەکی گرنگتری تاکیش، واتە سۆبژەکتیڤیتە، بریتیە لەحەقیقەت، کیارکە گۆرد نووسی مرۆڤ لەو رووەوە لەئاژەڵان جوێ دەکرێتەوە، چونکە وەك تاك بوونی هەیە: "تاك چەمکێکی بڕیاردەرو بنەڕەتی مەسیحیەتە" [67] و گوتاری مەسیح بۆ هەر تاکێك بوو. لەڕوانگەی کیارکە گۆردەوە تاکە شێوازێکی بڕوا شێوازە فەردیەکەیەتی.

ئەو خاڵەی کە چەمکی سۆبژێکت لەزەینیەت گرنگترەو زیاتر بردەکات، خۆی ئەوە نیشاندەدات کەنرخی سۆبژەکتیڤیتە تەنیا لەئازادی بیرکردنەوەدا کورت نابێتەوە. سۆبژەکتیڤیتە بەدەستەڵاتگرتنە دەستی بابەتیانەی ئازادی مرۆڤەوە گرێدراوە. ئەو چەمکە کە لە "مافە دیموکراسیەکانی هاوولاتیەت"دا رەنگی داوەتەوە. نووسەرانی ئەو بزووتنەوەیەی بە "رەخنەکاری فەرهەنگی"ش بەناوبانگە، لەنێوان ئاڕاستەی کۆمەڵایەتیانەی فەرهەنگ کەناویان دەنا Kultur و لایەنی فەردی فەرهەنگ کەبەچاولێکردن لەگۆتە پێیاندەگوت Bildung، جیاوازییان دەکرد. لەمشتومڕی نێوان تاکخوازەکانو کۆمەڵخوازەکاندا لایەنێك زیاتر

جەختی دەکردەوە سەر چەمکی تاك وەك چەمکێکی مۆدێرن و لایەنی بەرامبەریش، تاکبوون و دوورکەوتنەوە یان لەئیرادەی گشتی - کە بەبەرهەمی پێکەوەبوونی بەکۆمەڵی یان دەزانی، - بەسەرچاوەی لەخود نامۆبوون لێکدەدایەوە، رەخنەی کۆمەڵخوازەکان لەتاکپەرستەکان ئەوەبوو، کە بەهۆی رەتکردنەوەی ئیرادەی گشتیەوە، لەڕاستیا ئەوان سەرپێچیاندەکرد لەیاسای گشتیو جیهانگرەوەی مۆدێرنیتی، لەبەرامبەر ئەمەدا تاکپەرستەکان هێمایاندەکرد بۆ خەونەکانی رۆژگاری مۆدێرنیتی، واتە بۆ هیومانیزم (مرۆڤدۆستیی)ی سەردەمی رێنیسانس. ماکس شتایرنر لەوەڵامدانەوەی کۆمەڵخوازەکاندا دەیگوت هیچ شێوازێکی لەخود نامۆبوون نیە رەگو ریشەی کۆمەڵایەتی نەبێت: "ئەوەی هی تۆیە، هی تۆیە وەك فەردێ، ئەوەی تۆ لەخۆت جیادەکاتەوە شتێکی کۆمەڵایەتیە". ئەو دەیگوت" تۆ کۆیلەی ئیشکردنیت بەڵام ئیشکردن لەکوێ مانای هەیە؟ لەکۆمەڵگادا".

ئارتۆر شۆپنهاوەر لەگۆشەیەکی ترەوە تاوی دەدایە تاکپەرستی. ئەو دەیگوت کە تایبەتمەندی فەردی بۆی هەیە وەکو تایبەتمەندی کۆمەڵایەتی دروستکەرو بەدیهێنەری خراپە بێت. بەبڕوای ئەو مرۆڤ بەندی ناو "پرنسیپی فەردیەت" (Principum Individuationis)ەو ناتوانێ لەمەوداو درزێکەوە تێپەڕێ کەجوێی دەکەنەوە لەتاکەکانی تر، بەڵام لەهەمان کاتیشدا ناتوانێ کامەرانی خۆی لەدەرەوەی پەیوەندیەکانی بەوانی ترەوە وێنا بکات، ئەوانەی کەتەواو جیاوازیشن لەخۆی: "ئەوانیتر ئەو هەڵەیەن کە هەم مەترسیو هەم ئازادی وەبەردەهێنن. ئەم پێویستیە بەیەکێکیتر دروستکەری شێوازێکیشە لەئازار، ویستی لەگەڵ یەکێکیتر بوون خەمێکە. یاساخیو رێگرتن لەچێژبینین هاوشانی ئەوویستە دێت، بەڵام دیارە چێژ بەبێ ئەویتر نەهەستی پێدەکرێو نەئەزموندەکرێ". [68]. ئا بەم جۆرە تاکپەرستی مۆدێرن روونکەرەوەی لایەنێکی کامڵ نەبووی ژیانی مرۆڤە. پێشرەوەکانی بزووتنەوەی مۆدێرنیزم لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا ئەم وانەیە لەشۆپنهاوەرەوە فێربوون. کاکڵەی سەرەکی بادن برۆکەکان (1901) کە یەکەمین رۆمانی (تۆماس مان)ە هەمان شتە: تۆماس بادن برۆك لەکاتی خوێندنەوەی کێشەکەی شۆپنهاوەردا بۆی دەردەکەوێ کە فەردبوونی ئەو جگە لەرێگرو بەرهەڵستکەرێك لەبەردەم کامەرانیدا نەبێ، شتێکیتر نیە. هەروەها لەوەش تێدەگات کەئازادی فەردی بەشێوەیەکی تەواو تەنیا لەداهێنان، موکاشەفەو دیتنی هونەریدا دەزانرێو دەردەبڕدرێ، نەك بەدەست دەهێنرێت، پەیوەندی ئازادی تاك بەداهێنانی هونەریەوە خاڵێکە نیچەش لە لەدایکبوونی تراژیدیا دا وەسفی کردبوو. هونەرمەندی دیۆنیزیۆس لەهونەردا پەی بەتاکبوونی خۆی دەبات، و پەی بەجیاوازی نێوان ئەم تاکبوونەو ئەوجۆرە تاکبوونەی کە لەکۆمەڵگای مۆدێرن دا هەیە، دەبات، فەردیەتی هونەرمەند لەئیرادەی هێزەوە. سەرچاوە دەگرێ. لەئینسانی، زۆر ئینسانی (1878)دا نیچە بنەمای کۆمەڵگای مۆدێرنی بە"داهێنانی فەردیەتو بیرۆکەی مافی یەکسانی" کە بەبڕوای ئەو دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی سستی. ئەم شێوازەی فەردیەت لەگەڵ تاکبوونی مەسیحیدا یەکدەگرنەوە، ئەوەی کە هەر فەردێ بزانێ یان وابزانێت کە "چۆتە خزمەتکردنی خۆشبەختی گشتەوە، بەمانای قوربانیکردنی خۆشبەختیە، ئەویش بەو شێوەیەی فەرد دەیناسێ.. لەزانینی کامەران دا زۆردارو ئاژاوەگێڕ جیاوازیان نیە، چونکە هەردووکیان بۆچوونی بەقوربانیکردنی تاك بەکامڵبوونی تاکپەرستێتی دەزانن و دەناسێنن.

نیچە لەساڵەکانی دوایـی ئیشـکردنی فیکریـدا، تاکپەرستی بە "شێوەی سنگفراوان و هێشتا نا ئاگایانەی ئیرادەی هێز" لەقەڵەمدا. [69]

تـەنیایی گرنگـترین دەسـتکەوتی ئـەخلاقی مۆدێرنیتیە، بـەڵام هـەروەکو خودی تاکپەرستی دوو پەیوەندی جیاوازی لەگەڵ ڕۆژگاری مۆدێرندا هەیە. هەم دەشبێت بە "نەخۆشی ژیانی نوێ" لەقەڵەم بدرێت، و هەم دەشکرێ "بەدوا بنـەمای سـەرەکی فەرهـەنگێکی رەسـەن" حسابی بـۆ بکرێ. نیچە گوتویە: "تـەنیایی لەبەختی کەسێ هەڵاتنی نەخۆشێکە، و لەبەختی کەسێکی تریش، ڕاکردنە لەبەرامبەر نەخۆشەکاندا" [70]

تـەنیایی زەردەشت لـەجۆری دووەمیانـە کـە دەڵـێ: "جێهێشتنێکیترو تەنیاییـەکی تـر، ئایـا ئێستا ئەمە فێربوویت؟ ئەوەش هەر دەزانم کە تۆ لەناو مرۆڤەکاندا هەردەم دڕندەو نـامۆ دەبیت." [71] ئەمەیە سروودی ستایشی زەردەشت کاتێ دەگەڕێتەوە ماڵ: "ئەی تەنیایی! ئەی ماڵی من، تـەنیایی. چەندە خۆش و پـڕ نـەوازش لەگـەڵم دەئـاخڤی.. هەمووشـتێ لای تـۆ کرانەوەیـەو ڕووناکایی. لێرە کاتژمێرەکانیش هێدیتر هـەنگاو دەنێن" [72]. لـە ئەمەیـە مـرۆڤ (1888)دا نیچـە دەنووسێ: "سـەراپای زەردەشـتەکەی من هیـچ نیـــە جگـــە لەســـروودی ستایشـــکردنی تەنیایی" و "لەڕاستیا من پێویستم بەتـەنیایی یە، دەبـێ بڵێـم کەتـەنیایی باشـتربوونی منــە، گەڕانەوەمە بـۆ خـۆم، بـۆ نەفسی ئـازاد، هێمن و گوێڕایەڵم. [73]

لەسـەرەتای چـەرخی بیسـتـەمدا، واتـە لـەو سـەردەمەدا کەبـەمۆدێرنیزم بەناوبانگـە، هونەرمەندەکان حـەزیان لەتـەنیایی دەکرد. وەك یۆتۆپیایەك باسیاندەکردو ئەمەشیان نـەك هـەر تـەنیا لەنیچـەوە، بـەڵکو لەشـاعیرێکی مـەزنی سەدەی پێشترەوە فـێرببوون: "لێهاتوو {نابغە} یەکێکەو کەواتە تەنیایە. شـانازیش هـەر یەکێکە بەڵام لەقووڕیان هەڵکێشاوە؟. نیچە ئەم وتەیەی شـارل بۆدلـێری بـەزمانی فەرەنسـی لـەدوا یادداشتەکانی خۆیدا نووسیبۆوە. ئـەو لەزستانی 1887–1888دا لە نیس سـەرجەمی بەرهەمـەکانی بۆ دلێری خوێنـدەوەو پاشـانیش نووسـی کـە "خەسڵەتی ڕوو لەداڕمانی تەنیایی شاعیر" هـەم ترسـاندویەتیو هـەم سەرنجیشی ڕاکێشـاوە. ژان پۆل سارتەر لەمەڕ تەنیایی بۆدلێرەوە نووسـیویە لەبەرئـەوەی ئـەو چیـدی نـەیدەتوانی بەرگـەی تەنیاییەکـەی بگـرێ، باسـیدەکرد تـا بتوانـێ بەرگەی بگرێ. [74]

ئێستا بابڕوانینـە لایـەنێکی تـری فەردیـەت. کۆمـەڵگای پیشەسازی لەلایەکەوە بەدیهێنـەری "دنیـای بەرژەوەندیە مادیـەکان" بـوو کەلـەوێدا سـوودی تایبـەتی وەك ئامـانجی سـەرەکی ژیـان لێکدەدرایـەوە؛ (جیـهانێ کەشـوێنهاوەر "لەڕوانگـەی ئـەخلاقیو ئێسـتاتیکی" یـەوە مـەحکومی دەکـرد)و، لەلایـەکی تریشـەوە بەدیهێنەری "دنیایی تایبەتی ویستو حەز" بوون ئەمەش بەو مانایەی کـەئامانجی سـەرەکی ژیانی تاکە کەسی لەدەرەوەی دەستەڵاتو هـەڵبژاردنی تاك دادەنا، بەڵام ئـەو خەیاڵـەش لەبیرکردنـەوەی تـاك دا نەخـەملاند کە ئـەم جیهانـە یـان بـۆ ئـەو کەوییە، یان کەوی دەبێو ئـەوی تـاك کۆنـترۆڵی خـۆی بەسـەر هـەموو شـتێکدا دەسـەلمێنێ. بـارودۆخی تراژیدیانـەی مرۆڤی مۆدێرن ئەوەیـە کەحـەزی بـۆ ژیـان لەگـەڵ ئـەوانیترا (ژیانـێ کەوەڵامی شۆڕو شەهوەتو غەریزەکانی بداتەوە) لەڕێڕەوی پێشکەوتنا، دەبێتە هـۆی قبووڵکردنـی بـەرە بـەرەی گۆشـە گـیری، دابـڕانو تـەنیایی. لەپێناوی تێگەیشتنی ویستو ئیرادەی خۆمدا، دەبـێ قبووڵـی ئیرادەیـەکیتر بکـەم، و لەئەنجامیشدا دەبێ چاوپۆشم لەویستی خۆم.

مافی هەڵبژاردن‌و ئازادی لەتاکبووندا مانایان هەیە، بەڵام لەژیانی مۆدێرن دا هیچ کەسێ ناتوانێ لەناو تاکێتی خۆیدا بمێنێتەوە کەواتە ویستی ژیان لەبیرکردنەوەی فەلسەفی‌و هونەریدا، لەباشترین (و کامڵترین شێوەی خۆیدا کەبیرکردنەوەیە لەمەرگ، شێواز وەردەگرێ، لەم نەگونجاوانەوە مەحکوومبوونی تاك بەژیانی تاك (تەنیایی) سەرهەڵدەدات‌و ئیدی تەنیایی دەبێتە سەرچاوەی ویستی ژیان: "ژیانی مرۆڤ دەردەدارترین شێوەی ژیانە: لەرەنجکێشانەوە بەرەو تەنیامانەوەو شڵەژان دەچێ" [75] مرۆڤەکان لەترسی ئەم بەتەنیا مانەوەیە روودەکەنە ژیانی بەکۆمەڵی‌و ئەمەش ژیانی بەتەنیا مانەوەیی چەندین جار زیاتر ئەکا: "رەوتی غەریزەیی مرۆڤ لە راکردنیا لەئازارو دەرد، تەنیا رووخساری دەردو ئازار دەگۆرێ؟. [76]

شۆپنهاوەر مەودای خۆی لەگەڵ عەقڵ، زانست، تەکنەلۆژی‌و مۆدێرنیتی نەدەشاردەوە، دەیگوت ئەمانە هەموویان ژیان لەبازنەی دیتنی ئێمە دەکەنەدەرێ. ئەزموونی راستەقینەی ئێمە (ئەزموونێ کە لەژیانی کۆمەلایەتیەوە هاتبێ) کەئەزموونێکی نا تایبەت‌و نافەردییە وەك ئەزموونێکی فەردی خۆی دەنوێنێ‌و، ویست‌و ئاگایی‌و تواناکانمان سنووردار ئەکات. "دنیای بەراست هەبووی ئێمە، دنیایەك کە کارکردی هەیە، رەتکەرەوەی واقیعییەتە" [77]. ئەوەی کە بەگشتی وەك پۆزەتیڤ لەقەڵەم دەدرێ‌و ئێمە پێیدەڵێین هەبوون، لەگەڵ ئەزموونداندا (ئەزموونی لەدنیا بوون دا) شێوازێکی نەگەتیڤ بەخۆیەوە دەگرێ. نیچە بەیارمەتی کارەکانی شۆبنهاوەر لەگەڵ ئەم لایەنەی فەردیەتدا ئاشنابووبوو. دنیایی مۆدێرن، دنیایەك کەئێمە تیایدا خوامان کوشتووە، بەرەو گۆشەگیری راپێچمان دەکات. ئێمە وەك هەر بکوژێك تەنیاین. بەسانایی دەشێت گوێمان لەدەنگی دۆستۆیڤسکی بێت: لەدنیای بێخوادا هەموو ئیشێ رێگەی پێدراوە. ئالێرەشدا هەڵگەرانەوەی بەهاکان دەدۆزرێتەوە، ئەو شتەی نیچە پێیدەگوت **UMWERTUNG**. دەبێ تەنیابین‌و لەو شوێنەشدا تەنیاییمان بەسەرا دەسەپێنرێ کەژیان بەکۆمەڵیەو سەراپای ئەرکەکانیش لەم جۆرە ژیانەوە سەرچاوە دەگرن. بەم جۆرە ژیانی واقیعیمان گۆریوە بەئەفسانە ژیانی بەرژەوەندیە تایبەتی‌و "سوودخوازی"یەکانیش (کە نیچە بەرقەوە پێیدەگوت "بیری ئینگلیزی") ئاشکرا کەری ئەم هەڵگەرانەوەی بەهایانەیە. بەوردبوونەوەمان لەجینالۆژیای ئەخلاق‌و بەهاکان، تێدەگەین کە لە دنیای ئێمەدا بەهێزو بێهێز زۆردارو زۆرلێکراو، و گورگ‌و مەڕ هەن. لەنێوان ئەمانەدا پەیوەندی ماددی هەیەو، ئەخلاقیش هەوڵدەدات ئەم پەیوەندیە بشارێتەوە. بێهێز بەراکردنی لەم پەیوەندیە لەبەهێزبوون تێناگات، بەڵکو لەگەڵ زۆرداریدا تێکەڵی دەکات‌و وەکو شەرانیەتێکی رەها دەیناسێنێ. هەوڵدەدا شوناسێکی سەربەخۆ بۆ خۆی دەست بخات: باسی کردارەکان، ویستەکان‌و "تاکە جەوهەر" دەکات کە لەراستیا بوونی نیە. ژیل دۆلۆز لەنیچەو فەلسەفە (1962)دا دەنووسێ کەئاگایی هەرگیز ئاگایی لەسەر خودێکی سەربەخۆ (و پشت بەخۆ بەستوو) نیە، بەڵکو ئاگایی‌یە لەسەر من کە پەیوەندیم هەیە لەگەڵ شتێك یان کەسێکدا کەبەسەر مندا باڵا دەستە "ئاگایی کەمتر لەپەیوەندی بەلایەنی دەرەکیەوە، بەدەربرینێکی واقیعی پێناسە دەکرێ، و زیاتر لەپەیوەندی لەگەڵ باڵاتردا، بەدەربرینی بەهاکان

دەخرێتەڕوو. لای نیچە بەردەوام ئاگایی، ژێر دەستە" [78]. ئاگایی، ئاگایی خوداکان (ئاغاکان) نیە، بەڵکو ئاگایی کۆیلەیە. بەمجۆرەش بیرکردنەوە بریتیە لەبێزاربوون لەدەست بارودۆخی ژێردەستەیی.

پۆل ریکۆر لەوتارێکیدا لەبارەی کتێبەکەی لویی دومۆن چەند تێزێك لەمەڕ تاکپەرستییەوە، باسی "قەیرانی ناسنامە" دەکات کەدەشێت بەهۆیەوە قەیرانی مۆدێرنیتی بناسین، [79] بەلای ریکۆرەوە چەمکی ناسنامە لەچەمکی فەردیەتەوە دێت. ناسنامەی بەکۆمەڵی تەنیا دەربڕینێکی رێکەوتن نامەییە . تاك لەیەکەم پلەی عەودالْیا بۆ دۆزینەوەی ناسنامەی خۆی (کە پلەیەکی مەعریفییە) خۆی وەك "کەسێ" لە"رەگەز" جوێدەکاتەوە. ئەمەش جۆرێکە لەتاکبوون یاخود باشترە بڵێم "بوونە تاك"ە. بەلام ئەم بەتاك بوونە لەکردەوەدا مانا بەدەست دەهێنێ، لەکردەی گوتاریدا. کاتێ دەڵێم "بینیم کە.." راناوی تاکە کەس، من نەك وەکو یەکێ لەرەگەزی مرۆڤ بەڵکو وەك کەسێ دەخولقێنێ. ئەمەش جۆرێکە لەدۆزینەوەی ناسنامە. هەرکەسێ بەوتنی "من" ناسنامەیەك دەدات بەخۆی. بەلام ئەم ناسنامەیە جیاوازە لەگەڵ ئەو "ناسنامە ریوایەتیەی" کەمن دەیبەخشمە خۆم. لەم قۆناغە سەرەکیەدایە کە من ئەبمە خودی خۆم. کەواتە دۆزینەوەی ناسنامە پرۆسیسێکی بەدوای یەکدا هاتووە کە لەکەسی مرۆڤەوە دەگۆڕێ بۆ تاكو پاشان بۆ ناسنامەی ریوایەتی. یەهودیەك، لەو یەهودیەوە کەهەموو رۆژێك هەیە، دەگۆڕێ بەمرۆڤێکی تاكو پاشانیش بەناسنامەیەکی ریوایی. هەریەکێك لەم قۆناغانە دەکرێ یان دروست نەبن یاخود تەواو نەبن. ئالێرەدایە کە قەیرانی ناسنامە سەرهەڵدەدات.

شێوەی بنەبڕی ئەم قەیرانە ئەوکاتە ئاشکرا دەبێ کەناسنامە وەکو "کارکردی ریوایەت" نەیەتە دەست. هەر فەردێ بەهۆی "ئەوەی لەمەڕ خۆیەوە" ریوایەتی دەکا (و هەروەها بەهۆی ریوایەتی ئەوانی ترەوە لەسەر خۆی)، خۆی دروست ئەکا. بەقسەی ڤیلهلم شاپت (قوتابی هوسرل) تاك خاوەنی ناسنامە نیە، بەڵکو "ناسنامەی خۆی لەو گوزارشەدا دەدۆزێتەوە کە لەمەڕ خۆیەوەیەتی". لەم روەوە شاپت باسی خۆدۆزینەوە لەگوزارش دا ئەکا: "من، لەخۆیدا هیچی نیە، هەموو شتێکی خۆی لەبەسەرهاتی خۆیەوە بەدەست دەهێنێ" [80] ئەمەیە رازی گرنگی ژیاننامەی خۆنووسینو بیرەوەری تایبەتی لەئەدەبیاتی مۆدێرن دا و رازی کارکردی راناوی "من" لەهەمان ئەدەبیات دا.

جۆرج سیمیلیش باسی پەیوەندی تاكو قەیرانی ناسنامەی کردووە. سەرەتاکەی کارەکەی ئەو بریتیە لەڕووبەڕووبوونەوەی فەردیەت لەگەڵ لایەنی ژیانی کۆمەلایەتیدا، سمیل بۆ روونکردنەوەی ئەم رووبەڕووبوونەوەیە لەنێوان فەردیەتی چۆنایەتیو فەردیەتی چەندایەتی دا جیاوازی کردووە بەبڕوای ئەو فەردیەتی چەندایەتی لەسەدەی هەژدەیەمەوە ماوەتەوە. هەر تاکێ ملکەچی یان رەتکەرەوەی کۆمەڵی بەهایە کە گرووپ دروستیکردوون، و ئەو تاکە بایەخی خۆی لەو ملکەچبوونو رەتکردنەوەیەدا بەدەست دەهێنێ. بەلام فەردیەتی چۆنایەتی لە ئەنجامێکی سەدەی نۆزدەیەمەوە: تاك لەخۆیدا، جیاواز لەو رۆڵەی لەگروپ دا هەیەتی حسابی بۆ دەکرێ. گرنگی ئەو "بۆ خۆیەتی". کەسێکە ناشێت یەکێکیتری بخەینە جێ. ئەو لەخۆیدا تاکە یەقینێ

"دەدۆزێتەوە". (81) دەكرێ بگوترێ پەیوەندی تاك بەكۆمەڵەوە شێوەیەكی نەگۆڕی هەیە كە لەگەڵ فەردیەتی چەندایەتیدا پەیوەندیدارەو شێوەیەكی دینامیكی هەیە كەبەفەردیەتی چۆنایەتیەوە گرێدراوە. ئاگایی مرۆڤی مۆدێرن بەهۆی پەیوەندارێتی‌یەوە لەگەڵ نەریتەكاندا، هێشتاكو لەئاستێكدا نیە لەگرنگی فەردیەتی چۆنایەتی تێبگات (82). بەڵام ئەم مرۆڤە هەرچۆنێ بێت جۆرێ لەپەرچەكردار لەئاست "بارودۆخی نوێ"ی خۆیدا دەنوێنێ: لەم رووەیشەوە بەردەوام لە"بنەما گشتی‌یەكان" دووردەكەوێتەوەو بنەمای فەردی بنیاد دەنێ: "فەردیەت وزەیەكە بەرگری دەكا لەتوانەوەی تەواوی {ئێمە لەناو كۆمەڵدا}" (83). مرۆڤی مۆدێرن لەبەرئەوەی تاكە بەرپرسیارێكی ئەو بەهایانەیە كەدروستیكردوون، هەمیشە تەنیاو ترس لێنیشتووە.

رۆحی مۆدێرن بەردەوام لەگۆڕاندایە. سیمیل باسی نەبوونی هاوسەنگی دەكات لەكارەكانی رۆدین داو ئەمەش بەتایبەتمەندی مۆدێرنانەی ئەو بەرهەمانە لەقەڵەم دەدات(84). كۆمەڵگای تەقلیدی پێویستی بەدەروونناسی نەبوو، ئەمەش نەك تەنیا بەهۆی ئەوەی كەگرووپ رێگەی بەسەرهەڵدانی دەروونی تاك نەدەدا، بەڵكو لەبەرئەو هۆ گرنگترەی كەتاك بەئاسانی‌و زووبەزوو لەگەڵ ئەو شوێنگەیەدا رادەهات كە كۆمەڵگا پێی دەبەخشی. بێئارامی رۆحی مۆدێرن لەدایكبووی نەگونجانی تاكە لەگەڵ كۆمەڵو گرووپ دا، بەبڕوای سیمیل، رودین هەوڵیداوە لەپەیكەرەكانیا ئەم خاڵە پیشان بدات: "جەوهەری مۆدێرنیتی بریتیە لە دەروونناسی، هەموو شتێ لەدەروونی ئێمەدا روودەدات" (85) سیمیل لەگەڵ برگسون دا هاوڕابوو، كەسەدەی بیستەم، سەدەی دەروونناسی دەبێ، چونكە "ئیدی روون بۆتەوە كە تاكپەرستی رەوتی مۆدێرنیتی رووناكدەكاتەوە". هەر لەبەر ئەم هۆیەشە، كاتێ باسی قەیرانی ژیانی مۆدێرن دەكەین، باسەكە بەرەو "قەیرانی فەردیەت" و "قەیرانی ناسنامە" دەچێت كە ئەمەش لەقەیرانی فەرهەنگ دا خۆی ئاشكرا دەكات.

قەیرانی فەرهەنگ. ئەمەیە كرۆكی سەرەكی بیركردنەوەی سمیل لەمەڕ مۆدێرنیتیەوە. جەوهەری قەیرانی رۆژگاری مۆدێرن لەڕوانگەی ئەوەوە لەفەرهەنگدایە. فەرهەنگ بەرز ترین دەربڕینی ژیانی داهێنەرانەیە، بەڵام ئەم ژیانە دەروونیە، و ئەم پێگەیشتنە رەسەنە دەروونناسانەیە"شتێ دەسازێنێ كە خودی ژیان نیە، و بەمانایەكیش ژیان مەبەستی خۆی تیایدا لەدەست دەدات، و لەگەڵ ویستەكانی ژیاندا دەكەوێتە شەڕ" بەپێی ئاماژەكردنە تاڵەكەی سیمیل، فەرهەنگ "دروستكەری ئاژاوەیەكی بەردەوامە لەنێوان شێوە ئەتۆمیەكاندا" (86). چیدی مرۆڤ لەتوانایدا نیە شێوازی نوێی باوەڕی ئایینی دابهێنێ، چیدی هونەر دەربڕ نیە، فەلسەفە لەتەنگو چەڵەمەدایە، و بەگوتەی سیمیل، لەنێوان چوارچێوە یۆنانی‌یەكەیی‌و واقیعیەتی ئامادەدا مەودایەك دروستبووە. سیمیل كەبەردەوام ناوی ئەفلاتوون - فەیلەسووفە خۆشەویستەكەی - دەهێنێ، دەنووسێ كەهێزی خولقێنەری هونەریش لەئاست چارەسەركردنی دژایەتی نێوان داهێنانی فەردی‌و "ویژدانی بەكۆمەڵیدا" بێتوانایە. بەمجۆرەش "قەیرانی فەرهەنگی مۆدێرن، گوزارشت لەجەوهەری دژ بەیەكی ژیان خۆی دەدات" (87).

سیمیل نەك هەر تەنیا یەكێك لەیەكەمین بەرپەرچدانەوە سیستەماتیزەكانی لەدژی

فەرهەنگی مۆدێرن خستەڕوو، بەڵکو بەشێکی زۆر لەلایەنەکانی ژیانی مۆدێرنی ئاشکرا کردوون، کە ئەمڕۆکە بەتایبەتی گرنگی خۆیانیان بەدەستهێناوە یەکێك لەم لایەنانە جیاوازیو نایەکسانی بارودۆخی کۆمەڵایەتی ئافرەتانو پیاوانە لەکۆمەڵگای مۆدێرن دا. یەکێکیتریان شارنشینیو ژیانی پڕ زەحمەت لەکۆمەڵگای شارەکاندا. لەم وتە دوو جەمسەرەیدا کە دەڵێ: "شار هەم شوێنگەی بەرەتی مۆدێرنیتیە و هەم پاڵەوانیشێتی" دەتوانین پەی بەقسەی سیمیل ببەین. [88]. سیمیل لەوتارێکیدا بەناوی "کۆمەڵگای شارو ژیای زەینی" (1911)، روونیدەکاتەوە کەچۆن ئێمە بەشێوەی جۆربەجۆر وەلامی ئەو ئەزموونانە دەدەینەوە کە کۆمەڵگای شار بەسەرماندا "دەیانسەپێنێ" و، لەرووی فیکریو دەروونیەوە، دەیانگۆڕین بەبارودۆخێکی ناوەکی". ئێمە لەکۆمەڵگای شاردا لەدەست زنجیری "پەیوەندیە بەرامبەرەکانو سۆبژەکتیڤەکان" رزگارمان دەبێت، یاخود بەلای کەمەوە کەمتر هەست بەفشاریان دەکەین،و چەندین جار زیاتر لەچاو ژیانی تەقلیدیدا هەست بەئازادی دەکەین. بەڵام ئەم ئازادیەمان لەنرخی ئەوەدا هێناوەتە دەست کە ئەوانیتر وەك هۆکارو شمەك ببینین.ئەویتر تەنیا لەلێپرسینەوە وشكو دوور لەسۆزەکانی سەرمایەدا، یاخود باشتروایە بگوترێ لەشوێنی ئەو لەمەیدانی دابەشبوونی کاری کۆمەڵایەتیدا، پەیدا دەبێت. تەنانەت تێگەیشتنی ئێمە لەشوێنو کات هاوئاهەنگ دەبێت بەعەقلانیەتی هۆکاری، ئابووریو ژمێریارانە. سیمیل یەکەمین کۆمەڵناسێ نەبوو کەباسی "پەیوەندی کۆمەڵگای شاری بەمۆدێرنیتی هونەری"یەوە، کردبێ؛ بەلام یەکەمین بیریارێ بوو کەبێتوانایی لەدەربڕیندای بەئەنجامێکی ژیانی ناو شاری مۆدێرن لەقەڵەم دابێ: "نزیکی جەستەییو بەرتەسکبوونی فەزا، مەودای دەروونی بەرجەستە تر ئەکا.. هیچ کەسێ لەهیچ شوێنێ وەکو ناوشاری گەورە هەست بەتەنیاییو ونبوون ناکات... گرنگترین هۆیش کەکۆمەڵگای شار فەردی ترین لایەنی بوونی تایبەتی دەخەملێنێ، لایەنی گەشەی فەرهەنگی مۆدێرنە، واتە زاڵبوونی رۆحی بابەتیانە بەسەر رۆحی زەینیدا" [89] لەشاردا هەموو شتێ بەپێی مۆدێلەکانی رۆژ، پێکەوەبوونو پەیوەندیەکی درۆزنانەیان لەگەڵ یەکتردا هەیە: "هەرچەندە سەردەمێ تووڕەتر بێت مۆدەکانیشی زووتر دەگۆڕێن، چونکە پێویستی بەئاشکراکردنی جیاوازیەکان - یەکێك لەگرنگترین هۆکارەکانی مۆدەی رۆژ هاوشان لەگەڵ وزەی تووڕەییدا دەچێت بەڕێوە" [90] وتارەکەی سیمیل لەمەڕ (مۆد)ەوە یەکێکە لەنمونە سەرەتاییەکانی لێکۆڵینەوە لە "گۆڕانی مۆدەی رۆژ". دەبێ بۆ گرنگی ئەم وتارە لەتێگەیشتنی پەیوەندی نێوان "رەوتی فەردی" و"رەوتی کۆمەڵایەتی" فەرهەنگدا بگەڕێین، واتە لەجۆرێ تێگەیشتنی دوولایەنەی شارەوە لەژیانی مۆدێرن دا. نزیك بەنیو سەدە دوای نووسینی وتارەکەی سیمیل، رۆلان بارت کتێبی سیستەمی مۆدەی رۆژ (1967)ی نووسی: یەکەمین هەنگاوێکی شیلگیرانەیە لەم مەیدانەدا کە لەدوای سیمیلەوە هەڵهێنرایەوە.

**پەراوێزەکان**

**یادداشت های فصل نخست**

1- M.Foucault, politics, Philosophy, Culture, ed, L.D.Kritzman, London, 1998, P.34,

2- ف. نیچه، چنین گفت زرتشت، ترجمه‌ی د. اشوری، تهران، 1362، ص 7.

3- Ch. Baudeiaire, Critique d'art, ed C.pichois, Paris, 1992, P. 345.

**4- ف. ادمیت، اندیشه های میرزا فتحعلی اخوندزاده، تهران، 1349، ص ص 243-244.**

5- ا. **کاسیرر، فلسفه روشنگری، ترجمه‌ی ی. موقن، تهران، 1370،ص ص 374-373.**
E. Cassirer, The Philosophy of the Enlightenement, Princeton, 1951, PP. 275-276.

6- p. Gay, The Enligthtenment, The Rise of Modern Paganism, New York , 1966, P. 130.

7- ا. کانت (سنجش خرد ناب) ترجمه‌ی م. ش. ادیب **سلطانی**، تهران، 1362، ص 12 پ

8- G.W.F.Hegel, Phenomenology of Spirit, tra A.V.Miller, Oxford, 1977, p.6.

9- G.W.F.Hegel, L'essence de la critique, philosophique tra B.Fauquet, Paris, 1972.

10- K.Marx, f.Engels, Collected Works, Moscow, 1976, vol.5, PP. 28-29.

11- Lbid, vol.3, P.91.

12- F.Nietzsche, Ecce Homo, P.285.

13- G.W.F.Hegel, Philosophy of Right, tra T.M.Knoz , Oxford , 1967, P.10.

14- ك. ا. اپل، (( حکم اخلاقی ))، ترجمه‌ی ع.ب، پیام یونسکو، تهران، مردادو شهریور 1371، ص17.

15. نگاه کنید به اخرین کار لیوتار:
J-F.Lyotard, Moralites postmodernes, Paris, 1993, p.97.

16. A.Arato, E.Gebhardt eds, The Essential Frankfurt School Reader, New yok, 1978,pp. 25-26.

17. E.Husserl, La crise des science Europeanes et la phenomenologie transcendantale, tra G.Granel, Paris, 1989, pp. 105-112.

18. M.Heidegger, Kant et le probleme de la metaphysique, tra. A De Waelhens, Paris, 1981, p.86.

19. L.Ferry, "Le penseur de la modernite", Magazine litteraire, Avril 1993, p19.

20. J.Habemas. le discours philosophique de la modermite, tra Ch.Bouchindhomme, R.Rochlitz, paris, 1988, p.19.

21. Hegel, philosphy of Right, p.77.

22. Ibid, p.84.

23. G.W.F. Hegel, System de la vie ethique, tra. J.Taminaux, paris, 1976, p.160.

24. Ibid, p.163.

25. D.Mc Lellan, The young Hegelans and Karl Marx, London, 1980, p.60.

26. Ibid, pp. 65-66.

27. K.Marx, F.Engels, Collected works, vol 3, p141.

28. Ibid, vol.6, p.486.

29. Ibid, p.487.

30. Ibid, p.506.

31. A.Touraine, Critique de la modernite, paris, 1992, pp. 101-102.

32. K.Marx, A Contribution to the Critique of Political Economy, Moscow, 1978, pp. 19-23.

33. J. Dhondt ed, Hegel et le siecle des Lumiers, paris, 1974.

و نیز نگاه کنید به:

K.Marx, Early Writings, ed.L.Colletti, tra. R.Livingston, London, 1975, p.61.

34. M.Weber, The Protestant Ethic and the Spirit of Capitalism, tra. Parsons, London, 1972.

در این مورد نگاه کنید به:

J.Freund, The sociology of Max Weber,tra M.Ilford, London, 1972, pp.174-218.

35. H.Blumenberg, The Legitimacy of the Modern Age, tra R.M.Wallace, MIT. Press, 1985, pp.3-13, pp.63-76.

36. ر. ارون، مراحل اساسی اندیشه در جامعه شناسی، ترجمه‌ی ب. پرهام، تهران، 1370، ص. ص 581–580

37. A.Touraine, Critique de la Modernite, pp.40-41.

38. Ibid, p.42.

39. R.Bernstein ed, Habermas and modernity, Oxford, 1985, p.5.

40. P.Raynaud, Max Weber et le dilemme de raison modern, paris, 1987.

41. F.Nietzsche, Ecce Homo, pp.310-311.

42. F.Nietzsche, Twilight of the Idols, tra, R.J.Hollingdale, London, 1968, pp.40-41.

43. F.Nietzsche, The Will to Power, tre W. Kaufmann. New york, 1968, p.280.

44. Ibid, pp.266-267.

45. Ibid, p.329.

46. Ibid, p.282.

47. F.Nietzsche,On the Genealogy of Morals, tra W.Kaufmann, New york, 1969, p.36.

و نیز نگاه کنید به:

M.Scheler, Lhomme du ressentiment, paris, 1970.

48. ف. نیچه، فراسوی نیك و بد، ص 155 .

49. پیشین، ص157.

50. پیشین، ص180.

51. F.Nietzsche, Twilight of the Idois, p.25.

52. ف. نیچه، فراسوی وبد، ص411.

53. F. Nietzche, The Gay Science, tra, W. Kaufmann, New york, 1977, PP.338-340.

54. ف. نیچه، چنین گفت زرتشت، ص411.

55. F.Nietzsche, The Gay Science, p.167.

56. F.Nietzsche, On the Genealogy of Morals, p.15.

57. F.Nietzsche, The Will to Power, p.22.

58. ف. نیچه، فراسوی نیك و بد، ص 115.

59. F.Nietzsche, On the Genqlogy of Morals, p.15.

60. ف. نیچه، فراسوی نیك و بد، ص ص 164–160، ص178.

61. تورگنیف، پدران و پسران، ترجمه‌ی م. اهی، تهران، 1356، ص ص 62–51.

62. F.Nietzsche, The Will to Power, p.7.

63. Ibid, p.9.

64. M.Heidegger, Chemins Qyi ne menent nulle part, tra W.Brokmeier, Paris, 1963, pp.173-219.

65. ف. نیچه، چنین گفت زرتشت، ص 142.

66. F.Nietzsche, The Will to power, p.3.

67. S.Kiekegaard, Ld maladie a la mort, Paris. n.d.

S.Kiekegaard, Le concept de desespoir,tra.P.H.Tisseau, Paris,1969, p.111.

68. S.Aierkegaard, Point de vue explicatif de mon oeuvre, tra. P.H.Tisseau, Paris1963, p.91.

69. A.Schopenhauer, Le monde comme volonte et comme representation, tra. A.Burdeau, Paris, 1966, p.457.

70. F.Nietzsche, The will to Power, p.411.

71. ف. نیچه، چنین گفت زرتشت، ص 263.

72. پیشین، ص 278.

73. پیشین، ص 278 .

74. F.nietzsche, Ecce Homo, p.234, p.233.

75. J.P.Sartare, Baudelaire, Paris, 1979,p.21.

76. A.Schopenhauer, Le monde comme volonte et comme representation, pp.325-333.

77. Ibid, p.327.

78. Ibid, p.427.

79. G.Deleuze,Nietzsche et la philosophie, paris, 1977, p.44.

80. P.Ricoeur, “Individu et identite personnelle” Sur individu, ouvrage collectif, Paris, 1987.

81. نقل از کتاب زیر:

J.Le Rider, Modernite Viennoise, paris, 1990, p.51.

82. G. Simmei, Sosioioge et epistemologie, tra L.Gasparini, paris, 1981, p.146, p.155.

83. Ibid, p.236.

84. G.Simmel, Philosophie de la modemite, tra J.L.Vieillard-Baron, paris, 1989, vol. 1, p.34.

85. Ibid, vol.2, pp. 105-126.

86. Ibid, vol.1, p.136.

87. Ibid, vol.2, p.278.

88. Ibid, vol.2, p.258.

89. M.De Certeau, The practice of Everyday Life, Berkeley, 1984.

90. G.Simmel, Philosophie de la modernite vol.1 p.149.

91. Ibid, vol.1, pp.168-172.

# وتوویژخوازترین رۆشنبیری ئەڵمانیا

خوسرەو ناقد

● و: موسلیح عەبدولقەهار

لەگەڵ مردنی مارتین هایدگەر لە ساڵی 1976ی زایینیدا، نەریتی فەلسەفیش لە ئەڵمانیای هاوچەرخدا کە تائەوکات لە بیروڕاکانی فەیلەسوفێکدا بەرجەستەدەبوو، لە ژیانی مەعنەویی ئەڵمانیادا چاوی لێکنا. پێش هایدگەر بیریارانی وەك "کارل یاسپێرس"، "تیۆدۆرئادۆرنۆ"، "ماکس هۆرکهایمەر" و "کارل لویت"، پارێزەر و دامەزرێنەری نەریتێك بوون کە داوای یەکێتی - هەرچەند پڕ بێنەو بەردە و کۆشش - تێزە فەلسەفیەکان و ژیانی مرۆڤی دەکرد. بەڵام لەگەڵ نەمانی ئەوانە، بۆچوونی بەرجەستەبووی ناویەك جەستە، چووە چەندین جەستەوە.

لەوە بەدواوە، زانکۆ و بنکەکانی لێکۆڵینەوە و تۆژینەوە، بوون بە شوێن و گۆڕەپانی وتوویژە فەلسەفییەکان. ئێستا وا دەردەکەوێت کە فەلسەفە گۆشەگیری هەڵبژاردووە و گوێگران (مخاطب) و هاوڕاکانی خۆیشی لەنێوان ئەو کۆمەڵە شارەزایە کولتورییانەدا دەدۆزێتەوە کە تەنیا خۆیان بە کارو لێکۆڵینەوەکانیان رازی و خۆشحاڵن، بێئەوەی هەست بە پێویستبوونی دانوستانی تەجریبی و فیکری و خۆنزیککردنەوە لە رای گشتی بکەن.

یۆرگن هابرماس، دوایین میراتگری "قوتابخانەی فرانکفۆرت" و یەکێك لە بەتواناترین قوتابیانی ئادۆرنۆ - کە لەوانەیە سەربەخۆترین قوتابی ئەو بێت - کەمێك دوای مردنی یاسپێرس و ئادۆرنۆ، لە ساڵی 1969، لەرێی ناسینی کێشەکە و دەستنیشانکردنی بارودۆخی باو بەدوای رێگەچارەدا گەڕاوە و تیۆرێکی دارشت کە تێیدا رۆڵی رۆشنبیران و بیریاران لە بواری گشتی دا دەستنیشان دەکات. لە راستیدا تیۆری هابرماس سەبارەت بە رۆڵ و پێگەی رۆشنبیران لە کۆمەڵگا کراوە و دیموکراتییەکاندا،

دەروازەیەکە بۆ "تیۆری کرداری پەیوەندی" کە بە سەرەکیترین و گرنگترین بەرهەمی تیۆریی ئەو دادەنرێت.




بەڵام پێش تاووتوێکردنی تیۆری هابرماس لەمەڕ رۆڵی رۆشنبیران، پێویستە سەرەتا ئاماژە بە رۆڵی ئەو بکەین وەك یەکێك لە رۆشنبیرانی کۆمەڵگای ئەڵمانی و بیریارێك کە بیرو بۆچوونەکانی لە دەرەوەی سنوورەکانی ئەورووپای رۆژئاواشدا سەرنجی کۆڕە زانستی و ئەکادیمیایەکانی بەخۆوە خەریك کردووە.

ئەو چەندین ساڵە لە رێی خستنەڕووی تیۆر و گریمانەکانی خۆی و رەخنەگرتن و تاوتوێکردنی بیروبۆچوونی ئەوانی دی، ئامادەبوونێکی چالاکانەی لە وتوێژە فەلسەفییەکاندا هەبوو و لەرێی بەشداریکردنی کاریگەرانە لە وتووێژە کۆمەڵایەتییەکان و دانوستان لەبارەی کێشە سیاسییەکانی سەردەم، هەوڵی داوە کاریگەری لەسەر رای گشتی هەبێت.

هابرماس نزیکەی سێ دەیەیە کە هەم لە وتوێژە فەلسەفیەکانی مەزهەبی پۆزێتیفیزم، بەشداریدەکات و هەم رەخنەش لە تێڕوانینی فەیلەسوفانی فەرەنسی دەگرێت، هەم بە دیدێکی رەخنەگرانەوە سەیری بزاڤە ناڕەزاییەکەی قوتابیانی زانکۆ لە ئەورووپای رۆژئاوا لە دەیەکانی شەست و حەفتاو ئاکامەکانی دەکات و هەم بەشداریدەکات لە وتووێژی مێژوونووسان سەبارەت بە بێوێنەبوونی کوشتاری جوولەکەکان لە سەردەمی رایشی سێیەمدا.

رەخنەگرتن لە چۆنیەتی یەکگرتنی هەردوو ئەڵمانیا یەکێك بووە لەو بابەتانەی کە هابرماس بایەخیان پێدەدات، بێئەوەی دووربکەوێتەوە لەو وتووێژانەی کە لەو ساڵانەی دواییدا لەبارەی مۆدێرنیزم و پۆستمۆدێرنیزم ئەنجام دراون. سەرەڕای مشتومڕکردن لەبارەی ئەو قەیرانەی رووبەڕووی رۆشنبیرانی ئەورووپی و بەتایبەتی رۆشنبیرانی چەپی ئەڵمانی بۆتەوە، بێئاگا نەبووە لە باسکردنی کێشەی فراوانبوونی رۆژ لەدوای رۆژی توندڕەوە راستڕەوەکان لە کۆمەڵگاکانی ئەورووپیدا و ئەو ململانێ و پێکدادانە توندوتیژانەی کە نازییە نوێیەکان لە دژی بیانییەکانی نیشتەجێی ئەڵمانیا و بەتایبەت لەگەڵ بیانییە نائەورووپییەکاندا بەکاری دێنن.

لەکاتێکدا کە لە زانکۆی فرانکفۆرت وانەی فەلسەفە دەڵێتەوە، بەشداریشدەکات لە خۆپیشاندان لە دژی شەڕو کوشتاری موسڵمانانی بۆسنی هێرزەگۆڤین. هابرماس وتارە رۆشنبیری و کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانی خۆی بە زۆری لە هەفتەنامە بایەخدارەکانی وەکو "شپیگل" و "دی تسایت" دا بە چاپ دەگەیەنێت، کە هەردووکیان پرخوێنەرترین و بەکاریگەرترین بڵاوکراوەی ئەڵمانی زمانن. لەناو بەرهەمەکانیدا ناونیشانی وەکو "بیرکردنەوە دوای میتافیزیکا" و "یاسا و دەوڵەتی یاسایی دیموکرات" یش

بەرچاو دەکەون، کە یەکەمیان باس لە فەلسەفەی تیۆریی کلاسیك و دووەمیان باس لە کێشەکانی فەلسەفەی سیاسی دەکات.

نازناوی "وتووێژخوازترین رۆشنبیری ئەڵمانیا" یان داوەتە پاڵ هابرماس. بەڵام رازی وتووێژ لەودا شتێکی زیاترە لەو وتووێژە رۆشنبیرییانەی کە بە زۆری بۆ رازیکردنی شەخسیی ئەنجام دەدرێت. بەدواداچوونی وتووێژە فەلسەفی و سیاسییەکانی هابرماس یەکێکە لە رێیەکانی چوونە نێو جەوهەری بیروڕاکانی و دەروازەیەکە بۆ چوونە نێو مەبەستە سەرەکییەکانی.

مەیلی وتووێژکردن لە هابرماسدا بە واتایەك ئاماژە بە پەیوەندی (بیر) و (کردار) دەکات کە تێیدا لەجێی ئیدیعا کۆنەکان، باس لە گونجانی تێزە فەلسەفیەکان لەگەڵ ژیانی مرۆڤدا دەکرێت. دەشێ فەلسەفەی هابرماس بە وەڵامێك دابنێین بۆ بنبەستی "رەخنەی عەقڵ" لە "تیۆری رەخنەیی" قوتابخانەی فرانکفۆرت. بەڕای ئەدۆرنۆ و هۆرکهایمەر، "عەقڵی بە گشتی کراو" بەرهەمی کاری مرۆڤ بووە لێرەشەوە بووە بە هۆکار و ئامێری باڵادەستی و سەرکوتکردنی تاك کە بە درێژایی مێژوو هەمیشە و هەموو کات زاڵ بووە.

ئەم تێڕوانینە نێگەتیڤە بۆ فەلسەفەی مێژوو لە دوایین ساڵەکانی تەمەنی ئەدۆرنۆدا بووە هۆی نائومێدبوونی لەرادەبەدەری، باروودۆخێکی ئەوتۆ کە وەك هابرماس دەڵێ "شانۆی دراماکانی سامۆئیل بێکت" ی بیردەهێنایەوە. ئەدۆرنۆ ئەو پرسیارە بێوەڵام دەهێڵێتەوە کە دەڵێ ئایا دەشێ رەخنەیەکی مەعقول لە "عەقڵی بەشتبوو" هەبێت؟ بەڵام لەبەرئەوەی کە بەبڕوای ئەو عەقڵ هەمیشە حاکم بووە، وەڵامی ئەدۆرنۆ بۆ ئەم پرسیارەش بێگومان دەبێ نەرێ بێت.

تێڕوانینی هابرماس رێك دەکەوێتە خاڵی بەرامبەری ئەو تیۆرەوە. ئەو ئامادە نییە عەقڵ بۆ "کار" و "فەرمانڕەوایی" کورت بکاتەوە. بە رای ئەو تازەکردنەوەی بەرهەمهێنانەوەی رەگەزی مرۆڤ تەنیا بە مەبەستی کارێکی دیاریکراو ئەنجام نادرێت، بەڵکو "پەیوەندیکردن و لێك گەیشتن"ی نێوان مرۆڤەکانیش دەگرێتەخۆ. بەبڕوای ئەو گەشەکردن و فراوانبوونی پەیوەندی و توانای دروستکردنی لێك حاڵیبوون، دوو هۆکارن کە سەقامگیریی و سەلامەتیی کۆمەڵگا دابین دەکەن.

کەواتە لەپاڵ "عەقڵ ئامێری" دا، "عەقڵی پەیوەندی" یش دێتە بوونەوە کە لە ناوەڕۆکدا پرۆسەیەکی کلتورییە و لەسەر بنەمای گەشەی بیروڕاکان دامەزراوە. هابرماس پێی وایە لەراستیدا ئەو کۆمەڵە پێوەرە رەفتاریانە بایەخیان هەیە کە لە گوتارە عەقڵانیەکانەوە سەریانهەڵدابێ و هەتا بکرێ هەموو ئەو کەسانەش بگرێتە خۆ کە بەچەشنێك سەروکاریان لەگەڵیدا هەیە. ئەو بنەما ئیعتیبارییەی کە رۆشنگەری دایڕشت، لێرەدا وەکو کەرەستەی پالاوتنی عەقڵ کاردەکات. لێکگەیشتنی نێوان مرۆڤەکان لای هابرماس خاوەن پێوەرێکی تایبەتە کە بەپێی ئەوە رەخنەگرتن لە عەقڵی مەعقول شیاو دەبێت و هەر لەو رێیەشەوەیە کە "تیۆری رەخنەیی" دەبێتە شتێکی شیاو. هابرماس هاوکات لەگەڵ کەمکردنەوەی لایەنە هەستی و سۆزییەکانی "تیۆری رەخنەیی" ، زەمینەیەك خۆشدەکات کە بەپێی ئەوە گفتوگۆ و وتووێژ و گوتار دەتوانێت دووبارە لە بوارێکی بەرفراواندا دەستپێبکاتەوە.

پاش داڕشتنی ئەم تێزە، ئیدی هەموو بەرهەم و بۆچوونەکانی هابرماس لە دەوری "کرداری پەیوەندی" دەخولێتەوە کە بە گەشەسەندن و

پەرەسەندنی، تیۆرێك هەر بەو ناونیشانەوە دادەڕێژرێت. ئەو لە كتێبی "تیۆری كرداری پەیوەندی" دا كە بەناوبانگترین و گرنگترین بەرهەمیەتی. هابرماس لە پاڵ باس و تاوتوێكردن و رەخنەگرتن لە بۆچوون و بیروڕای زۆرێك لە بیریارانی زانستە كۆمەڵایەتییەكان و ڕووبەڕووبونەوە لەگەڵ گرنگترین قوتابخانە فەلسەفی و كۆمەڵناسیەكان، بە خستنەروو و ڕوونكردنەوەی چەمكگەلێكی نوێ. سنووری تیۆریەكە خۆی دەستنیشان دەكات.

ئەو لەبەرهەمەكەیدا هەوڵیداوە رەگوریشەی دەوڵەتی یاسایی دیموكرات بدۆزێتەوە. لەو ڕووەوە خوێنەر لەناو بەرهەمەكانیدا هەمیشە ڕووبەڕووی سەرچاوەی سەرەكیی بیرەكانی ئەو دەبێتەوە كە سەبارەت بە پەیوەندی عەقڵ و بواری گشتییە.

## پێشینەی مێژوویی زاراوەی "ڕۆشنبیر"

هابرماس لە تیوریەكانی خۆیدا، ڕۆڵی دێرینی بیریاری كۆمەڵگا بە چالاكی نواندن لە دووكایەی سەربەخۆ و لە هەمان كاتدا پێكەوە بەستراوە دابەش دەكات: *لەلایەك وەكو بیریار و توێژەرێك كە لەگەڵ هاوكارەكانی خۆی وتووێژی "پسپۆڕی" ئەنجام دەدات و لەو ڕێیەوە لەبواری پەرەسەندن و فراوانكردنی تیۆرەكان و سەرهەڵدانی گریمانەی نوێ و دامێنەرە لەلایەكی دیكەوە وەكو ڕۆشنبیرێكی كۆمەڵایەتی بە مەبەستی ڕۆشنگەری، لە وتووێژە گشتییەكانی كۆمەڵگادا بەشداری دەكات و هەوڵدەدات لەڕێی بەشداریكردن و هاتنە ناو مەیدانی بابەتەكانی سەردەم و پێشكەش كردن و پێشنیار بۆ چارەسەركردنی كێشە باوەكانی ناو كۆمەڵگا، كاریگەری هەبێت لە پرۆسەی پەرەسەندن و چاكبوونەوەی دۆخی باودا.*

بەم پێیە ئەركێكی نوێ دەكەوێتە سەرشانی فەیلەسوفان و نووسەران كە تەنیا بە تیۆرانی و سەرگەرمیی زهنیی تاكەكەسییەوە سنوردارنابێت، بەڵكو لەوە بەدواوە لەپاڵ بابەتە پسپۆڕی و ئەبستكراتەكاندا، هەڵدەستن بە رەخنەگرتنی ئاشكرا و تاووتوێكردن و توێژینەوەی ڕووداوەكانی ناو كۆمەڵگاش. بەڵام بۆ درێژەدان بە باس و لێكۆڵینەوە و پەرەپێدانی ئەم تیۆرەیە، وا چاكترە بەدوای پێشینەی مێژوویی "ڕۆشنبیر" دا بەو شێوەیەی كە لەم وتارەدا جێی سەرنجە بگەڕێین.

زاراوەی "ڕۆشنبیر" بۆ یەكەمجار لە فەرەنسا و لەمیانی دادگایەك كە بۆ چاوخشاندنەوە بە بارودۆخی ئەفسەرێكی جولەكە "ئەلفێرد دریفۆس" پێكهێنرابوو، چەمك و واتای ئەمڕۆیی خۆی وەرگرت. لە كانوونی دووەمی ساڵی 1898 ی زایینیدا "ئەمیل زۆلا"، نووسەری فەرەنسایی، لە یەكێك لە ڕۆژنامەی فەرنسادا نامەیەكی كراوەی بەناوی "من تاوانبارەكەم" بڵاوكردەوە كە بۆ سەركۆماری فەرەنسای نوسیبوو.

زۆلا لەو نامەیەدا لە دژی رای ئەو دادگایەی كە حوكمی دورخستنەوەی ئەبەدی بە تاوانی جاسوسی بۆ ئەڵمانیا بۆ دریفۆس دەركردبوو سوپا و دادگای بەكاری دژی یاسا تاوانباركرد. یەك ڕۆژ دوای بڵاوكردنەوەی نامەكراوەكەی زۆلا، بەیاننامەیەك بە ئیمزای زیاتر لە سەد بیریار و نووسەری ناسراو لە هەمان ڕۆژنامەدا بڵاوكرایەوە كە بە توندی ناڕەزاییان دەربڕیبوو لە نایاساییبوونی ئەو دادگایەی ئەفسەر دریفۆسی تێدا دادگایی و تاوانبار كرابوو.

ئەو بەیاننامەی کە لە رای گشتیدا بە "مانیفێستی رۆشنبیران" ناوی دەرکرد و بەخێرایی لە ئەوروپادا بڵاوبۆوە و رای گشتی فەرەنسای خستە ژێر کاریگەری خۆیەوە، بووە هۆی سەرهەڵدانی قەیران لە ناوخۆی فەرەنسادا و پایەکانی کۆماری سێیەمی فەرەنسای خستە لەرزەوە.

بەهۆی هەوڵ و تێکۆشان و رۆشنگەری رۆشنبیران و ئاگادار بوونەوەی رای گشتی لە چۆنیەتی رووداوەکە، دادگای تێهەڵچوونەوە پێکهات و دەنگی بۆ بێتاوانی مرۆڤێك دا کە بە ناحەق بە زیندانی ئەبەدی مەحکوم کرابوو و پاش ماوەیەکی درێژ، رێز و حورمەتیان بۆ گەڕانەوە. سەرکەوتنی رۆشنبیرانی فەرەنسا لە "کێشەی دریفۆس" دا کە لە راستیدا بە رزگاربوونی کۆماری سێیەمی فەرەنسا لە کەوتنە ناو زەلکاوی "بۆناپەرتیزم" یش لەقەڵەم دەدرا، پێگەیەکی تایبەتی بە رۆشنبیرانی فەرەنسایی بەخشیو رۆڵو کاریگەری ئەوانی لەناو کۆمەڵگاو رای گشتیدا زیادکرد. "ئەناتۆل فرانس" لەو سەردەمەداپێناسەیەکی "رۆشنبیر" ی کرد کە لە جۆری خۆیدا تازەبوو. ئەو "رۆشنبیران" ی بەو *کۆمەڵە پێگەیشتووەی کۆمەڵگا ناوبرد کە بەبێئەوەی ئەرکێکی سیاسیان پێ سپێردرابێت - جگە لە چالاکی نواندن لە چوارچێوەی پیشەی خۆیان،خۆیان لەو کاروبارانەشدا هەڵدەقورتێنن کە پەیوەندی بە بەرژەوەندیی گشتیی کۆمەڵگاوە هەیە وکاردانەوەی خۆیان نیشان دەدەن.*

ئەم رووداوە بەرادەیەکی زۆر پێگەی رۆشنبیرانی لە فەرەنسادا جێگیرکرد، پێگەیەك کە کەسایەتیە کولتووریەکانی پاریس - لە ئەمیل زۆلاوە بگرە تا ژان پۆل سارتەر - لە گۆڕەپانی چالاکییە کۆمەڵایەتیەکانی خۆیاندا هەمیشە بەشێوەیەکی کاریگەر کەڵکیان لێوەرگرت.

## رۆڵ و پێگەی رۆشنبیران

ئەو کەسایەتییە نموونەیی‌یەی کە هابرماس لە دارشتنی تیۆری خۆیدا سەبارەت بە رۆل و پێگەی رۆشنبیران لەبەرچاوی گرتووە، "هاینریش هاینە" (1797 - 1856) شاعیرو نووسەری ناوداری ئەڵمانیایە کە بەشێکی گەورەی مەعنەوی ئەو بریتیبوولە تێکۆشان لەپێناوی وەدەسهێنانی ئازادی و هەوڵدان بۆ ئەمێشتنی نایەکسانیە کۆمەڵایەتیەکان و بەرگریکردن لە بەرامبەر دەستێوەردانی دەوڵەت لەبەرهەمی بیریاران و نووسەران و هونەرمەندان هەر لەبەر ئەو هەڵوێستانەی ناچار چەندین ساڵ لە دەرەوەی نیشتمان ژیانی بەسەربرد و دوور لە نیشتمانیش سەری نایەوە. شیعر و نووسینەکانی هاینە ئاوێنەی دۆخی ئاڵۆزی سیاسی و کۆمەڵایەتیی ئەوروپای نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەی زایینی و رەنگدانەوەی رووداوەکانی شۆرشی 1848 ی ئەڵمانیایە.

ئەوەی لە هەموو شتێك زێتر هاینەی ئازار دەدا سانسۆرکردنی بەرهەمەکانی نووسەران و شاعیران بوو لە ئەڵمانیادا کە لە ئەنجامدا بە قەدەغەکردنی بڵاوبوونەوەی بەرهەمەکانی ئەو و هەندێ لە نووسەران گەیشت. ئەنجومەنی نوێنەرانی فرانکفۆرت لە ساڵی 1835 دا یاسایەکیان پەسندکرد کە بەپێی ئەوە بەرهەمی کۆمەڵێك نووسەر و شاعیر - و لەوانەش هاینە - کە بە گروپی "ئەڵمانیای لاو" بەناوبانگ بوون، لە بڵاوکردنەوە قەدەغەکران.

دەستەی فەرمانرەوا لەرێی دەرکردنی ئەم یاسایەوە دەیویست رێ لە سەرهەڵدانی ئەو

بارودۆخە بگرێت کەلە فەرەنسادا سەریهەڵدابوو و راستەوخۆ کۆسپ بخاتە سەر رێی خۆ دەرخستنی رۆشنبیران لە گۆرەپانی سیاسەت ئەو کاریگەریەی رەنگە لەسەر رای گشتی دابنێن. لە راستیدا رۆشنبیران لە هێزی کاریەدەستانی سانسۆردا بەمامانی بە زەبری (بالقوة) لەدایکبوونی رایگشتیی بە سیاسیبوو دەژمێردران کە دەبوایە بەهەر شێوەیەك بێت رێ لە نفوز و بڵاوبوونەوەی بیروبۆچوونی ئەوان لەنێو خەڵکدا بگرێت.

چاکترین و کاریگەرترین رێگە بۆ گەیشتن بەم ئامانجەیان بە سانسۆر کردنی بەرهەمەکانی نووسەران و هونەرمەندان و لە کاتی پێویستدا رێگرتن لە بڵاوبوونەوەی نووسینەکانیان دەزانی. بەڵام ئەو ئەنجامەی کە لە سیاسەتی سانسۆرکردنی بەرهەمەکان و قەدەغەکردنی نووسەران لە نووسین کەوتەوە ئەوە بوو کە سەرنجی رای گشتی بۆ ئەو بەرهەمانە و خاوەنەکانیان زیادی کرد.

گرووپی "ئەڵمانیای لاو" و لە پێشەوەی هەموانیش هاینە، بەهۆی نارەزایی دەربڕین لە نووسەرانی نەوەی رابردوو، هەروەها بە رەخنەگرتن لە گۆشەگیریی هەڵچووانەی "یۆهان فۆلفانگ گۆتە" لە ساڵەکانی کۆتایی تەمەنیدا، مژدەی دەستپێکردنی قۆناغێکی نوێیان دەدا کە تێیدا تێفکرین و قووڵبوونەوە لە رابردوو و تاوتوێکردنی تەنیا لایەنە ستاتیکییەکانی ئەدەبیات، جێی خۆی بۆ بزاڤ و کردار و هەنگاونان لەپێناوی رەخنەلێگرتن و چاکسازیکردنی دۆخی باو و تاووتوێکردنی کێشە و گرفتەکانی ئەمرۆ و بنیاتنانی سبەی چۆڵ دەکات. هاینە دەیگوت: خوا، بەو شێوەی کە گۆتە پێی وابوو، بەشێوەیەکی یەکسان لە هەموو شتێکدا بەرجەستە نابێت، کە ئەو بەپێی ئەوە خۆی تەنیا بە چەند وتەزایەکی وەکو "گۆرانی بارودۆخی گیاکان" و "تیۆری رەنگەکان" و ئەناتۆمی کردنو و سەیرکردنی ئاسمان و هەورەکان سەرگەرم دەکرد.

بەرزترین جێی دەرکەوتنی خوا لە بزاڤ دایە، لە کردار و لە زەمان دایە. لاپەڕەکانی مێژوو بە هەناسەی پاکی پەروەردگار هەڵدەدرێنەوە کە لە راستیدا پەیام و کتێبی سەرەکیی ئەوە... کردار منداڵی قسەکردنە: قسە جوانەکانی گۆتەش بێ منداڵ. هاینە لەو بڕوایەدابوو کە ئەرکی ئەخلاقیی هونەرمەندان و رۆشنبیران ناسینی ئەو هێزی بزوێنەرەیە کە دەبێتە هۆی گۆڕانکاریی کۆمەڵایەتی. جگە لەمەش هەوڵدان بۆ کاریگەری خستنە سەر پرۆسەی ئەو گۆڕانگارییە و بەشداربوون لە فۆرمەلەبوونی بونیادی کۆمەڵایەتی و سیاسیی کۆمەڵگاش بە بەشێك لە ئەرکە ئەخلاقییەکانی ئەوان دەزانی. ئەو هەروەها رۆشنبیران و رۆشنگەرانی کۆمەڵگای ئاگادار دەکردەوە کە نەکەن لەچاوپێداخشاندنەوەی بەردەوامی جیهانبینی خۆیان و (لەکاتی پێویستدا) راستکردنەوەیدا غافڵ بن.

هابرماس بۆچوونەکانی هاینە دەکاتە بناغەی تیۆری خۆی سەبارەت بە رۆڵی رۆشنبیران. بە رای ئەو رۆشنبیرانیش بەسەقامگیریی فۆرمەلەبوونی سیستەمی پەرلەمانی رۆڵێکی تایبەتیان دەکەوێتە ئەستۆ. لەوە بەدواوە وەرگرانی ئەوان بواری گشتیە کە لە ژێر کاریگەری چالاکیی حزبە سیاسیەکان و هۆیەکانی گەیاندنی گشتی دا دروستبووە. هەڵبەتە رای

گشتیی بە سیاسیبوو تەنیا لە کاتی سەقامگیربوونی حکومەتی یاسادا دەتوانێت ببێتە هۆکارێك و بەهێزکەرێك بۆ گەشەکردنی هۆشیارانەی بیروڕا دیموکراتیکەکان.

لەودۆخەدا و لەژێر ئەو هەلومەرجەدایە رۆشنبیران پێگەی واقیعی خۆیان بەو شێوەیەی کە هابرماس بۆی دیارکردوون، دەدۆزنەوە.

هەڵبەتە هابرماس لە بیروڕاو تیۆرەکانی "ماکس ڤیبەر" (1864 -1920). کۆمەڵناسی ئەڵمانیایی لەمەڕ رۆڵی رۆشنبیران ئاگادارە، کە دەکەونە بەرامبەر بۆچوونەکانی ئەو و هاینەوە و لە وتارێکدا لەژێر ناونیشانی "هاینریش هاینە و رۆڵی رۆشنبیران لە ئەڵمانیادا" بەرپەرچی بۆچوونەکانی (ماکس ڤیبەر) دەداتەوە. ڤیبەر رۆشنبیران لەخۆ هەڵقورتاندن لە کاروباری سیاسیدا ئاگادار دەکاتەوە و دەستێوەردانی سەرگەرمییانەی نووسەران و فەیلەسوفان لە کاروباری سیاسیدا، بەرابواردن و گەشتوگوزارێکی زهینی سەرنج راکێش دەزانێت کە لە بۆشاییدا و بەبێ هەستکردن بە لێپرسراوێتی و بەبێ وەستان لەسەر راستی و واقیعی کاروباری سیاسی ئەنجام دەدرێ. لە حاڵێکدا سیاسەتمەدارانی شارەزا بە واقیعبین، زانا، کارزان و ئامادەی وەرگرتنی لێپرسراوێتی دادەنێت و گۆڕەپانی کاروباری سیاسیان پێ دەسپێرێ.

لێرەدا ئەو پرسیارە دێتە ئاراوە کە ئایا ئاراستە وەرگرتن و هەڵوێست وەرگرتنی ئەو رۆشنبیرانەی کە ڤیبەر رێیان لێ دەگرێ دەستبخەنە کاروباری سیاسیی کۆمەڵگاوە، رێکو راست لە هەمان ئاراستەی بۆچوونەکانی بەرەی هاینەدا بووە؟ ئایا رۆشنبیرانی ئەڵمانیا لەسەردەمی جەنگی یەکەمی جیهانیدا، کەسایەتیی کۆمەڵایەتیی هاینە و بنەمای "وەرگرتنی لێپرسراوێتی" ئەویان کردبووە نمونەی خۆیان؟

سەرەتا ئەوەیە کە لە ئەڵمانیاشدا بە هەستێکی تایبەتەوە چاویان بڕیبووە "کێشەی دریفۆس" و دەرئەنجامەکانی ئەوکێشەیە و رۆڵی رۆشنبیرانی فەرەنسایی لەو رووداوەدا. دووەم، پێویستە بزانین کە توێژێك بەناوی رۆشنبیر، وەك ئەوەی جێی سەرنجی هاینەبوو، لەو سەردەمەدا لە ئەڵمانیادا پەیدا نەبیوو. سەرەڕای ئەوانە، رای گشتی لە ئەڵمانیادا نەك تەنیا هیچ رۆڵێکی رۆشنبیرانەی نەدەبەخشی، بەڵکو بەکارهێنانی زاراوەی "رۆشنبیر" یش هەمیشە روویەکی سلبی هەبوو بەشێوەیەکی گشتی "رۆشنبیر" بەو کەسە دادەنرا کە جگە لە نارەزامەندی هیچ رۆڵێکی دیکەی نییە.

راشکاوانە دەتوانین بڵێین تا ساڵی 1933 (ئەو ساڵەی هیتلەر دەسەڵاتی سیاسی ئەڵمانیای خستە ژێر رکێفی خۆیەوە) ژمارەی ئەو نووسەر و توێژەرانەی کە هەوڵیاندا دیموکراسیەکی مرۆڤخوازانەی جێی سەرنج و پەسەندی هاینریش هاینە بە رای گشتی بگەیەنن و بڵاویبکەنەوە، لە ژمارەی پەنجەکانی یەك دەست تێنەدەپەڕین. هەتا نووسەری ناودار و رۆشنبیران وەکو "هاینریش مان" و "ئەلفرێد دوبلین" یش نەدەوێران وشەی "رۆشنبیر" بەمانا ئیجابییەکەی بەکاربهێنن. لەوەش سەرنجراکێشتر ئەوەبوو کە هەتا ئەو کەسانەی دەیانویست زاراوەی رۆشنبیر بە مانا ئیجابی و بەسوودەکەی بەکاربهێنن، لە وشەی "رۆشنبیر" خۆیان دەپاراست و لەجێی ئەوە زاراوەگەلێکی وەکو "بیریاران" یاخود "مرۆڤە بیریارەکان" یان بەکاردێنا. چەپەکانیش هەر بەو شێوەیە رۆشنبیرانیان بە "کرێکارانی فیکری" لەپاڵ "کرێکارانی دەستی" ناودەبرد.

بە کورتی تا سەرەتای شەڕی دووەمی جیهانی، رەخنەگرتن لە رۆشنبیران لە راستیدا لەلایەن رۆشنبیران خۆیانەوە و بەبێ بوونی رۆشنبیران ئەنجام دەدرا. تەنها دوای کۆتایی هاتنی شەڕ بوو کە توێژێکی رۆشنبیری سەریهەڵدا کە خۆی بەو ناوەوە ناونا و نووسەران و شاعیران و هونەرمەندان و هەروەها توێژەرانیش بەرەبەرە لەو لێپرسراوێتی و رۆڵە ئاگاداربوونەوە کە وەکو رۆشنبیر و رۆشنگەر لە بەرامبەر کۆمەڵگادا هەیانە.

هابرماس لە وتاری "هاینریش هاینە و رۆڵی رۆشنبیران لە ئەڵمانیادا" وێڕای ئاماژەکردن بە "کێشەی دریفۆس"، پێناسەیەکیش لە رۆڵی رۆشنبیران - وەك جێی پەسەندی ئەو و هاینەیە- بە دەستەوە دەدات کە دوورنییە لەو پێناسە روون و ئاشکرایەی "ئەناتۆل فرانس" کە پێشتر ئاماژەمان پێکرد.

بە رای هابرماس کاتێك رۆشنبیران بە بەکارهێنانی توانای وتاربێژی و بەیارمەتی بەڵگە (هەندێجار) زیادەڕۆکانیان هەڵدەستن بە بەرگریکردن لە مافە ژێرپێخراوەکان و راستیە سەرکوتکراوەکان و پشتیوانیکردن لە ئەنجامدانی چاکسازی و داهێنانە تازەکان و پەرەسەندن و گەشەکردنی دواخراو، بە پلەی یەکەم روویان لەو بیروراگشتیانەیە کە نەك تەنیا لەو کاروبارانە تێدەگات، بەڵکو هۆشیار و ئاگادارە و ئامادەی کاردانەوەیە.

هەر لێرەدا پێویستە بڵێین بنچینەی فەلسەفەی سیاسی هابرماس لەسەر بنەمای "خۆپاراستن لە توندوتیژی و پیادەکردنی هێز" دامەزراوە و کاتێك باسی (کاردانەوەی) هاووڵاتیان دەکات، مەبەستی کاردانەوەیەکە لە سنووری یاسای بنچینەیی کە دوورە لە توندوتیژیەوە. لە کۆمەڵگایەکی دیموکراتیکدا، ئەوە تەنیا هۆشیاری و ناڕەزایی دەربڕینی دەست بەجێی هاووڵاتیانە کە ئەگەری سەرپێچیکردنی دەستەی فەرمانڕەوا لە یاسا سنووردار دەکات. ئەگەر لە رابردوودا سەرۆکی پەرلەمان بە "پاسەوانی یاسای بنچینەیی" دادەنرا، ئەوا لەلای هابرماس ئەم ئەرکە خراوەتە سەرشانی هاووڵاتیانی کۆمەڵگا.

لێرەوە یاخیبوونی رەوای هاووڵاتیان دژی قبوڵکردنی هەندێ یاسای دانراو، تا ئەوکاتەی لە چوارچێوە و سنووری یاسای بنچینەییدا ئەنجام بدرێت، گەرچی لەسەرنجی یەکەمدا بە "نافەرمانی و سەرپێچی" دێتە بەرچاو، بەڵام لەبەرئەوەی یاسا و سیاسەت لە کۆمەڵگا کراوە و دیموکراتیکەکاندا بەردەوام لە حاڵەتی گونجاندن و نوێبوونەوە دایە، ئەم سەرپێچیە رووکەشانەیە لە یاسا دەشێ بۆ راستکردنەوە و داڕشتنەوەی یاسا کاریگەر و بەکەڵك بێت. بە مانایەکی دی گەل پاسەوانی یاسای بنچینەیی و دادوەری دواییە.

هەڵبەتە شتێکی بەڵگەنەویستە کە دەبێ یاخیبوون لە ئەرکە یاساییەکان سنوورێکیش هەبێت بۆئەوەی رێ لە ئاڵۆزی و ئاژاوە بگیرێت. سەرەتا دەبێ یاخیبوون لە یاسای دانراو ئەوکاتە بخرێتە نێو بەرنامەی ئیشکردنەوە کە هەموو توانا یاساییەکان بۆ ئاگادارکردنەوە و هۆشیارکردنەوەی زۆرینە و راکێشانی سەرنجی بەرپرسان بۆ کەموکوڕی و سەرپێچییەکان، بە هیچ ئەنجامێك نەگەیشتبێ. سەرەڕای ئەمەش پێویستە یاخیبوان هەنگاو و کارەکانیان بە هەنگاوێکی رەمزی دابنێن، نەك وەك رێگەچارەیەکی سیاسی. لەو رووەوە دەبێ لە

هەڵبژاردنی ڕێ و شێوازی خۆیان زۆر وردبین بن و بەهێزی و لاوازی کاردانەوەکانیشیان دەبێ لەگەڵ گرنگی بابەتەکەدا بگونجێ، نەك تەنیا پشت بە بیروباوەڕی پێشڕەوانە و بیروڕای پێشکەوتوو یان جیهانبینی تاکەکەسی و پاڵنەرە زاتییەکان ببەستن. پێش هەموو شتێك پێویستە دان بەوەدا بنێن کە جیاوازییەکی سەرەکی هەیە لەنێوان کاردانەوەی ئەو هاووڵاتیانەی کە دان بە ڕەسمیبوونی دەوڵەتەکەیان دا دەنێن و ئەوانەی دان بە ڕەوایەتی دەزگای دەوڵەت دا نانێن و بە زۆردار لەقەڵەمی دەدەن.

بەرگریکردنی جۆری دووەم لە سیستەمێکی دیموکراتیدا هیچ ڕەوایەتیەکی نییە، ئەوە لە کاتێکدا ئەم کارە لە بەرامبەر سیستەمێکی دیکتاتۆریدا دەشێ ڕەوایەتی وەربگرێت. لەڕاستیدا باشترین ڕێگەی ناسین و لێکجیاکردنەوەی حکومەتە یاساییەکان لە حکومەتە ناشەرعیەکانیش لە جۆر و چۆنیەتی ئەو کاردانەوەیەدایە کە هەموو حکومەتێك لە بەرامبەر هاوڵاتیانی بەرهەڵستکار و یاخیدا دەری دەبڕێت.

پشت بەستنی ڕۆشنبیرانیش کەم تازۆر بە ئەرکی نیمچە سەرکەوتووی دەوڵەتی یاساییەوەیەو هیواو و دڵنیابوونیشیان بەدامەزراوە دیموکراتیکەکان کە تەنیا بە ئیلتیزامکردنی ئەو هاووڵاتیانە توانای درێژەدان بە ژیانیان هەیە کە بە ئازایەتی و بوێری و هەروەها بە گومان و نیگەرانییەوە، هەمیشە چاودێریی ئەرك و گۆڕانکارییەکانی ئەو دامەزراوە دیموکراتییانە دەکەن.

دواتر هابرماس بۆ نەهێشتن و لابردنی هەرجۆرە بەهەڵە تێگەیشتنێك لەو ڕۆڵەی کە بۆ ڕۆشنبیرانی لەبەرچاو گرتووە، ئاماژە بۆ دوو خاڵی سەرەکی دەکات:

یەکەمیان: بریتیە لەوەی کە ئیلتیزامی زانایان و ڕۆشنبیرانی کۆمەڵگا بە ئیشکردن لە بواری گشتی و هەوڵدان بۆ کاریگەری خستنە سەر پرۆسەی گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتی و سیاسیەکان، نابێ ببێتە هۆی تێکەڵاوبوونی چالاکییە زانستی و کولتوورییەکان لەگەڵ هەوڵ و کۆششە کۆمەڵایەتییەکان و کارکردنیان لەناو کێشە سیاسیەکانی کۆمەڵگادا.

دووەم خاڵ: پەیوەندی بە جۆر و چۆنیەتی ئەو ئیلتیزامەوە هەیە کە ڕۆشنبیران لە ئەستۆی خۆیانی دەگرن. لەم بارەوەش نابێ کاریگەری سیاسی خستنە سەر رای گشتی لەگەڵ ئینتیماکردن بە ڕێکخراوێکی سیاسی تایبەت یان بەشداریکردن لە دەزگای حکومەتێکدا و هەوڵدان بۆ وەدەستهێنانی دەسەڵاتی سیاسی تێکەڵ بەیەك بکرێت.

سەرچاوە:

ئەم وتارە وەرگێڕدراوی بەشی دووەمی وتارێکی خوسرەو ناقدە بەناوی "نقش و مقام روشنفکران" کە لەو سەرچاوەیەی خوارەوە بڵاوکراوەتەوە:

(اطلاعات سیاسی - اقتصادی، سال یازدەهم، شمارە 117-118، خرداد وتیر 1376).

# رەخنەو تۆژینەوە

- کەسی شۆڕشگێڕ کێیە؟

- توندوتیژی دژی ژنان و کچان لە جیهاندا

- گەشتێک بەنێو هەندێ لێکۆڵینەوەدا لەسەر ئاینەکەی (مانی)

- سەبارەت بە تێزی تورک لە مێژوودا

- ریشەی دیموکراسی لە کوردستاندا

# کەسی شۆڕشگێڕ کێیە؟

■ ئەریك فرۆم

● و. ئازاد بەرزنجی

چەمكی (كەسێتیی شۆڕشگێڕانە) چەمكێكی سیاسی - دەروونناسییەو لەم روانگەیەوە وەك (كەسێتیی دەسەڵاتخوازانە) وایە كە لە سی ساڵ لەمەوبەرەوە هاتۆتە بواری دەروونناسییەوە.

چەمكی (كەسێتیی دەسەڵاتخوازانە) ئاوێتەیەكە لە گوتاری سیاسی (بونیادی دەسەڵات لە دەوڵەت و خێزاندا) و، گوتاری دەروونناسی (بونیادی كەسێتی كە لەسەر بنچینەی بونیادی سیاسی یا كۆمەڵایەتی فۆرمەلە دەبێت).

چەمكی كەسێتیی دەسەڵاتخوازانە لە هەندێ زەمینەو بەرژەوەندیی دیاریكراوی سیاسییەوە سەرچاوە دەگرێ. دەورووبەری ساڵی 1930 لە ئەڵمانیا، ئێمە دەمانویست ئەوە روون بكەینەوە كە ئەگەری شكستی هیتلەر تا چ رادەیەكە.[1] ئەو دەمە، زۆربەی خەڵكی ئەڵمانیا، بەتایبەتیش كرێكاران و كارمەندان ئەیاری نازیزم بوون. ئەمانە لە هەڵبژاردنە سیاسی و رێكخراوەییەكانی خۆیاندا ئەوەیان دەرخست كە هەوادار و خوازیاری دیموكراسین. مەسەلەكە ئەوە بوو ئایا گەر كۆڕی خەبات هاتە پێشێ ئەو خەڵكە بۆ بەرگریكردن لەو بیروباوەڕەیان دێنە مەیدانەوە یان نەء؟

گریمانەكەی ئێمە ئەوە بوو كە (ڕا - Opinion) شتێكەو (باوەڕ - Conviction) شتێكی ترە. بەواتایەكی دی هەركەسێك دەتوانێ رایەكی هەبێت، ئەمە وەكو فێربوونی زمانێكی بێگانە وایە. بەڵام ئەو بیروقەناعەتانەی كە لە بونیادی كەسێتیی تاكەكاندا رەگیان داكوتاوە و هێز بەكەسێتی دەدەن و گەشەی پێدەدەن، بە "باوەڕ" لەقەڵەم دەدرێن، كاریگەریی بیروڕاكان لەسەر تاكەكەس، بەتایبەتیش وەختێ كە

لەلایەن زۆربەی خەڵکیەوە قبووڵ دەکرێن و دەردەبڕڕێن، تاڕادەیەکی زۆر پەیوەندیی بە بونیادی کەسێتیی ئەو تاکەکەسەوە لە هەلومەرجە ناسکەکاندا هەیە. هەروەکو بوکرات وتویەتی و فرۆیدیش روونی کردۆتەوە، "کەسێتی، چارەنووسی تاکەکەسە". هەر بونیادی کەسێتیە ئەوە دیاریدەکات کە تاکەکەس کام بیروڕایانە قبووڵبکات و تا چ ئەندازەیەک. فرۆید لە پێناسەکردنی چەمکی کەسێتی‌دا، ئەم مەسەلەیە بە گرنگترین مەسەلە دەزانێت. فرۆید گوتویەتی کە کەسێتی چەمکی تەقلیدیی رەفتار باڵادەکات و ئەو رەفتارەی کە هێزێکی دینامیکیانەی هەیە رێکیدەخات. بەجۆرێك کە تاکەکەس نەك هەر بەشێوەیەکی دیاریکراو بیردەکاتەوە، بەڵکو بیرکردنەوەی لە مەیل و هەست و سۆزەکانیەوە سەرچاوە دەگرێ.

ئەو مەسەلەیەی ئەو دەمەی ئێمە خستمانە روو بەمجۆرە بوو:

ئایا کرێکاران و کارمەندانی ئەڵمانی تا چ رادەیەك دەتوانن بونیادی کەسێتی‌یەکی نەیار بەرامبەر بیروباوەڕی دەسەڵاتخوازانەی نازیزم لەخۆیاندا بخەنەروو؟ لەم مەسەلەیەوە پرسیارێکی تریش دێتە پێشەوە: کرێکاران و کارمەندانی ئەڵمانی تا چ رادەیەك لە هەلومەرجە قەیراناوی و ناسکەکاندا لەگەڵ نازیزمدا دەجەنگن؟

پاش توێژینەوەکە ئەنجامەکە ئەوە بوو کە (10٪) ی ئەو کرێکار و کارمەندانەی توێژینەوەکەی ئێمە دەیگرتنەوە خاوەنی بونیادی کەسێتی‌یەك بوون کە ئێمە پێمان دەوت "کەسێتی دەسەڵاتخوازانە". بەڵام 15٪ یان خاوەنی کەسێتیی دیموکراتیك بوون. ئەوانی دی (نزیکەی 75٪) خەڵکانێك بوون کە بونیادی کەسێتیان تێکەڵەیەك بوو لەو دووانە.[2] بەپێی گریمانەکەی ئێمە "دەسەڵاتخوازان" نازی‌یە پەتی‌یەکان بوون و "دیموکرات" ەکانیش نیمچە سەربازانێکی دژ بە نازیزم بوون. بەڵام زۆربەکەی تر، نە ئەمیان و نە ئەویان بوون. ئەوە بوو رووداوەکانی ساڵانی 1933–1945 سەلماندی کە ئەم گریمانەیەی ئێمە بە جیاوازییەکی کەمەوە، تەواو وردو راست دەرچوو.[3]

بۆ سەلماندنی ئەو بۆچوونەمان هێندە بەسە ئاماژە بۆئەوە بکەین کە بونیادی کەسێتیی دەسەڵاتخواز لەڕاستیدا بونیادی کەسێتیی کەسێکە کە لە سەرێکەوە بە تەسلیمبوون بە هێزێکی ترو پشتبەستنی رەمزی بە خاوەن پلەوپایەو دەسەڵاتەکان هەست بەهێزو شوناسی خۆی دەکات، لەسەرێکی تریشەوە دەسەڵاتێکی رەمزیی بەسەر کەسانێکدا هەیە کە تەسلیمی ئەو دەبن یان پشتی پێ‌دەبەستن.

واتە کەسێتیی دەسەڵاتخوازانە ئەو دەمە هەست بە هێزو شوناسی خۆی دەکات کە خۆی لە خزمەتی دەسەڵاتێکی بە رواڵەت پایەداردا دەبینێتەوە و دەبێتە بەشێك لەو دەسەڵاتە و، لەهەمان کاتیشدا لەڕێی بەکارهێنانی دەسەڵاتەوە بەرامبەر خەڵکێك کە لەژێر دەستی ئەودان، گەشە دەکات. لە راستیدا ئەم حاڵەتە رەنگدانەوەی نەخۆشیەکی ئیزدواجیانەی ئازاردان و ئازارچەشتنە کە هەستی دەسەڵات و شوناس بەو دەبەخشێت.

ئەو (واتە کەسێتیی دەسەڵاتخوازانە _ و _) کە دەبێ بە بەشێك لە بەشەکانی گەورەیەك (ئیدی ئەو گەورەیە هەرچییەك بێت) خۆی بە گەورە دەبینێت. ئەگەر بە تەنیا بمێنێتەوە، خۆی لەخۆیدا هەرەس دەهێنێت. هەربۆیە، هەڕەشەکردن لە دەسەڵاتداران و کەوتنەمەترسیی بونیادی دەسەڵاتیان، لەواقیعدا بەهەڕەشەیەك دەژمێردرێ بۆ سەر کەسێتیی دەسەڵاتخوازانەی ئەوکەسە (واتە هۆکارە وجودی

و ئەقلانیەکانی دەگەوێتە مەترسییەوە). لەم ڕووەوە ئەو بەناچاری دژ بەو هۆکارانە دەوەستێتەوە کە مەترسی بۆ سەر دەسەلاتخوازی دروستدەکەن. چونکە بەم ڕێگەیە لە ڕاستیدا لەپێناوی پاراستنی هۆکارەکانی بوون و ژیانی خۆیدا دەجەنگێت.

بۆ پێناسەی (کەسێتیی شۆڕشگێرانە) دەبێ لەوەوە دەستپێبکەین کە کەسێتیی شۆڕشگێرانە چی نییە. لە ڕاستیدا مەرج نییە کەسێتیی شۆڕشگێرانە کەسێك بێت کە لە شۆڕشەکاندا بەشداری دەکات. ئەم مەسەلەیە بە وردی خاڵی جیاوازی نێوان ڕەفتارو کەسێتیی دینامیکییە، بە چەمکە فرۆیدییەکەی. هەموو کەسێك لە بەر هەر هۆیەك بێت دەتوانێ لە شۆڕشێکدا بەشداریبکات، بەچاوپۆشین لەوەی چ هەستێکی هەیە یان لەسەر چ بناغەیەك پەیوەندیی بەشۆڕشەوە کردووە. بەلام ئەو خاڵە کە ئەو وەکو شۆڕشگێرێك ڕەفتار دەکات، خۆی لەخۆیدا هەندێ دەرکەوتەی کەسێتیی ئەومان بۆ دەخاتە ڕوو.

خاڵی دووەم لەوەدا کە کەسێتیی شۆڕشگێرانە چی نییە، تاڕادەیەك گرفتامێز و ئاڵۆزە. کەسێتیی شۆڕشگێرانە (ئاژاوە خواز) نییە. مەبەست لە (کەسی ئاژاوەخواز) چییە؟[4] من کەسێك بە ئاژاوەخواز دەزانم کە بۆئەوە رقی لە دەسەلاتێك نابێتەوە لەبەرئەوەی دەسەلاتێکی بێزراوە یان بەگوێرەی ویست و خواستی ئەو نییە، بەلکو لەبەرئەوەی دەیەوێ ئەو دەسەلاتە سەرنگون بێت تا دواتر خۆی جێی بگرێتەوە و دەسەلات بگرێتە دەست. لە زۆربەی جارەکانیشدا ئەم جۆرە کەسە کە بە ئامانجی خۆی دەگات، بە هەمان ماهیەتی دەسەلاتی پێشوو و بەلکو لەو خراپتریش دەست بە مەحکەمکردن و فراوانکردنی دەسەلاتی خۆی دەکات.

دەتوانین نموونەیەکی ئاشکرای کەسێتییەکی ئاژاوەخواز لەمێژووی سیاسیی سەدەی بیستەمدا بهێنینەوە، بۆ نموونە کەسێکی وەکو (ڕەمزی ماکدۆنالد)، کە سەرەتا وەکو کەسێکی ئاشتیخواز و بەرگریکار لە ویژدان دەرکەوت و، کاتێکیش دەسەلاتی گرتە دەست، دەسبەرداری پارتی کرێکاران بوو و چووە ڕیزی هەمان ئەو دەستەوتاقمانەی دەسەلاتەوە کە ساڵانێکی زۆر دژیان خەباتیکردبوو. ئەو هەر لە سەرەتای چوونە نێو دەوڵەتی میللییەوە، بە هاوڕێ و هاوخەباتی دێرینی خۆی (سناودن) دەڵێت: (تازە من و ئێوە کوجا مەرحەبا؟ ئێستا هەموو ژنە دۆقەکانی لەندەن تامەزرۆی ئەوەن ئەملاولام ماچکەن.)

ئەمە نموونەی تەواوی ئاژاوەگێرێکە کە بە ئاژاوەگێڕی دەگاتە دەسەلات. جاری وایە ساڵانێك دەخایەنێ تا ئەم شتانە دەردەکەون و جاری واشە زووتر. بۆ نموونە کەسێتییەکی وەکو (لاڤیل ی بەدبەخت) بهێننەوە یادی خۆتان کە وەکو ئاژاوەخوازێك لە پاریس دەرچوو و، لە ماوەیەکی زۆر کورتدا هەموو سەرمایەی سیاسیی خۆی فرۆشت. دەتوانم زۆر نموونەی تری ئەم کەسێتیانە بهێنمەوە. بەلام هەموویان چوونیەکن. لەوانەیە بڵێن ژیانی سیاسیی سەدەی بیستەم گۆڕستانێکە پڕ لە گۆڕی ئەخلاقیی خەڵکانێك کە سەرەتا لافی شۆڕشگێڕێتیان لێداوە، کەچی دوایی هیچ نەبوون جگە لە کۆمەڵێك ئاژاوەگێڕی هەلپەرست.

خەسڵەتێکی تر کە کەسێتیی شۆڕشگێڕانە شکی نابات و تاڕادەیەك لە خەسڵەتەکانی کەسێتیی ئاژاوەگێڕ ئاڵۆزترە، ئایدیالیزم (میسالیەت) ە. کەسێتیی شۆڕشگێڕانە، ئایدیالیست نییە. شۆڕشگێڕەکان لەڕووی ڕەفتارەوە بەزۆری ئایدیالیستن. لێرەشدا، لانی کەم بەلای منەوە، جیاوازیی نێوان ڕەفتاری

سیاسی و بونیادی کەسێتی ئاشکراو دیارە. مەبەست لە ئایدیالیست چییە؟ بەبۆچوونی من ئەو کەسێك نییە کە خاوەنی (باوەڕ) بێت. (ئەمڕۆ وەکو مۆدێکی لێهاتووە، ئەگەر کەسێك خاوەنی کۆمەڵێك بیروباوەڕبوو پێیدەڵێن ئایدیالیست، و ئەگەر باوەڕیشی نەبوو یان لە باوەڕی خۆیدا نەرمیی پیشاندا، پێیدەڵێن "واقیعی").

من لەو بڕوایەدام کە لە روانگەی دەروونشیکاریی کلینیکیەوە، کەسی ئایدیالیست کەسێکە کە خاوەنی خودشەیدایی (نێرگسیەت) یەکی فرەیە. لەڕاستیدا کەسێتییەکی دەروونپەرێشانە (نائومێدییەکی تێکەڵ بەخۆگەورەزانی)، کە وەکو هەردەروونێکی تری نەخۆش لەدنیای دەوروبەری خۆی جیایەو پێی نامۆیە. بەڵام ڕێگاچارەیەکی لەبەردەمدایە کە ئەو لە دەروونپەرێشان جیادەکاتەوە. ئەو خۆی بە بیانوویەکەوە (هەر بیانوویەك بێت، سیاسی، ئایینی، ... هتد) بەستۆتەوە و کردوویەتی بە کۆڵەکەی بوونی و بە بتێك و، بە تەسلیمبوونی تەواوەتی بەرامبەر بەو بتەی خۆی، بە مانا و گەرمیی ژیان دەگات. لە هەلومەرجەکانی تەسلیمبوونیدا، شوناسی خۆی لەو بتە دەسەنێت، بتێك کە خۆی قوتی کردۆتەوە و رەهایی (موتڵەقیەت) ی پێبەخشیوە.

ئەگەر بمانەوێ رەمزێك بۆ کەسێتییەکی ئایدیالیست هەڵبژێرین، دەبێ پێی بڵێین "سەهۆڵی ئاگرین". چونکە هاوکات لەگەڵ ئەوەدا کە خوێنگەرم و بەکەفوکوڵە، ساردوسڕیشە. ئەو بەتەواوەتی لە جیهانی دەوروبەری خۆی دابڕاوە و لە هەمانکاتدا پڕە لە هەست و سۆزی گەرم. ئاوێتەیەکە لە هەستی چالاکانەو حەز بەبەشداریکردن و تەسلیم بوون بەرامبەر موتڵەق. بۆ پەیبردن بە کەسێتیی ئایدیالیست، نابێ گوێ لە قسەکانی بگرین، بەڵکو دەبێ بڕوانینە ئەو بریسکە تایبەتییەی لە نیگایدایە و سروشتی ساردوسڕی کە لەواقیعدا دەربڕی ئەو دژایەتییە کە لەنێوان ئایدیالیزمەکەی و رەنگدانەوەی نەبوونی پەیوەندییەتی لەگەڵ جیهان و ملکەچی و تەسلیمبوونیەتی بە بتەکەی. ئایدیالیست لە کەسێك دەچێت کە پێغەمبەرەکان ناویان ناوە "بتپەرست". پێویست ناکات ئەوە بهێنینەوە یادمان کە ئایدیالیستەکان هەمیشە رۆڵێکی گەورەیان لە گۆڕانکارییە مێژووییەکانی جیهاندا بینیوە و هەرچییەکیان گوتووە، روون و ئاشکرابووە. هەروەکو کەسێتیی شۆڕشگێڕانە کە کەسێکی راشکاوە.

هەوڵدەدەم روونیبکەمەوە کەکەسێتیی شۆڕشگێڕانە چ شتێك نییە. لەو بڕوایەدام کە ئەمڕۆ چەمکی کەسێتیناسیی شۆڕشگێڕانە، چەمکێکی زۆر گرنگە. هەروەکو چۆن چەمکی کەسێتیی دەسەڵاتخوازانەش دەشێ هەمان گرنگیی هەبێت. لەڕاستیدا ئێمە لە چاخی کۆمەڵێك شۆڕشدا دەژین کە لە سێسەدە لەمەویەرەوە هەر لە ئاژاوە سیاسییەکانی بەریتانیا و پاشان فەرەنسا و ئەمریکاوە دەستی پێکردووە و بە شۆڕشە کۆمەڵایەتیەکانی روسیا و چین و ..هتد ئێستاش لە ئەمریکای لاتین دا بەردەوامە.

لەم چاخە شۆڕشگێڕانەیەدا، وشەی "شۆڕشگێڕ" لە زۆر پنتی جیهاندا وشەیەکی دڵڕفێنە و وەکو چۆنیەتییەکی پۆزەتیڤانە خراوەتە پاڵ گەلێ بزاوتی سیاسی. لە راستیدا هەموو ئەو بزاڤانەی کە سوود لە وشەی "شۆڕشگێڕ" وەردەگرن، لافی کۆمەڵێك ئامانجی چوونیەك لێدەدەن: واتە ئەوەی کە لە پێناوی "ئازادی" و "سەربەخۆیی" دا خەبات دەکەن. بەڵام لە پراکتیکدا هەندێکیان وان و هەندێکیان وانین.

واتە هەندێکیان بەڕاستی بۆ ئازادی و سەربەخۆیی خەبات دەکەن و هەندێکی تریشیان بەتەنها سوود لە دروشمەکانیان دەبینن، بەڵام ئامانجیان بەرقەرارکردنی سیستمی دەسەڵاتگەرایە. تەنها بەو جیاوازییەی کە ئەمجارەیان خۆیان لەجیاتی دەسەڵاتدارەکانی پێشوو دەسەڵات بگرنە دەست.

## چۆن دەتوانین پێناسەی "شۆڕش" بکەین؟

ئەگەر بمانەوێ لە سنوورە فەرهەنگیەکەیدا پێناسەی شۆڕش بکەین، دەبێ بە سادەییەوە بڵێین کە شۆڕش سەرنگونکردنی توندوتیژانە یان ئاشتیئامێزانەی حکومەتی حوکمڕانە و دانانی حکومەتێکی نوێیە لەجێگەکەی. هەڵبەت ئەم پێناسەیە پێناسەیەکی ڕەسمیی سیاسییە. دەکرێ لە ڕوانگەیەکی مارکسیستیەوە شۆڕش بە جێگرتنەوەی سیستمێکی باڵاتری مێژوویی لەجێی ئەو سیستمە لەقەڵەم بدەین کە لە ئارادایە: بێگومان لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوەو ئەویش ئەوەیە کە ئایا سیستمێکی باڵاتری مێژوویی لە ڕوانگەو هەڵسەنگاندنی چ کەسێکەوە؟ بەڵام بەشێوە باوەکەی براوەکانی ئەم ململانێیە (لانی کەم لە وڵاتی خۆیاندا) لافی نوێنەرایەتیی سیستمێکی باڵاتری مێژوویی لێدەدەن.

سەرەنجام، دەتوانین لە ڕوانگەی دەروونناسییەوە شۆڕش پێناسە بکەین. بەگوێرەی ئەم ڕوانگەیە، شۆڕش بریتییە لە بزوتنەوەیەکی سیاسی بە ڕابەرایەتیی کەسانێك کە خاوەن کەسێتیی شۆڕشگێڕانەن و، دەرەنجام ڕاکێشانی خەڵکی لەڕێی ئەوکەسێتییە شۆڕشگێڕانانەوە. هەڵبەت ئەمە هەموو پێناسەکە نییە. بەڵام بۆ مەبەستی ئێمە لەم وتارەدا کە جەختی سەرەکیمان لەسەر مەسەلەی "کەسێتیی شۆڕشگێڕانە" یە، هێندە بەسە.

سەرەکیترین خەسڵەتی "کەسێتیی شۆڕشگێڕانە" سەربەخۆبوون و ئازادیی ئەوە. بۆ ڕوونکردنەوە، وا چاکترە چەمکی سەربەخۆبوون بەرامبەر بە چەمکی ڕەمزیی وابەستەبوون بە دەسەڵاتدارانی باڵادەست و بێدەسەڵاتانی خوارەوە (هەروەکو لە کاتی ڕوونکردنەوەی کەسێتی دەسەڵاتخوازدا لێی دواین) دابنێین. بەڵام ئەم خاڵە بەتەنیا مانای "سەربەخۆیی" و "ئازادی" ڕوون ناکاتەوە. کێشەکە لەوەدایە کە وشەی وەك سەربەخۆیی و ئازادی ئەمڕۆکە بەوجۆرە بەکاردەهێنرێن کە لە سیستمێکی دیموکراتیکدا هەموو سەربەخۆ و ئازادن. چەمکی سەربەخۆیی و ئازادی لەواقیعدا ڕەگوڕیشەی دەچێتەوە سەر شۆڕشەکانی چینی ناوەند بەسەر سیستمی فیوداڵی (دەرەبەگایەتی) دا هەروەها دژایەتیکردنی سیستمە دیکتاتۆر و تۆتالیتارەکان هێزو مکومیەکی تری پێبەخشین. لە قۆناغی سیستمە فیوداڵی و دەسەڵاتە گشتگیرەکاندا، تاکەکەس نە ئازاد بووە و نە سەربەخۆ. بەڵکو چەوساوەی دەست یاساکانی دابو نەریت و فەرمانی باڵادەستەکان بووە. شۆڕشە سەرکەوتووەکانی بۆرژوازی لە ئەورووپا و ئەمریکادا بوونە مایەی ئازادی و سەربەخۆیی سیاسیی تاکەکەسەکان. ئەم ئازادییە بریتیبوو لە "ئازادبوون لە" و "سەربەخۆبوون لە" دەسەڵاتە سیاسیەکان.

بێگومان ئەم شتانە بە گۆڕانکارییەکی گرنگ دەژمێردران. هەرچەندە ئەمڕۆ ڕەوتی پیشەسازیبوون وتەشەنەکردنی تەکنۆکراتی

شێوەی نوێی وابەستەییان هێناوەتە ئاراوە کە جیاوازە لە پرۆسەی خودسازیو داهێنانی سەربەخۆیانەی بازرگانەکانی سەدەی نۆزدەیەم. بەڵام بەهەرحاڵ، چەمکی سەربەخۆیی و ئازادی گەلێ لەو چەمکانە قووڵترن کە باسمان لێوەکردن. چەمکی سەربەخۆیی لە روانگەیەکی قووڵەوە، بریتییە لە سەرەکیترین لایەنی نەشونماو گۆرانی مرۆڤ.

مناڵێکی ساوا هێشتا لەگەڵ دەوروبەری خۆیدا یەکە و تەبایە. لای ئەو دونیای دەرەوە وەکو راستییەکی جیا لەو بوونی نییە. بەڵام تەنانەت ئەو کاتەش کە مناڵ دەتوانێ شتەکانی دی لەخۆی جیابکاتەوە، هێشتا هەر بێدەسەڵاتەو تاماوەیەکی زۆر ناتوانێ بەبێ یارمەتیی باوك و دایکی بژی. ئەم بێدەسەڵاتییە درێژخایەنەی مرۆڤ بە بەراورد لەگەڵ گیانەوەرانی تردا، یەکێکە لە کۆڵەکە سەرەکییەکانی گەشەسەندنی ئەو، بەڵام لە هەمانکاتدا مناڵ فێردەکات کە پشت بە دەسەڵاتێك (باوك و دایك) ببەستێت و لە دەسەڵاتیش بترسێت.

بەشێوەیەکی سروشتی، باوك و دایکی مناڵێك کەسانێکن کە لەکاتی لەدایکبوونەوە تا باڵقبوون بۆ ئەو مناڵە رەمزی دەسەڵاتن و خاوەنی هەردوو لایەنەکەین. ئەم دوولایەنەش بریتین لە یارمەتی و تەمێکردن. لە قۆناغی باڵقبووندا، لاو دەگاتە قۆناغێك کە تیایدا نەشونمای کردووە و دەتوانێ بۆ خۆی بێت (هەڵبەتە لە کۆمەڵگا سادەکانی کشتوکاڵدا). چیدی ژیانی کۆمەڵایەتیی ئەو بەدایك و باوکیەوە وابەستەنییە. ئەو دەتوانێ تەنانەت لە رووی ئابووریشەوە لە باوك و دایکی سەربەخۆبێت. لە زۆر کۆمەڵگای سەرەتاییدا بۆ سەربەخۆبوونی تاکەکەس (بەتایبەتی لە باوك و دایکی) میهرەجانی ئایینی سازدەکرێ کە لە هەمان کاتدا وابەستەیی ئەو تاکەکەسە بە هۆزەکەوە رەت ناکاتەوە. باڵقبوونی سێکسیش هۆکارێکی ترە کە خێرایی بە پرۆسەی سەربەخۆبوون لە باوك و دایك دەبەخشێت.

ئارەزووی سێکسی و تەقەللا بۆ تێرکردنی، تاکەکەس بەلای خەڵکی دەرەوەی خێزانەکەدا رادەکێشێت، کردەی سێکسی خۆی لەو شتانەیە کە باوك و دایك ناتوانن تیایدا یارمەتیی تاکەکەس بدەن و ئەنجامدانی ئەکەوێتە ئەستۆی ئەو لاوە خۆی. تەنانەت لەو کۆمەڵگایانەشدا کە مەسەلەی تێرکردنی ئارەزووی سێکسی بۆ 5 تا 10 ساڵ دوا باڵقبوون دواوەدەخرێ، ئارەزووی بێدارکراو پێداویستی بۆ سەربەخۆیی لەتاکەکەسدا دەوروژێنێ و وا لە لاو دەکات لەگەڵ باوك و دایك یان خاوەن دەسەڵات و قەرار بەدەستانی نێو کۆمەڵگادا بەیەکدا بێن. کەسێکی ئاسایی ساڵانێك پاش باڵقبوون بەو پلەیە لە سەربەخۆیی دەگات. بەڵام راستیەك هەیە کە نکوڵیی لێناکرێ، ئەویش ئەوەیە کە ئەم جۆرە سەربەخۆبوونە، سەرباری ئەوەی تاکەکەس دەچێتە ژیانی هاوسەرێتییەوە و مناڵ دەخاتەوەو هەتا کۆتایی، ژیانی خۆی بەرێوەدەبات، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە ئەو بە دروستی سەربەخۆیی وەچنگ هێناوە. ئەو گەرچی بە تەمەن گەورەشە، بەڵام هێشتا لە زۆر رووەوە بێدەسەڵات و بێ داڵدەیە و دەبێ بۆ پاراستنی خۆی و بەرگریکردن لەخۆی پەنا بۆ هەندێ دەسەڵات بەرێت. نرخی بەدەستهێنانی ئەو یارمەتیەش وابەستەبوونە بە سەرچاوەکانی دەسەڵاتو لەدەستدانی ئازادی و سەرەنجام لە گەشە وەستانی ئەو. ئەو بیروبۆچوونەکانی لەوان بە قەرز وەردەگرێ. هەست و سۆز و ئامانج و بەهاکانی هی ئەوانە، گەرچی خۆی لەو وەهمەدا

دەمێنێتەوە کە هزر و هەست و سۆز و هەڵبژاردنەکانی لەناخی خۆیەوە هەڵدەقوڵێن.

ئازادی و سەربەخۆیی تەواو وەختێ دێتەدی کە مرۆڤ بۆخۆی بیربکاتەوە، بۆ خۆی هەستبکات و بڕیاربدات. ئەو بەتەنها کاتێك دەتوانێ وەها دڵنیابێت و لەناخەوە رەفتار بکات کە گەیشتبێتە قۆناغی پەیوەندیی دینامیکیانە و خولقێنەرانە لەگەڵ جیهانی دەوروبەری خۆیدا. لەم حاڵەتەدایە کە دەتوانێ ژیانێکی رەسەنی هەبێت. ئەمجۆرە چەمکی سەربەخۆبوون و ئازادبوونە دەتوانین لە هزری عارفانی رەسەن و هەروەها کەسانێکی وەکو (مارکس) یشدا ببینینەوە، یەکێك لە عارفە رەسەنە مەسیحیەکان، واتە مایستەر ئیکهارت دەڵێت: (ژیانی من چییە؟ شتێکە کە لەناخەوە هەڵدەقوڵێت، شتێکە کە لە دەرەوە بە بێگیانی هەڵدەقوڵێت) و یان (... مرۆڤ کە شتێك لە دەرەوە وەردەگرێ و یان لەژێر کاریگەریی ئەو شتەدا بڕیاردەدات. ئەوە شتێکی راست نییە. هیچ کەس ناتوانێ لە دەرەوەی خۆیدا خوا بدۆزێتەوە یان تەجروبەی بکات، بەڵکو هەرچی هەیە لە ناو دەروونی خۆمان و خودی خۆماندایە).

(مارکس) یش هەرچەندە لە راوانگەیەکی نادینییەوە دەڕوانێتە مەسەلەکان، بەڵام بە هەمان شێوە ئەویش دەڵێت: (بوونەوەرێکی زیندوو ناتوانێ خۆی بەسەربەخۆ بزانێ، مەگەر ئەوەی کە خۆی گەورەی خۆی بێت. وەختێکیش گەورەی خۆیەتی کە ژیانی هی خۆی بێت، کەسێك کە لە سایەیبەزەیی و پشتبەستنی بە کەسێکی ترەوە بژی، خۆی وەك بوونەوەرێکی وابەستە دەبینێ، کەوابوو قەرزاری ئەو دەبێ و تەنانەت خولقاندنی خۆیشی بەهی ئەو دەزانێ. لەبەرئەوەی ئەو دەبێتە سەرچاوە بۆی. ئەگەر ژیانی من، دەسکردی خۆم نەبێ. بەپێویست دەبێتە وابەستەی هۆکارێکی دەرەوە."

یان مارکس لە شوێنێکی دیکەدا دەڵێت: "مرۆڤ کاتێك سەربەخۆ دەبێت کە بتوانێ تاکێتی (فەردیەت) ی خۆی وەکو ئادەمیزادێکی کامڵ و تەواو لە هەر پەیوەندییەکیدا لەگەڵ دنیادا (وەکو بینین، بیستن، بۆنکردن، تامکردن، هەستکردن، بیرکردنەوە، ئارەزوکردن و خۆشەویستی) بسەلمێنێ و پراکتیزەبکات. بەکورتی ئەگەر ئەو بتوانێ تەواوی لایەنەکانی تاکێتیی خۆی بەدەست بهێنێتەوە، ئەوا ئادەمیزادێکی سەربەخۆیە". سەربەخۆیی و ئازادی لە راستیدا وەدیهاتن و فۆرمەلەبوونی تاکێتییە، نەك رزگاربوون لە دەسەڵاتی کەسێك و یان ئازادبوون لە مەسەلە ئابووری و بازرگانیەکان.

مەسەلەکانی تاکەکەس بەشێوەیەك لە شێوەکان لەگەڵ ئازادیی ئەودا یەك دەگرنەوە. مرۆڤێکی هوشیار و داهێنەر، مرۆڤێکی ئازادە، چونکە بەشێوەیەکی رەسەن و سەربەستانە دەژی. بوونی خۆی سەرچاوەی ژیانی خۆیەتی. دەبێ ئەوەش بڵێین کە ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە مرۆڤی سەربەخۆ مرۆڤێکی گۆشەگیرو جیایە. راستە کەسێتی و پرۆسەی گەشەسەندنی ئەو لە پەیوەندیدایە بەئەوانی ترو بە جیهانی دەرەوە. بەڵام ئەم پەیوەندییە پەیوەندیی وابەستەبوون نییە. مارکس ئەوەندەی پەیوەندیی بە سەربەخۆیی تاکەکەسەوە هەیە، بەناوی خودسازیو وەدیهاتنی تاکەکەسەوە رەخنە لە کۆمەڵگای بۆرژوازی دەگرێ. لەکاتێکا کە فرۆید لەم بارەیەوە تیۆرەیەکی دی واتە "گرێی ئۆدیپ" دەخاتە روو.

فرۆید لەو بڕوایەدایە کە ساغی و دروستیی زەین لەوەدایە تاکەکەس بەسەر بیرۆکەی جووتبوون لەگەڵ دایکیدا زاڵ بێت و بەمجۆرە، سەلامەتیی زەینی و باڵقبوون لەسەر بناغەی ئازادی و سەربەخۆیی دێتەدی. بەڵام بەبۆچوونی فرۆید ئەم پرۆسەیە سەرەتا بە ترس لە سەرکوتکردنی باوك دەستپێدەکات و بە جێبەجێکردنی ئەمرو نەهییەکانی ئەو و قبووڵکردنیان لە "منی باڵا" دا کۆتایی دێ. لەم رووەوە سەربەخۆبوون "لە دایك" نیوەی پرۆسەکەیەو وابەستەبوون بە باوك و دەسەڵاتە کۆمەڵایەتیەکانەوە لەڕێی "منی باڵا" وە بەردەوام دەبێ.

کەسێتیی شۆڕشگێڕانە کەسێکە کە بە مرۆڤدۆستی نەشونمادەکات و بەمجۆرە سنوورەکان و دزێوییەکانی کۆمەڵگای خۆی تێدەپەڕێنێت. هەر لەبەرئەوە دەتوانێ کۆمەڵگاکەی خۆی و یان کۆمەڵگای تر لە روانگەی ئەقڵ و مرۆڤدۆستییەوە بخاتە بەر رەخنە. کەسێتیی شۆڕشگێڕانە ناکەوێتە داوی شتە وردو درشتەکانی ئەو ژینگە فەرهەنگیەی کە بە رێکەوتێکی زەمانی و شوێنی تیایدا لەدایکبووە و، بەدەستیانەوە گرفتار نابێت. ئەو دەتوانێ بەچاوی کراوەوە بڕوانێتە دەورووپشتی خۆی و لەم روانگەیەوە ئارەزووی داوەری بەدەستەوە بگرێت و لەنێو رێگە جۆراوجۆرەکاندا توانای جیاکردنەوەی باشە لەخراپە (ئەقڵ) بناسێتەوە.

کەسێتیی شۆڕشگێڕانە مرۆڤدۆستی (ئینسانیەت) سەنگی مەحەکیەتی و بەگوتەی ئەلبێرت شڤایتزەر، تامەزرۆییەکی قووڵ و مەیلێکی زۆر و عیشقێکی لەبن نەهاتووی بۆ ژیان هەیە. راستە کە ئێمەش وەکو گیانەوەران پڕ بە ژیاندا دەکەین و لەگەڵ مەرگدا دەجەنگین. بەڵام نووسان بە ژیانەوە شتێکە و عیشق بۆ ژیان شتێکی دی. بۆ زیاتر روونکردنەوە، دەبێ ئەو راستیە ببینین کە جۆرە کەسێتییەکیش هەیە کە لەبری ژیان سەوداسەری مەرگ و وێرانی و نەبوونە (هیتلەر نموونەیەکی زەقی ئەم جۆرە کەسێتیانەیە.) هەروەکو ئۆنا مۆنۆ لەوەڵامی پرسیارێکیدا بە ژەنەراڵ فرانکۆ (کە دروشمی سەرەکیی "بژی مەرگ" بوو) لە ساڵی 1936 دا دەڵێت، ئەمجۆرە کەسێتیە دەکرێ پێی بڵێین "کەسێتیی لەمەرگ راماو."

نابێ لە ناو دەروون و هۆشیاریی مرۆڤدا بۆ مەیل بۆ مەرگ و نەبوون، بگەڕێین، بەڵکو لە کاروکردەوە و رەفتارەکانیدا رەنگدەداتەوە. وێرانی و کاولکردن و فەوتاندنی ژیان بەلای ئەم جۆرە کەسێتییەوە هەمان رەزامەندی و خۆشیی بۆ دروستدەکات کە کەسێتییەکی ژیاندۆست لەئەنجامی گۆڕان و گەشەسەندنی ژیانەوە لای دروستدەبێت. لە مەرگ راماو، راستییەکی لەڕێ لاچووە کە بەرامبەر ژیان بەرەو فەوتان دەچێت.

بیروهەستی کەسێتیی شۆڕشگێڕانە چەکدارە بە ئامرازەکانی رەخنە (یان بە زمانی مۆسیقا، بە کلیلی رەخنە). ئەو دروشمە لاتینیەی کە دەڵێت: (دەبێ گومان لە هەموو شتێك بکەین) لە واقیعدا بەشێکی زۆر گرنگی بەرپرسیارێتیی کەسێتیی شۆڕشگێڕانە بەرامبەر بە جیهان پێکدێنێت. ئەم رۆحیەتە بە هیچ کلۆجێك خۆپەرستانە نییە. بەڵکو تێگەیشتنێکە لە راستییەوە سەرچاوە ئەگرێ و پێچەوانەی خەیاڵاتە کە وەکو جێگرەوەی راستی خۆی بۆ مرۆڤ دەنوێنێ.

کەسێتیی ناشۆڕشگێڕ کەسێکە شانازی بەوەوە دەکات کە باوەڕی بەو شتانە هەیە کە زۆربەی خەڵك باوەڕیان پێیەتی. بەڵام کەسێك

خاوەنی گیانێکی ڕەخنەگرانەبێت تەواو بەپێچەوانەوە ڕەفتار دەکات. بەتایبەتیش کاتێ گوێی لە بیروڕای کۆڕو کۆبوونەوەکانی خەڵکی عەوام و دەسەڵاتداران دەبێت، لەسەر هەڵوێستی ڕەخنەگرانەی خۆی دەمێنێتەوە. خۆ گەر ئەو خەڵکەش مەسیحین (وەکو خۆیان دەڵێن)، کەواتە نابێ کێشەیان بەرامبەر هەڵوێست و ڕوانینەکانی ئەو هەبێت و دژی بوەستنەوە. چونکە لەڕاستیدا ئەم ئاراستەی ڕەخنەگرتنە لە پێودانگە سواو و قبوولکراوەکان، لای مەسیحیش هەبووە. ئەم هەڵوێستە ڕەخنەگرانەیە لای سوکراتیش هەبووە. ئەمە هەڵوێستی پێغەمبەران و گەلێ کەس بووە کەئێمە لەبەر زۆر هۆ ستایشیان دەکەین.

"هەڵوێستی ڕەخنەگرانە" هەڵوێستێکە کە تیایدا ئادەمیزاد بەرامبەر بە شتەکانی ژیانی ڕۆژانە و بیروباوەڕی باوی عەوام کە سواون و هەروەهابەرامبەر ئەو تورەهات و شتە هیچانەش دەوەستێتەوە. کە لەبەرئەوەی زۆربەی خەڵك پەیرەویی لێدەکەن، وادەزانرێ مانایان هەیە.

لەوانەیە نەتوانین بەئاسانی پێناسەی ئەو هەڵوێستە ڕەخنەگرانەیە بکەین کە من لێی دەدوێم، بەڵام ئەگەر کەسێك ئەمە لەگەڵ خۆی و کەسانی تردا تاقیبکاتەوە، بە ئاسانی دەتوانێ ئەو کەسێتییە بناسێتەوە کە خاوەنی هەڵوێستی ڕەخنەگرانەیە، یان ئەوەی خاوەنی نییە.

بۆنموونە چەند ملیۆن خەڵك باوەڕیان وایە کە دەکرێ لەڕێی پێشبڕکێی خۆچەکدارکردنی ئەتۆمییەوە بە ئاشتی بگەین؟ ئەم باوەڕە پێچەوانەی هەموو ئەو ئەزموونانەیە کە لە ڕابردوودا پیایاندا تێپەڕیوین. ئەی چەند کەس بڕوایان وایە گەر دەنگی ئاژێر (ئینزار) هات (لەگەڵ ئەوەشدا لە زۆربەی شارەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا ژێر زەمین و پەناگە دروستکراون) بە زیندوویی دەمێننەوە؟ ئەوان دەزانن کە تەنها 15 دەقیقەیان لەبەردەمدایە. پێویست ناکات کارمەندی بەئاگاهێنانەوە بێت تا بزانیت کە خۆگەیاندنە ژێرزەمین لە 15 دەقیقە زیاتری دەوێت. لەم ماوە کەمەشدا مەرگی ناکاو لەڕێدایە. بەڵام بە ڕواڵەت ملیۆنەها کەس قەناعەتیان بەوەیە کە ژێرزەمینە مەحکەم و پتەوەکانیان بەرگەی بۆمبی 50 تا 100 میگاتەنی دەگرن. بۆچی؟ لەبەرئەوەی ئەو ملیۆنەها کەسانە ڕۆحیەت و هەڵوێستی ڕەخنەگرانەیان لانییە.

ئەگەر منداڵێکی پێنج ساڵان ئەمە ببیستێت، بە زۆری گومانی لادروست دەبێت. منداڵان لەم تەمەنەدا بەشێوەیەکی سروشتی هەڵوێستی ڕەخنەگرانە تریان لە گەورەکان هەیە. گەورەکان فێربوون کە ڕەخنەگر نەبن و هەموو شتێکی هیچ و بێبەها بە شتی مانادار بزانن. کەسێتیی شۆڕشگێڕانە، جگە لە هەڵوێستی ڕەخنەگرانە، پەیوەندیی تایبەتیی لەگەڵ دەسەڵاتدا هەیە. ئەو کەسێکی خەیاڵاوی نییە و دەزانێ کە دەسەڵات مرۆڤ تێکدەشێوێنێ و زەبوونی دەکات و دەیفەوتێنێ. ئەو لەگەڵ دەسەڵاتدا جۆرە پەیوەندییەکی تری هەیە. لای ئەو هیچ کاتێ دەسەڵات پیرۆز نییە و هیچ کاتێکیش لای ئەو جێی حەقیقەت، یا ئاکار و یان خوا ناگرێتەوە.

یەکێك لە گرنگترین مەسەلەکانی ئەمڕۆ، پەیوەندیی کەسەکانە بە دەسەڵاتەوە. مەسەلەکە ئەوە نییە کە دەسەڵات چییە، مەسەلەکە ئەوەیە کە بۆچی دەسەڵات پیرۆز دەبێ و بۆچی ئەخلاقیاتیش دەچێتە ژێر رکێفی دەسەڵاتەوە. ئەو کەسەی دەسەڵات رکێفی ئەخلاقیاتی

دەکات، هەرگیز ناچێتە پێگەی رەخنەگرانەوە و لەئەنجامیشدا هەرگیز کەسێتییەکی شۆڕشگێڕانەی نەبووە و ناشبێت.

کەسێتی شۆڕشگێڕانە توانای ئەوەی هەیە بڵێ "نەء". بە دەربڕینێکی دی، کەسێتیی شۆڕشگێڕانە کەسێتییەکە مل کەچ ناکات. کەسێکە کە خۆپاراستن لە کۆیلایەتی لەلای ئەو رەندی (فەزیلەت) و ئازایەتییە. بۆ زیاتر روونکردنەوە، پتر لەم باسە دەدوێین:

مێژووی مرۆڤایەتی بەخۆڕاگری دەستی پێکردووە. من ئاماژە بۆ میتۆدۆلۆجیای یۆنانی و عیبری دەکەم. لە چیرۆکی ئادەم و حەوادا، فەرمانی خواوەند ئەوە بوو کە لەو میوەیە نەخۆن. کەچی مرۆڤ (بەشێوەیەکی وردتریش بیلێین: ئافرەت) توانیی بڵێ (نەء). ئەو توانیی سەرپێچی بکات و تەنانەت قەناعەت بە پیاویش بکات. ئەنجامەکە چی بوو؟ لە ئەفسانەدا واهاتووە کە مرۆڤ لە بەهەشت دەردەکرێ. واتە مرۆڤ لەنێو هەلومەرجی بەر لە فەردیەت و بەر لە هۆشیاری و بەر لەمێژوویی و یان بەر لە ئینسانیش دەردەکرێ. ئەو هەلومەرجەی کە دەکرێ بە ژینی کۆرپەلەی بشوبهێنین وەختێ لەنێو منداڵدانی دایکیدایە. بەمجۆرە بوو کە ئەو لە بەهەشت دەرکرا و پێی خستە سەر شەقامی مێژوو.

بە زمانی ئەفسانە، ئەو رێی گەڕانەوەی پێنەدرا. بەڵام لەڕاستیدا نەیدەتوانی بگەڕێتەوە. چونکە وەختێ ئەو بەخۆیدا هاتەوە و، هۆشیار بوو بە جیابوونەوەی خۆی لەوی دی و لە سروشت، ئیدی نەیدەتوانی بگەڕێتەوە بۆ هەلومەرجەکانی ئاسوودەیی یەکەمجار و دۆخی بەر لە هۆشیاری. مێژووی مرۆڤایەتی بەم یەکەمین یاخیبوونە دەستی پێ کردو یەکەمین یاخیبوونیش، یەکەمین هەنگاو بوو لە رێی ئازادیدا.

یۆنانییەکان رەمزێکی تر بەکاردەهێنن: پرۆمیتیۆس. ئەوە پرۆمیتۆس بوو کە ئاگری لە خواکان رفاند و گوناهی کرد. ئەویش سەرپێچی کردو بەوەی کە ئاگری بە ئادەمیزادەکان دا، مێژووی مرۆڤ (و یان ژیاری مرۆڤ) دەستی پێکرد.

هەم عیبرییەکان و هەم یۆنانییەکان لەو باوەڕەدابوون کە تەقەللای مرۆڤ و مێژووی مرۆڤ بەسەرپێچی و یاخیبوون دەستپێکردووە. پرسیاری من ئەوەیە ئایا مێژووی مرۆڤ بە گوێڕایەڵی و سەردانەواندن کۆتایی دێ؟ ئەفسوس کە من لێرەدا باس لە حیکایەت و ئەفسانە ناکەم، بەڵکو باس لەڕاستی دەکەم. ئەگەر جەنگێکی ئەتۆمی لە دووسێ ساڵدا نیوەی خەڵکی سەرزەوی بفەوتێنێ و قۆناغی وەحشیگەریی پەتی بێتە پێشەوە، یان ئەگەر ئەم جەنگە دە ساڵ بخایەنێ و تەواوی مرۆڤەکانی سەرزەوی قەلاچۆ بکات. ئەمە هەمان ئەو مانای سەردانەواندنەیە لەلایەن خەڵك و مرۆڤەکانەوە، کە مەبەستی منە. واتە قبوڵکردنی فەرمانی تەقەکردن و ملکەچکردن بۆئەو بیروباوەڕانەی کە دەبنە مایەی هێنانەدیی ئەم هەلومەرجە شێتانەیە.

سەرپێچیکردن (یاخیبوون) چەمکێکی دیالەکتیکییە. لەبەرئەوەی هەرکردەوەیەکی یاخیگەریانە لە راستیدا کردەوەیەکی سەردانەواندنیشە، مەبەستم لەوەیە کە هەر یاخیبوونێك جگە لەو جۆرەی کە ئاژاوە گێڕانەیە، چەشنە سەردانەواندن و ملکەچکردنێکە بۆ پرنسیپێکی دی. من سەرپێچی لە بتەکان دەکەم، چونکە بە فەرمانی خواوەند دەکەم. من نابمە

کۆیلەی قەیسەر چونکە بەندەی خوام. بە زمانێکی نادینیش ئەوەیە کە من بە فەرمانی ئەقڵی خۆم و بە پشتبەستن پێی پەیرەوی لەکۆمەڵێك پرنسیپ و بەها دەکەم. لەوانەیە لە دەوڵەت یاخی بم، لەبەرئەوەی پەیرەوی لە کۆمەڵێك یاسای ئینسانی دەکەم.

کەواتە کە لێرەدا گوێڕایەڵم، هەمیشە جێیەکی تر و شتێکی تر بۆ سەرپێچیکردن هەیە. مەسەلەکە بەتەنها سەردانەواندن و یاخیبوونیش نییە، بەڵکو سەردانەواندن و یاخیبوون لەکێ و لەچی؟

لەو شتانەوەی کە گوتمان، ئەو ئەنجامە بەدەست دەهێنین کە کەسێتیی شۆڕشگێڕانە بەو مانایەی کە من مەبەستمە، تەنها جۆرە کەسێتییەك نییە لە رەهەندە سیاسییەکەیدا، بەڵکو لە ئایین و هونەر و فەلسەفەشدا هەیە. بوودا و پێغەمبەرێکی وەکو عیساو، جیور دانۆ برۆنۆ و مایستەر ئیکهارت و گالیلۆ و مارکس و ئینگلز و ئینشتاین و شڤایتزەر و راسل، هەموو کۆمەڵێك کەسێتیی شۆڕشگێڕ بوون. لە راستیدا تۆش دەتوانیت خەسڵەتی کەسێتیی شۆڕشگێڕانە لە کەسێکدا ببینیتەوە کە لە خانەی ئەو کەسێتیانەی پێشووشدا نییە. کەسێك کە بەراستی "بەڵێ" ی بەڵێیەو "نەخێر" ی نەخێرە. کەسێك کە دەتوانێ حەقیقەت بڵێت، هەروەکو منداڵەکەی چیرۆکی "جلوبەرگە تازەکەی ئیمپراتۆر" ی هانز کریستیان ئەندرسن. ئەو منداڵە دەیبینی کە ئیمپراتۆر رووت و قووتە و ئەوەی کە دەیبینی بە راستگۆییەوە دەریدەبڕی.

دەشێ سەدەی نۆزدەیەم، قۆناغێك بووبێت کە تیایدا یاخیبوون ئاسانتر بووبێت. لەبەرئەوەی سەدەی نۆزدە سەدەی ئامادەگیی دەسەڵات بوو لە خێزانو دەوڵەتدا. هەربۆیە زەمینەش بۆ کەسێتیی شۆڕشگێڕانە خۆش بوو. سەدەی بیستەم سەدەیەکی ترە. ئەم سەدەیە چاخی سیستمە نوێیەکانی پیشەسازی و خولقێنەری ئادەمیزادی رێکخراو (دیسپلینکراو) ە. سیستمە فراوانەکانی بیرۆکراسی کە جەختیان لەسەر رەفتاری نەرم و گونجاوی کەسانێکە کە لە ژێر (چاودێری) دان.

ئەم رەفتارەش وەنەبێ لەرێی زۆرلێکردنەوە بەدیهاتبێت. بەڵکو لەرێی دەستخستنە ناو ئینسانەکان و پەروەردەکردنیانەوە. بەرێوەبەرانی سیستمی بیرۆکراسی لافی ئەوە لێدەدەن کە گوێڕایەڵیی خەڵك بۆ فەرمانەکانیان شتێکە بە ویستی ئەو خەڵکانە خۆیان. ئەوان هەوڵدەدەن لەرێی دابینکردن و رەزامەندکردنی ماددیەوە هەموومان قەناعەت پێ بکەن ئەوە بین کە ئەوان بۆیان دیاریکردووین. ئادەمیزادی دیسپلینکراو کەسێك نییە بتوانێ یاخیبێت. ئەو تەنانەت بەخۆی نازانێت کە ملکەچیشە. ئیدی ئەگەر بەخۆی نەزانێت کە کۆیلە و گوێڕایەڵە، چۆن لە مانای یاخیبوون دەگات؟ ئەو تەنها یەکێکە لە "پاتاڵ" ەکانی کۆمەڵ. ئەو لە کاروباریدا "ورد" ە. بیر لە شتی "مەنتیقی" دەکاتەوەو کاری پێدەکات. تەنانەت گەر ئەو مەنتیقە ببێتە هۆی فەوتاندنی گیانی خۆی و ژن و منداڵەکانیشی. هەر بۆیە بۆ ئادەمیزادی هاوچەرخی بیرۆکراسیەتی سەدەی بیستەم، زۆر قورسترە کە یاخی بێت و خەسڵەتەکانی کەسێتی شۆرگێڕانەی تیابێت.

ئێمە لەچاخێکدا دەژین کە مەنتیقی پارەو مەنتیقی بەرهەمهێنانی کالا، تەواوی ئاستەکانی ژیانی مرۆڤی تەنیوەتەوە. ئادەمیزادەکان بوون بە ژمارە. هەروەکو چۆن کالاکان ژمارەیان

لەسەرە. ئادەمیزادەکان و کاڵاکان دوو چەندێتین بۆ پرۆسەی بەرهەمهێنان.

دووپاتی دەکەمەوە، بەلای کەسێکەوە کە بەخۆی نازانێت گوێڕایەڵ و ملکەچە، زۆر زەحمەتە ببێتە کەسێکی یاخی. بەواتایەکی تر، کێ دەتوانێ بەرامبەر کۆمپیوتەر سەرپێچی بکات؟ چۆن دەکرێ بەرامبەر فەلسەفەیەک کە ئامانجەکەی بە کۆمپیوتەربوونی فەلسەفە و، دابڕان لە ئیرادە و هەست و عاتیفەیە، بگوترێ "نەخێر"؟

بێگومان ئەمرۆ ملکەچی بە ملکەچی لەقەڵەم نادرێ. چونکە ئەم مانایەیان لەژێر پەردەی "تێگەیشتنی هاوبەش" و قبوولکردنی پێداویستیە کۆنکرێتیەکانی کۆمەڵگادا بەئەقڵانی کردووە. گریمان هێزێکی چەکداری کاولکەر لە خۆرئاوا و خۆرهەلاتدا پەیدا دەبێ، کام سەرپێچیە دەکەن؟ لەکاتێکا کە هەموو ئەوەیان قبووڵ کردبێت کە سەردانەواندن بۆ ئەو کارە لەبەر پێداویستیە کۆنکرێتیەکانی کۆمەڵگایە نەک ئیرادەی مرۆڤ، چ کەسێك لە یاخیبوون و وتنی "نەء" ی خۆی قایل دەبێ؟

لایەنێکی تر کە پەیوەندیی بە هەلومەرجەکانی ئێمەوە هەیە. لەم سیستەمە پیشەسازییەدا کە بەڕای من هەم لە خۆرئاوا و هەم لە خۆرهەلاتیشدا رۆژ بەرۆژ لە تەشەنەکردندایە، تارادەی مەرگ ئادەمیزادیان لەڕێی بیرۆکراسیەتی گەورە و مەزنیی (دەوڵەت و بیرۆکراسیەتی پیشەسازی و بیرۆکراسیەتی رێکخراوەکان) ەوە ترساندووە.

ئەو نەک هەر ترساوە، بەڵکو خۆی زۆر بچووک دێتە بەرچاو. ئەو چیدی داوود نییە بە گولیات بڵێ "نەء". ئایا ئەم مرۆڤە بچکۆلەیە دەتوانێ بەرامبەر بە شتێك کە لەچاو پەنجا یا سەد ساڵ لەمەوبەردا هەزاران جار گەورەتر و بە دەسەڵاتتر بووە، بڵێ نەء؟ ئەم مرۆڤە لە ملکەچکردنیدا بۆ دەسەڵات، خۆشحاڵە و ئەو فەرمانانەی پێ قبووڵە کە لەژێر پەردەی ئەقڵ و تێگەیشتنی هاوبەشدا پێی دەدرێ و هیچ تێگەیشتنێکیشی بۆ ئەوە نییە کە خۆی کۆیلە و ملکەچە.

بەکورتی، مەبەست لە "کەسێتیی شۆڕشگێڕانە" مانا رەفتارییەکەی نییە، بەڵکو چەمکە دینامیکیەکەیەتی. لەم روانگەی کەسێتی ناسییەوە، هەر کەسێك دروشمێکی شۆڕشگێڕانەی بەرزکردەوە یا لە شۆڕشێکدا بەشداریی‌کرد، بە کەسێتی‌یەکی شۆڕشگێڕانە لەقەڵەم نادرێ. کەسی شۆڕشگێڕ لێرەدا کەسێکە کە خۆی لە کۆت و پێوەندەکانی خوێن و خاك و پشتبەستنی منالانە بە دەسەلاتی باوك و دایك و خۆسپاردنی تایبەتی بە دەسەلات و چین و رەگەز.. ئازادکردبێت. کەسێتیی شۆڕشگێڕانە بەو پێیەی هەموو ئینسانیەتی لەخۆیدا تاقیکردۆتەوە کەسێکی ئینسانادۆستەو، هیچ شتێك نییە لە ئینسانیەتدا بەلای ئەوەوە نامۆبێت. ئەو عاشقی ژیانە و رێزی لێ‌دەگرێت. ئەو گوماندارە و کەسێکی راستگۆیە.

گوماندارە، لەبەرئەوەی لەگەڵ ئەو ئایدیۆلۆژیا و جیهانبینیانەدا ناکۆکە کە لەسەر هەندێ زەمینەی ناجۆر دامەزراون. راستگۆشە، چونکە باوەڕی بەو هێزە شاراوەیە هەیە کە لە ئارادایە، گەرچی تا ئێستا نەهاتبێتە دیش. ئەو فێرە بڵێ "نەء" و لە توانایدایە لەو هێزانە یاخی بێت کە دەیانەوێ جڵەوی بکەن و کڕنووشی پێبەرن. لەبەرئەوەی رێی گوتنی "بەڵێ" یش دەزانێ بۆ ئەو پرنسیپانەی کە پەیڕەوییان لێدەکات.ئەو کەسێکی خەواڵوونییە، بەڵکو چاوی لە ئاست راستییە تایبەتی و

کۆمەڵایەتیەکانی دەوروبەری خۆیدا کراوەیە. ئەو سەربەخۆیە. ئەوەی کە هەیەتی بەری رەنجی خودی خۆیەتی. ئەو ئازادە و کۆیلەی کەس نییە.

لەم کورتەیەوە رەنگە وا بکەوێتەوە کە ئەوەی دەربارەی کەسێتیی شۆڕشگێڕانە وتمان، زیاتر پەیوەندیی بە هەلومەرجەکانی ساغی و ئاسوودەیی زەینیی مرۆڤەوە هەبێت. بەڵام بەهەرحاڵ، قسەکانی من سەبارەت کەسێکە کە خاوەن ئەقڵە و زیندووە و ساغە.

ئەوەی من دەیڵێم ئەوەیە کە ئەم کەسە کەوتۆتە جیهانێکی شێتەوە. کەسێکی هۆشیار و کامڵ لە جیهانێکی ئیفلیجدا، مرۆڤێکی بێدار و بەئاگا لە جیهانێکی خەواڵوودا. ئەوکەسێکی شۆڕشگێڕە و وەختێ ئەوانی تریش هەموو بێداربوونەوە، ئیدی پێویست بە کەسێکی شۆڕشگێڕ یان رابەر ناکات. ئیدی لەوێ بەتەنها مرۆڤی هۆشیار دەبینینەوە.

هەڵبەت زۆریەی خەڵك کەسانێکی شۆڕشگێڕنەبوون. بەڵام هۆی ئەوەی کە ئێستا ئێمە لە ئەشکەوتەکاندا ناژین ئەوەیە کە لەکۆمەڵگای مرۆییدا بەردەوام کەسانێکی شۆڕشگێڕی وا هەبوون کەئێمەیان لە ئەشکەوت و تاریکیەکان رزگارکردووە. زۆری تریش هەبوون کە تەنها لافی ئەوەیان لێداوە کە شۆڕشگێڕ بوون، بەڵام لەڕاستیدا بەتەنها لە ئاژاوەگێڕ و دەسەڵاتخواز و هەلپەرست بەولاوە هیچی تر نەبوون.

من لەو باوەڕەدام کە دەروونناسان ئەرکێکی زۆر گرنگیان سەبارەت بە لێکۆڵینەوەی جیاوازییەکانی کەسێتیناسی، بەدوور لە جۆرەکانی ئایدیالۆژیای سیاسی، لە ئەستۆدایە. بەڵام بۆئەوەی کە ئەم ئەرکە بەڕێکی ئەنجامبدرێ، دەبێ ئەوانە لانی کەم هەندێ لەو خەسڵەتانەیان تیابێت کە دەربارەی کەسێتیی شۆڕشگێڕانە خستمانەروو. بەڵکو دەبێ ئەوانە خۆیان کەسانێکی شۆڕشگێڕ بن. [*]

(سەرنج: ناونیشانی وتارەکە لە ئەسڵەکەیدا "کەسێتیی شۆڕشگێڕانە" یە -و-)

پەراوێزەکان:

1) ئەم لێکۆڵینەوەیە من و هەندێ لە هاوکارانم، لەوانە دکتۆر. ئا شاختن، بەرنامەڕێژیمان بۆ کرد. دکتۆر پ.لازار سفێلدیش وەکو راوێژکاری ئاماری یارمەتیی داین. ئەم لێکۆڵینەوەیە بەسەرپەرشتیی دکتۆر ماکس هۆرکهایمەر بۆ دەزگای لێکۆڵینەوەی کۆمەڵایەتیی زانکۆی فرانکفۆرت ئەنجامدرا.

2) شێوازی توێژینەوەکە بریتی بوو لە کۆمەڵێك پرسیاری جیاواز کە لە پرسنامەکەدا هاتبوو. وەڵامەکان لەسەر بنچینەی شیکردنەوەی مەیلی دەروونی و نائاشکرای ئەو کەسە هەڵدەسەنگێنران. بۆنموونە لەم پرسیارەدا کە کام کەسێتیی مێژوویی بەلاوە پەسەندە، ئەگەر وەڵامەکە ئەسکەندەری گەورە، قەیسەر، ناپلیۆن بوایە، ئەوا وەڵامدەرەوەکە دەخرایە ریزی دەسەڵاتخوازانەوە. لەبەرئەوەی ئەو مەیلی بەلای کەسێتیی دیکتاتۆرەکان و رابەرانی سەربازیدا هەبووە. ئەگەر وەڵامەکەش بوکرات، پاستۆر، کانت، مارکس و لینین بوایە. وەڵامدەرەوەکە دەخرایە ریزی دیموکراتەکانەوە، لەبەرئەوەی مەیلی بەلای خێرخوازەکانی مرۆڤایەتیدا هەبووە.

3) ئەم مەسەلەیە دووبارە خرایەوە بەرباس و لێکۆڵینەوە. لە لێکۆڵینەوە نوێیەکەدا هەندێ ریفۆرمکاری لە توێژینەوەکەدا کرابوو:

T. W. Adorno and others, The Authoritarian Personality (New York: Harper & Row , Publishers, 1950)

4) بەشێوەیەکی فراوان ئەم خاڵەم لە کتێبی (هەڵاتن لە ئازادی) دا شی کردۆتەوە.

* سەرچاوە: مجلە (چیستا) شمارە 7،6 / اسفند 1377 و فروردین 1378. ص ص 545-555.

# توندوتیژی دژی ژنانو کچان لەجیهاندا

چارلۆت بەنچ

• تۆفیق عەبدول

توندوتیـژی دژی ژنـانو کچـان فراوانـترین پێشێل کردنـی مـافی مرۆڤـه لەجیهانی ئـەمڕۆدا، شێوازەکانی نامرۆڤانـەو ئاشکرانو کاریگـەرییان لەسـەر گەشەسـەندنو پەرەسـەندنو پـەرەپێدان یەکجار قوولو درێژ خایەنە.

ریشـەو بنـەماکانی لـەناو کـەلتوری گـەلانی جیهاندا ئەوەندە شاراوەو تواوەیە کە بەئاسـانی نـابینرێن. لەگـەڵ ئەوەشدا ئـەم وەحشـیگەریە حەتمیو بێ چارەسەر نیە.

کـاتێك زانیمـان، سـەرچاوەی هـێزو گیـانی بـەردەوامییو هۆکـاری راگرتنـی بارودۆخەکـە بەمـەنگی، چیـە، ئـەتوانین لـەکاریان بخـەینو هـەڵیان بوەشـێنین. تەماشـا بکـە، خـەڵکێك بەشێوەیەکی رۆتینـی رۆژانـە، ناچـار ئـەکرێن، پەلامار ئەدرێن، ئەتك (اغتصاب– rape) ئەکرێن، جگـە لـە کۆیلایـەتی سێکسـیو بـەندکردنی کۆمەڵایـەتیو چەوسـاندنەوەو جنێـو پێـدانو شێواندنی روخسارو برینی هـەندێك لـە ئـەندامانی لەشی.. تا ئەگاتە ئەوەی هەندێك دەستی بچێتە خوێنیانو کۆتایی بەژیانیان بێنێت. ئەمـە هـەموو تەنیا لەبەر ئەوەی ئەو خەڵکانە: ئەو ژنانـە، ئـەو کچانە وەکو رەگەزی دووەم لەدایك بون.

لـەوەش زیـاتر تصورکـە، ئـەو ئـازارو ئەشـکەنجەیە بەشـێوەیەکی رێـکو پێـکو سیستیماتیك (نظـامی) لەماڵـەوە لەشوێنی کـارو ناو پۆلو لەناو هۆڵەکانی دادگادا پەیڕەو ئەکرێتو تۆخ تر ئەکرێتەوەو برەوی پێ ئەدرێتو بـەرگریی لێ ئـەکرێت. تەنانـەت لـەکاتی عیبـادەتو دەسـت بازیشدا. ژمارەیەکی کەم تا ئێستاش نکوڵی لەوە ئەکەن، ئەم چینە مامەڵەی تایبـەتی نادروستیان لەگەڵدا کرابێت.

بەڵێ، ئەم چینە هەیەو ئەندامـەکانی نزیکـەی نیوەی سەرجەم مرۆڤایەتی پێك ئـەهێنن، کـەچی هێشـتا بەنارەحـەت ئیعـتراف ئـەکرێت کـە

توندوتیژی دژی ژنانو کچان -کە بۆ هەندێکیان لە سەرپشتی بێشکەوە دەست پێ ئەکات تا شۆڕ ئەکرێتەوە ناوگۆڕ، بەسانایی تەنیا لەبەر ئەوەی توخمی جیاوازە- فراوانترین پێشێل کردنی مافەکانی مرۆڤە لە جیهانی ئەمڕۆدا.

چەوساندنەوەی رەگەزەکەی تر، هەروەها مەسەلەیەکی تەندروستیو گەشەپێدانیشەو کاریگەرییەکی بەهێزی هەیە لەسەر نەوەکانی داهاتو، و کۆمەڵگا بەگشتی. لەناوبردنی ئەم پێشێلکاریو توندوتیژیە زۆر بنەڕەتییە بۆ بنیاتنانی نمونەی کۆمەڵگایەکی ئاسایشو بێوەی، چونکە ئاشتیو ئاسایشیو ناومالٚ بنچینەی ئاشتیو ئاسایشی گشتییە. بەبێ دابین کردنی ئەو ئاشتیو ئاسایشە، نیازو ئارەزووی پێش خستنو گەشەکردنی مرۆڤایەتی تەنیا کارێکی فەنتازیە. بەهەرحالٚ، وروژاندنو دەرگا کردنەوە لەسەر توندوتیژیی دژی مێینە لەجیهاندا وەکو ئەوە وایە لەبەردەرگای ژوورێکی فراواندا بوەستێتو بەهەموو هێزت دژی ئازارەکانت هاوار بکەیت، هاوارەکەت لە تاریکیەکەدا ئەخنکێتو دەنگدانەوەی ناڕەزاییەکەت لەوسەرەوە وەکو دەنگێکی کپ دێتەوە گوێت.

بە لەبەرچاوگرتنی هەندێك راستی لەو ژوورە تاریکەوە -ئەو راستیانەی کە بواری گومان ناهێڵنەوە- کێشەی توندوتیژیی دژی ژنان شایانی ئەوەیە شوێنێکی دیاری لە (بەرنامەی کار-Agenda)ی مافی مرۆڤدا بۆ تەرخان بکرێ.

• نزیکەی 60 ملیۆن ژن کە ئەبوایە ئێستا زیندوبونایە، بەهۆی جیاوازی رەگەزەوە تیاچون، بەتایبەتیش لەباشورو خۆرئاوای ئاسیاو چینو ئەفریقای باکور.

• لە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکاش، کە لەماوەی بیست ساڵی رابوردودا تاوانەکانی دژی ژنان بەردەوام لەبەرزبونەوەدا بووە، هەموو 9 چرکەیەك ژنێك لەلایەن هاوسەرە خۆشەویستەکەیەوە ئازاری جەستەیی ئەدرێت.

• لە هندستان سالآنە زیاتر لە 5000 کچ لەلایەن حەقدارەکانیانەوە ئەکوژرێن لەبەر ئەوەی مارەیی (Dowry) یەکانیان کەمەو کەس نایانەوێت، لەو تاوانکارانەش تەنیا ژمارەیەکی کەمیان ئەدرێنە دادگا.

• لەهەندێك ولآتانی خۆرهەلآتی ناوەڕاستو ئەمریکای لاتین، پیاوسەرزەنشت ناکرێت ئەگەر ژنەکەی بکوژێت لەسەر ناپاکیو دەمەوەریو لەقسەدەرچون، لەسەر بنچینەی بەرگری کردن لەشەرەفو پیاوەتی.

• لەم سالآنەی دوایدا ئابڕوتکاندنو ئەتك کردنی ژنانو کچان لە جەنگەکاندا لەسەر حەوت ولآت تۆمار کراوە، ئەم دیاردە ناشیرینە بەدرێژی مێژوو لەهەمو جەنگەکاندا بەجیاوازیی مەبەستەکانیانەوە، شەرمەزارانە تۆمار کراوە.

• شێواندنی روخساری ژن بە تێزاب ئەوەندە باوە لە بەنگلادیش، لەیاسای سزاکانی ئەو ولآتەدا برگەو سزای تایبەتی خۆی بۆ دیاری کراوە.

• سالآنە نزیکەی دوو ملیۆن کچ (واتە 6000 کچ رۆژانە) خەتەنە ئەکرێن.

هەمان دیاردە لەو ولآتانەدا بەرامبەر نێرینەش ئەکرێت

• سالآنە نزیکەی یەك ملیۆن منالٚ کە زوربەیان کچن ناچاری لەش فرۆشتن ئەکرێن، کە زۆربەیان لەئاسیان. ئەو دیاردەیە بەردەوام لەبرەودایە، وەکو خۆپاراستنێك لەنەخۆشی ئایدز، چونکە وابلآوە هەتا منالٚتر بێتو تەمەنی کەمتر بێت، کەمتر ئەگەری ئەوە هەیە ئەو نەخۆشیەی هەبێت.

کە سەرەتا چاوێك بەئاماری ئەم وەحشیگەریە بەردەوامەدا ئەخشێنی، سەرت سوڕئەمێنێو بەلاتەوە مەعقول نیە، بەلآم

بێگومان راستەو ئەوەی زیاتر جێی داخە ئەم بوارە تا ئێستا بایەخی پێنەدراوەو ئەو دیراسەو لێکۆڵینەوانەی ئەنجام دراون یەکجار کەمن؛ لەوەش خراپتر ئەوەیە زوربەی ئەو تاوانانەی لەم بوارەدا ئەنجام ئەدرێن، دامو دەزگا بەرپرسەکانی لێ ئاگادار ناکرێتەوەو تۆمار ناکرێن.

سەرئەنجام نائومێدی لەوەدایە ئەو تاوانانەی کەدژی رەگەزی مێ ئەنجام ئەدرێن، نەك تۆمار ناکرێنو سزا نادرێن بەڵکو دائەپۆشرێنو بێدەنگەیان لێ ئەکرێت. بێدەنگی لەلایەن کۆمەڵگاو بێدەنگی لەلایەن قوربانیەکان خۆیشیانەوە، لەترسی تۆڵەسەندنەوەو ناوزڕانو ژن بەسەرهێنانو سەرزەنشتو شەرم کردن لەوانەی تاوانەکانیان کردوەو دڵنیابون لەوەی بەپێی دابو نەریت کەس لەتاوانەکانیان ناپێچێتەوەو مانەوەی پیاو لەسەر عەرشی حوکمی خێزان ئەبنە پاساوی ئەو بێدەنگیەو هۆی ئەوەی ئەو کەسانە بەسەریانەوە بچێت.

ئەمە جگە لە چەندین وڵاتو ناوچە کە بەهەر بیانویەك بێت زوربەی پیاوان چەکدارنو لەپاشەکشێو لاوازیی یاسادا چەك حوکم ئەکاتو بەرئەنجامەکەی جگە لە کاولکاریو بەخەستی بەسەر ژنانو کچاندا ئەشکێتەوەو لەریزی پێشەوەی قوربانیە بێ چەکەکانن.

لەگەڵ ئەوەشدا، توندوتیژیی بەرامبەر ژنانو کچان بەدرێژایی مێژوو هەبوە، تەنیا لە دە ساڵی رابوردودا لەسەر ئاستی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی ئاشکرا کراوەو لێکۆڵینەوەی نیزامی دەربارەی ئەنجام دراوەو هەوڵ دراوە ئەوەندە بکرێت لەیاسادا رێو شوێنی تایبەتی بۆ دابنرێت.

لەساڵەکانی نەوەدەکاندا لەسەر ئاستی جیهان، نەهێشتنی تاوان دژی ژنان پشتگیریی بەدەست هێناوەو وەکو پێشێل کردنی مافەکانی مرۆڤ ناسێنرا. ئەمە هەواڵێکی دڵخۆشکەرەو بەرگرتنی هەوڵو تێکۆشانی ژنانە لەپێناوی بەرچاوخستنی کێشەکەیانو، بروایان بەخۆیان پتەوتر ئەکات، بەڵام هەرگیز مانای کۆڵ دانو پشت لێکردنەوە نیە.

لەگەڵ بەرەو کۆتایی هاتنی هەزارەی دووەم، جڵەوی ململانێکە هێشتا لەدەستی پیاودایەو لەبەرژەوەندی ئەودایە. لێکۆڵینەوەکان ئەیسەلمێنن توندوتیژیی هێشتا لەزیادبوندایە، چەوساندنەوەو زوڵم کردن لەژنان بەهەموو جۆرەکانیەوە، هەرەمەکی نیە، بەڵکو بەنەخشەوپلانە، وەکو هەندێك کەس ئەیەوێت لەبایەخی کەم بکاتەوە یان سنورداری بکات، تەنیا لەسەر مەسەلەی شەرەفو سێکسی نیە، بەڵکو روخسارو رواڵەتی کۆمەڵایەتی هەیە کە ئامانجیان: کۆنترۆڵ کردنی ژیانی ژنانو پاشکۆخستنیانە وەکو هاووڵاتی پلە دوو. لەبەر ئەوە هوشیاریو بەئاگایی پێویستە بۆ پاراستنی ئەو کەمە دەستکەوتە ناسکانە بۆ ئەوەی هەنگاوێك زیاتر لەیەکسانی نزیك ببینەوەو کۆتاییەك بۆ ئە و چەوساندنەوە رۆژانەیە دابنێین، کە نەك هەر تەنیا لەپلەو پایەی ژنان دێنێتە خوارەوە بەڵکو شەرمەزارییشە بۆ سەرجەم مرۆڤایەتی.

### دوژمنە رۆح سوکەکە

بۆ دەیان ملیۆن ژنان لەجیهاندا، ئەمڕۆ، ماڵ، سەرچاوەی زوڵمو چەوساندنەوەیە، نەك لەلایەن دوژمنێکەوە کە لە دەرەوە شاڵاو بێنێت، بەڵکو لەلایەن کەسانێکەوە کە لەو ماڵەدا خزمەتیان ئەکات، لەلایەن خزمانو دۆستانو خۆشەویستانو ئەندامانی خێزانەوە.

چەوساندنەوەی خۆماڵیو لەژێر سایەی سەقفی ماڵدا، باوترینو بڵاوترین شێوازی رێزنەگرتنە لەژن لەسەرتاسەری جیهانداو هۆیەکی کاریگەریشە بۆ تێکشکاندنی نەفسیەتو شەخسیەتی ژن لە قۆناغی پێگەیشتنیەوە تا کۆتایی ژیانی.

ئەم جۆرە زوڵمو سوکایەتی پێکردنە، پرۆسەیەك نیە بتوانرێ نەخشەی بنەبڕکردنو یاسای بۆ دابنرێتو پۆلێن بکرێ. چونکە لەپشت دەرگای داخراوەوە رووئەدەنو قوربانیەکان خۆیان قبوڵیانەو پێیان خۆش نیە یان ناوێرن ئاشکرای بکەن.

هەتا لەکۆمەڵگایەکی کراوەی وەکو ئەمریکاشدا، لێکۆڵینەوەکان نیشانی ئەدەن تەنیا یەك ژن لەکۆی سەد ژن، ئازارو ئەشکەنجەو سوکایەتیەکانیان باس ئەکەن. ئامارەکانی تاوان نیشانی ئەدەن زۆربەی ئەو ژنانەی دەستدرێژی کراوەتە سەر ناموسیان ئابڕوبەرەکانیان ئەناسن، هەروەها 40٪ی بکوژانی ژنانیش بەبێ لێکۆڵینەوە ناسراون. لەبەر ئەوەی بەراستی چەوساندنەوەی ناوماڵ شێوازێکی تراجیدی هەیەو لەرێگای خێزانەوە خۆی خزاندۆتە ناو پۆلو جێکارو کەلتورو بیروباوەڕی عەشایەریو تایەفەگەریەوە.

لێکدانەوەیەکی بانکی جیهانی بۆ 35 لێکۆڵینەوەی نوێ لەوڵاتە پیشەسازیەکانو تازە پێگەیشتوەکان ئەیسەلمێنێت 25٪ تا 50٪ی سەرجەم ژنان لەلایەن یەکێك لەئازیزانو، خۆشەویستەکانیانەوە تووشی ئازاری جەستەیی بون.

لەگەڵ ئەوەدا زانیاریمان لەبەردەستدا نیە، وڵاتێك لەگەڵ وڵاتێکی تردا بەراورد بکەین، گومانی تیا نیە چەوساندنەوەی خۆماڵیو ناوماڵی لەناو هەموو وڵاتاندا -بەجیاوازی کەلتورو فەرهەنگو شارستانیەوە- بڵاوە ئامارەکان دەربارەی ئابڕوتکاندنو ئەتك کردن (اغتصاب- Rape) لەوڵاتە پیشەسازیە پێشکەوتوەکانو وڵاتە تازەپێگەیشتوەکاندا ئەیسەلمێنن، شێوازیان یەکەو لەقەوارەدا نزیکن لەیەکەوە. ژنێك لەهەر پێنج ژنێكو لەهەر حەوت ژنێك لەژیانیاندا جارێك دەستدرێژی ئەکرێتە سەر ناموسیان.

لەوانەیە کەسێك وابێت بەخەیاڵیدا، سەربەستیو ئازادی ژنان بۆتە رێگر لەبەردەم چەوساندنەوەو توندوتیژی، بەڵام هێشتا چەوساندنەوەو سوکایەتی پێکردن لەناوماڵدا کۆسپێکی گەورەیە لەرێگای ئەوەی ژنان چێژ لەئازادیو سەربەستی وەربگرن.

لەژمارەیەك وڵاتانی خۆرئاوادا، چەوساندنەوەی ناوماڵ کەوتۆتە بەرهەڵمەتی میدیاو سزای یاسایی، بەڵام هەڵمەتێکی جەماوەریی وا، بۆ زیانەکانیو بنەبڕکردنی نەکراوە، وەك ئەوەی بۆ جگەرەکێشان یان ئوتومبێل لێ خوڕین بەسەرخۆشی، کراوە. لەوەش زیاتر، تا ئەمڕۆش، لەزوربەی وڵاتاندا چەوساندنەوەی ناوماڵی بەپێی یاسا مەسەلەیەکی شەخصیو تایبەتە، لەسنورێکی پیرۆزدا کە ناکرێت ببەزێنرێت..

دەستدرێژی سێکسیو ئەشکەنجەی جەستەیی لەدەرەوەی ماڵدا، لەلایەن یاساوە بەتاوان دائەنرێتو لێ پێچانەوەو سزای هەیە، بەڵام ئەگەر لەچوارچێوەی خێزاندا بوو ئەوا لەزوربەی وڵاتاندا یاسا کەڕو دەستەوسانە. ئەو یاسایەی ئەڕوات تا ئەگاتە بەردەرگای ماڵو لەوێدا ئەوەستێتو لەرووی نایەت لەدەرگابدات، دوڕووەو شەریكو پاسەوانی تاوانبارە.

مەسەلەکە هەر بەوە کۆتایی نایەت، توندوتیژییو دەستدرێژیەکە ئەگەر کۆتایشی بێت، کاریگەریە خراپەکانی وەکو میکرۆبو ماکی نەخۆشی لە جەستەی کۆمەڵگادا ئەمێنێتەوە.

یەکەم، چەوساندنەوەی خێزانی ئاسەوارەکانی ئەگوێزرێنەوە بۆ نەوەکانی داهاتوو. ئەو مناڵانەی باوکەکانیان لەگەڵ دایکیان خراپن، بەردەوام لەلایەن دایکەکانیانەوە ئازار دەدرێن، جگە لەوەش، لێکۆڵینەوەکان نیشانی ئەدەن، ئەو منالانەی لەسایەی شەڕو ئاژاوەی نێوان دایكو باوکدا پەروەردە ئەبن، نەك

هەر هەمان توندوتیژیی لەگەڵ خێزانەکانی دواڕۆژیاندا بەکاردێنن، بەڵکو بەشێك لەتاوانەکانی دژی کۆمەڵگاش ئەمان ئەنجامی ئەدەن. ئەم خولە ترسناکە پێویستە لەکاربخرێت.

دووەم، سەلمێنراوە پەیوەندیەکی هاوسەنگو هاوتەریب هەیە لەنێوان توندوتیژیی لەناوماڵو نادروستیی هەڵسو کەوت لەدەرەوەی ماڵ. ئەگەر توندوتیژیی ناوماڵو مناڵ دژی ژنانو کچان بەشێوەیەکی سیستیماتیك ئەنجام دراو قبوڵ کراو بێدەنگەی لێ کرا، ئەبێت بەخوو، دابو نەریتێکی کۆمەڵایەتی مەقبول.

لێکۆڵینەوەکان بەپێ‌داگرتنەوە نیشانی ئەدەن ئاژاوەی ناوماڵ، سەرچاوەی زوربەی کێشە کۆمەڵایەتیەکانە، وەکو منالآنی سەرجادەو کارکردنی منالّو لەش فرۆشیو دزیو بەنگ کێشی.

سێیەم، مەسەلەکە تەندروستی گشتیشە، ئاژاوەی ناوماڵو چەوساندنەوەی ژنانو کچان، بەشێکی گرنگی کۆمەڵ تووشی کێشەی جەستەییو دەروونیو کۆمەڵایەتی ئەکاتو هەندێ جار بەدرێژایی ژیانی زوڵم لێکراوە کە ئاسەوارەکانی لاناچێت.

چوارەم، ئاژاوەو چەوساندنەوەی ناوماڵ کاریگەرییەکی خراپی بەهێزی هەیە لەسەر گەشەکردنی ئابوریو بەرهەم هێنانی هەموو کۆمەڵگا. ئاشکرایە ئێستا ژنان بەردی گۆشەی گەشەسەندنن. پاراستنی مافەکانیانو چاکردنی باری مرۆڤایەتیان کارێکی پێویستە بۆ گوێزانەوەی کۆمەڵ، لەخێزانی خۆرا-وە، بۆ بەرهەم هێنی خۆراك. ئاواتو ئارەزووەکانی ژنان بۆ کارکردن بەرهەم هێنان بەتوندی لەلایەن نێرینەوە سەرکوت کراوە، نەك تەنیا بەلێدانو بریندارکردنو ئەشکەنجەی جەستەیی، بەڵکو هەڕەشەی بەردەوامی نێرینەی لەسەرەتای پەروەردە کردنەوە.

ئەم وانەیە هەر لە زووەوە دائەدرێتو سێبەری توندوتیژیی کوڕ سنور بۆ ئاواتو ئامانجەکانی کچ دائەنێتو، نێرینە ئەبێ بڕیاربدات کچ ئەتوانێ چی بکاتو ببێت بەچی؟!

ئەم وانەیە، هەرگیز لەیاد نەچووە، بڵێیت ژنێك هەبێت، رۆژێك لەرۆژان لەروی رەگەزەکەی تردا، هەستی بەترس نەکردبێتو سەربەخۆ سنوری چالاکیەکانی خۆی دیاری کردبێت؟

**دابو نەریتە بەسوێکان ( Harmful )**

لەهەموو کۆمەڵگاکاندا، هەژاری، بەکەم زانین، پشت گوێ خستنو باجی کێشە کۆمەڵایەتیەکان، بەشی دەست لێ نەدراوی ژنن. لەگەڵ ئەوانەشدا، سەرسەخت ترین دوژمنی کەرامەتو ئاسایشی ژن ئەو هێزە کەلتوریەیە کە ئەبێتە دیواری پاراستنی بالآ دەستی پیاوو مۆڵەت نامەی حوکم کردنو چەوساندنەوەی ژن. ئەو هێزەش ناوی (دابو نەریتی بەرێزو پیرۆز)ە.

لەکۆمەڵگا پیشەسازیە پێشکەوتوەکاندا، وەکو ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا، کە چەوساندنەوەی رەگەزو تیایاندا، بەپێی یاسا قەدەغەیەو کۆمەڵێك دامو دەزگای دەوڵەتی جێبەجێیان ئەکات، چەندین رواڵەتی ژیانو هەڵسو کەوت ئەکرێت کە سەرپێچیو پێچەوانەی مەبەستەکانی ئەو یاسایەیە، مۆسیقاو روناکی بەشێوەیەکی هونەریی بەکاردێت بۆ رووت کردنەوەی ژنانو پیشان دانیان وەکو داوێن پیس (Whores)، گۆڤارێکی بەربلآوی پیاوان ئامەنگی ئابروتکاندنی بەکۆمەڵ ئەگێرێتو واپیشان ئەدات جەستەی ژنان شایانی ئەوەیە بکرێت بەمەکینەی قیمەدا.

هەراسان کردنی سێکسیی ژنان، خەریکە ئەخرێتە بەرنامەکانی مەشقی سەربازیەوە، یان هەندێ دامو دەزگا ژنانی گەنج ناچار ئەکەن

هەر هەمان توندوتیژیی لەگەڵ خێزانەکانی دواڕۆژیاندا بەکاردێنن، بەڵکو بەشێك لەتاوانەکانی دژی کۆمەڵگاش ئەمان ئەنجامی ئەدەن. ئەم خولە ترسناکە پێویستە لەکاربخرێت.

دووەم، سەلمێنراوە پەیوەندیەکی هاوسەنگو هاوتەریب هەیە لەنێوان توندوتیژیی لەناوماڵو نادروستیی هەڵسو کەوت لەدەرەوەی ماڵ. ئەگەر توندوتیژیی ناوماڵو منداڵ دژی ژنانو کچان بەشێوەیەکی سیستیماتیك ئەنجام دراو قبوڵ کراو بێدەنگەی لێ کرا، ئەبێت بەخوو، دابو نەریتێکی کۆمەڵایەتی مەقبول.

لێکۆڵینەوەکان بەپێ‌داگرتنەوە نیشانی ئەدەن ئاژاوەی ناوماڵ، سەرچاوەی زوربەی کێشە کۆمەڵایەتیەکانە، وەکو منداڵانی سەرجادەو کارکردنی منداڵو لەش فرۆشیو دزیو بەنگ کێشی.

سێیەم، مەسەلەکە تەندروستی گشتیشە، ئاژاوەی ناوماڵو چەوساندنەوەی ژنانو کچان، بەشێکی گرنگی کۆمەڵ تووشی کێشەی جەستەییو دەروونیو کۆمەڵایەتی ئەکاتو هەندێ جار بەدرێژایی ژیانی زوڵم لێکراوە کە ئاسەوارەکانی لاناچێت.

چوارەم، ئاژاوەو چەوساندنەوەی ناوماڵ کاریگەرییەکی خراپی بەهێزی هەیە لەسەر گەشەکردنی ئابوریو بەرهەم هێنانی هەموو کۆمەڵگا. ئاشکرایە ئێستا ژنان بەردی گۆشەی گەشەسەندنن. پاراستنی مافەکانیانو چاکردنی باری مرۆڤایەتیان کارێکی پێویستە بۆ گوێزانەوەی کۆمەڵ، لەخێزانی خۆرا-وە، بۆ بەرهەم هێنی خۆراك. ئاواتو ئارەزووەکانی ژنان بۆ کارکردن بەرهەم هێنان بەتوندی لەلایەن نێرینەوە سەرکوت کراوە، نەك تەنیا بەلێدانو بریندارکردنو ئەشکەنجەی جەستەیی، بەڵکو هەڕەشەی بەردەوامی نێرینەی لەسەرەتای پەروەردە کردنەوە.

ئەم وانەیە هەر لە زووەوە دائەدرێتو سێبەری توندوتیژیی کوڕ سنور بۆ ئاواتو ئامانجەکانی کچ دائەنێتو، نێرینە ئەبێ بڕیاربدات کچ ئەتوانێ چی بکاتو ببێت بەچی؟!

ئەم وانەیە، هەرگیز لەیاد نەچووە، بڵێیت ژنێك هەبێت، ڕۆژێك لەڕۆژان لەروی رەگەزەکەی تردا، هەستی بەترس نەکردبێتو سەربەخۆ سنوری چالاکیەکانی خۆی دیاری کردبێت؟

**دابو نەریتە بەسوێکان ( Harmful )**

لەهەموو کۆمەڵگاکاندا، هەژاری، بەکەم زانین، پشت گوێ خستنو باجی کێشە کۆمەڵایەتیەکان، بەشی دەست لێ نەدراوی ژنن. لەگەڵ ئەوانەشدا، سەرسەخت ترین دوژمنی کەرامەتو ئاسایشی ژن ئەو هێزە کەلتوریەیە کە ئەبێتە دیواری پاراستنی باڵا دەستی پیاوو مۆڵەت نامەی حوکم کردنو چەوساندنەوەی ژن. ئەو هێزەش ناوی (دابو نەریتی بەرێزو پیرۆز)ە.

لەکۆمەڵگا پیشەسازیە پێشکەوتوەکاندا، وەکو ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا، کە چەوساندنەوەی رەگەزو تیایاندا، بەپێی یاسا قەدەغەیەو کۆمەڵێك دامو دەزگای دەوڵەتی جێبەجێیان ئەکات، چەندین رواڵەتی ژیانو هەڵسو کەوت ئەکرێت کە سەرپێچیو پێچەوانەی مەبەستەکانی ئەو یاسایەیە، مۆسیقاو روناکی بەشێوەیەکی هونەریی بەکاردێت بۆ رووت کردنەوەی ژنانو پیشان دانیان وەکو داوێن پیس (Whores)، گۆڤارێکی بەربڵاوی پیاوان ئاهەنگی ئابروتکاندنی بەکۆمەڵ ئەگێرێتو واپیشان ئەدات جەستەی ژنان شایانی ئەوەیە بکرێت بەمەکینەی قیمەدا.

هەراسان کردنی سێکسیی ژنان، خەریکە ئەخرێتە بەرنامەکانی مەشقی سەربازیەوە، یان هەندێ دامو دەزگا ژنانی گەنج ناچار ئەکەن

لــە وڵاتــاندا کــە دانیشــتوان تــێرووپڕن‌و تەندروستیان باشە، بـەتێکڕا، 105 کـوڕ بەرامبـەر 100 کچ لـەدایك ئـەبن، بـەڵام لەسـاڵی یەکـەمی تەمەندا ژمارەیەك لەو کوڕانە- زیاتر لـە ژمـارەی کچەکان- ئەمرن لەبەر ئەوە تەرازوی هاوسـەنگی رەگـەز لـە بـەرژەوەندی کچان لاسـەنگ ئـەبێت‌و ژمارەیان زاڵو بەرچاوتر ئەبێت.

لەهـەندێ وڵاتـان بەتایبـەت لەئاسـیا، ئـەو هاوسەنگیە زۆر خـراپ تێـك ئـەچێت، ئەوکاتـە توندوتیژیی‌و رەگـەزی دژی کچـان دەسـت پـێ ئەکات‌و قڕیان تێ ئەخەن‌و دەست ئەکەن بە لەناو بردنیان. ساڵانە ملیۆنەها ژن‌و کچ بێ‌سەرو شـوێن ئەکرێن‌و لەسەر رووی زەوی نامێنن.

لـەجیاتی ئـەوەی هـەڵڵاو هـەراو هوریایـەکی جیهانی دەربـارەی چارەنوسـی ئـەو بێ‌سـەرو شـوێنانە بـەرپابکرێ، ئـەبینین لەراپۆرتـەکانی گەشەسـەندن‌و پـەرەپێدان‌دا، لەبڕگـەی ژنـاندا، ئاماژەیەکی لاوەکی بۆ ئەکرێت‌و بەسوکی دەمـی بۆ ئەبرێت.

لەکاتێکدا جەنگەکان لـەنێوان وڵاتـاندا کڵپـە ئەسـێنێت، یـان بەربەرەکانیـــە چەکداریـــەکان لـــەنێوان گروپـــە ئـــاینی‌و رەگەزیـــەکاندا سەرهەڵئەدات، ژنان‌و کچان بە بەربڵاوی دوچـاری ئـەتك کـردن‌و سك پـڕ کـردن ئـەبن‌و بـاجی ئـەو ناکۆکیانـە ئـەدەن. زیـاتر لـە 20 هـەزار ژنـی موسڵمان لە بۆسنی هـەرزەگۆڤین لـەکاتی شـەڕی بـەڵکاندا ئـەتك کـراون‌و دەسـتدرێژی کرایـە سـەر ناموسیان. لەرواندائاش لەماوەی یەك ساڵدا زیـاتر لە 15 هەزار ژن ئەتك کران. لـەم سـاڵانەی دوایـدا ئەتك کردن (اغتصاب- Rape)ی بەکۆمـەڵ وەکـو یەکێك لە چەکەکانی جەنگ لە وڵاتانی: کەمبۆدیا، لایبیریا، پیرۆ، سۆماڵو ئۆگەندادا بەکارهاتوە.

ئەمانـە تـەنیا چـەند نمونەیـەکی کـەم بـون لەوانەی کۆمەڵگا ئەیدات بەگوێماندا کە ژیانی ژن‌و کەرامەتی‌و مافـە ئینسـانیەکانی لـەژێر رەحمـەتی پیاودان.

لەرۆژی لەدایکبونیانەوە، مێینە سـوکایەتییان پی‌ئەکرێت‌و لەپلەو رێزی کەم ئەکرێتەوە، تـا ئـەو رادەیـــەی (جـــەیمس. پ. گرانـــت)ی دوایـــن بەڕێوەبـەری بـەجێ‌هێنانی یونیسـێف نـاوی نـاوە (رەگەزپەرستی توخم) (Apartheid of Gender).
لەگەڵ ئەوەشدا کە کۆیلایەتی لەجیهانی ئـەمڕۆدا نەماوە، لەهەندێ وڵاتاندا وەکو کەل‌و پەلی ناوماڵ (Chattel) مامەڵە لەگەڵ ژندا ئەکرێت‌و بەچـەندین کۆت‌و پێوەندی: (کەم خوێندن‌و کەم رۆشـنبیری‌و پاشکۆخســـتنی ئـــابوری‌و لاوازی دەســـەڵاتی نامرۆڤانـەو سـەریاری هەموشـیان نایەکسـانی بەرامبـەر یاسـا) زەلیـل ئـەکرێن. توندوتیژیـی کاریگـەرترین تێڵای پاراسـتن‌و بـەردەوامی ئـەو کۆت‌و پێوەندانەیە.

**گۆڕینی ئەم واقیعە نالەبارە.**

هیچ گومـان هـەڵناگرێت، کلیلـی چارەسـەری توندوتیژیـی پێشـێل کردنـی مـافی ژنـان‌و کچـان بەدەست هێنانی هێزو دەسەڵاتە دژی ئـەپارتاید، واتە رەگەزپەرستی دژی مێینەو، بەکـەم زانینـی، و کـارکردن بـۆ راسـت کردنـەوەی ئـەو هاوکێشـە لەنگە.

بەڵام لەبەر ئەوەی ئەو برینە ئەوەندە قـووڵو ریشەدارو کۆنە لەناو کەلتورو گەلاندا، هەوڵدان بۆ دروسـت کردنـی ئـەو کۆمەڵگایـەی (تەحـەمول tolerate)ی ئـەو گۆڕانکاریـە بکـات یـان تەنانـەت ئامـادە بێـت (ببینێـت)، ئـەفراندن‌و ئـارامی‌و کارکردنی فرەلایەنی ئەوێت.

لەناوبردنی توندوتیژیی‌و دژایەتی کردنی ژنان‌و کچان تەنیا بەوە نابێت ئەو کەسانە سزا بدرێن کە

پێی هەڵئەستن، مەسەلەکە ئەوەیە ئەو بنەمایە هەڵئەکێنین کە گوایە ژن هەر بەخۆڕسك لەپیاو کەمترو بێدەسەلاّت ترە.

کچانو ژنان شوێنی شایانی خۆیان، وەکو ئەندامێکی یەکسانو بەهێزی کۆمەڵگا بەدەست دێنن، کە توندوتیژیی بەرامبەریان نەك نەکرێت چاوپۆشی لیّ بکرێت، بەڵکو بنیاتی سەرجەم کۆمەڵگا بلەرزێنێت.

ئەو پەندەی کە ئەڵێت رێگای چەندان میل بەهەنگاوێك دەست پێئەکات، لێرەشدا راستە. لەسەرتاسەری جیهاندا، زۆر کۆمەڵگا دەستیان کردوە بە هەڵگرتنی هەنگاوی بچوك بەرەو مسۆگەر کردنی سەرجەم مافە مەدەنیەکانی ژنانو کچان لە کۆمەڵگایەکی یەکساندا.. لەسەر ئاستی جیهانیش، یەکەم هەنگاو جێبەجێ کردنی ((پەیماننامەی مافەکانی منالّ))ە کە لە مایسی 1997دا لەلایەن 190 ولاّتەوە مۆرکراوە، لەگەڵ جێبەجێکردنی ((پەیماننامەی نەهێشتنی هەمو جۆرەکانی جیاواز بینی دژی ژنان))

Convention on the Elimination of all–forms of Discrimination Against Women-CEDAW)

کە لەلایەن 160 دەوڵەتەوە مۆرکراوە. لەگەڵ ئەوەشدا بیروباوەڕو هەڵسو کەوت بەجۆرێکی سیحرییانە بەمۆرکردنی پەیماننامەو بەیاننامە ناگۆڕێت، بەڵام هەنگاوێکی بنەڕەتیە بۆ دامەزراندنی زەمینەیەکی لەبار بۆ رایی کردنی ریفۆرمە کۆمەڵایەتیو یاساییەکان.

پەیماننامەی مافەکانی منالّ، بایەخێکی زۆری هەیە، چونکە پەیوەندییەکی پتەو هەیە لەنێوان مافەکانی منالّو مافەکانی ژناندا. توندوتیژیی دژی مێینە، چ لە ماڵەوەو چ لە لایەن کۆمەڵگاوە، لەسەرەتای منالّیەوە دەست پێئەکات، واتە بەشێك لە پێشێلکاری دژی مێینە، بەپێشێل کردنی مافەکانی، وەکو منالّ، دەست پێئەکات.

پەیماننامەکە، ئەو ولاّتانەی مۆریان کردووە، ناچار ئەکات هەمو هەنگاوێکی پێویست بگرنە بەر بۆ پاراستنی منالّ لە ((هەمو گوشارێکی جەستەییو دەروونیو مێشکیی)) وەکو استغلالی سێکسیو بازرگانی پێوەکردنو رام کردنو راهێنان لەسەرکاری لەعەقلّ بەدەر.

ئێستا کە پەیماننامەکە -بێجگە لەسێ ولاّت- لەلایەن سەرجەم ولاّتانی سەر زەویەوە مۆرکراوە، کارکردن بۆ ئەوەی ببێت بە پاڵپشتێکی راستەقینە بۆ منالاّن، دەستی پێکردوە، بۆ نمونە: ریفۆرمی سیستمی یاسای نەوجەوانان لەنزیکەی نیوەی ولاّتانی ئەمریکای لاتیندا ئەنجام دراوە. ژمارەیەك ولاّتی تریش، بەتایبەتی فلیپین، یاساکانی پاراستنی منالّیان دژی ئیستغلالی سێکسی کاریگەرترو بەهێزتر کردوە.

چەند هەنگاوێکی هاوشێوەش هەیە بۆ ئەوەی CEDAWیش بکەوێتە سەرپێ لە بۆتسواناو زیمبابۆی، دادگاکان CEDAW یان بەکارهێناوە بۆ بەرپەرچدانەوەی جیاوازبینی دژی ژنان، لەیاسا مەدەنیەکاندا.

بەرازیل رەشکاری ریفۆرمێکی دەستوریی خستۆتەروو کە ئامانجەکانی CEDAW بێنێتەدی. تەنزانیا یاسایەکی عەشایەریی باوی دەربارەی جیاوازبینی ژنان دەستکاری کردوە.

سویدو ژمارەیەك لەولاّتانی ئەمریکای لاتین شوێن کەوتو (معقب Ombudswomen)ی یاسایی تایبەتیان دامەزراندوە بۆ بەدواداچونی ئەو شکاتو گلەییو نارەزاییانەی ژنان هەیانە بەرامبەر حکومەت.

بەلایەنی کەمەوە شەش ولات پۆلیسخانەی تایبەتیان دروست کردوە، تەنیا بۆ ژنان مەکسیك لقێکی تایبەتی دادگای تەرخان کردوە بۆ تاوانە سێکسیەکان.

کامیرۆنو چین بەم دواییە، یەکەم پەناگەیان بۆ ئەو ژنانە دروست کردوە، کە هەلاتوی دەستی توندوتیژیی خێزانیی یان ناومالیی-ن. ئەم داموو دەزگایانە نەك تەنیا هەر ئەوەیە ژنان ئەپارێزن، بەلکو هۆکارێکیشن بۆ ئەوەی بەردەوام بیری کۆمەلگا بخەنەوەو بیسەلمێنن کە پاراستنی مافەکانی ژنان یەکێکە لە ئەرکەکانی دەولەت.

ئەمانە رێو شوێنی گرنگن بۆ پاراستنی مافەکانی ژنان بەگشتیو بنەبڕکردنی توندوتیژیی دژیان بەشێوەیەکی تایبەتی، بەلام هێشتا زۆر رێو شوێنی تر ماوە لەلایەن زۆر ولاتانەوە بگیرێتەبەر.

زۆربەی ئەو ولاتانەی CEDAW یان مۆرکردوە، هێشتا زۆریان ماوە برگەو بنەماکانی لەهەلسو کەوتی بەکردەوەو یاسا ناوخۆییەکانیاندا جێ بکەنەوە.

ئەم پەیماننامەیە روبەڕوی ململانێی سەخت بۆتەوەو ئەو راستیە نکولی لێ ناکرێت کە هیچ پەیماننامەیەکی نێودەولەتی بەقەد ئەم پەیماننامەیە روبەڕوی بڕوبیانوو، لەدارشتنو خۆمالی کردنو سستیو تەمەلی لەجێبەجێکردنیدا، نەبۆتەوە.

جێبەجێکردنی ئەو یاسایانە سەرەتا بەخوێندەوارکردنی کچان دەست پێ ئەکات. نەرەخسانی دەرفەتی یەکسان لەگەل کوراندا بۆ خوێندن، یەکێکە لەهۆکارە هەرە دێرینو بنچینەییەکانی رێخۆشکردن بۆ پێشێل کردنی مافەکانیانو زامن کردنی بەردەوام بونی.

جگە لەوەی خوێندەواریی، کچان فێری خوێندنەوەو نوسینو حساب ئەکات، زەمینەیان بۆ خۆش ئەکات هەمو تواناکانیان بخەنەگەڕ، و ئارەزووی شەڕخوازیو توندوتیژیش لەلای هەردو رەگەزەکە لاواز ئەکات.

لەپال ئەمانەشدا خوێندنی کوڕانو کچان بەیەکەوە لەیەك پۆلو یەك قوتابخانەدا هەر لە سەرەتاوە بیروباوەڕی یەکسانی لای هەردووکیان دروست ئەکات.

خوێندنی کچان رێگایەکی مسۆگەرە بۆ بنیات نانی ئابوریەکی سەربەخۆ. دابین کردنی خەرجو بژێوی لەلایەن ژن خۆیەوە، پلەو پایەی لەناو خێزانو کۆمەلدا بەرز ئەکاتەوەو دووری ئەخاتەوە لەپەیوەندی ژێردەستیو بەکۆیلەبونو بڕوای بەخۆی پێ‌پەیدا ئەکات کە تەسلیمی هیچ جۆرە پێشێلکارییەك نەبێت.

لە بەنگلادیش، نمونەیەکی سەرکەوتوی بەناوبانگ هەیە بەناوی (بانکی گرامینی بەنگلادیش) کە سەرمایەیەك بەقەرزی بچوك ئەدات بەژنان لەهەمو ناوچەکانی ولاتدا بەمەبەستی ئیش پێوەکردن.

بیست ولات زیاتر دەستیان کردوە بە بەرنامەی قەرزی بچوك (Microcredit) کە قەرز ئەدات بەژنان بۆ مەبەستی کۆمەلایەتیو تەندروستی تا ژنان بتوانن سەرپەرشتیو چاودێری کۆمەلایەتیو تەندروستی منالەکانیان بکەن، قەرزەکان زیاتر بۆ مەبەستی کڕینو بەخێوکردنی ئاژەلو پەلەوەر، یان کردنەوەی دوکانی بچوك یان کرێی خوێندن بەکاردێن. بۆ نمونە لەکەمبۆدیا زیاتر لە 15000 ژن ئەو وردە قەرزانەیان وەرگرتوە. ڤێتنام بەهۆی ئەو قەرزانەوە کە ئەدرێ بەدایکان، ژمارەی ئەو

کچانەی ئەخرێنە بەر خوێندن، بەرزبونەوەیەکی بەرچاوی بەخۆیەوە بینیوە..

لەبواری دەسەڵاتی سیاسیشدا، دەرفەت نەڕەخساوە، ژنان هێزو توانایان هەبێت، لەگەڵ ئەوەشدا، سەرکردایەتی کردنی دەوڵەت لەلایەن ژنەوە، مانای ئەوە نیە ژنان لەدەسەڵاتدان، بەڵکو بوونی ژنان لەکورسی دەسەڵاتدا لەچوارچێوەی سیستمێکی سیاسیدا، بەرژەوەندی تری لەپشتەوەیە. لەپاڵ ئەوەدا کە ژنان لەسەرتاسەری جیهاندا بێجگە لە شەش وڵاتی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستو برۆنایو دار السلام لەباشوری خۆرهەڵاتی ئاسیا– مافی خۆپاڵاوتنو دەنگدانیان هەیە، لەسەر ئاستی جیهان تەنیا 70٪ی کورسی پۆستە باڵا دەسەڵاتدارەکانی حکومەتیان وەرگرتوە، دەسەڵاتدارێتی هەر لەکۆنەوە لەسەر پیاو تاپۆ بوە، لەکاتێکدا ژنان زۆر بە شێنەیی هەنگاویان هەڵگرتوە بچنە بواری سیاسەتو دەسەڵاتەوە، لەبەر ئەوە ژمارەی ژنان لەپۆستەکانی دەسەڵاتی بڕیاردانەدا، بەشێوەیەکی بەرچاو، کەمە. چاوپیاخشاندنێك بەو ئامارانەی لەبەردەستدان ئەوە ئەسەلمێنن کە جیاوازیخوازی لەو بوارەشدا پەیڕەو کراوە.

ئەو جیاوازیە بەوە کۆتایی دێت، ژنان بەو ڕێژەیەی لەتوانایاندا هەیە بەپێی کارامەییو لێوەشاوەیی، شوێنی خۆیان لەپۆستە باڵادەستەکانی بوارەکانی کۆمەڵایەتیو ئابوریو سیاسیدا بگرن.

بەپێی ئەو ئامارو زانیاریانەی کە دەزگا تایبەتمەندەکانی نەتەوە یەکگرتوەکان ساڵی 1996 کۆیان کردۆتەوە، ژنان، لەسەر ئاستی جیهان تەنیا 70٪ی پۆستی وەزارەتەکانیان وەرگرتوە، ئەم ڕێژە کەمەش لەخۆیدا جارێکی تر بەجۆرێك دابەش ئەبێتەوە، کە زوربەی پۆستە وەزاریەکانی ژنان ئەکەونە بوارەکانی کاروباری کۆمەڵایەتیەوە، وەکو پەروەردەو تەندروستیو خێزانو.. تاد. کۆی نوێنەرایەتی ژنان لەوەزارەتەکانی کاروبارە کۆمەڵایەتیەکاندا بەرز ئەبێتەوە بۆ 14٪، لەکاتێکدا لەبواری سیاسەتدا دائەبەزێت بۆ 3٪ و لەپۆستە تەنفیزیەکاندا 4٪و لەبواری ئابوریدا 4٪، بەڵام لەبواری دادوەریو یاسادا بەرز ئەبێتەوە بۆ ڕێژەیەکی دڵخۆشکەرتر کە 10٪یە.

سەرکەوتنی ژنان بۆ هۆڵەکانی ململانێی نێودەوڵەتیو کورسیەکانی دەسەڵاتی حکومەتەکانو ئەندامێتیو فراکسیۆنی کاریگەری پەرلەمانەکان پێویستی نەك بەتەنیا بەهەوڵو تەقەلای بێوچانی ژنان خۆیان هەیە، بەڵکو بەهاوکاریو پشتگیریی ئەو پیاوانەش هەیە کە بڕوای تەواویان بەو مەسەلانە هەیە ئەبێ داموو دەزگاکانی حکومەتو پەیمانگاکانی پەروەردەکردنی خەڵکانی بەدەسەڵات، هاوپەیمانێتی ژنان بکەن. ساڵەکانی نەوەدەکان، دە ساڵێکی بێوێنە بون لەبەدەست هێنانی مافە مرۆییەکانی ژناندا. بەڵام تێگەیشتنو ڕەتکردنەوەی توندوتیژیی ژنان لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی، بەبێ خەباتو تێکۆشان نەهاتۆتەدی. ژنان پێویستە هەڵمەتێکی جیهانی بەرپابکەن بۆ ڕسواکردنی توندوتیژییو بەرچاوخستنی کاریگەرییە خراپەکانی لەسەر ژیانیانو توانایان، و کۆمەڵگای جیهانیی قەناعەت پێ بکرێ، کە سەرکەوتو نەبون لەپاراستنی مافە سەرەکیەکانی ژنان بۆ زامن کردنی ئاسایشی شەخسی.

دیارترین هەوڵ لەو بوارەدا، مێزگردێکی جیهانی بوو دەربارەی پێشێل کردنی مافە مرۆییەکانی ژنان، کە ساڵی 1993 لەچوارچێوەی

کۆنگرەی جیهانی مافەکانی مرۆڤدا لە ڤییەننا بەسترا، کە تیایدا بەشداران دەنگیاندا بۆ بنەبڕکردنی توندوتیژیی دژی ژنان لەژیانی گشتیو تایبەتیداو بڕیاریانداو رایانگەیاند مافەکانی ژنانو کچان مەسەلەیەکە (Inalieable) بڕاوەتەوەو قابیلی سەنگو سوك نیەو (Integral) راستو تەواوەو (Indivisible) بەشێکی دانەبڕاوە، لەسەرجەم مافەکانی مرۆڤ یەك رۆژی رەبەق لە ڤییەننا، زۆر لە نێردەکانو خەڵکانی تریش. گوێیان لە شاهیدیی بەڵگەداری 33 ژن گرت سەبارەت بەو توندوتیژییەی دوچاری بوون، وەکو بەڵگەیەك لەسەر ئەوەی رۆژانە لە هەمو کۆمەڵگاکانی جیهاندا رووئەدات، راستە شتێکی شیعار (emblematic)ی بوو، بەڵام واقیعی بوو لە گوزارەکردن لەو ئازارو ئەشکەنجانەی ژنان ئەیچێژن، ئەتروانی بەزوورەکەدا، راستیەکانو وێنەو ژمارەکان بوو بوون بە گۆشتو خوێنو بینەرە سەرسوڕماوەکان، ناچار بوون بێدەسەڵاتانە بیروڕای خۆیان بگۆڕن.

کۆبونەوەکە کۆتاییەکی رەسمی، بۆ چەندین سەدە لە ناڕەزاییو پێشێلکاریو چەوساندنەوەو توندوتیژیی داناو چەندین ژنو پیاوی بەئاگا هێنایەوە کە مەسەلەی پاراستنی مافەکانی ژنان، و دەستەبەربونی دوبارە نەبونەوەی مامەڵەی سەدەکانی پێشوو، ئەرکی سەرشانی کۆمەڵگای نێودەوڵەتییە. دواتر هەر لەو ساڵەدا وەکو بەدەنگەوەهاتنی ئەو گوشارەی ڤییەننا، کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتوەکان، بەیاننامەیەکی دەرکرد دەربارەی بنەبڕکردنی توندوتیژیی دژی ژنانو پیاچونەوەو بژارکردنی CEDAWی لەبەرچاوگرت کە کاتی خۆی لەئاماژەکردنی رەشکاریەکەیدا ساڵی 1979 راستەوخۆ باسی لە توندوتیژیی رەگەزایەتی (Genitic) نەکردبو، بەڵکو توندوتیژیی بەگشتی رەت کردبۆوە.

بەیاننامەکە لەخۆیدا بەڵگەنامەیەکی بەرزو ئاشکرا بو لە سێ رووەوە:

توندوتیژیی دژی ژنانی لەڕێڕەوی وتووێژەکانی مافی مرۆڤدا خستە چوارچێوەیەکی تایبەتەوە؛ (ژن)ێتی هۆکارێکی سەرەتایی لەبارە بۆ ئەوەی نێچیری توندوتیژیی بێت؛ هەروەها سنوری پێناسەی توندوتیژیی رەگەزایەتی ئەوەندە فراوان کرد کە هەمو لایەنەکانی ژیانی کچانو ژنان بگرێتەوە.

هەنگاوێکی تری پڕبایەخ، مێژگردی ساڵی 1994بوو، بۆ گوێگرتن لەراپۆرتی کۆنوسیار (Rapporteur– المقرر)ی تایبەتی نەتەوە یەکگرتوەکان دەربارەی توندوتیژیی دژی ژنان. هەوڵی سیستیماتیکو بە بەرنامە بۆ بەرزکردنەوەی فایلی کێشەی توندوتیژیی دژی ژنان، پێویستە هەموو لایەنەکانی ژیانی کۆمەڵگا بگرێتەوە، وەك، سیستمی دادوەری، بوارەکانی راگەیاندن، سیستمی پەروەردە، سەرپەرشتیو چاودێری، تەندروستی، رێکخراوە حکومیو ناحکومیەکان، سیاسەتمەداران، پیاوانی ئاینیو، بێگومان هەموو تاکەکانی کۆمەڵگا بەژنو پیاوەوە. ئەو هەوڵانە بە پلەیەکی سەرەکی ئیشی ژنان خۆیانو بزوتنەوەکەیانو رێکخراوە ناحکومیەکانیانە.

هەندێك بزوتنەوەی کۆمەڵایەتی لەماوەیەکی زۆر کورتدا، زۆر بە هێمنیو بەئاشتی لەو بوارانەدا جێی خۆیان کردۆتەوەو تا ئێستاش ئەو رێکخراوە بچوکانە، لەو کارە مەزنانەیاندا بە تەنیا بەردەوامن.

چەند لەدەسەڵاتدارانی حکومەت، بەڵێنی ئەوەیان داوەو پیشەکەیان تەرخان کردوە بۆ

چارەسەری ئەو کێشانەی پەیوەندییان بە چەوساندنەوەی رەگەزایەتیەوە هەیە؟ ئێستا ئیتر کاتی ئەوەیە وا هەڵسو کەوت بکەن.

یاسا رایی‌کردن (Legislation) دژی توندوتیژیی خۆماڵی لە 44 وڵاتدا پەسەندکراوە، 17 وڵات ئابڕوتکاندنو ئەتك کردنو پەلاماری سێکسی نابەدڵ، ی بەتاوانی یاسایی دەست نیشان کردووە.

27 وڵات یاسای دژی (تەنگەتاو، هەراسان (harassment—مضايقة) کردنی سێکسی رایی کردووەو، 12 وڵاتیش یاسای دژی شێواندنی جەستەو روخسار (-Female Genital mutilation FGM) وەکو خەتەنەکردنو لوت بڕینو داخ کردن، دەرکردووە.

ئەو ژمارە کەمە یاسایانەی رایی کراون، لەتوانای بەرپەرچدانەوەو هێزی سزادانەدا لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر جیاوازن، ئەو وڵاتانەی تا ئێستا یاسای تایبەتییان رایی کردووە، ئەتوانن بەگوێرە ی زۆر لە یاساکانی تری سیستمی دادوەری ناوخۆیی، دەستدرێژی کەران بەرپەرچ بدەنەوەو سزا بدەن.

هەندێ وڵاتی تر، یاسایەکی نەرمی رێكو پێکی دارشتوە دژی چەوساندنەوەی خێزانیی ژن، وەکو یاسای 1995ی ئیکوادۆر، کە پێناسەو سنورو سزای دەستدرێژی جەستەییو مێشکیو دەرونی دیاری کردوەو تیایدا بایەخێکی زۆر بە چەوساندنەوەی دەرونی دراوە.

هەندێ وڵاتی تر یاساکانیان تەمو مژاویە، نیوزیلەندە یاسایەکی دژی توندوتیژی خێزانی رایی کردووە، بەڵام ئیشارەتی ئاشکرای نەداوە بەکچانو ژنان..

لەم ساڵانەی دوایدا، دەستدرێژی کردنی سێکسی، لە ناو وڵاتاندا بەشێوەیەکی گشتی بانگەشەی بۆ کراوەو رەت کراوەتەوە وەکو زیان گەیاندن بە ژن حسابی بۆ کراوە.

وڵاتان هەنگاوی سەرەتایان هەڵناوە بۆ دەرکردنی یاسای دژی ئەو دیاردەیە. لەساڵی 1995 بەدواوە رایی کردنی یاساکە راستەوخۆ، تایبەتە بە دەستدرێژی کردنی سێکسی لەم وڵاتانەدا ئەنجام دراوە:

بەلجیکا، بیلیزیە، کۆستاریکا، فنلەندا، فەرەنسا، ئێرلەندا، پاراگوای، فلیپینو سویسرا، یاسای هاوشێوەش لە هەندێ وڵاتی تردا پێشنیارو پێشکەش کراوە، وەك شیلیو ئیتالیاو جامایکاو ئەفریقای باشور.

دارشتنی ئەو یاسایانەی کە توندوتیژیی لەسەر بنچینەی رەگەز بەتاوان دائەنێن هەنگاوی بنەرەتی بەسودو بەکەڵکن، لەسەر ئاستی جیهان تێبینی کراوە، لەهەر شوێنێك یاسایەك هەبێت دژی دیاردەیەك، ژمارەی ئەوانەی ئەبنە قوربانیی ئەو دیاردەیە، روو لەکەم بون ئەکات، بەمەرجێك دەوڵەت پشتگیریی یاساکە بکاتو گەرەنتی جێبەجێکردنی بداتو چاوپۆشی نەکات لە چەسپاندنی سزاکانیدا.

بەپێچەوانەوە، ئەگەر یاساکانیش هەبن، کەسیان پێ نادرێتەوە دادگاو حوکمەکان جێبەجێ ناکرێن.

پاشکۆ:

ناوی ئەو وڵاتانەی یاسای تایبەتیان دەرکردوە دژی:

| | توندوتیژیی ناوماڵ | تەنگەتاوکردنی سێکسی | ئابڕوتکاندان | شێواندنی جەستەو روخسار fgm |
|---|---|---|---|---|
| 1 | ئەرجەنتین | ئەرجەنتین | ئوسترالیا | ئوسترالیا |
| 2 | ئوسترالیا | ئوسترالیا | ئەمسا | بورکینا فاسۆ |
| 3 | بەهاما | ئەمسا | باربادۆس | کەنەدا |
| 4 | بەنگلادیش | بەهاما | کەنەدا | میسر |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| 5 | باربادۆس | بەلجیکا | دانیمارك | فەرەنسا |
| 6 | بیلیزیە | بیلیزیە | فەرەنسا | گانا |
| 7 | بۆلیڤیا | کەنەدا | ئەڵمانیا | نیوزیلەندا |
| 8 | بەرازیل | کۆستاریکا | نێرلەندا | نەرویج |
| 9 | کەنەدا | فنلەندا | نیوزیلەندا | سودان |
| 10 | شیلی | فەرەنسا | نەرویج | سوید |
| 11 | چین | ئەڵمانیا | پۆلەندا | بەریتانیا |
| 12 | کۆلۆمبیا | گینیا | ئـــەفریقای باشور | ئەمریکا |
| 13 | کۆستاریکا | نێرلەندا | ئیسپانیا | |
| 14 | قوبرس | ئیسرائیل | سوید | |
| 15 | چیك | لیسۆتۆ | ترینیداد | |
| 16 | دانیمارك | مالاوی | بەریتانیا | |
| 17 | ئیکوادۆر | نامیبیا | ئەمریکا | |
| 18 | ئێل سلڤادۆر | هۆلەندا | | |
| 19 | فنلەندا | نیوزیلەندا | | |
| 20 | فەرەنسا | پەنەما | | |
| 21 | گواتیمالا | پاراگوای | | |
| 22 | گینیا | فلیپین | | |
| 23 | هندۆراس | ئیسپانیا | | |
| 24 | نێرلەندا | سوید | | |
| 25 | ئیسرائیل | سویسرا | | |
| 26 | ئیتالیا | بەریتانیا | | |
| 27 | جامایکا | ئەمریکا | | |
| 28 | مالاوی | | | |
| 29 | مالیزیا | | | |
| 30 | مەکسیك | | | |
| 31 | نیوزیلەندە | | | |
| 32 | پەنەما | | | |
| 33 | پەرەگوای | | | |
| 34 | پیرۆ | | | |
| 35 | پورتوگال | | | |
| 36 | سانت لوسیا | | | |
| 37 | سانت ڤنسنت | | | |
| 38 | گرینادا | | | |
| 39 | ئـــەفریقای باشوور | | | |
| 40 | ئیسپانیا | | | |
| 41 | ترینیداد | | | |
| 42 | تونس | | | |
| 43 | بەریتانیا | | | |
| 44 | ئەمریکا | | | |
| 45 | ئورەگوای | | | |

*چارلۆت بەنچ. Charlotte Bunch

-بەرێوەبـەری جێبـەجێکردنی سـەنتەری سـەرکردایەتی جیـهانیی ژنـان-ە لـەزانکۆی رۆتجەرز لە ئەمریکا.

-رێکخەری کارەکانی هەڵمەتی جیهانیی مافە مرۆییـەکانی ژنـان، لەکۆنفرانسـی جیـهانیی مافەکانی مرۆڤ لە ڤییەننا- 1993.

-رێکخـەری چالاکیـەکانی مافـە مرۆییـەکانی ژنـان، لـەچوارەمین کۆنفرانسـی جیـهانی ژنـان. لەپەکین-1995.

-زیاتر لە 25 ساڵە لەرێکخراوەکانی ژناندا کار ئەکاتو دەربارەی فەمینیزم ئەنوسێت.

سەرچاوە:

Progress of Nations

Unicef- 1997

The Intolerable Statua quo:

Violence against Women and Gis.

PP.41-48.

# گەشتێك بەنێو هەندێك لێكۆڵینەوەدا

# لەسەر (مانی) و ئاینەکەی

نێڵ. جەی. رۆرت

و: محەمەد حەمە ساڵح تۆفیق

لە پاش مردنی "مانی" خەڵك بەردەوام سەرسامی ژیان و راسپاردەکانی بوون و قوتابییەکانی ملکەچی و دڵسۆزیی خۆیان بۆ رێبازەکەی راگەیاند. بەڵام ناحەزانی، تەواوی رق و کینەی خۆیان لە دژی هەڵرشت و لەبەرئەوە چەندین سەدەی پێچوو تاوەکو مێژوونووسان توانییان بێلایەنانە باسی "مانی" بکەن.

لە سەدەکانی 18و 19 دا مێژوونووسان و زمانەوان و زانایانی لاهووت، کاروبەرهەمی ناوازەیان بڵاوکردەوە کە تێیدا هەوڵیان داوە لە نیازو مەبەستی "مانی" بگەن و کرۆکی باوەڕەکەی گەڵاڵە بکەن.

هەندێ لەم لێکۆڵینەوانە تاڕادەیەك سەرنەکەوتوون چونکە گەلێ بەڵگەنامەی ئاینی "مانی" تا ئەو دەمە نەدۆزرابوونەوە. بەڵام لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا بڕێکی زۆری تێکستە مانییەکان کەوتنە بەردەست، لەبەرئەوە ئێستا هەلێکی باشمان هەیە بۆ لێکۆڵینەوە لەسەر نیازو مەبەستی راستەقینەی "مانی".

بەهەرحاڵ راست نیە بوترێ کەوا دوایین ئەنجامی لێکۆڵینەوە ئەوەی سەلماندبێت گوایە ئەو کتێبانەی پێشتر لەسەر "مانی" دەرچوون هەموویان کەڵکیان لەدەست دابێت. دەتوانین بڵێین کەوا کتێب و لێکۆڵینەوەکانی ئێستا زۆر بە

قوولّی کاریگەریی بیروڕای لێکۆڵەرەوانی سەدەی نۆزدەهەمیان لەسەرە.

کەواتە کارێکی بەسوود دەبێت ئەگەر دەست بکرێ بە تاوتوێکردنی هەندێ لە کارو بەرهەمە پێشینەکانی کە لەسەر دامەزرێنەری مانییەت هاتوونە ئاراوە هەروەها لەم تاوتوێکردنەشدا پێویستە بایەخ بدەین بەو بەرهەمانەی کەوا نوێترن.

بێگومان لێرەدا کتێبەکانی خودی "مانی" خۆی و کاری موریدەکانی بەجیا هەڵدەسەنگێنرێن، یان روونتر بڵێین، کەوا کاری ئەودانەرانەی زانیاریی سەرزارەکی یان نووسراوی نوێیان لەسەر مانییەت لەلایە، پاشتر باس دەکرێت لە سۆنگەی خۆبە دوورگرتن لە پەلاماری توند و تیژی ئاینییەوە.

لێکۆڵینەوەیەکی نایاب و دانسقە دەربارەی "مانی" لە دەوروبەری 1734 -1739 دا بڵاوکراوەتەوە. دی بیسۆبر کتێبێکی دووبەرگیی لەسەر "رەخنەی مێژوویی سەبارەت بەمانی و مانییەت" نووسیوەو هەرچەندە زانیارییەکی وای نەبووە لەوبارەیەوە بەڵام کارەکەی نموونەیەکی وردی لێکۆڵینەوەیەکی بە ویژدانانە بووە.

دی بیسۆبر وای بۆدەچێ کەوا بەپەرۆش بوونی بۆ "مانی" لە بزووتنەوە تایبەتییەکانی سەدە ناوەنجییەکانەوە سەرچاوە دەگرێ. وەك دەستوورێك ئەم بزووتنەوانە پێیان دەوترا "مانییەت Manichaen" و بەم پێیە دی بیسۆبر مێژووی "مانی" و مانییەتی لێکداوەتەوە.

رەنگە کەمێك جێی سەرسوڕمان بێت ئەگەر بزانین کەوا مەسیحییەکانی سەدەکانی ناوەڕاست پاڵیان بەدیسۆبرەوە ناوە بۆ نووسینی ئەو کتێبە. لەلایەکی تریشەوە مەسەلەیەکی سروشتی بوو کەوا هەر لێکۆڵەرەوەیەکی سەدەی هەژدەیەم بەردەوام بەرەو رووی تێرمی "مانییەت" ببێتەوە.

وەك یاساو دەستوورێك ئەم نازناوە بەسترابوو بەو تاقمە مەسیحییانەوە کەمانییان نەدەناسی. بەهەرحاڵ ئەو دەمە مانییەت بە حوکمی بایەخی خۆی بوو بوو بە مۆرکی ئەو بزاڤانەی بەنەریت سروشتی دوالیزمیان هەبوو. لە سەدەکانی ناوەڕاستدا مامەڵەکردن لەگەڵ تێرمی مانییەتدا مەسەلەیەکی ئاسایی و باو بوو. یەك لەو رێگایانەی هەڵسەنگاندنی ناوەڕۆکی راستەقینەی ئەم تێرمە لەلایەن S.Runciman ەوە پەیڕەویی کرا لە لێکۆڵینەوەکانیدا.. "مانییەتی سەدەکانی ناوەڕاست" کمبریدج 1955. لێرەدا باسی ئەو جەورو ستەمانە دەکا کەوا لە پەیڕەویکارانی "مانی" دەکرا.

کۆمەڵگای مانییەت بەرگەی ئەو هێرش و پەلامارانەی نەگرت و لەدواییدا تێکشکێندرا، بەڵام مانییەت هەژاندنێکی گەورەی بەرپاکرد و بایەخی تایبەتی خۆی سەلماند.

هەوڵێکی دیکەی نوێ لە ساڵی 1831 دا لەلایەن "باور" Baur ەوە ئەنجامدراوە لەسەر مانییەت. لە ساڵی 1928 دا ئەم کتێبە دووبارە چاپ کرایەوە بێ هیچ گۆڕانکارییەك بەڵام ئەمەیان وا ناگەیەنێ کە سەرچاوەی لێکۆڵینەوەکەی "باور" کەم و زۆر بە چەسپاوی مابێتەوە. بەپێچەوانەوە سەرەتای سەدەی بیستەم گەلێ سوودی گەیاند وسەرچاوەیەکی زۆر لەسەر مانییەت دۆزرایەوە. ئەو بابەتە نوێیانە نەخرانە چاپی دووەمی کتێبەکەی "باور"ەوە. بەم پێیە لێکۆڵینەوەکانی باور دەبێ وەك نموونەیەکی لێکۆڵینەوەی توێژەرێکی سەدەی نۆزدەیەدەم وەربگیرێت.

"باور" بەروونی مەبەستەکانی باس کردووە لە پێشەکی کتێبەکەیدا. پێش هەموو شتێك ئەو دەیەوێ سیستەمی "مانی" سەرلەنوێ

دابڕێژێتەوە لەسەربنەمای ڕەگەزە مێژووییەکان و بەکارهێنانی گشت دۆکومێنتە ڕەسەنەکان.

دووەمیش ئەرکی مێژووناسانەکە مەودایەك دروست بکەن لەنێوان خۆی و ئەنجامی لێکۆڵینەوەکانیدا. سێهەم مەبەستی "باور" دۆزینەوەی بنەمای مێژوویی ڕاست و گەشەکردنی مانییەتە. تەنها ئەگەر سیستەمی "مانی" لە تەواوی تاقم و تایەفەکانی مەسیحیەت جوێ ببێتەوە ئەو کاتە ڕەنگە بتوانین شوێنی شیاو و ڕاستەقینە بدەینە "مانی" لە مێژووی ئاینەکاندا. "باور" کتێبەکەی بەم شێوەیەی خوارەوە دابەش کردووە:

- دوو بنەما و دوو جیهان.
- ململانێی هەردوو بنەماکە و دروستبوونی جیهان.
- جەستە و گیان و دروستبوونی مرۆڤ.
- مەسیح و ڕزگاربوون، گەڕانەوەی گیان لە جیهانی مادییەوە و دواچارەنووس.
- پەیوەندیی مانییەت بە بتپەرستی و یەهوودییەت و مەسیحییەتەوە: ئەو ڕەگەز و توخمانەی کە سەرچاوەیان لێوە دەگرێ.

"باور" دەڵێ "مانی" خۆی وا لە قەڵەم داوە کەنوێنەری حەقیقەتی خواوەندە. "مانی" یش وەك زەردەشت و محەمەد دەیوست چلۆنایەتیی باوەڕەکەی لە ناوەڕۆکیەوە بخاتە ڕوو. بەڵام تەنانەت "باور"یش ناتوانێ ئەوە ڕوون بکاتەوە کە چۆن "مانی" سرووشی وەرگرتووە. بۆ ئەم پرسیارە ناسکە سەرچاوەکان هەر بەبێدەنگی ماونەتەوە.

لە بەشی کۆتایی کتێبەکەیدا "باور" مانییەت بەراورد دەکا لەگەڵ بتپەرستی و یەهوودییەت و مەسیحیەت و بوودایىدا. زۆربەی ئیقتیباسە مەسیحییەکانی لە کارو بەرهەمەکانی سانت ئۆگستین وەرگرتووە، بەڵام "باور" نەریت و فەرهەنگی ڕۆژهەڵاتیی "مانی" یش باس دەکا. چیرۆکی بەناوبانگی "مانی" کە چۆن لە ئەشکەوتێکدا چووەتە خەڵوەتەوە لەلایەن مێژوونووسێکی فارسەوە باسکراوە کە لە سەدەی پانزەهەمدا ژیاوە. "باور" لە ڕوانگەی نەریت و فەرهەنگە ڕۆژهەڵاتی و ڕۆژئاواییەکانەوە دەڕوانێتە ئەم چیرۆکەی "مانی". لەپاش تاقیکردنەوەو تاوتوێ کردن "باور" گەیشتووەتە ئەو ئەنجامەی کەوا ئەشکەوتەکەی "مانی" لە ڕووی مێژووییەوە پەی پێ نەبراوە بەڵکو لە ڕووی ئەفسانەوەیە. نموونەیەکی دیکەی شێوازی سەربەخۆیی "باور" بۆ لێکۆڵینەوە ئەوەیە کەوا لەپاش گەڕانەوە بۆ چیرۆکی دوان لە باوباپیرانی "مانی" ( Terebinthus و Scythianus) "باور" گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە ناتوانێ وەك کەسی مێژوویی بچێتەوە سەریان.

"باور" نەیتوانیوە وردەکاریی لەسەر ژیان و بەسەرهاتی "مانی" بداتە دەستەوە. بە گشتی ئەویش وەك "دی بیسۆبر" گەڕاوەتەوە سەر هەمان دەقەکانی پێشوو. "باور" هەرچەندە بە چاکی مامەڵەی لەگەڵ سەرچاوەکانی کردووە بەڵام نەیشیتوانیوە بەتەواوی بگەڕێتەوە بۆ ڕەگ و ڕیشەی مانییەت. ڕاستیکەی هێشتا گەلێ بوار ماون و چاوەڕێی پشکنین و دۆزینەوەن.

لە ساڵی 1862 دا "گۆستاف فلۆجل" کتێبێکی سەرنجڕاکێشی لەلایپزگ بڵاوکردەوە بە زمانی ئەڵمانی بەم ناونیشانە:

Gustav Flugel (Mani Seine Leher und Seine schriften)

ئەم کتێبە لەسەر "فهرست"ی ( أبو الفرج محمد ابن اسحق الورّاق) دەدوێ کە بە فەهرەستی (ابن الندیم) بەناوبانگە. (ابن الندیم) کتێبی "فهرست" ی لە ساڵی 988 دا داناوەو لەم کارەیدا مێژوویەکی ئەدەبی باس دەکات و باسی

ژیانی نووسەرێکی گەورە دەکات لەگەڵ باس و خواسی کتێبە گرنگەکانیدا. لە کتێبی نۆیەمدا فهرستی ابن الندیم باس لە باوەڕی مانییەت دەکات.

ئەو پەڕەگرافانەی فهرستی بەناوبانگی ابن الندیم سەبارەت بە ئاینی "مانی" ئەم بابەتانەی خوارەوەی گرتووەتەوە:

راسپاردەکانی مانییەت، ئەو قسانەی بە "مانی" وتراوە لە لایەن تەلتەوومی فریشتەوە، راسپاردەکانی "مانی" لە ئیلاهییاتدا، درووستبوون و شەڕی نێوان رووناکی و تاریکی، سەرەتای زاوزێکردنی ئەبەدی لە مەزهەبی "مانی" دا، وەسفی رووناکیی زەوی و رووناکیی ئاسمان، وەسفی تاریکیی سەر زەوی و ساتەکانی تجلّي، چۆن دەبێ خەڵکی بچنە نێو ئاینەوە، ئەو یاساو فەرمانانەی لە "مانی" یەوە دەرچوون، راوبۆچوونی جیاواز لەبارەی رێبەرییەوە (ئیمامەت) لەدوای مردنی "مانی"، دابەشبوونی مانییەت بەسەر دوو رێبازدا: میهرایی و میکلاشی. بەرهەڵستی میکلاشی بۆ میهرایی، بیروباوەڕی مانییەت لەسەر ژیانی ئەو دنیا، وەسفی بەهەشت و جەهەنەم، ناوی کتێبەکانی "مانی"، ناونیشانی نامەو پەیامەکانی "مانی" و موریدەکانی کە لەدوای ئەو هاتبوون، بەشەکانی مێژووی مانییەت، کۆچکردنیان بۆ وڵاتانی تر و هەواڵی رێبەرانیان، پاشانیش باس و خواسێك لەسەر پەیوەندی نێوان مانییەت و ئیسلام.

لە پێشەکی ئەم دەقەدا فلۆجل ئەوە روونکاتەوە کەوا گفتوگۆی نێوان "مانی" و ئەرخیلۆس Archelaus چیرۆکێکی خەیاڵییە. ئەگەرچی دەقەکانی فهرست گەلێ زانیاریی بایەخدار دەخاتە سەر ئەو راستیانەی تا ئەمڕۆ زانراون، بەڵام فلۆجل دەتوانێ پتر لەسەر وردەکارییە نوێکان بڕوات. ئەو هەرچەندە ناتوانێ ناوی "مانی" شیبکاتەوە، بەڵام دڵنیایە لەوەی کە بنەماڵەی "مانی" دەچێتەوە سەر رەچەڵەکێکی ئێرانی. فلۆجل راستەوخۆ لە چیرۆکی باوکی مانی یەوە دەگاتە ئەو ئەنجامەی کەوا ئەو هیچ وەختێ ئاگر پەرستیی نەکردووە لە ئاتەشکەدەکانی مەجووسدا دایکی مانی لەخەونەکانیدا تەجەلییاتی کوڕەکەی بینیوە. بگرە کاتێ کە بەخەبەریش بووە "مانی" بینیوە لە زەوی بەرزدەکرێتەوە. ئەمە دەیسەلمێنێ کەوا دایکی "مانی" زۆر لەژێر کاریگەریی کەسایەتیی کوڕەکەیدا بووە، تەنانەت پێش ئەوەش کە لەناو خەڵکدا ناوبانگی بڕوات.

باوکی "مانی" لە حەرەمی پیرۆزی ئەو پەرستگایەدا کە هاتوچۆی کردبوو دەنگێك لە غەیبەوە سێ فەرمانی پێکردبوو:

(گۆشت مەخۆ، مەی مەخۆرەوە، کاری سێکسی واز لێبێنە).

ئەم سێ فەرمانە پێش لەدایکبوونی کوڕەکەی بە گوێی باوکی "مانی" دا درا بوو بەدەستووری ژیان لە بازنەی ناوخۆی کەسە دیارو بەرچاوەکانی کۆمەڵگای مانییەتدا.

"فلۆجل" بەختی هەبوو کەوا دەقێکی بێگەرد کەوتە بەردەستی و بەمە رزگاری بوو لەو مشتومڕانەی بەرەو رووی لێکۆڵەرەوە و دانەرانی تر دەبووەوە. ئەڵبەتە وەرگێڕان و باری سەرنج و لێکۆڵینەوەکانی بێ بەروارن. لەگەڵ ئەوەشدا هەموو ئەگەرو کۆششی خۆی لە رووی لێکۆڵینەوەی زمانەوە خستووەتە روو.

بەم جۆرە کتێبەکەی "فلۆجل" دەمانخاتە چەرخێکی تری مەسح و تاوتوێ کردنی ئەو کتێبانەی لەسەر "مانی" و ئاینەکەی نووسراون.

هەروەها دەبێ سەرنجی کتێبەکەی. "د. کۆنراد کێسلەر – Dr. Konrad Kessler" بدەین کە لە ساڵی 1889 دا چاپی کردووە. زۆرجێی داخە کەوا "کێسلەر" بەرگی دووەمی

کتێبەکەی بڵاونەکردەوە. ئەو لەم کتێبەدا مامەڵە لەگەڵ گەلێ کێشەدا دەکات و وەك پەیوەندیی مانییەت بە ئاینی میتراکانەوە، ئاینی بابل لە هەموو قۆناغەکانیدا، ئاینی ئێرانییەکان، مەسیحییەت و بوودایی.

لەو کاتەوە کە "فلۆجل" کتێبەکەی داناوە دەبوو لێکۆڵینەوەی فراوان لەلایەن ڕۆژهەڵاتناسانەوە ئەنجام بدرایە نەك لاهووتناسان. کاری لاهووتیانە دەبێ لەگەڵ راهێنانی زمانەوانی و زانیاریدا لێك گرێ بدرێن. ئەمە گریمانەی سەرەکیی "کێسلەر" ە بۆ کارێکی رێخۆشکەر. لێکۆڵینەوەکانی دواتر لەگەڵ ئەم خاڵی سەرەتایەدا یەکدەگرنەوە.

"کێسلەر" ئەوە دەردەبڕێ کەوا لێکۆڵینەوەکانی لە هەموو کتێبەکانی تر جیاوازە لەبەر بیروبۆچوونی جیاوازی سەبارەت بە گەوهەر و ناوەڕۆکی مانییەت،. ئاینی "مانی" نە چەشنی سێکتێکی مەسیحیە نە زەردەشتی. "کێسلەر" وا لە مانییەت گەیشتووە کە ئاینێکی نوێ و سەربەخۆیە و ئاینێکی جیهانگیریی وایە کە هاوشان بێت لەگەڵ زەردەشتی و مەسیحییەتدا. بەم پێیە ئەو تێرمی (ئاینی مانی) پێ باشترە لە مانییەت.

بەشی یەکەمی ئەو کتێبە باس لە باوباپیرانی "مانی" دەکات ( Terebinthus و Schythianus). "کێسلەر" Scythianus وا ناو دەبات گوایە هەمان ناوی (فاتەك) ی باوکی "مانی"یە و بگرە زیاتر وای بۆ دەچێت کە ئەو دووناوەی سەرەوە هەریەك کەس بووبێتن. ئەو لە (فهرست) ی ابن الندیمەوە باس لەو کێشانە دەکات کە پەیوەندییان بە باوك و دایکی "مانی" و باوەڕی باوکییەوە هەیە.

بەشی دووەم باس لە کێشەی زمانەوانی دەکا لە Acta Archelai. ئەوجا "کێسلەر" دەگاتە ئەو ئەنجامەی کەوا گفتوگۆی راستەقینەی نێوان "مانی" و مەتران "ئەرخیلۆس" هەرگیز رووی نەداوە. ئەم بۆچوونە زیهنییە لەوەوە هاتووە گوایە موریدانی مانییەت هەوڵیان داوە بۆئەوەی خەڵکی باشووری وڵاتی بابل بهێننە سەرئەو رێبازە.

لە بەشی سێهەمی کتێبەکەدا مەسحێکی باش لەسەر ئەدەبی مانییەت هاتووە. "کێسلەر" وا باس دەکا کە "مانی" و کتێب نووسانی مانییەتی بەرایی نووسینی زۆر و قەبارە گەورەیان بەجێهێشتووە.

بەداخەوە ئەم کتێبانە بە تەواوەتی نەگەیشتوونەتە ئێمە. بگرە ئەوەش دەڵێ کەوا هەر هەموو کتێبەکان هیچیان لێ‌دەرنەچووە و سەرپاك فەوتێنراون بە حوکمی گیانی چەوساندنەوە و ستەمکاری لەلایەن دوژمنانی مانییەتەوە. بۆیە تەنها بەش بەش و پارچە پارچە ئەدەبی" مانی" پارێزراوە. ئەم بەشانە لە نەریت و فەرهەنگی ڕۆژهەڵاتیدا وەدەردەکەون. "کێسلەر" زانیارییەکی زۆری لەم نەریت و فەرهەنگانەوە کۆکردووەتەوە.

لەم بەشەدا "کێسلەر" نموونەیەکی وردی وەسفی ئەو بەشانەمان دەداتێ و هیچ لێکۆڵەرەوەیەك بەو وردییە ئەو سەرچاوە ڕۆژهەڵاتیانەی کۆنەکردووەتەوە. بە هەمان شێوە لە دوا بەشیشدا "کێسلەر" گەلێ بابەتی دانەرانی ڕۆژهەڵاتی گواستووەتەوە یان کارو بەرهەمەکانیانی وەرگێڕاوە.

شارەزایی "کێسلەر" لە دانەرانی ڕۆژهەڵاتدا بە روونی لە بابەتگەلێکی زۆردا دەردەکەوێ.

ئیمە دواڕۆژ دەتوانین بیسەلمێنین کە کارەکانی "کێسلەر" چەندە بایەخداربوون.

سەرەتای سەدەی بیستەم ئەنجامەکانی بەرەو تورکستان چوونی تێدا دەرکەوت. ئەو دەمە بەجارێ تێکست و پارچە و دەسنووسی بێشوومار کەوتنە بەردەست. ئەمانە بریتی بوون لە دەقەکانی ئێرانی سەدەکانی ناوەڕاست و پارس.

بێگومان ماوەیەکی پێچوو تا ئەو دۆزراوە گرنگانە بڵاوکرانەوە. بەهەرحاڵ ساتی یەکلاکەرەوە هات و گەورەترین ژمارەی تێکستە رەسەنەکانی مانییەت کە دۆزرانەوە خرانە سەر ئەو سەرچاوانەی لێکۆڵەرەوان کاریان تێدا دەکرد بۆ دۆزینەوەی مانای راستەقینەی مانییەت. ناوی لێکۆڵەرەوەی ئەڵمان "مولەر" کەوتە پێش ناوی هاوکارانی و گەلێ لەباسە ئەکادیمییەکانی مولەر هاتنە بڵاوکردنەوە. پاشان چاپکراوی تریشی بەدواداهات.

A.Von Le Coq زنجیرەیەك کەرەستەی تورکی چاپ کرد کە لە تورفان دۆزرابووەوە. هەروەها هەندێ نیگاری مانییەتیشی بڵاوکردەوە لە بەرگی دووەمی کتێبەکەیدا:

(Die Buddhistischen Spatanike, Berlin 1923)

لە رووسیاش دوو لێکۆڵەرەوە (W.Radloff و S.Salemann) لە تێکستەکانی مانییەتیان کۆڵیوەتەوە و کەم و زۆر سەرکەوتنیان تێدا بەدەستهێناوە. کەسێکی تریش بەناوی F.Cument کتێبێکی دووبەرگی لەسەر مانییەت نووسیوە بەناوی.

(Recherches Surle Manichesme, Brussles 1912)

ئێستا شێوازی مانییەت تاڕادەیەك ناسراوە و ئاینی "مانی" جێگەی خۆی کردووەتەوە لە مێژووی ئاینەکاندا و فرە سەرچاوەی رەسەنی مانییەت دۆزراونەتەوە. مێژووناسانی ئاین و زانایانی فیلۆلۆجیا (زانستی رێزمان) توانیویانە لەدەقەکانی مانییەت بکۆڵنەوە. ئەنجام شوێن و رێی مانییەت لە نێو رۆحانییەتدا (Gnosticism) بەگشتی باشتر پێناسە دەکرێ. هەروەها (Jones, Reitzenstien, Bousset) لە چەند بەرهەمێکدا باری سەرنج و بۆچونی خۆیان دەربڕیوە.

بە پێچەوانەی ئەو سێ لێکۆڵەرەوەوە (Brukitt) باکگراوندی راستەقینەی مانییەت و مەسیحیەتی دۆزییەوە. بەڕای ئەو ئاینی "مانی" بریتییە لە مەزهەبێکی رۆحی "گنۆستی" مەسیحی. بروکیت دەیەوێ ئەمە بسەلمێنێ لە کتێبەکەیدا دەربارەی مانییەت. بەم رەنگە ئەو رەگەزەکانی مەسیحیەت لە مانییەتدا موناقەشە دەکات.

ساڵی 1923 دۆزینەوەی بایەخداری تر هاتە ئاراوە لەلایەن (H.J.Polostky و C.Schmidt) ەوە. ساڵی 1930 "شمیدت" کۆمەڵێك دەسنووسی قیبتیی Coptic لە میسر دۆزییەوە. بەشێك لەوانە لەگەڵ وەرگێڕانێکی ئەڵمانی یان ئینگلیزیدا بڵاوکرانەوە. بەهۆی ئەم دەقانەوە ڕوانینمان بۆ مانییەتی بەرایی زۆر قووڵ بووەوە. هەروەها دۆزراوە قیبتییەکان توانای تاوتوێکردنی داینێ بۆ زۆر لەو نەریتانەی پەیوەندییان بە ژیان و مردنی مانییەوە هەیە.

هەموو شاگردەکانی مانی و ئاینەکەی منەتباری (W.B.Henning) ن. ئەم زانایە لە ماوەی سی (30) ساڵدا دەیان تێکستی

مانییەتی بڵاوکردەوە و بەردەوام سەرنج و لێکدانەوەی بایەخداری خۆی دەخستنە سەر. بەهۆی بابەتەکانی هێنینگەوە بە گەلێ بواری نەزانراو ئاشنا بووین. ئێمە زۆر بەداخەوەین کەوا هێنینگ هەرگیز کاتی ئەوەی نەبووە بۆ نووسینی لێکۆڵینەوەیەکی بەرفروان لەسەر "مانی" و مانییەت.

هەرچەندە ئێمە زۆرجار دەگەڕێینەوە بۆ بڵاوکراوەکانی هێنینگ بەڵام چوار لە بابەتەکانی شیاوی سەرنجدانی تایبەتین و پێویستە باسیان بکەین لێرەدا.

لە "دوا سەفەری مانی دا" "هێنینگ" شوێن "مانی" دەکەوێ بەرێگایەوە بەرەومردن. ئەم بابەتە وەرگێڕانێکی تازەی ($M_3$) ی تێدایە کەوا چوونی دواجاری مانیی بۆلای بەهرام شای تێدا تۆمار کراوە. دوانیان تا ئەمڕۆ نەکراونەتەوە کە (M6031) و (M6033) ن و لە لایەن هێنینگەوە ئیزافەکراون. هەردووکیان باس و خواسی (Patecius) یان تێدایەو لەسەر ئەو رووداوانەی بوون بەهۆی بەند کردنی "مانی". نموونەیەکی ناوازە و راستەقینەی لێکگرێدان و بووژاندنەوە کە لەلایەن هێنینگەوە بڵاوکراوەتەوە لە بابەتەکەیدا "کتێبی زەبەلاحەکان The Book of Gaints) پێشەکییەك بەدوای کتێبی زەبەلاحەکاندا دێت بەناوی (کاوان لە ئێرانی سەدەکانی ناوەڕاستدا) بە چەندین زمان.

دواجار هێنینگ لەو دەقانە دەدوێ کە گواستوونیەوە و لە ئیشارەتە زمنییەکانی کە لە کتێبی زەبەلاحەکاندا هاتوون. هاوکاری کردنی Henning لەگەڵ (G.Haloun) دا گەیاندنیە (کورتەیەك سەبارەت بە رێباز و شێوازەکانی راسپاردەکانی "مانی" و بوودا لەمەڕ رووناکی.) یەکێك لە وەرگێڕانەکانی هێنینگ بۆ بابەتێکی تەقیزادە، گەلێ پرسیارو دۆخی ئاڵۆزی تێدا بەرچاو دەکەوێت سەبارەت بە مێژووی ژیانی "مانی" لە لەدایکبوونیەوە تا مردن.

لەم هەڵبژاردەیەوە بۆمان روون دەبێتەوە کەوا هێنینگ یارمەتی بەرچاوی داوە بۆ چارەسەرکردنی هەموو ئەو جۆرە کێشانەی پەیوەندییان بە دەقەکانی مانیەت و لێکدانەوەی دەرکەوتنی مانییەوە هەیە لە مێژووی ئاینەکاندا. هێنینگ تەنها بەش و تێکستەکانی بڵاونەکردووەتەوە، بەڵکو زۆر لێکدانەوەی بایەخداری داوە بە زانیارییە تەمومژاوییەکان.

ساڵی 1945 لێکۆڵەرەوەی سویدی W.Widengren دوو بەرگ لێکۆڵینەوە لەسەر ئاینە رۆحیەکانی (Gnostic) ئێرانی، مانییەت، مەندایی، سووریی نووسیوە. یەکەم بڵاوکراوەی ناوی "فۆهۆمانامی مەزن و پێغەمبەری خودا The Great Vohu Manah and) Apostle of God) بابەتی ئەم لێکۆڵینەوەیە تێرمی مەنبەهمەدی بزورگ (Manvahmed Vazurg) ە لە نووسینەکانی مانییەتدا. لە پێشەکیەکەدا وایدنگرێن دەڵێ کەوا دەیەوێ بیسەلمێنێ کە (ئەگەری چەمکی رۆحیی مانییەت لەبارەی مەنبەهمەدی بزروگەوە لە باوەڕێکی ئێرانی دێرینەوە پەرەی سەندووە).

مەنبەهمەدی مەزن وا دەگەیەنێ کەوا گیانێکی تاکەو وەك گیانی گشتی پێناسە دەکرێ. وایدنگرێن لە کتێبەکەیدا دەیەوێ پەیوەندی نێوان چەمکی مەنبەهمەدی بزورگ تاقیبکاتەوە وەك گیانێکی گەردوونی و "پێغەمبەر" یش کە هەردووکیان خواوەندێك بن و لە هەمان کاتیشدا کەسێکی بنیادەمیش بن.

بەشی یەکەم لە تێرمی مەنبەهمەدی بزورگ ورد دەبێتەوە.

لێرەدا وایدنگرێن گفتوگۆ لەسەر هاتنی "مانی" دەکات لەگەڵ ئەو راستییەدا کەوا لەلایەن هێزێکی خواوەندەوە بە (دوانە Twin) بانگ کراوە. ئەوجا دەگاتە ئەو ئەنجامەی کەوا (مانیی پێغەمبەر جووت هاوەڵێکی هەیە، کە مەسیح و گیانێکی تاکی ترە. لە هەردوو حاڵەتەکەدا واڵێکدەدرێتەوە کە جووت هاوەڵەکە هەڵگری گیانی مردن بێت و دەگەڕێتەوە بۆ ماڵی رووناکی لە ئاسماندا.)

لێکدانەوەی وایدنگرێن لەسەر بنەمای پێناسەکردنی هەردوو دەربڕینی: مەنبەهمەدی بزورگ و ئەقڵی مەزن Great Nous (کە هەردووک حوزووری بەردەوامیان هەیە لە ئەدەبی مانیدا). بەهمەنی مەزن (بەهمەنی مەنبەهمەد)، گیانی بزورگ، بەرزترین بنەمایە لە بنیادەمدا و گیانی مرۆڤیش بەشێکە لە بنەمای گەردوون. گرنگی بەهمەن Vahman لەوە زیاترە. ئەقڵی مەزنیش گونجاوە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا. بەم جۆرە بەهمەن رابەری کۆمەڵگای ئایینییە و هەروەها بەرجەستەکاری ئایینیشە.

بەشی دووەم لەگەڵ مانای تێرمی (Vohu Manah) ی ئاڤێستادا مامەڵە دەکا. وایدنگرێن پەیوەندیی Vohu Manah و توانای گەردوون و مرۆڤ و Manah ی تاك لێکدەداتەوە. ئەو وای باس دەکا کە Vohu Manah لە گیانی بنیادەمدا وەك میوان جێگیر بووە.

دوای ئەوە وایدنگرێن سەرنج بۆ ئەو راستییە رادەکێشێ کەوا لێکچوونێکی نزیك هەیە لەو رستەسازییەی کە پەیوەندیی بە بنیاتنانی (Vohu Mana) وە هەیە لە مرۆڤدا لە نووسینی پەهلەوی مانییەتدا و دەقی پەهلەویی زەردەشتیدا. وایدنگرێن تەنانەت دەڵێ کەوا "لێکچوون لە نێوان ئایدیای زەردەشتی و مانییەتدا لەو بابەتانەی پرسیاریان لەسەرە، وەك بۆچوونی پەیوەندییەکی گەرم و گوڕی نێوان (Vohu Mana) و مرۆڤ بەشێوەیەکی بنەڕەتی دەگەڕێتەوە بۆ رۆژگارە دێرینەکان.

سەلماندنی ئەم گریمانەیە لە برگەیەکی یەکێك لە ئەپانیشادەکانەوە وەرگیراوە. بەم جۆرە وایدنگرێن (پەیامبەر) واتە پێغەمبەری خوا و مەزهەبی "مانی" تاقیدەکاتەوە سەبارەت بە سرووشی چەندین پێغەمبەر کەوا لە چەندین چەرخی جۆراوجۆردا دەرکەوتوون و بەئەنجام گەیشتنەکەی بەم جۆرەیە: "باوەڕی سرووشی سووڕاوە Cyclic) وەك دیاردەیەکی لاهووتیەتی ئێران، زۆر لە شێوازی رامانی ئەڤاتارای هندیی دەچێت، بەم جۆرە و بەهەموو ئیحتیماڵێك ئێمە دەتوانین گریمانەی بوونی باوەڕێکی هیند و – ئێرانیی دێرین رابگەیەنین کەوا باکگراوندی راستەقینەی باوەڕی مانییە لەم حاڵەتەدا".

بەشی سێیەم دوابارەی سەرنج و تێبینی دەخاتە روو. بەهۆی هەندێ نموونەوە پەیوەندیی رۆحانییەت (Gnosficsm) بە (مانییەتیشەوە) بە تێرامانی هیندۆ – ئێرانییەوە دەردەکەوێت. نموونەکان بە گشتی لەمەڕ پۆشاك و پۆشاکی پیرۆزن، وەك سیمبوڵێکی گیانی مرۆڤ.

پاشان وایدنگرێن بە کورتی وێنەی چەمکی ئەقڵی مەزن لە ئەدەبی سریانی دا (مەسیحی) دەکێشێ. کتێبەکە لە دواییدا بە دوو پرسیاری بێ وەڵام کۆتایی پێ دێت:

١ ) چۆن چەمکی سووریی ئەقڵی مەزن پەیوەندیی بەبیری هێلینیەوە هەیە.

ح ) لەیەکچوونی هێمایی نێوان بیرۆکەی ئەقڵی مەزن و پەیمانی نوێ (العهد الجدید) لە چەمکی (رۆح، نفس - Pneuma) دا دەبێ رەچاوبکرێ.

چاوخشاندنێك بە لێکۆڵینەوەکانی وایدنگرێندا دەبێ پێ لەوە بنێین کەوا دانەر تەجانوسی چەمکە ئێرانی و مانییەکان دەسەلمێنێ لەمەڕ گیانی مرۆڤ و بنەما خواوەندییەکان. بەهەرحاڵ وایدنگرێن نەیتوانی تەوافقی زیاتر بخاتە روو لەنێوان بیروباوەڕی مانییەت و هیندۆ - ئێرانی دا. بۆ ئەم مەبەستە بەڵگەهێنانەوە لەو تێکستانە زۆر قەناعەت بەخش نین.

کتێبەکەی دیکەی وایدنگرێن بەناونیشانی "رەگەزەکانی میزۆپۆتامیا لە مانییەتدا" یە. خاڵی دەستپێکردن بەم جۆرەیە: ئایا هیچ رەگەزێکی میزۆپۆتامیا و مەسیحیەت لە شێوازی سەرەتایی سیستەمی ئاینی مانیدا هەیە؟

نووسەر لەو کتێبەدا ئەم رەگەزانەی خوارەوە دەخاتە روو: کوڕی ژیان تێرمێکی میزۆپۆتامیایە کە زۆر باش لە سووری گنۆستیدا ناسراوە لەلایەن سوورییەکانەوە. درەختی ژیان، دەروازەی ژیان، ماڵی ژیان.. تاد، ئەمانە هەموو بۆچوونی میسۆدولوجیای میزۆپۆتامیان. ئەژدیهای بەدو درێو و شوێنی تاریکی (واتە باشوور)، ئەمانەش لە بنەڕەتدا لە میزۆپۆتامیاوە هاتوون. رزگارکەری بەزیو "گیان" لە نووسینە مەندایی و مانییەکاندا یادگارێکی کۆنی تەمووزە (Tammuz).

هەروەها دیالۆگی نێوان پەیامبەر و مرۆڤی سەرەتایی دەشێ بگەڕێتەوە بۆ تێکستە دێرینەکانی تەمووز، کە هەمان شتی باشی گەڕانەوەی گیانی رزگارکەرە لە کەشتیی دەریاز کردندا. وایدنگرێن لە بەشی کۆتایی کتێبەکەیدا ئەوە دەردەبڕێ. کە نازناوەکانی رزگارکەر شێوازی میزۆپۆتامیای پێوەیە چەشنی درەختی ژیان، پزیشك (حەکیم)، رووناکی، چرا، پەیامبەر. وایدنگرێن لەم بوارانەدا دەداتە لایەنی دوورو درێژی و لە دواییدا کتێبەکە بەم ئەنجامانە کۆتایی دێنێ:

یەکەم ئەنجامی ئەوەیە کەوا گەلێ لە رەگەزەکانی میزۆپۆتامیا لە مانییەتدایە. زۆر گونجانی کات و شوێن هەیە لەنێوان مانییەت و مەندایی و سووریدا لە رووی زانیاریی رۆحییەوە و ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ باکگراوندی هاوبەشی میزۆپۆتامیا، چونکە هەرسێکیان ئاینی رزگارکەرن. بەم پێیە "مانی" لێکدانەوەیەکی ئێرانیانە دەدا بە ئەفسانەیەکی میزۆپۆتامیا.

وایدنگرێن دیسان دێتە سەر باسکردن و دەڵێ:

(دەبێ وای دابنێین کە هەنگاوی یەکلاکەرەوە بۆ ئاوێتەکردنی ئاینە رزگارکەرەکانی ئێران و میزۆپۆتامیا چەند سەدەی بردووە لە پێش مانیدا کاتێ کە فیگەری (پیاوی مەزن) وەك فیگەرێکی بەرچاوی رزگارکەر دەپەرسترا لە وڵاتی نێوان دوو رووباردا.)

دواجار وایدنگرێن بایەخی مانی بەم جۆرە وەسف دەکا:

(ئامانجی ئاینی - سایسی دەرکەوتنی مانی ئێستا تارادەیەك بەروونتر دێتە بەرچاو ئەگەر تەنها وای تێڕوانین کە دژی باکگراوندی ئەو سیاسەتە ئاینییە بوە کە لەلایەن فەرمانڕەوا ساسانییەکانەوە لە ئەستۆگیرابوو. بەهۆی بڵاوبوونەوەی ئاینێکی خۆ حەشاردەرەوە Syncretistic مانی دەتوانێ ئاینێ بە شاهەنشای ساسانی ببەخشێ کەوا بە چاکی

شیاو بێت و پەسەند کراوبێت لەلای هەردوو رەعیبەتەکەی کە ئێرانی و میزۆپۆتامیا بوون. بیروبۆچوونی بنەڕەتیی ئەم سیستەمە ئاینیەیە ئێرانیەکانن، بەڵام زمانەکەی لە رۆحانییەتی میزۆپۆتامیاوە سەرچاوە دەگرێ هاوکات لەگەڵ سۆز و هەواداریی مەسیحییەتدا.)

دواڵاپەڕەکانی کتێبەکەی وایدنگرێن ئەو پرسیارە دەوروژێنێ کە ئایا نیاز و مەبەستی مانی بەم لایەنەدا رۆیشتووە. کێشەکانی قەناعەت پێکردنی مانی و بەرهەڵستی کردنی دواتر بەرپادەبن.

وایدنگرێن جارێکی تر دەگەڕێتەوە سەر باری سەرنج و بۆچوونی خۆی لەسەر مانی و ئاینەکەی و نەخشەی بارودۆخی سیاسی و فەرهەنگی و ئاینی دەکێشێ لە میزۆپۆتامیادا لە رۆژگاری مانیدا. بەشێکی تری تەرخان کراوە بۆ ژیانی مانی و پاشان باوەڕەکانی مانی باسی لێوەکراوە. بەشەکانی تر لە تێکستەکانی ئەدەبی مانییەت، رێکخراوی ئەکلیریکی و گرووپی ئاینی و پەرستن، هونەری مانییەت و بڵاوبوونەوەی مانیزم دەدوێ. وایدنگرێن تەنها وەك فەیلەسووفێك باسی مانی ناکات بەڵکو وەك بلیمەت و شارەزایەکی لاهووتیش باسی دەکا. مانی بەتەنها سیستەمێکی ئاینی – فەلسەفیی نەهێناوەتە ئاراوە بەڵکو مژدەی سرووشێکی خواوەندیشی داوە.

ساڵی 1949 زاناو لێکۆڵەرەوەی فەرەنسی H.CH.Puech کتێبێکی لەسەر مانییەت بڵاوکردەوە بەناوی : (. Les Manicheisme (Son Fondateur – Sa doctrine) کە بەرهەمێکی گەلێ نایاب و ناوازەیە.

دواتر Puechبایەخی دا بە بەرەوارەکان و بەردەوام بوو لە نووسیندا لەسەر ژیانی مانی و مردنی. بایەخی لێکدانەوەکانی Peuch لەرووی بەکارهێنانی سەرچاوەوە بوو بە ویژدانێکی زیندوو و ئیزافەکردنی گەلێ سەرنج و تێبینی رێك وپێك بۆ تێکستەکەی. ئەو بەم رێگەیە مشتومڕ لەسەر لەدایکبوونی مانی دەکا (14ی نیسانی 216)، شوێنی لەدایکبوونی، باوك و دایکی، پەیوەندیی مانی بە بنەماڵەی پاشایەتی وڵاتی ئێرانەوە، ئاینی باوکی مانی، پەیوەندیی بە مەندایییەوە، ئەو وەحی و سرووشەی بۆ مانی هاتووە، گەشتەکانی مانی بۆ هندستان، چالاکییەکانی مانی لەنێوان ساڵانی 242–273 دا، چاوپێکەوتنی مانی لەگەڵ شادا، بەندکردنی مانی و مردنی.

لە نیوەی دووەمی کتێبەکەیدا Puech بیروباوەڕی مانی ئاوەڵا دەکا. سێ خاسیەتی مانیزم شۆرەتی خۆیان هەیە: لەپێش هەموو شتێکدا ئاینەکەی مانی خاسیەتێکی گشتگیریی هەیە، ئەمە تاقە ئاینە کە لە توانایدا بێت رزگاربوون ببەخشێ بە تەواوی دنیا و بەرای مانی هەموو سروشەکانی تر ناتەواو بوون. دووەمیان ئەوەیە کە مانیزم گیانێکی تەبشیریی یەکجار گەورەی هەیە، چونکە ئەرکی هەر باوەڕدارێك بووە کە بە ئاشکرا باوەڕی خۆی دەربڕێ و بانگەشەی بۆ بکات. ئەمەش هۆیەکە بۆ بەزوویی بڵاوبوونەوەی ئاینی مانی. دواجار نووسینە پیرۆزەکانی مانی گەوهەری مانیزم پێکدێنێ. مانی بۆئەوەی موریدەکانی لە مەترسیی هەڵوەشانەوەو لێکترازان بپارێزێ لە دوای خۆی هەڵسا پەیامەکەی کرد بە نووسین. لەپێناسەکردنی گەوهەر و ناوەڕۆکی مانیزمدا Peuch تێرمی Gnosticsim ی پێ پەسەندتر ە لە (Syncretism). Puech دواجار بە دووبارە بەرهەمهێنانەوەی

میتۆدۆلۆجیای مانیزم کۆتایی بە مەسەلەکە دێنێ.

ئەم چاوخشاندنە بە ئەدەبی مانیزم دا دەری دەخا کەوا گەلێ جیاوازیی بیرورا لەسەر مانی و سیستەمە ئایینەکەی هەیە. روانینە کێشەکانی مانییەت وردە وردە بەرەو قووڵبوونەوە دەچێت. ئەمە کارێکی سەرسامکەر نیە بەهۆی سروشتی ئاڵۆزی دیاردەی ئاینەکانەوە، سەرەڕای ئەوەش قووڵتر تێگەیشتن لە مانیزم بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ هەندێ هۆ تەگەرەیان دەخستە رێ. بێجگە لەمەش گرفتێکی تر پەیدابوو، ئەویش شێوەو چۆنێتی خۆلەقەرەدانی ئاینەکان بوو، چونکە کام ئاین بگری ئاسان نیە تێگەیشتنی. بەدرێژایی چەرخ و رۆژگار مێژووناسانی ئاین بەردەوام کێشەیان هاتووەتە رێ کاتێ کە ویستوویانە ناوەرۆکی ئاینێك پێناسە بکەن. لەم رەوتەدا رێبازێکی تازە دۆزراوەتەوە کە پێی دەوترێ رێبازی فینۆمینۆلۆجیی لێکۆڵینەوە. لەنێو ئەو لێکۆڵەرەوانەدا کە ئەم رێبازەیان بەکارهێناوە ڤان دەرلیوو - G.Vander Leeuw و بلیکەر- C.J.Bleeker دەبێ ناویان بێت و بەهۆی کارەکانی ئەوانەوە رێبازی فینۆمینۆلۆجی زۆر تەشەنەی سەند.

بلیکەر بابەتەکانی فینۆمینۆلۆجیای ئاینی بەم شێوەیە فۆرمەلە کردووە:

1- لێکۆڵینەوە لە "تیۆریی" دیاردەی ئاینی، بۆ نموونە، تەماشاکردنی دیاردە وەك زانیارییەك کەوا بەهای ئاینەکە روون ببێتەوە.

2- شوێنکەوتنی بنەمای ئەقڵانییەت و شیکردنەوەی پێکهاتەی بنەڕەتیی دیاردەی ئاینی.

3- شوێنکەوتنی "دینامیکا" ی دیاردەی ئاینی، بۆ نموونە پرسیارکردن لە هەر پێشکەوتنێکی دیاریکراوی ئاینی رەگەزی مرۆڤ.

ئەم بابەتانە دەچنەوە سەر لێکۆڵینەوەی گشتی دیاردەی ئاینی. کاتێکیش کە ئاینێك بەتایبەتی بخرێتە بەر تاقیکردنەوە ئەوە رێبازی فینۆمینۆلۆجی بەکاردەهێنرێ. ڤان دەرلیوو ئەم بەرنامەیەی خوارەوەی بەکارهێناوە:

4- فینۆمینا ناوێك دەگرێتە خۆ و بەهۆی ناو پێدانێك بۆ دیاردەیەکی ئاینی دەگەینە پۆلێن کردنێك.

5- دیاردە یان فینۆمینا گرێدراوە بە ژیانی لێکۆڵەرەوەوە. ڤان دەرلیوو باسی ئەوە دەکا کە: "راستی هەمیشە راستیی خۆمەو مێژوو مێژووی خۆمە."

6- وا هەست دەکرێ کە فینۆمینۆلۆجی تەنها پەیوەندی بەفینۆمیناوە هەیە، فینۆمینۆلۆجیای ئاین خۆی دەخاتە لاوە و تەماشای ساتەکانی تجلي دەکات.

7- ناکرێ خۆ لە پاکتاو کردن بە دوور بگری. زانیاریی جۆراوجۆر دەبێ جوێ بکرێتەوە و لێکۆڵەرەوە بەدوای بەیەکەوە گرێدانی مەنتیقیدا دەگەڕێ.

8- گشت ئەو خاڵانەی لەسەرەوە باس کران "تێگەیشتنێکی" راستەقینە پێکدێنن. راستیی تەمومژاوی و چەسپاو دەبێتەوە بە سروشێك، بە پەیامێك.

9- لێکۆڵینەوەی فیلۆلۆجی دەبێ هەمیشە لەتەك لێکۆڵینەوەی فیلۆلۆجی و ئارکیۆلۆجیدا بێت.

10- لێکۆڵینەوەی فینۆمینۆلۆجی نزیکی بابەتەکە خۆی دەبێتەوە. ئەوجا

لێکۆڵەرەوە دەتوانێ زانیاریی بەبەڵگەوە بدات، لەوانەی کە بۆی دەرکەوتووە.

ئەم دوو بابەتە بەروونی ئەو کێشە و گرفتانە پیشان دەدەن کەوا لێکۆڵەرەوەیەك تووشی دەبێت لەکاتی لێکۆڵینەوەیدا لەسەر ئاینێکی دیاریکراو. هەمان کێشەو گرفت دێنە پێشەوە لە هەوڵداندا بۆ تێگەیشتن لە ئاینێك، ئەو ئاینە ئیسلام بێت، بوودیی بێت یان مانیيەت.

پرسیاری ئاڵۆز بۆ گەیشتن لە ئاینێك لەم دواییەدا لەلایەن وێردینبوورگەوە مامەڵەی لەگەڵ کراوە لە بۆچوونەکەیدا. سەرنجەکانی لێرەدا سوودیان لێوەرگیراوە وەك نموونەیەك بۆ ئەو کۆسپانەی دێنە رێی هەموو مێژوو نووسێکی ئاین.

وێردینبوورگ باسی ئەوە دەکا کەوا گەلێ قۆناغ هەن لە لێکۆڵینەوەدا، یەکێکیان ئەوەیە کە دەبێ لە جیهانی هەموو ئاینێك بکۆڵیتەوە. لەم جیهانەدا فینۆمینایەکی ئاینی تایبەت پێویستی بە گرنگی پێدانی تایبەتی‌یە. پاشان تێگەیشتنی بونیاد دێتە پێشەوە. کێشەو گرفتی ناوەکی ئاینێك بەرەو لێکۆڵینەوەت دەبا بۆ گەوهەر و ناوەڕۆکی ئەو ئاینە. بەلام ناوەڕۆکی راستەقینەی ئەو ئاینە رەنگە قەت نەیەتە دەست.

ئەمە وامان لێدەکات هەست بەوە بکەین کەوا لێکۆڵینەوە لەسەر مانییەت گەلێ کۆسپ و تەگەرەی هاتووەتە رێ و هەندێکیشیان هێشتا هەر لەڕێگایدان.

گەلێ لە دەق و نووسینەکان هەرگیز بە وێژدانەوە نەنووسراون. بەم جۆرە هەرکتێبێك لەسەر "مانی" نووسرابێت پرکێشییەکە بۆخۆی. لێرەوە ئێمە هەوڵ دەدەین تیشکێك بخەینە سەر پەیدابوونی ئەفسووناویی "مانی". ئێمە لێرەدا بابەتەکە بەم برگانە کۆتایی پێ دێنین کەوا لە کەفەلایاوە Kephalaia وەرگیراوە، "تۆ خۆت دەزانی کە ئەو حیکمەتە مەزنەی کەوا (مژدەی پێدەدەم) لە شارێکەوە بۆ شارێك، لە ولاتێکەوە بۆ ولاتێك، دوور لە شتەکان لە کتێبدا (دەنووسم)، هیچ زارێکی ئادەمی بەشی نووسین ناکات. بەلام تۆ، بەپێی توانات و تا ئەو شوێنەی لە تواناتدایە، بیرت بێتەوە و چەردەیەك لە بارەی ئەو حیکمەتە مەزنەوە بنووسە کەوا لە منت بیستووە."

بەدوای ئامۆژگاریی مانیدا، تا بتوانین، دەمانەوێ بیرمان بێتەوە و کەمێك لەو حیکمەتە مەزنە بنووسینەوە کە لەلایەن "مانی" یەوە مژدەی پێدراوە.

سەرچاوە: کتێبی

**MANI**

ARELIGIO- HISTORICAL
DESCRIPTION
OF HIS PERSONALITY
BY: L.J.RORT
LONDON 1967
CHAPTER ONE بەشی یەکەم
SURVEY OF SOME IMPORTANT
STUDIES ABOUT MANI AND HIS
RELIGLON.

لەوەرگێرانی ئەم بابەتەدا کەمێك کورتکردنەوەم تێدا کردووە، بەلام بەهیچ جۆرێك نەمهێشتووە لابدات لەو ناوەڕۆکەی کە مەبەستێتی. (وەرگێڕ)

# سەبارەت بە (تێزی تورك لە مێژوودا)

■ حەمید بۆز ئەرسلان*

● و: سدیق سالّح

ئەم دەقەی خوارەوە وردبوونەوەیەکە لە کتێبێك ساڵی 1977 لەلایەن نووسەری تورك ئیسماعیل بێشکچییەوە دەرچووە. [1] ناوبراو (تا لە 1989 دا بەرەڵاکرا بە یەکێك لەو گەورەترین زیندانیانەی تورکیا دادەنرێت کە لەسەر بیروڕاکانی گیراوەو، بە خەبات و داکۆکیکردنیشی لە کورد ناسراوە. دانەر لەم کتێبەیدا کەوتووەتە شیکردنەوەی دوو تیۆری کە هەڵوێستی تورکیای کەمالی و پاش کەمالی‌یان بەرانبەر بە مەسەلەی کورد دیاری کردووە. ئەگەرچی ئەم دوو تیۆریە بەلای خوێندەوارانی ساڵی 1991 ەوە سەیرو سریالین، بەڵام هەردوکیان لە ساڵانی سیدا گەڵاڵە بوون و لە گەلێك کۆنگرەو بڵاوکراوەی دەزگا زانستیەکانی دەوڵەتی تورکیادا بەرگرییان لێکراوە، ئەو دوو تیۆریە تێڕوانینی ماوەی بیست ساڵی ئەنتلجنسیای تورکیان بەرانبەر بە جیهان دەست نیشان کردووە و، شوێنەوارێکی دیاریان بە عەقڵی نەوەکانی لەوەبەدواوە بەجێهێشتووە. پوختەی هەردوو تیۆری ئەمەیە: "نەژادی تورك سەرچاوەی رەسەنی هەموو شارستانیەتەکانی جیهانە" و "زمانی تورکی دایکی هەموو زمانەکانە".

ئەم دوو تیۆریە کە یەکەمیان ناوی "تێزی تورك لە مێژوودا" و دووەمیان "تیۆریی زمان – خۆر" ە، لە سەروبەندێکدا گەڵاڵە بوون کە تورکیای کەمالی چەندین هەژانی گەورەی بەخۆوە دین، وەك چۆن پێشتر ساڵی 1930 دووچاری شۆڕشێکی کوردیی بە زەبروزەنگ بوو کە زۆر لەسەر تورکیا کەوت و، هەواڵەکانی بەدرێژایی پتر

له چوار مانگ ستوونەکانی پێشەوەی ڕۆژنامەکانیان بۆ خۆیان داگیرکردبوو، ئۆپۆزسیۆنی تورکیا، وێڕای ئەوەی کە هەر دەستکردی مستەفا کەمال خۆی بوو، نەخشێکی بەرچاوی لە نەهێشتنی متمانەو دەسەڵاتی حیزبی حوکمداردا بینیو، دواتر دەسەڵاتدارانی تورکیای ناچارکرد حیزب و دەوڵەت لە یەك دەزگادا لێك بدەن. هەرچی قەیرانی ئابووریشە، بە توندی کاری کردە سەر دێهاتەکان و، ناڕەزایی جەماوەرییش کە لە ئزمیر بە چەند ڕێگایەکی سیاسی کەوتە ڕوو، بوو بە جووڵانەوەیەکی ئایدیۆلۆژیی ناسراو بە مەنەمەن (MENEMEN)[2].

ئەم هۆکارانە دەتوانن ببنە لێکدەرەوەی هەڵوێستی نەتەوەیی توندوتیژی ئەو سەرکردانەی تورك کە حەزیان دەکرد: بە خێرایی بکەونە هێنانە ناوەوەو لێکدانی نەژادی کورد و دانیشتوانیش لە دەوری "حیزب - دەوڵەت" کۆبکەنەوە و گوتارێکی سادەکەرەوەی یەکلایەنە بهێننە گۆڕێو ژیانی کۆمەڵایەتی لە چوارچێوەی نموونەیەکی ستوونیدا ڕێك بخەن بە جۆرێك کە سەرکردە و پێشەواکان لە چڵەپۆپەیدا بن. ئەگەرچی ئەم هۆکارانە کەش و هەوای دەروونیی ئەو ماوەیەمان تێدەگەیەنن، کەچی هێشتا بەس نین بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارەی خوارەوە: ئەو تیۆری داڕێژانە چۆن بە خۆیاندا ڕاپەڕموو لافی ئەوە لێبدەن کە نەژادی تورك ئەسڵی سەرلەبەری شارستانەتیی مرۆڤایەتییە؟ ئێمە بە پێچەوانەی گەلێك مێژوونووسی تورکیای کەمالییەوە، پێمان وانییە بتوانین ئەم تێپەڕاندنە عەقڵییە لە ئایدیۆلۆژیای نەتەوەییدا بە دەرکەوتەیەك لە قەڵەم بدەین، چونکە ئەم تێپەڕاندنە قەیرانێکی قووڵی فیکری و دەروونی پێشان دەدات. بۆیە پێویستە بایەخێکی تایبەت بە بنچینە و شوێنەوارەکانی بدەین.

گوتەی نەتەوەیی لە گوتاری ئەنتلجنسیای تورکدا پێش پەیدابوونی کەمالیزم سەری هەڵداو، دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی حەمیدی و، ڕەنگە بۆ سەردەمی ڕێکخستنەکان (1838-1876) یش. مەسەلەی (نەتەوەی هاوجۆر) (کە بە مەرجێکی هەمەلایەنەیی "شمولیە" دادەنرێت) و کێشەی تواندنەوەی نەژادە غەیرە تورکەکان جێی مشتومڕ و بگرە ململانێی نێوان تاقمی "جۆن تورکەکان" یش بوو لە دوورە وڵات.[3] هەروەها بەکارهێنانی ئایدیۆلۆژیای نەتەوەیی وەك ڕێگایەك بۆ بنیاتنانی شەرعیەتی کاری سیاسی و دانانی گەوهەرێك بۆ بوونی دەوڵەت، بەرهەمی نەك هەر کۆماری کەمالی، بەڵکوو هیی کۆمەڵەی "ئیتیحادو تەرەقی" ی بنەڕەتی فیکری و ئۆرگانیی ئەو کۆمارەیش نییە. کۆمەڵێك زاراوەی وەك بیرو هۆشیاری و نەتەوەو مێژوو و شارستانەتی و دەوڵەت و ڕۆشنبیری (بە مانا جەرمانیەکەی وشەکە) هەر لە سەردەمی ئیتیحادیەکانەوە پەیدابوون و زۆربەیان بوونە بنچینەی ئەو ڕێبازە دەسەڵاتخوازانە کە ئەوروپایش هەردوو سەدەی نۆزدەیەم و بیستەم بەخۆوەی دین. شۆڕش وەك کارو دەسەڵاتێکی سیاسی کە دەست بژاردە (نخبە) بەپێی چەمکێکی بەگشتی ناکۆك لەگەڵ سرووش (الوحی) یا پەیامی پێغەمبەرانەدا جێبەجێی دەکات، نێوان ساڵانی 1908و1918 لە زەینی ئیتیحادیەکاندا ئامادەبوو.

کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی بەم شێوەیە ئاشکرا ڕایدەگەیاند: دەست بژاردە هۆکارێکی سەرکیی دامەزراندنی کۆنترۆڵی "نەتەوەی تورك" ە[4]. شەرعیەتی دەوڵەتی عوسمانیی لەسەر ئیسلام و ئیمپراتۆری دامەزراو لە هەمان ماوەدا دووچاری زەبری نەتەوایەتیی تورك بوو، بەڕادەیەك ئیتیحادیەکان (کاتێك پایەکانی دەسەڵاتیان بەدەستەوە گرت) کۆیان لەوە

نەدەکردەوە بڕیار و پەیماننامە رەسمییەکان بەناوی حکوومەتی "تورکیای لاو" ەوە ئیمزا بکەن. لیژنەی "حیزب- دەوڵەت" یش لە 1913 بەدواوە نەك هەر خۆیی بە "کەعبەی ئازادی" دەژمارد[5]، بەڵکە بە تاکە زامنکەری مانەوەی نەتەوەی تورك و، دواجار بەو هێزە سیاسیە کە ناتوانێ دەست بەرداری دەسەلات ببێ. ئەو بەهرە تۆرانچێتیـیە کە نێوان سالانی 1903 و 1098 لە زەینی تورکدا جێگیربوو لەلایەکەوە، کوشتاری دەستەجەمعیی دانیشتوانی ئەرمەن لە سەروبەندی یەکەمین جەنگی جیهانیدا لەلایەکی دیکەوە، بەشێوەیەکی تراژیدی سەلماندنیان لەوانەیە بیروڕا ببێتە هێزی داینەمۆی مێژوو.

بەڵام نەتەوایەتیی ئیتیحادی نەیتوانی خۆ لە ئیسلام دابڕێ، بەڵکو لە ماوەی یەکەمین جەنگی جیهاندا وەك ئامرازێك بەکاری هێنا، چونکە تێڕوانینی یۆتۆپیانەی ڕێبازی نەتەوایەتیی ئیتیحادیەکان، لە رووی داگیرکردنی وڵاتانەوە، تەواو دەرکی بە سروشتی وەهمیی "قەوارە" ی نەتەوەیی کردبوو. نەتەوەی تورك هێشتا نەك هەر "دەرکەوتەیەکی بنچینەیی"، بەڵکوو حاڵەتێکی عەقڵیشی پێك دەهێنا، لەکاتێکدا دەبوو ئەو دەوڵەتە سەرلەنوێ دروستی بکاتەوە کە بەم دروستکردنە تورکی دەخستە سەر رێگای گەیشتن بە "شارستانەتی". هەموو ئەمانەیش هەر راگواستنێکی ساختەی نموونەی بنەڕەتی ئەڵمانی بوو. ڕێبازەکەیش هەر لە سەرەتاوە تا کۆتایی ڕێبازێکی دەست بژاردە خواز "نخبویی" بوو[6]. بەڵام نەتەوایەتیی تورك هێشتا زۆر لەو تێڕوانینە لاهووتیـیەوە دوور بوو کە پەیامێکی شارستانیی مێژوویی دەبەخشیە نەتەوە (دواتر نەژاد).

ئەو بیروڕایانە سەرەتای سەرهەڵدانیان بوو و، تایبەت بوون بەو دەوڵەتە کە بریتی بوو لە دەزگایەکی پێشڕەو و سەرکوتکەر و بەرجەستەکەری چاکترین تورك. دەوڵەت راسپێردرابوو ئەرکی خولقاندنی نەتەوەی تورك تەواو بکات و، پاشان دوورابیەکی گەردوونیی هەمەلاینە بداتە تورك، چونکە دامەزراندنی نەتەوە مەرجێکی بنچینەیی گەیشتن بوو بە هەمەلایەنەیی و گەردوونخوازی (الشمولیه والکونیه)[7].

ئەم جیاوازیە، بە بەراورد لەگەڵ سەردەمی کەمالیدا، بە کەم ئەزموونی و سادە لەوحیی دەستبژاردەی ئیتیحادی‌و، بەو مەرجە ماددیانەیش کەناچاریان کرد لەئاستێکی سادەکردنەوەدا کاربکات و نەیانهێشت هیچ موزایەدەیەکی فیکری بکات، لێکدەدرێتەوە. بەڵام وێڕای هەموو ئەمانەو، وێڕای سەرلێشێوانی تیۆریی ماوەی نێوان هەردوو سەردەمەکە (1919–1922) ، ئاراستەی ئیتیحادی لە ئەنجامدا ئاراستەی کەمالیی لێکەوتەوە:

واتە ئاین و دەوڵەت تا ئەوکاتە یەکتریان تەڵاق نەدابوو و، هۆکارەکانی بە گشتی ئامادەبوون. بەم پێیە تورکیا لە هەمەلایەنەیی ئیسلامیـیەوە پێی نایە ئاستی نەتەوایەتیی تورك. ئەمەی دواییشیان روویدەکردە دانیشتوانی موسڵمانی غەیرە تورك: ئەلبانیەکان و عەرەب و کورد[8]. لەکاتێکدا دوورابیە ئاینییەکان هەڵنەوەشێندرانەوە، بەڵکە لە رووی جۆرایەتیـیەوە کزتر کران (سەرەڕای راگەیاندنی جیهاد لەلایەن خەلیفە – ئیمپراتۆرەوە).

لەپاڵ ئەوەدا، زیاتر بە شان و باڵی خودی (جەنگیزخان) دا هەڵدرا (کە موسڵمانان بە چەشنە کارەساتێکیان دادەنا)[9]. ئەگەر دەوڵەت هێشتا نەیتوانیبێ بەتەواوی دەست بەرداری ئیسلام ببێ، ئەوا بەیەکجاری و تەواوی خۆی لە ئایدیۆلۆژیای عوسمانی دابڕی، کە بریتیـیە لە کۆمەڵێك بیروڕا و بۆچوونی رۆمانی و بێزەنتی. تیۆری دارێژە ئیتیحادیەکان تەواو

پەییان بەوە بردبوو کە بنیاتنانی نەتەوەیی دەقاودەق هاوشانی نەریتی عوسمانیانە نییە. دوای نەمانی عوسمانچێتی، زەنگی وەلاتانی ئیسلامیش لێدرا.

بەلام ئەم دەولەتە نەتەوەییە ساوایە پاش پاکتاوکردنی ئیسلام، یەکجار سەرسام بوو: ئامانجی یەکجارەکیی شەڕی کەمالی ئەوەبوو وەك سەرکەوتوویەکی لێبڕ و شارستانەتیەکی خۆی هەبێ و دەولەتێکی جیا لە ئیسلام دابمەزرێنێ. ئەم ئامانجە، بە کردنە ئیسلامی "تورکیا" و بنەبڕکردن یا دەرکردنی کەمە نەتەوەی ئەرمەن و یۆنان نەبوایە، بەدی نەدەهات. دەست بژاردەی کەمالی تەنیا بەم ڕێگایە، واتە لەنێوبردن یا دەرپەڕاندنی کەمە نەتەوە غەیرە موسولمانەکان، توانیی واز لەکارتی ئاین بهێنێ و دەولەت و کۆمەلگا خۆراوایی بکات. بەم پێیە زنجیرەی خۆراواییکردنی ولات Westernization پێویستی بەوە دەکرد یەکەمجار بکرێتە ئیسلامی.

گرەوکردن لەسەر ئەو دەولەتە نەتەوەییە کە کەمالییەکان رەنگیان بۆ رشت، هەمان بەراوردی لەبەر هەمان هۆ دەخستە روو، چونکە بە زەحمەت بەدی دەهات و پێوەندیی بە بنیاتێکی فشەلی تیۆری و کۆمەلایەتییەوە هەبوو. کەمالیەکان هەولیان دا بە دامەزراندنی دەولەتێکی بەهێز و یەکخەری حیزب و دەولەت و ناچاری ملکەچیی ئەو سەرکردانە (کە ئەرکیان ئەوەیە کارێك بکەن نەتەوە پەیامی مێژوویی خۆی جێبەجێ بکات) کە دەتوانن لایەنە کۆمەلایەتیەکانی سەرتاسەری تورکیا کۆبکەنەوە، ئەم فشەلییە نەهێلن. هەر رژێمێکی لەوجۆرە دەیتوانی ڕێگەچارەی سەرکردەکان بسەپێنێ و بەشێوەیەکی عەسکەریی توندوتیژ بەرپەرچی بەرخودانی کورد بداتەوە. هەرچی لایەنی تیۆریشە، کەمالیزم هەولی دا چاوپۆشی لە فشەلیی بنیاتی تیۆری بکات، ئەویش بەوەی کە مەرجی خولقاندنی نەتەوە بکاتە دەرکەوتەیەکی بنچینەیی. کەمالیزم ئاوا "ئەرك" ەکەی لە دەولەتەوە بۆ "نەتەوە" گواستەوە و کارێکی کرد - دەولەت - نوێنەرایەتیی نەتەوە بۆ خۆی قۆرخ بکات و ئیرادەی بەجێبهێنێ.

ئەم بنیاتە تیۆریە تازەیە سەبارەت بە نەتەوایەتیی "دەسەلاتخواز"، هاوتای ئەو ئەزموونە تراژیدیایانە بوو کە سەدەی بیستەم تووشیان بوو. بەلام وێڕای ئەوە، جۆرە هەلاتنێك بوو بەرەو پێشەوە، چونکە نەدەکرا مەسەلی شەرعیەت فەرامۆش بکرێت. بالی ئیتیحادی خەوی بەوەوە دەبینی "ئیمپراتۆرییەکی نەتەوەیی" لەگەل ئاسیای ناوەندا وەك "نیشتمانی دایك" دابمەزرێنێ.

ئەنادۆل بەلای ئەوەوە لە پارێزگایەك بەدەر نەبوو. بەم شێوەیە شکانی بالی ئیتیحادی، نەك هەر بووە هۆی پەیدابوونی بۆشاییەکی تیۆری تەنیا لە چەمکە نەتەوەییەکاندا، بەلکە کێشانەوەیش بۆنەوەی ئەو پارێزگایە بکرێتە تاکە پارچەی ئەو ئیمپراتۆریە کە دەکرا "دووبارە داگیربکرێتەوە".

بەلام ئەو پارێزگا ناوبراوە، سەرباری مۆرکە تورکی و مەسیحییو ئیسلامیەکەی، لە رووی مێژووییەوە هیی ئەرمەن و یۆنان و ئاشووری کوردو عەرەب.. تە بوو. ئەم سروشتە دوو لایەنە هیچ کێشەیەکی لە باری تێڕوانین و چەمکی عوسمانییەوە نەدەخستە روو، چونکە ئیسلام و ئەو مۆرکی باوك سالاری و هەمەلایەنیە کە ئیمپراتۆریەکەی پێ دەناسرانەوە، دوورابییەکی هەمەلایەنەیان پێدەبەخشی لە هەستی نەتەوەییی تورکی تێدەپەڕاند. بەلام هەر ئەوەندەی دەرکەوت پرۆژەی کەمالی بە تەمایە دەولەتی نەتەوەیی تورك دابمەزرێنی، بالادەستیی نەژادی تورك بوو بە مەسەلەیەکی

داسەپاو. پاشتر "شەڕی سەربەخۆیی" کە ساڵی 1922 کۆتایی پێهات، هەر دەبوە هۆی باڵادەستیی سیاسی و عەسکەری و (تاڕادەیەك) دیمۆگرافیی تورك.

ئەم باڵادەستی‌یە بەس بوو بۆ ئەوەی دەوڵەت (وەك مێژوو سەلماندوویە) کۆنترۆڵی وڵاتەکە بکات و یادەوەری لە گۆڕینێ بە رادەیەك کەمالیزم ناچار بوو پاساوی داگیرکردن بداتەوەو بلێت لەسەر بنچینەی مێژوو و هەق، نەك هێز، دامەزراوە بۆیە پێویست بوو حیسابی خۆی لەگەڵ ئەو تیرە مەسیحیانەدا کە – بە قسەی تورگووت ئووزال– لە دەرەوەی سنووری نیشتمان بوون [10]، یەکلایی بکاتەوە.

دەبوو (مۆرکی رەسەنی تورك) بۆ نیشتمان دروست بکرێت، بە واتایەکی دیکە، سەرلەنوێ مێژوو دروست بکرێتەوە. لە گۆڕینانی یادەوەری و کەمکردنەوەی کەلەپووری یۆنانی‌و مەسیحی بەمەرجی خۆتەکاندنەوە لە یۆنانیەکان و مەسیحیەکان )[11]، و گەلێك کۆشش و مانۆڕی فیکری بۆ هێنانەگۆڕیی ناکۆکی لەنێوان ئەنادۆڵی گریکی (واتە تورکی) و یۆنانی گریکی (دوژمن) دا و، خوڵقاندنی بەردەوامیی مێژوویی بۆ مۆرکی تورکیی ئەنادۆڵ... هەموو ئەمانە بریتی بوون لە کۆمەڵێك هەوڵ و تەقەلا بۆ دروستکردنی (رەسەنایەتی). تیۆری داڕێژانی کۆمار کاتێك گوتیان مستەفا کەمال رابردووی وەکوو پاشەڕۆژ خوڵقاندووە، هەڵەیان نەکرد [12]، مەرجی سەرکەوتنی ئەم رێبازە فیکری‌یە لەوەدا بوو کە گەلان و مێژوویان لێك جیابکرێنەوە. بەم پێیە هەریەکە لە حیسیەکان و سۆمەریەکان و ئاشووریەکان و، یۆنانیەکان و ئەرمەنیەکانیش، سەرجەم بە قودرەتی قادر بوون بە (تورك). ئەو ئەرمەنانە کە بە بەراورد (لەگەڵ قووڵایی مێژوو) دا لە ئەنجامی (جموجووڵی کۆچکردن) ەوە هەر بۆ ماوەیەکی کورت لەسەر خاکی نیشتمان نیشتەجێ بووبوون، [13] تووشی سانسۆرێکی توند دەبوون.

وەدەرنانی گریکەکانیش کۆتایی (میرات) ی گریکی یا مەسیحی تورکەکانی نەدەگەیاند، بەڵکە سزادانی داگیرکەران و رزگاری و گەڕانەوەیان بوو بۆ خاوەنە ئەسڵیەکانیان، بەم شێوەیە کاتێك نیشتمان لە (هاو نیشتمانان) ی رزگار کرا، بوو بە بەهەشتێکی خوڵقێندراو بۆئەو تورکانە کە لە سەرەتای مێژوو و بگرە سەرەتای پەیدابوونی مرۆڤەوە بەڵێنی ئەوێیان پێدرابوو، چونکە پێوەندی نێوان تورك و مێژوو زۆر لە پێوەندیی نێوان هێلکەو مریشك دەچێ. وەك چۆن ئایدیۆلۆژیای کەمالی دەیتوانی ململانێکردن لەگەڵ خوادا وەك ئامانجێکی بنەڕەت و مەبەستی مێژوو قبووڵ بکات، [14]، هەروایش ئەوانە بوونە دروستکراو و جێبەجێکەری ئەرکەکانی.

بەلام بە پێچەوانەیشەوە، مێژوو هیچ مانایەکی نەدەبوو یا لانی کەم تورکەکان نەیاندەتوانی لافی ئەوە لێبدەن کە ئەوان نێردراو و ئەمینداری مێژوون. نەتەوەی تورك کە بە گوتەی تیۆری داڕێژە ئیتیحادیەکان گرەو لەسەر بنیاتنانی دەکرا، بەوپەڕی سادایییەوە بوو بەمێژوو خۆیی‌و دروستکراو و خولقێنەر و ئەسڵی بوون و مەبەستی ئەو مێژووەیش. موزایەدە کردن لە ئاستی تیۆری و عەقڵیدا هەر دیاریکراو بوو. بەلام پاش تاوسەندنی گەلەکۆمەی تیۆری داڕێژانی رژێم، ئەم موزایەدەیە مۆرکی فەلسەفیی خۆیی دۆڕاند و وەك خۆی وەرگیراو، رۆژنامەکان و رادیۆ و زانکۆ و دەستە زانستیەکانی دیکەیش ساز و تەیار کران (بەڵگەو سەلماندنی بنەبڕ و یەکجارەکی) بهێننەوە بۆئەوەی کە سەرلەبەری ژیاری مرۆڤایەتی (چین، هیندستان، رۆما، یۆنان، میسر، میزۆپۆتامیا، ئێران...) لە بنەڕەتدا تورکین.

بێگومان بەڵگەكان (بنەبڕ) بوون، چونكە سەرچاوەكەیان: مستەفا كەمال (خۆر) وەك شوبهێندرابێ بە پەروەردگار، لە هەڵبەدەر بوو [15]، زانا زمانەوانیەكانیش جەختیان كردەوە كە هەموو زمانە سامی و هیندۆ- ئەوروپاییەكان هەر لقێكی زمانی توركیی دایكن. بەر هەڵستانی ئەم دوو تیۆریە ناچاربوون بێدەنگ ببن یا پشتگیری تێزە رەسمیەكان بكەن، چونكە مەحاڵ بوو (مستەفا كەمال) بە درۆ بخرێتەوە، دەنا سزا دەدران [16].

گەورەیی ئەم موزایەدەیە كە لە ماوەیەكی كورتدا بوو بە بابەتی سەرەكیی نێو زانكۆكانی توركیا، مەسەلەیەكی جێی سەرسامی یە. بەڵام دەبێ ئاماژەی پێ بدەین كە ئەم موزایەدەیە بوو بۆشاییی مایەپووچی ئیتیحادیەكانی پڕكردەوەو، كارێكی كرد ئەو نەتەوایەتیە توندڕەوە خۆ لەگەڵ پێشهاتە جیۆسیاسیەكانی پاش جەنگدا بگونجێنێ. شانازیكردن بە ئەسڵی مرۆڤایەتی و مێژووەوە، دەیتوانی لەدەستدانی ئیمپراتۆری و (تۆرانچێتی) لە زەینی خەڵكدا قەرەبوو بكاتەوە، هەروەها كارێكی كرد توركیا بە درێژایی مێژوو زەوت بكرێ و هەموو كێشەیەكی شەرعیەت دووربخرێتەوە.

-بەڵام ئەم موزایەدەیە هەمانكات رێخۆشكەر بووبۆ قسەو قسەڵۆكی ناماقووڵ و كۆمەڵێك لەو نووسینانە كە دەتوانین ناوی (ئەدەبی كلینیكی) یان بە مانای دەروونیی وشەكە لێ بنێین، كە - بە گوتەی ئەوروپاییەكان - تورك بەوپەڕی شانازییەوە بەرگی (بەربەرییەكی هەرچیوپەرچی) ی تێدا دەپۆشێ. جا لەكاتێكدا تورك ئارەزووی دەكرد بچێتە نێو چوارچێوەی خۆراوای ئەوروپاو خۆی بە دامەزرێن و دەربڕی (شارستانەتی) و رۆشنبیریش دابنێت، هاوكات شانازیی بەخۆوە دەكرد كە تێكوپێك دەدات و دەسووتێنێ و دەكوژێ... هتد [17]. هێز، وەختێك مەسەلەكە پێوەندیی بە (پەیامی مێژوویی) ی سەرشانی (نەتەوەی تورك) ەوە هەبوو، دەبوە یەكەمین هۆكار. ئەم ئەدەبیاتەی سەردەمی ئیتیحادیەكان، هەمانكات دەزگایەكی (كەلەپوور) و ئەو (جۆر) ە نەتەوەیەیش بوو كە تا ئەمڕۆ لاپەڕەی بڵاوكراوە رەسمیەكانی وەزارەتی رۆشنبیریی توركیا پڕ دەكەنەوە [18].

دووەم لایەنی مەسەلەی شەرعیەتیش، پێوەندیی بە وەزعی دانیشتوانی موسڵمان و غەیرە تورك و بەتایبەت كوردەوە هەبوو. ئەنتلجنسیای نەتەوەیی كورد بە كاریگەریی ئایدیۆلۆژیای كەمالی، لەوە بێ داروبارتر بوو بتوانێ هەمان تێزی كەمالی وەربگرێ و لە مێژووی گەلی كورددا بەكاری بهێنێ [19]، چونكە ئەگەر ئەرمەن و یۆنانیەكان لە (دەرەوەی سنووری نەتەوەیی) دا بوبن، ئەوا كورد لە نێو، پانتایی ئەم سنوورەدا بوو.

سەرلەبەری سەردەمی كەمال ئەتاتورك بەخەگیری (هەڕەشە) ی ئەو (شۆڕشە كوردیانە) بوو كە (ئابووریی نیشتمان) یان تێكشكاند. (مەسەلەی كورد) لە روانگەی نەتەوایەتییەوە گەلێك كێشەی لە هیی مەسەلەی (كەمەنەتەوە) غەیرە موسڵمانەكان زۆرتری دەهێنایە مەیدان. باڵی كەمالی پێش ئەوەی پەنا بباتە بەر گوتەی (یەكێتیی نەتەوەیی)، بە ناچاری چەند بەهانەیەكی تەواو ئاینیی خستە كار. تەنانەت پاشتریش،وەك بێشكچی و لویس و ماردین گوتوویانە [20]، ئەو باڵە ناوبراوە ناچار بوو چەمكی (نەتەوە) بە مانا ئاینیە ئیسلامیەكەی بەكاربهێنێ، گوتارەكانی عیسمەت ئینەنۆ لە لۆزان و زۆر بەڵگەنامەی لەوە بەدوا پاساویان بۆ ئینتیمای كوردی دەهێنایەوە و وا لێكیان دەدایەوە كە كەمەنەتەوە لە چەمكە ئیسلامیەكاندا نییە [21]، ئەوانە جارێكی دیكە

گەڕانەوە بۆ سەرچاوەیەکی نانەتەوەیی، یا بابڵێین دژ بە نەتەوایەتی – ئیسلام –، بۆ پێکهێنانی نەتەوە بە مانا نەتەوەییە نائاینییەکەی. بەم پێیە شێوازی پەنابردنە بەر ئیسلام لە سەردەمی کەمالیدا بەردەوام بوو [22]، نە ئیسلام و نە نەتەوە بە چەمکە ئیسلامیەکەی نەیاندەتوانی پاساوی دامەزراندنی دەوڵەتی نەتەوەیی هاوچەرخی عەلمانیی دژ بە ئاین بدەنەوەو، کەمالیەکانیش باش ئەوەیان دەزانی، بۆیە پەنا برایە بەر چەمکی (میللەت) کە زاراوەیەکی عوسمانیی ئیسلامیە و، بۆ پیشاندانی کەمینە ئاینیەکان بەکاردەهێنرا، میللەت بەپێی بەکارهێنانە نوێیەکەی، وێڕای نەتەوەی تورک، بەشی ئەنادۆڵی نەتەوەی دەگەیاند، هەڵبژاردنی ئەم زاراوەیە کە هیی پێش سەردەمی کەمالیە، رەنگدانەوەیەکی باشی ئەو چەمکە تیرەگەریە بوو کە یەکەمین تیۆری داڕێژە نەتەوەییەکانی تورک بۆ نەتەوەیان بەکارهێنا. بەڵام بەکارهێنانی لەوەبەدوای لەلایەن کەمالیەکانەوە و گواستنەوەی مانایەکی بۆ گەلی (ULUS) [23] لە ساڵانی سیدا وەك پرۆسەیەکی تەواوی بەخۆگرتن وابوو و، باڵی کەمالی یا لانی کەم کۆماری تورکیای خستە سەر کەڵکەڵەی مانۆڕی نێوان تیرەیەکی نەتەوەیی و تیرەیەکی ئاینی. هەروەها وایشی لێکرد دڵی هەردوولا رابگرێ. زاراوەی میللەت دەیتوانی چەمکی نەتەوە بە نەمری بهێڵێتەوە، بەڵام هەمانکات سنووری بۆ دادەناو نەیدەهێشت پەل بهاوێژێ بۆ دەرەوەی سنووری دەوڵەت تا لە ئاستی سیاسەتی دەرەوەدا بە دووربێ لە هەموو زێدەڕەوییەك. هەروەها ئەم چەمکە هاوبەشیی لە (نەتەوەی تورك) خستنە جێی (نەتەوە) (بە چەمکە ئیسلامیەکەی) دا کرد، بە رادەیەك چەمکی تورك بۆ یەکسانیی نێوان (هەموو تاکەکەسەکان) (بە کوردیشەوە) بووە هاوتای: گوتەی (برایەتیی ئاینی) و، هەمانکات (مافی خاوەنایەتیی کۆیلە) کە وەزیری دادی کەمالی دایە کورد [24] و، هەروەها (فەلسەفەی کەمالیی مێژوو) کە مافی کەمە نەتەوەکانی دەکردە قوربانی تێرکردنی (مافی نەتەوەکان – دەوڵەتان) [25]. پێ بەپێ توانی ئاوا و یەکجار بە ئاسانی لەگەڵ هەڕەشە و گوڕەشەی پاکتاوکردنی بەکۆمەڵ و گەلەکۆمەی چڕوپڕ و عەسکەری و کردەوەی کۆچ پێکردنی دەستەجەمعی... دا بگونجێت [26].

لێرەدا تێزی (مۆرکی نەمری تورك) سەبارەت بە ناوچەی ئەنادۆڵ، زامنکردنێکی زیاد و فۆرموولەیەکی ستراتیژیی درێژمەودای دەنایە نێو چنگی دەسەڵاتدارانی دەوڵەت. ئەم زامنکردنە توخمێکی بنچینەیی دروستبوون و مشتومڵدانی عەقڵیەتی (کۆمارخوازی) بوو. ئینتیماکردن بۆ (تورکی) هەر دەبوو بکێشێتەوە بۆ ئینتیماکردن بۆ مێژوو و شارستانەتی و، مانای دەرخستنی (بەڵگە ئەتنۆگرافی و مێژوویی و ئەنترۆفیزیۆلۆژی و زمانەوانیەکان نەبوو بۆ پاڵپشت و دووپاتکردنەوەی ئینتیمای کورد بۆ مۆرکی تورکی). زانست تەنیا وەك ئامرازێك بۆ قەناعەت پێکردن (یا سەرکوتکردن) بەکاردەهات تا ئەو ئاسنامەیە جەخت بکاتەوە کە بڕیار درابوو بە زۆر بیسەپێنن.

ئەم دوو تیۆریە دەستکردی نە بیریارە کەمالیەکان و نە مستەفا کەمال خۆی بوون. ئەڵمانەکانیش پێشتر تێزی ئینتیمای (عیسا) یان بۆ رەگەزی ئاری خستە روو و لافیان لێدا کە ئادەم بە ئەسڵ ئەڵمانییە [27]، بەڵام (تێزی تورك لە مێژوودا) و (تیۆریی زمان – خۆر) بەوپەڕی بێشەرمییەوە سەرەتای ئەو زنجیرە کارەیان ئاشکرا کرد [28]. هەرچی پەنابردنە بەر زامنکردنی زانستیش بوو، بەش بەخۆی بوو بە

سەرەتای دارزان و تێکشکانی ژیانی فیکریی تورکیا.

دەبوو هەردوو تیۆری، لانی کەم لە ئاستیی تیۆریدا، نەهێڵن هیچ زێدەڕەوییەکی زانستی رووبدات، کەچی لەڕووی خولقاندنی نەتەوەی تورکەوە بوونە نیشانەیەکی جیاکەرەوە و توخمێکی تیۆری و، خەریکی ئەوە بوون (بەڵگە) بهێننەوە بۆئەوەی کە تورک ئەسڵی مرۆڤایەتییە، یا لانی کەم ئینتمای تورکی بکەنە پیاوەتی بەسەر خەڵکەوە. (ئەوی دیکە) هەر لە سەرەتاوە کرابووە ناحەزی ئەو نەتەوەیە کە بە جەستەیەکی یەکجۆری داخراو دانرابوو. بەڵام هێنانە ناوەوە و بەخۆگرتنی ئەوانی دیکە، دواجار بە میکانیزمێکی ئاڵۆز تەواو دەبوو کە لەسەر بنچینەی زەوتکردن و خاوەنایەتی دامەزرابوو. (دوژمن) هەمیشە ئامادە و بە ناچاری دەبوایە هەبێ، چونکە ئەگەر نەبوایە پەیامی مێژوویی بە زەحمەت دادەڕێژراو پاساو دەدرایەوە و، بە زەحمەتیش مانایەك بەکاری نەتەوەیی یا شارستانانە دەبەخشرا. بەڵام (دوژمن) هەمیشە لە دەرەوەی (نەتەوە) دا هەبوو. بۆ نموونە وادانرابوو لە نێو (نەتەوە) دان، چونکە دواجار پێوەندیی بەو (تورك) انەوە هەبوو کە لەلایەن (دەرەبەگە کوردەکان) ەوە کرابوونە کورد.

بەم پێیە ئینتیمای کوردی بە تەواوی دەبوە جەستەیەکی نەیاری خاوەن سروشتێکی ئایدیۆلۆیی کە هیی سێیەم ئینتەرناسیۆنالیزمی کۆمۆنیستییە [29]. دواتر (رزگارکردنی تورکە بە کوردبووەکان) لە باڵادەستیی (دەرەبەگە کوردەکان) و گێڕانەوەیان بۆ باوەشی یەکەم سروشت و ئەسڵی خۆیان، واتە (ئینتیمای تورکی)، دەبوە کارێکی ناچاری و هەمانکات شیاو.

لێرەدا ئەستەمە بڵێین نموونەی کەمالیانە نموونەیەکی رەسەن و دەگمەن بوو. باڵی نەتەوەییی بولگاریش هەر لەوەوبەرتر هەوڵی دا ئەو بولگاریانە رزگار بکات کە دەرەبەگەکانی تورك تووشی (تورکاندن) یان کردبوون. داهێنانی ئەم میکانیزمە دەبوە هۆی دەستەپاچەکردن و سزادانی (ئەوی دیکە)، واتە ئەوانەی کە تێهەڵکێشی نەتەوە کرابوون و کەمالیەکان دەیانویست ئازادیان بکەن، لەوانە بۆ نموونە کورد و عەرەب و ئیتاڵیایی و کریتش کە رژێمی کەمالی داماو و سەرکوتی کردن [30]. بەڵام ئەم سەرکوتکردنە بەپێی چەمکی کەمالیانە رووی لە دوژمن بوو، تەنانەت ئەگەر بۆ دەست پێڕاگەیشتن ناچاریش بوایە لەسەر حیسابی ئەو خەڵکە تورکانە بیکات کە ئینتیمای تورکیان بەهۆی خودی هەمان دوژمنەوە سڕدرابووەوە. دەتوانین بە ئاسانی ناکۆکیی نێو ئەم رێبازە پێشان بدەین: تیۆریی زمان _ خۆر بە خەڵکی رادەگەیاند زمانی کوردی تورکییە و، دواتر جەختی دەکرد کە مەحاڵە بەش بە خۆی وەك زمانێك هەبێ. بەڵام دەسەڵاتدارانی کەمالی هاوکات زمانی کوردی (واتە بەپێی مەنتیقی پێشوو تورکی) یان قەدەغەدەکرد، چونکە هەڕەشەی لە یەکێتیی نەتەوەیی دەکرد، لەکاتێکدا ئەم زمانە (واتە تورکیی "کوردی"!) دوژمن (دەرەبەگی کورد) بەسەر دانیشتوانی تورکیدا سەپاندبوو.

ئاشکرایە هەردوو تیۆری، وەك بێشکچی ئاماژەی بۆ کردووە، لەسەر بنیاتێکی فشەڵ هەڵچنرابوون و، بە سەرکوتکاری و قەدەغەکردنی هەموو هەوڵێکی رەخنەلێگرتن و بەدرۆخستنەوەیان نەبوایە، نەدەکرا بەسەر ناوەندە فیکرییەکانی تورکیادا بسەپێندرێن. جگە لەوە دەکرا هەردووکیان بەردەوام لە ئارادابن، بەمەرجێك دەوڵەتی بەهێز و حیز ب – دەوڵەت

هەبن و، تەنیا پێشەواو سەرکردەکانی ئەو دەوڵەتەیش بە رەسمی جڵەوی سەروەریی (نەتەوە) یان لەدەستدابێ. تەنیا ئەم مەرجە دەیتوانی چاوپۆشی لە ناکۆکیەکان بکات و (گریمانە) ی ئینتیمای تورکیی کورد بە (فەلسەفەی کەمالی لە مێژوودا) وە گرێ بدات و مافی گەلانی بێدەوڵەت بکاتە قوربانیی بەرژەوەندی گەلانی دەوڵەتدار.

بەم پێیە - وەك بێشکچی گوتوویەتی- هاوشانی (زانست) و ئایدیۆلۆژیای رەسمی، ئابڵۆقە خرایە سەر مەسەلەی گەلی کورد و قسەلێکردنی بوو بە یەکێك لە شتە قەدەغەکراوەکان، زانست ئەرکی سەلماندنی تورك بوونی کورد (لەبەرئەوەی بە ئەسڵ تورکن) ی خرایە سەر و، هەرچی دەوڵەتیشە راسپێردرا (ئەم مەسەلەیە) بەرێوە ببات.

بەلام ئەم مەسەلەیە - بەرێوەبردنی مەسەلەی کورد لەلایەن سوپا و دەوڵەتەوە- پاش دامەزراندنی فرەدەنگیی سیاسی شیاوی بەردەوامبوون نەبوو، لەبەرئەوە نا کە هێزە سیاسیەکانی تورکیا تێروانینی (دیموکراتیانە) یان هەبوو، بەڵکە لەبەر چەند هۆیەکی پێوەند بە هەڵبژاردنەوە و، چونکە ئەو هێزە سیاسیە ناوبراوانەیش پێویستییان بە دەنگی هەڵبژێرە کوردەکان هەبوو. سێ کودەتای عەسکەریش سەلماندیان: هەم گەرانەوە بۆ سیاسەتی کەمالی لە ئاستی سیاسیدا بووبێ یا عەسکەری مەحاڵە، هەم ئەم تیۆریە دارێژراوە سەری نەگرت، لەکاتێکدا سەرکردە مەدەنیەکانی دەوڵەتی تورکیا ژێر بەژێر و لە هەموو دەرفەتێکدا دەچنەوە سەری.

سیستمی ئەم چەند ساڵەی دواییی (گوند پارێزان) لە ناوچە کوردنشینەکاندا و بەکارهێنانی پاساودانەوەی ئاینی لەلایەن دەوڵەتەوە، بەڵگەیەکی زۆر ئاشکرای ئەم ناچارییەن. ئەوی راستی بێ تورکیا چیدی دەوڵەت - نەتەوە و، لە هەموو حاڵ و بارێکدا ئەو دەوڵەت - نەتەوەیە نییە کە دەست بژاردەی کەمالی دایرشتووە [31].

بەلام میراتی فیکری و سیاسیی کەمالی هێشتا کۆسپی بەردەم دارشتنی بۆچوون و داهێنانی فۆرموولەیەکی نموونەی دەوڵەتی نەتەوەیییە. ئەم مەسەلەیە جووڵانەوەی نەتەوەپەرستی کوردەکانیش دەگرێتەوە کە هۆیەکی پارچەپارچەبوونی ئەمرۆی کۆماری تورکیایە.

(نەتەوە) لە روانگەی کەمالیەوە - وەك رینان گوتوویەتی - بریتی نەبوە لە (جەختکردنەوەیەکی هەمیشەیی رۆژانە) یا (ئیرادەیەك)، بەڵکە قەدەر و ناچارییەك بووە چارەنووس سەپاندوویەتی. بۆیە کەمالیزم بەرهەڵستیی (نەتەوە) ی بە بەرهەڵستیی (سروشت) و (مێژوو) دادەنا. (ئەرك) خستنە جێی (ئیرادە)، هەر بووە مایەی زیاتر ئاڵۆزکردنی سەرلێشێوانە عەمەلی و تیۆریەکان. هەل و مەرجی ئەو نەهامەتیە کە ماوەی نێوان هەردوو جەنگی جیهانیی گرتەوە، (رەچەڵەك - عرق) ی تێدا خرایە شوێنی (نەتەوە). تا هیچ خراپ حاڵیبوونێکیش روونەدات، پسپۆران و لێکۆڵەرەوەکانی کاروباری تورکی پێوەی خەریك بوون. با سەرەتا بیری بهێنینەوە کە زاراوەی رەچەڵەك لە بەرایی ئەم سەدەیەوە ئەم مانایەی ئێستای وەرگرتبوو. (زیا گویك ئالپ) ی یەکێك لەتیۆری دارێژانی کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقیو باوکێکی گیانی کەمالیزم، زیاتر لە جارێك لێکدانەوەی ئەنتی (عرقی) ی نەتەوایەتیی تورکی ریسوا کردووە [32]. تیۆری دارێژانی کەمالی ئارەزوومەندانە و بە چڕوپڕی زاراوەی رەچەڵەکیان بەکارهێناوە.

لێرەدا دوو نموونە دەهێنینەوە: (مرۆڤ رەچەڵەکی خۆی کاری تێدەکات (.....) کۆمەڵگاکانی مرۆڤایەتی لەبەر رۆشنایی

تایبەتمەندیی ئەتنییاندا پەرەدەستێنن و گەشە دەکەن (...) پرنسیپێکی کۆڕی مێژووی تورک کە ساڵی 1931 دامەزراوە، ئەوەیە کە تێزەکەی خۆیی بە مۆرکی ئەتنییەوە بەستووەتەوە)[33].
(دەبێ شۆڕشی تورک لەدەستی تورکە رەسەنەکاندا بمێنێتەوە. ئەو شۆڕشانە کە بە یارمەتیی کەسانی دیکە کراون، قەرزە بەسەریانەوە)... (خراپترین تورک لە هەرە باشترین غەیرە تورک چاکترە)[34].

تێزی تورک لە مێژوودا کە لەچاو نەتەوایەتیی ئیتیحادیدا بە زێدەڕەوییەک دەژمێردرێت، کێشایەوە بۆ زێدەڕەوییەکی دیکە کە لێکدانەوەی ئەتنی بوو. ئەم ئاراستەیە سەروبەندی ساڵانی دووەم جەنگی جیهانی تورکیای تووشی نەهامەتی کرد و، گەلێک دەستەو تاقمی لەگەڵ یەکتردا ناکۆکی هێنایە مەیدان، پشتیان بەچەندین بنەچەی جیاجیاو لێکۆڵینەوەی فیزۆلۆژی دەبەست بۆ دووپاتکردنەوەی تورک یا ناتورک بوونی هێندێک نەژادی کۆمەڵگای تورکی[35].

ئارەزووی چوونە نێو کۆمەڵی نەتەوە یەکگرتووەکان و دانەپاڵ ئۆردووگای وڵاتانی سەرکەوتوو (لە دووەم جەنگی جیهانیدا)، رژێمی (پێشەوای نەتەوەیی) ئینەنۆی هان دا (دیکتاتۆریەتی ئێمە بکاتە دیموکراسی)[36] و دەستی پاک بکاتەوەو دادگاری - محاکمە - ی بەشێکی گرنگی دەستو تاقمە ئەتنییەکان بکات. بەڵام ئەو چەمکە ئەتنییە کە لە (تێزی تورک لە مێژوودا) وە پەیدا بوو، بوو بە هۆکارێکی سیاسی و فیکری: بۆ کاری حیزبی راستی پەرگر (M.H.P.M.C.P.) کە کۆلۆنێل تورک سەرکردەیەتی و، بۆ گەلێک نووسینی هێندێک مامۆستای زانکۆیش. بەم شێوەیە، پرۆفیسۆر حیکمەت تانیوی یەکێک لە بیریارە ناودارەکانی رژێم ساڵی 1981 بەوپەڕی شانازیەوە نووسیویە: رەگەزپەرستی گەوهەری کەمالیزم بوو و، هەموو لێکدانەوەیەکی پێچەوانەی ئەم بۆچوونەیش بە خیانەت لە کەلەپووری (پێشەوای نەمر) دانرابوو)[37].

دەکرێت بەشێوەیەکی گشتی بڵێین کەمالیزمی لەسەر بنچینەی دەوڵەتی بەهێز و نەتەوەی یەکجۆر و تێزی تورک لە مێژوودا دامەزرا و، رێگای بۆ دوو لێکدانەوەی شیاو خۆش کرد:

یەکەم: بە تورک بوونی هەمووان و سڕینەوەی هەموو ئینتیمایەکی دیکە و هەموو یادەوەرییەکی دیکە.

دووەم: بە تورک بوون مەرجێکی بنچینەیی بوونی تورکیایە و دەبەخشرێتە تورکە رەسەنە خوێن پاکاکەن. هەردوو لێکدانەوەکە لە مەودایەکی دووردا بە بن بەست دەگەیشتن. یەکەم لێکدانەوە پێویستیی بە قەناعەت پێکردنی کورد هەبوو تا ببنە تورک و دەست لە یادەوەری و زمانیان هەڵبگرن. ئەو پەتای بە کوردبوونە کە لەکاتی راگەیاندنی کۆمارەوە تاوی سەندووە، سنووری ئەم چارەسەرەی دەرخستووە. هەرچی دووەم لێکدانەوەیانە، دەسەڵاتێکی دیکتاتۆریی لە چەشنی ئەوەی نازیەکانی گەرەک بوو کە بە پاکتاوکردنی بەکۆمەڵی بەراوردا نەبێ نەتوانێ بمێنێتەوەو درێژە بکێشێ[38]. هەردوو لێکدانەوەکە، ئەگەرچی لە تێڕوانیندا یەک بوون، چەند ئەنجامێکی پێچەوانەی دژ بەیەکتریان لێدەکەوتەوە. نەدەکرا یەک لەدوای یەک و هەمانکات هەردووکیان بەکاربهێنرێن. بە گشتی نە نەتەوەو نە رەچەڵەک نەیاندەتوانی مەسەلەی کورد ببڕێننەوە یا چارەسەرێکی هەمیشەیی بۆ ئەم کێشەیە دابنێن.

جارێکی دیکە زاراوەی (میللەت) لەم تەنگژەیە دەریکردن. هەردوو مانای ئەم زاراوەیە دەیانتوانی تەمومژێکی تیۆری دروستبکەن. ئەمڕۆ بەکارهێنانەوەی ئەم زاراوەیە ئاماژە بۆ

مایە پووچیی ئەو جووتە لێکدانەوەیە دەکات کە تێزی تورکیان لە مێژوودا پێ دەناسرێتەوە. بەڵام دەبێ ئەوەیش بڵێین تەمومژ دروستکردن سنووری خۆیی هەیە، نابێ لەوە واوەتر بچی، چونکە ئەگەر زاراوەی ناوبراو بە مانای نەتەوە بەکاربێت، دەبێ ئاماژە بۆ کوردیش بکرێت وەك نەتەوە. ئەی لەم حاڵەتەدا چۆن پاساوی کۆماری تورکیا دەدرێتەوە؟ بەپێچەوانەیشەوە، ئەگەر زاراوەکە بە مانای نەتەوەی ئیسلام بەکارهات، چۆن دەبێ هەر تورکیا بە تەنیا بگرێتەوە بەبێ رەچاوکردنی پاشماوەی جیهانی ئیسلام لە ساڵانی نەوەددا؟ بۆیە پێویستە واز لە رێبازی کەمالی بهێنرێت و، پاشان رۆشنبیریی سیاسیی تورك درێژەی پێبدرێت تا رێگەچارەیەك بۆ ئەم لێکدابڕان و ناکۆکییە دەدۆزرێتەوە.

س. میریچ کاتێك کتێبەکەی -ئاغائۆغڵووی شی کردووەتەوە، کەوتووەتە باسی تراژیدیای وەچە فیکرییەکانی تورکیا لە دوو سەدەی دواییدا و بەتایبەت ئیتیحادیەکان و کەمالیەکان کە چەند سەرکردەیەکیان ساڵی 1920 لەلایەن ئینگلیزەکانەوە لە ماڵتا زیندانی کران و، گوتوویە: (ئەم کتێبە کە لەژێر رکێفی دوژمندا دانراوە، داستانێکی شارستانەتیی دوژمنە، کینەو رقێکە پێڵاوی سەرکەوتووان دەلێسێتەوە.

ئەحمەد بەگ دوژمنێکی خوێنە خۆی هەم مێژووی عوسمانی بوو کە شارەزای نەبوو و، هەم ئەدەبی تورکیش کە تا مردن لێی بێئاگابوو)[39].

زاراوەی (شارستانەتی) لە روانگەی باوی ئیسلامییەوە هیچ مانایەکی نییە، بەکارهێنانی لە چوارچێوەی ئیسلامی کلاسیکیدا ئاماژە بۆ حاڵەتێکی روودرا و یا تێشکان دەکات و دژی ئاینە[40]. باسی بنەڕەتی فیکریی ئەم زاراوەیە زۆر ئاو دەکێشێ و، بواری ئەوە نییە لەم لێکۆڵینەوەیەدا لای لێبکەینەوە. کەمالیەکان مانایەکیان دەبەخشیە ئەم وشەیە کەم و زۆر بیرۆکەی (بەربەریەتی خولقێنەرانە) بوو کە زەینی ئەورووپای لە (رینان) وە تا سبیتر کۆنتڕۆڵ کردبوو، نەك نموونە باڵاکان وەك سان سیمۆن یا کانت دیارییان کردبوو. چەمکی ساوا و مرۆڤانەی عوسمانیەکان بۆ (شارستانەتی) شوێنەواری رێبازی هیوومانیزمی سەدەی نۆزدەیەمی پێوە دیارە. گەلاڵەی چەمکی کەمالیەکانیش گیانی سەدەی بیستەمی دەردەبڕی.

بەڵام هەر ئەوەندەی زاراوەی (شارستانەتی) بوو بە کلیلی شەرعیەتی سیاسی و فیکری و مێژوویی[41]، دەرگاکانی بە هەشتی (هەمەلایەنەیی) لە خۆوە دەکرانەوە. ئەگەر یەکێك (شارستانی) بوایە، ئەوە مافی مێژووکردبوون و هەمەلایەنەیی دەدایێ کە خۆراوایی‌بوون یا خەو بە سەرکەوتنەوە بینین دژی خۆراوا دەگەیەنێ. ئەم خەونە زۆر بیریاری تورکی تێکشاند. ئەو نەتەوەی تورکەی کە ئێستا، وەك تێزی تورك لە مێژوودا و تیۆریی زمان - خۆر جەختیان کردووە، بەهۆی هاوبەشیی لە مێژوو و شارستانەتیدا رەگی داکوتاوە، ئیدی مافی ئەوەی هەیە نەك هەر لافی (هەمەلایەنەیی) لێبدات، بەڵکو و داوابکات (هەمەلایەنەیی) بکاتە موڵکی تەنیا خۆی[42].

بەڵام ئەم روانینە مێژووییەی تورك بۆ (ئەوی دیکە) کە دەیکردە هەڵگری پەیامێکی شارستانانە، کاتی دارشتن زۆر زێدەڕەویی دەخستە روو. دەبوو کەمالیزم ئەوکاتە باسی ئەو هۆیانە بکات کە نەتەوەی تورکیان بە درێژایی چەندین سەدە لە بەدیهێنانی ئەم پەیامە دوورخستبووەوە. بۆ وەڵامی ئەم پرسیارەیش، بە رەسمی کەوتنە بەکارهێنانی تیۆریی پیلانگێڕان کە کۆسپی ناوەتە بەر جێبەجێکردنی ئەرکی مێژوویی سەرشانی نەتەوەی تورك.

کەواتە شارستانەتی خرایە خانەی (پەیامی مێژوویی)، وەك چۆن نەتەوەیش بو بە ئەرکێکی

پیرۆز. بۆیە مستەفا کەمال بەرگی کەسایەتی‌یەکی ئەفسانەییی پۆشی، وەك بڵێی لە هەموو زەمانێکدا هەبوە و بۆئەوە هاتووە پەیامی شارستانی بیر نەتەوەی تورك بخاتەوە و وای لێبکات ببێتە خاوەنی ئەو سەرکردە بەهرەمەندە کە لەمێژە چاوەڕوانی دەکات و خوای مێژوو رایسپاردووە ئەم نەتەوە شارستانە بەرجەستە و سەرکردایەتی بکات.

دەرکەوتنی سەرکردە کۆتاییی پیلانگێڕانی نەدەگەیاند، بەڵکە بە پێچەوانەوە نیشانەی کامڵی و توندوتیژیی بوو. سەرکردە کاتێك پەیدابوو کە پیلانگێڕان زۆر تاوی سەندبوو و خەریك بوو ئامانجەکانی خۆی بەدی بهێنێ، واتە نەتەوەی تورکی لەنێو دەبرد. سەرجەم رابردووی عوسمانی لە روانگەی کەمالیزمەوە بریتی بوو لە پیلانگێڕان لە نەتەوەی تورك و بەرهەڵستیی مێژوو و، مەسەلەی کوردیش بەشە دیارەکەی ئەو پیلانگێڕییە بوو. هەرچی تێڕوانینی ئەوروپاییەکانیشە بۆ تورك، بەپێی بیروڕای کەمالیەکان لەسەر مۆرکی زانستیی پیلانەکە، تەواو وەکوو بۆچوونی مێژوویی عوسمانیەکان وابوو. (ئێستا هەموو جیهان دەزانێ تورك نەتەوەکانی دیکە فێری شارستانەتی و ئازادی دەکات، تەنانەت ئەگەر ناچاریش بوون تێلاو شمشێر بەکاربهێنن)[43].

ئەم (پەیامە شارستانی) یە کە لە رووی تیۆرییەوە لەبەر رۆشنایی تیۆریی تورك لە مێژوودا داڕێژرابوو، زۆر لەسەر ناوچەی کوردنشین کەوت؛ چونکە زەبرێکی گورچکبڕی نەك تەنیا لە رووی مرۆڤایەتی‌یەوە، بەڵکە لە رووی ئەخلاقی و بەشەریشەوە، پێگەیاند، بەڵام هەر کورد تاکە قوربانی نەبوو. رەجەب پەکەری وەزیرێکی تورك لە سەردەمی مستەفا کەمالدا گوتوویە: نابێ شۆڕشی جیهانیی تورك کۆ لە بەکارهێنانی زەبروزەنگ بکاتەوە[44]. کەچی واقیعبینیی چەند سەرکردەیەکی کەمالی نەیهێشت ئەم بەرنامەیە سەرلەبەر جێبەجێ‌بێ. ئەوەیش نەبوە رێگری بەردەم سەرپەڕاندنی ئەوانە کە رازی‌نەبوون شەپقەی خۆراوایی (شارستانی) لەسەر بنێن. شاری (مەنەمەن) یش کە سەلماندی ئۆپۆزسیۆنی تورکیی دژ بە کەمالی لەوانەیە ببێتە جووڵانەوەیەکی ئاگادارکردنەوە، وەخت بوو تووشی کوشتارێکی گەورە ببێ، چونکە مستەفا کەمال و ژەنەڕاڵەکان بڕیاریان دا وێرانی بکەن و خۆشبەختانە نەکرا[45].

پاشتر تێڕوانینی پیلانگێڕانە لە چەمکی شارستانانە جیابووەوە و بوو بە توخمێکی رۆشنبیریی سیاسی تورك. ئیسماعیل بێشکچی لە بڵاوکراوەیەکی ئەم دواییەیدا خشتەیەکی هێناوەتەوە، گەلێك بەیاننامەی رەسمیی لە بارەوە پێشانداوە[46]. بەڵام ئەم تێڕوانینە هەر بە تەنیا دەوڵەتی نەدەگرتەوە، بەڵکە دەهاتەسەر دیاریکردنی هەڵوێستی ئۆپۆزسیۆن و ئەو ئەڵقە ئیسلامیانە کە کەمالیزمیان بە جۆرە پیلانێکی خۆراواییەکان یا بێدینەکان دژی ئیسلام و پەیامی خواوەندانە لە قەڵەم دەدا. ئەو بیریارانەیش کە بیروڕای خۆراوایی کاری تێکردبوون، ئۆپۆزسیۆنی ئیسلامی‌یان بە پیلانێك دژی شارستانەتی یا دژی شۆڕشی تورکیا دادەنا. گەلێك نەتەوەپەرستی کوردیش پێوەندیی کورد - عوسمانی یا کورد - تورك بە چەشنە (پیلانێکی پەنامەکی) دادەنێن.

چەمکی (پەیامی شارستانانە) ی لای کەمالیەکان دۆخێکی شیزۆفرینیا و گرێیەکی بەرانبەر بە (ئەوروپای قێزەون) لە تورکیا دروست کردووە. نەتەوە و رەچەڵەکی تورك لە روانگەی (تێزی تورك لە مێژوودا) وە تاکە لایەنی ئەمینداری پەیامی مێژوویی بوون، لەکاتێکدا شارستانەتی لە (شێوە باڵاکەی) دا لە ئەوروپا بوو. لەبەرئەوەی کەمالیەکان کەلەپووری

عوسمانی‌یان بەلاوە پیلانگێڕان بوو لە نەتەوەی تورك، خێرا کەوتنە راگەیاندنی خۆدابڕین لەو کەلەپوورە. بۆیە چ (یاسا، یاسادانان، پەروەردەکردن، جلوبەرگ، ئەلفوبێ...هتد) یەك پێوەندیی پێوە هەبووبێ، قەدەغە کرا. هەروەها پیتی لاتینی بەکارهێنرا (ناوی پیتی تورکی‌یان لێنرا) و، مستەفاکەمال ئەوەی کردە (ئەرکێکی نیشتمانی) [47]. لەپاڵ ئەوەدا، مۆسیقای تورکی قەدەغەکرا، چونکە گوایە لەگەڵ (گیانی بەرز) ی (نەتەوەی تورك) دا تەبا نییەو، مۆسیقای خۆراوایی خرایە جێ. بەم پێیە گرێی (نەتەوەی بالا) لە چاو ئەوانی دیکە (واتە ئەورووپا) دا، سووکایەتی پێکردنی خود و هەموو شتێکی تورکیی لە دووتوێدا بوو. کەمالیەکان بەم مانایە قوتابیی وەفاداری ئەو ئیتیحادیانە بوون کە بێزیان لە هەموو شتێکی (تورکی) دەکردەوە. ئەم شیزۆفرینیایە تا ئەمڕۆیش هەر ماوە و مۆرکی خولیای تورکیایە بۆ خۆراوایی بوون.

چەمکی کەمالی لە سیاسەت و سەرداری (سیادة) دا زۆر لە چەمکەکانی رژێمە ئەورووپاییەکانی یەکەم نیوەی سەدەی بیستەم دەچن و، بە رێکەوت نەبوە کەمالیەکان هەوڵیان داوە کەمالیزم لەپاڵ فاشیزم و ستالینیزمدا بکەنە سێیەم رێبازی دامەزرێنی ئەو جیهانە تازەیە کە جێی لیبرالیزم و سیانەی ساڵی 1798 ی تێدا نابێتەوە [48].

ئەم (دامەزرێن) ە دەیتوانی یاریدەی کەمالیزم بدات خەونی هەمەلایەنەیی (جیهانگیری) بەدی بهێنێ. کەمالیەکان مێژوی نوێیان بە چەند ئەڵقەیەکی دیاریکراو (شۆڕشی ئینگلیزی و شۆڕشی فەرەنسی و شۆڕشی رووسی) دادەنا کە دواجار کەمالیزم بەزرترین لوتکە و تێپەڕاندنی ئەو ئەڵقانە بووە [49]. نکوڵی لەخۆکردن و خۆ شوبهاندن بەوی دیکە، چلەپۆپەی ئەم نموونەیە بوو. بەڵام ئەوی راستی بێ کەمالیەکان خۆیان دەبینیەوە لەبەردەم نەك هەر رابردووی عوسمانی، بەڵکە ئەو ئیسلامەیشدان کە پتر لە جارێك وەك سەرچاوەی شەرعیەت بەکاریانهێناوە، بەو کاتەیشەوە کە دەزگای خەلافەتیان تێدا هەڵوەشاندەوە. کەمالیزم جارێکی دیکە لێکدرابڕانێکی سەیری لە پێشدا قوت بووەوە، چونکە نەدەکرا لەم حاڵ و بارەدا زێدەڕەوی و موزایەدەکاری قەدەغەبکرێن. وازهێنان لە مەرجەعیەتی ئیسلامی (سیاسیو رۆشنبیریو ئایینی)، مانای ئەوەبوو پێڕەویی مەرجەعیەتی جوولەکە – مەسیحی بکرێت لە رێگای رۆشنبیری‌ییەکی سیاسیی ئیسلامی‌یەوە.

بەلام ئەو ستایشە رێکخراوانە بۆ بەشان و باڵ هەڵدانی مستەفا کەمال، گیانی ئینجیلی‌یان تێدا نەبوو و لە سروودی عەسکەری دەچوون. یەعقووب قەدری نە خاوەنی رۆشنبیرییەکی ئینجیلی و نە (سۆدۆمی**)ش بوو، داجار نەیدەتوانی لەچاو بنووسانی چاخی کۆن و بروووست دا لە(گۆمۆڕو سۆدۆم)*** ی رووزەرد زیاتر دابهێنێ [50].

ئەزموونی کەمالی بنچینەی لاهووتی و مەرجەعیەتی ئایینیی شك نەدەبرد. بۆیە تێزی تورك لە مێژوودا هەوڵی دا ئاینێکی تازەی لەسەر نەتەوایەتیی تورك و بەتورك کردنی ئیسلام بنیاتنراو بێنێتە ئاراوە تەنیا بۆئەوەی بیکاتە پاڵپشتی ئاینە تازەکە. لەم حاڵەتەدا خوا دەبوو بە تورك و، مستەفا کەمال جێی مەحەمەدی پێغەمبەر (د.خ) ی دەگرتەوە. هەمانکات تیۆری داڕێژان هەوڵیان دا مۆرکی تورکی بە (قەواڵە) کەوە بنێن: واتە محەمەدی پێغەمبەر (د.خ) و هەرچوار یارانی و قورئان و پێغەمبەرانی وەك –بۆ نموونە– ئیبراهیم ئەلخەلیل کە ئیسلام بە موسڵمانیان دادەنێت، سەرجەم تورکن [51]. بەم شێوەیە کاتێك مۆری ناسنامەی تورکی بە

ئیسلامەوە نرا، دەكرا بخرێتە لاوە و بگۆڕدرێت بە نەتەوایەتیی تورك. بۆیە ئیسلام بوو بە قۆناخێكی گرنگی بەدیهێنانی ئەو پەیامە كە خرابووە ئەستۆی ڕەچەڵەكی تورك.

كەمالیزم تاكە ڕێباز نییە هەوڵی دابێ ئاین بگۆڕێ بە نەتەوایەتی. بەڵام چەمكە بنچینەییەكانی ئیسلام كارێكیان كرد كۆششی كەمالیەكان زیاتر توندوتیژ و پەرگر بێ. بەڵگەیش بۆئەوە، ئەو پەتایەیە كە ئێستا جووڵانەوە ئیسلامیەكانی توركیای گرتووەتەوە.

هیگڵ تراژیدیا بە كارێكی دامەزراو دادەنێت. تراژیدیا، ڕاست بێ یا خەیاڵی، دەكێشێتەوە بۆ مێژووكردبوون و هەمەلایەنیی جیهانی (چوونە دەرێ لە میسر، ژان و ئازاری مەسیح، كوشتاری كەربەلا، شۆڕشی 14ی تەمووزی فەرەنسە، تیرۆر..) بۆیە كەمالیەكان بۆ شەرعیەت دان بە ڕژێمەكەیان پەنایان بردە بەر تراژیدیا، واتە چیرۆكی چوونە دەرێی (ئێركنكن) (بریتیە لە ئەفسانەیەك ئێتیحادیەكان هەڵیان بەستووە، ئەو چوونە دەرەوەیە كە توركەكانی وا لێكرد بەسەركردایەتیی گورك تەوقی گۆشەگیری بشكێنن و بەجیهاندا بڵاوببنەوە). هەروەها خوتبە درێژەكەی مستەفا كەمال كە ساڵی 1927 خوێندیەوە. سەرلەبەری چەندین نەوە لە سایەی كاریگەریی ئەو تێشكانەدا كە ئەم دوو تراژیدیایە بەرهەمیان هێنا، ژیانیان بەسەر برد. ئەم دوو تراژیدیایە و تێزی تورك لە بە تورك كردندا كە دەبوو نەتەوەی تورك لەكاتی بێهێزیدا گەردوون بە بیری خۆی هەڵبسووڕێنێ، لەو سەرچاوانەن كە ڕژێم شەرعیەتی خۆیی لێوەرگرتن. هێندێك بیریاری تورك (لە ڕاست و چەپ پێكەوە) هێشتا بەداخەوەن بۆ چارەنووسی كەمالیزم. ئەوانە پێیان وایە ئەگەر خیانەت (واتە پیلان گێڕان) نەبوایە كەئەمجارە توركەكان خۆیان كردیان: واتە ئەو سیاسەتمەدارانە كەپاش تێپەڕینی سەردەمی كەمالی هاتنە سەركار، جێی شارستانەتیی گریكی – ڕۆمانیی دەگرتەوە.

بەڵام نەدەكرا تراژیدیا وەك بنچینەیەك بۆ شەرعیەتی ڕژێم بەكاربهێنرێت، ئەگەر حاڵەتێكی تێشكان نەبوایە بە نەمری بیهێڵێتەوە. تراژیدیای كەمالی – لەڕاستیدا یەكجار بێهێز و پیز بوو، چونكە نەیتوانی بەتوندی كاربكاتە سەر هۆشیاری و یادەوەری، لەكاتێكدا توركیا پاش ڕەوینەوەی خەونی كەمالی بۆی دەركەوت هەر وڵاتێكی دواكەوتووی دنیای سێیەمە.

تراژیدیا، وێڕای ئەوە، تراژیدیایەكی فیكری و شێتانەی هێنایە گۆڕێ و، ڕۆژنامەكانیش جۆشیان پێدا، توركیای (كەمالی) ی هاوچەرخ كە وادانرابوو ببێتە ڕێبەری فیكریی سەرتاسەری گەردوون، هەر دنیای سێیەمی لەپێش خۆیدا دیتەوە.

ئەو فیلم و ڕۆمانە توركیانە كە لە دەرەوە ڕەواجیان پەیداكرد، سەركەوتنیان بە زۆری لەبەر بازرگانیكردن بوو بەو نائومێدیەوە كە زۆربەی وڵاتانی دنیای سێیەم بەخۆیانەوە دیوە و، پاڵەوانی تێدا لە هەموو شوێنێكیدا دیارە و نادیاریشە. ئەمە بەرهەمی بێگەردی كەمالیزمە كە جۆرێكی سەیرو سەمەرەیەو لە هیچ شوێنێكدا هەڵناكات و، سەرەنجام مەحكوومە بە ڕووخان.

پەراوێز:

*لە دیار بەكر – كوردستانی توركیا لەدایك بووە و، چەند لێكۆڵینەوەیەكی بڵاوكراوەی بە زمانانی فەرەنسی ئینگلیزی و كوردی و توركی هەن، گرنگترینیان ئەمەیە:

“Tribus, Confreries, et intellctuels; Convergence des reponses Kurdes au

regime Kemaliste", dans Modermisation authoritaire en Turqie et en Iran, Sous la direction de Semith Vaner, Paris, l'Harmattan, 1991.

** سۆدۆمی: اللواط نێرباز

***گۆمۆڕ و سۆدۆم: دوو کۆنە شای فەلەستینن، خەلکەکەیان بە خراپەکارو بەدڕەوشت ناوبانگیان دەرکردبوو.

1– کتێبەکە ئەمەیە:

Turk Tarih Tezi ve Kurt Sorunu, Ankara, 1977.

2– بۆ ئەو ڕووداوانە کە سەروبەندی سالی 1920 کۆماری تورکیایان هەژاند، بڕوانە:

- I.Tekeli –S.Ilkin, 1929 Iktisad Banalimi ve Turklerin Yolarayislari, Ankara, 2970

هەروەها بڕوانە ئەم گۆفارەی ئێمە:

- "Messanisme et Maurement Socil; evenement de Menemen en Turqie", in CEMOTI, No.11, Paris, 1990, pp. 73-88.

3– بڕوانە: Y. Akcura, Uc – Tazi Siyaset (1903), E.Z Karal, Ankara. 1973.

4– بەتایبەت زیا گویك ئالپ (Z. Gokalp) ی تیۆری دارێژ.

5– بەم شێوەیە شاری سالۆنیك بو بە (مەککەی ئازادی) و بەتەواوی شوێنی شاری مەککەی پیرۆزی گرتەوە. بڕوانە بیرەوەریەکانی:

I. Temo, Ittihad ve Terakki Anilari, Istanbul, 1988, p. 173.

6 – ئیتیحادیەکان لای بیریارانی خۆراوای وەك دۆرکهایم و غۆبینۆ و لۆبۆن و بیرگسۆن سۆراخی ئەو هۆیانەیان دەکرد کە دەبوونە مایەی بەردەوامیی هیواکانیان. بڕوانە ت. ئالبی ناویراو لە:

J. Landau, Tekin ALP, Turki Patriot, Istanbul, Nederlands 1984 Historische- Archeologish Instatuut.

7– لێرەدا جارێکی دیکە دەتوانین ئاماژە بۆ زیا گویك ئالپ و ئاکشورە تا ت ز ئالپ بکەین.

8– بڕوانە بیرەوەریەکانی جەمالەدین ئەفەندیی شێخوئیسلامی پێشوو

9– ئیرتوغرول دوزداغ لە کتێبەکەیدا سەبارەت بە ئیسلام و ڕەگەزپەرستی، گەلێك دەقی ئیسلامیی هێناوەتەوە کە هیی ئەو سەردەمەن و پێوەندیان بە ستایشکردنی جەنگیزخانەوە هەیە. بڕوانە:

- M. Erugrul Dusdag, Turkiye'de Islam ve Irkcilik Meselesi, Istanbul, 1978, p. 211.
- Zaps, Buyuk Islam Tarihi , Isatanbul, 1978.

10– "سنووری نەتەوەیی ئەو کۆمارە تازە کورەیە ئەو ناوچانەی بە دەرەوە دادەنا کە دانیشتوانیان مەسیحیی بوون، مادامێکی ئەنادۆڵ خەلکانێکی هاوڕەگەز لەسەر خاکەکەی دادەنیشتن کە بە هەمان زمان دەئاخاوتن و باوەڕیان بە هەمان بەهای ڕۆشنبیری و هەمان ئاین هەبوو" . بڕوانە کتێبەکەی تورگووت ئۆوزال سەرکۆماری ئێستای تورکیا:

- Turgut Ozal, La Trquie dans l'Europe, Paris, 1988, p. 207.

کتێبەکە پێی وایە مەسەلەی ئەرمەن پێچراوەتەوە و بیرچووەتەوە و بەجێ نییە سەرلەنوێ بخرێتەوە روو ( هەمان سەرچاوە ، ل 146).

11– کتێبی ناوبراوی تورگووت ئووزال دوا نموونەیە لەسەر تێڕوانینی مێژوویی، بڕوانە رەخنەگرتن لەم تێڕوانینانە لە:

- T. Artunkal, "La Figure du Grec dans les manuels scolaires turcs ", in vaner (ed) , Le differnd Greco – turc, Paris, 1988, pp. 217-226.

12– بڕوانە ئەو بنوسانە کە ئیسماعیل بێشکچی ئاماژەی بۆ کردوون.

13– بڕوانە ئیسماعیل بێشکچی، سەرچاوەی پێشوو، ل 221.

14– بڕوانە ئەو "لەدایکبوون" ە کە ب ك. کاغلەر نوسیویە و لەدایکبوونی مستەفا کەمال ئەتاتورك بە رووداوێکی مێژوویی مەزن پەسن دەدات. بڕوانە:

A.Dilipak, Birbaska acidan Kemalizm , Istanbul, 1988, pp. 391-402.

15–بڕوانە: ئیسماعیل بێشکچی، سەرچاوەی پێشوو ، ل 176 – 179، ل 217.

16– ئەحمەد رەفیق ئالتەنای باوکێکی مێژووی تورکە. ناچارکرا بەدیار منداڵێکی بچووکەوە عوزر خوایی بۆ مستەفا کەمال ئەتاتورك بهێنێتەوە و، دانی پێدانا کە لە مەیدانی مێژوودا تەواو (نەزان) ە. بڕوانە:

M. Gokman , Tarihi serdiren Adam; Ahmet Refik Altinay Istanbul, 1973.

17– بۆ نموونە بڕوانە ب. ك کاغلەر کە ئیسماعیل بێشکچی لە سەرچاوەی پێشوو، ل 108–1–9 دا ناوی بردووە.

18–(زمانی یۆنانیی دڕندە ببڕە/ کێشەکەی بە تێلا یەکلایی بکەرەوە ئەگەر سەرۆکی خۆیی لەبیرکردبوو/ با بە باوەڕیی سەربازانی تورك سەرلەنوێ بیناسنەوە، قوبرسی محەمەدی بەسەر سەریاندا بڕوخێنن/ تەخت و بەخت و کەللە سەرو بەربەستەکانیان پان بکەرەوە. ئەو دوورگە سەوزەیی نیشتمانەکەمانە/ ئاشتیی جیهان داوامانە، خەممان مهمتەجەکی پاوانە، سوپای مەزنمانە/ بۆ پێشەوە بەرەو سەرکەوتن".

19– ئەمە نموونەیەکە: "ئایا کەس هەیە سەردەمی گەشاوەو پڕ سەروەریەکانی ژیانی ئەو نەتەوەیە لەبیر دۆستان و دوژمنان بباتەوە کە هێمای جەنگاوەرانی پاڵەوانە بەهۆی بریسکەی شمشێرەوە چووە نێو لاپەڕەکانی مێژوو و چەند سەدەیەك بە پاڵەوانی و دلێریی خۆی خاکی لەژێر پێی دوژمناندا لەرزاند". بڕوانە:

- N.Dersimi, Kurdistan Tarihinde Dersim , Aleppo, 1952, p. 336.

20– بۆ زانیاری سەبارەت بە تێکەڵ و پێکەڵ کردنی هەردوو چەمکی (میللەت) و (نەتەوە) (بە مانا ئیسلامیەکەی) لەنێو زاراوە سیاسیە تورکیەکاندا، بڕوانە:

S. Mardin, "Laiklik Ideal ve gercekler" in Ataturk Donemeinin Ekonomik ve Toplumal Sorunlari; 1923-1938, Istanbul, 1990, pp. 73-83.

21– ت. روستو، وەزیری دەرەوەی سەردەمی کەمال ئەتاتورك، بە باڵوێزی بەریتانیای گوتووە: "کورد موسڵمانە، بۆیە کەمەنەتەوەیەك پێکناهێنن، چونکە ئیسلام کەمەنەتەوەیی تێدا نیە".

بڕوانە:

- Hoshmand Othman, Culturet Polilique; Les publications Kurdes en Irak, 1918-1949, memorie de DEA, E.H.S.S, 1988, p. 82.

22– هەروەها بڕوانە:

- F. Blici, "L'Etat Turc a la recherche de la cohesion nationale par L'enseignement religieux" , in CEMOTI, No. 6, Paris, 1988, pp. 129-160.

23- ئیسماعیل بێشکچی، سەرچاوەی پێشوو، سەرچاوەی ناوبراوی پەراوێزی ژمارە 20.

24- رۆژنامەی میللییەت (بە تورکی)، 1930/9/19.

25- گەلێك گوتار لەسەر مافی چارەی خۆنووسین و مافی کەمەنەتەوەکان هەن، بەڵام ئەم مافانە دەکەونە پاش مافی نەتەوە دامەزراوەکان" مستەفا کەمال . بڕوانە:

- Dobbs, 22-11-1926, F.O E6677\6677\ 44.

26- مستەفا کەمال شەڕی دژی کوردی وەها پاساو داوەتەوە: "ئامانجی ئەم شەڕە بەدیهێنانی نموونەی باڵا - ئایدیا - یە. سەربازانمان بۆ یەکەمین جار لە مێژوودا شەڕ بۆ بەدیهێنانی ئامانجە باڵاکانیان و بۆ ئامانجێکی بەرز و بەجێ دەکەن". بڕوانە:

- T. Z Tunaya, Turkiye de siyasi partiler, Istanbul, 1952, p. 169.

27- بڕوانە:

- Hans kohn The Idea of nationalism; A stady in its origins and background, New York, 1946.

28- زیاگویك ئالپ کە خەریکی لە قاڵبدانی ئاین بوو بۆ چەند ئامانجێکی سیاسی، پێی وابوو (نەتەوە) ناتوانێ باز بەسەر (سرووش) -ئاین -دا بدات. بەم پێیە لای وابوو بیرێکی سۆزەلگر هەر بە شیعر دەردەبڕدرێت. ئیسماعیل بێشکچی راستی گووتوە کە بنەرەتی (تێزی تورك لە مێژوودا) داوەتە پاڵ ئەم کابرایە.

29- بنیاتی تیۆریی کەمالیزم تا رادەیەکی زۆر گوتاری سادەکەرەوەی ئینتەرناسیۆنالیزمی سێیەم کاریان تێکردبوو. هێندێك رۆشنبیری کەمالی (لە تاقمی گۆڤاری کاردۆ 1931 - 1934) باوەڕیان بە کەمالیزم هێنا، بۆیە زیاتر بوونە هۆی لێکچوونی هەردوو گوتارەکە.

30- "مستەفا کەمال دەیگوت زمان خاسیەتێکی گەوهەریی نەتەوە پێکدەهێنێ. ئەوی دەڵێت سەر بە نەتەوەی تورکم، پێویستە بەر لە هەموو شتێك زمانی تورکی بەرەوانی بزانێ و قسەی پێ بکات" . بڕوانە رۆژنامەی جمهورییەت (بە تورکی 1931/2/14).

مستەفا کەمال لە گوتارێکی دیکەدا گوتوویە:

(ئەگەر نەوەی ئێمە توانی بەرێبەری زانست ژیانی خۆی بۆ کاری شێلگێرانە تەرخان بکات، نەتەوەی تورك لە رووی رۆشنبیری و فیکری و کۆمەڵایەتیەوە بە تەواوی دەبێتە تورك. جەبێ رۆشنبیریەکانی دیکەی نێو ئەم نەتەوە هاورەگەزە بسڕدرێنەوە، چونکە نابێ چەند شارستانەتیەکی جیا جیا لە نێو یەك نەتەوەدا هەبن) بڕوانە:

- Cumhurbaskanleri, Basbakanlar ve Milli Egitim Bakanlarinin Milli Egitim Ue Ilgli soylev ve Demecleri, Istanbul, 1946, P. 92.

31- بڕوانە ئەم توێژینەوەیەمان:

- Regionalis ion des acteurs minoritaires au Moyen- Orient' , journ'ees
- detudes “Relation entre les pays arabes et la Turquie a laube
- des annees 1970” , F.N.S.P. , Paris, 15-16 mars 1990.

32- بەتایبەت Turkcugun Esaslari کە لە ئەنقەرە دیسان بڵاوکرایەوە.

33- بڕوانە

A. Inan in Belleten, No. B. PP. 39-40

34: بڕوانە:

- M. E. Bozkurt , Ataturk Ihtiali (1940) , Istanbul, 1967, pp. 353-3454.

35- سەبارەت بە تۆرانچێتی لە سەردەمی مستەفا کەمالدا، بڕوانە:

- J. Landeau, Pan – Turkism in Turkey; A stady in irredentism, London, 1981.

36- ئەمە دەربڕینی ت. ئووزالە. بڕوانە:

- I . Ozal, Waldoo, sen neden burada degilsin, Istanbul, 1989, p . 30.

37- بڕوانە:

- H. Tanyu Ataturk ve Turk millytciligi, Ankara, 1981.

بنووس دەقە رەسمیە کەمالیەکان بە چڕو پڕی بۆ پاڵپشتی تێزەکەی بەکاردەهێنێ.

38- بۆ نموونە ئاماژە بۆ دەقی ن. ئاکتسز دەکەین کە تیۆری داڕێژێکی سەرەکیی باڵی راستی پەرگرە لە تورکیا: (ئەگەر کورد راکەراکەی دوای وەهمی دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردییان بێ، قەدەر کوێریان دەکاتەوە. رەچەڵەکی تورک رێگای تایبەتی خۆیی هەیە بۆ مامەڵەکردن لەکەڵ کەسانێکدا بە تەمان زەفەر بەو نیشتمانە ببەن کە بە ئارەقی نێوچاوان دایمەزراندووە و خوێنی پاکی خۆیی لەپێناودا بەخشیوە. ئەرمەن ساڵی 1915 و یۆنانیەکانیش ساڵی 1922 لەنێو بران). بڕوانە: گۆڤاری یەنی ئاکیس (بە تورکی)، ژمارە 1، ئابی 1966.

39-بڕوانە:

C.Meric, Bu Ulke. Istanbul, 1989, p. 12.

40- سەبارەت بە چەمکی (شارستانەتی) لە روانگەی ئیسلامییەوە، بڕوانە:

Cerdet Pasa, Cerdet pasa Terihi, Istanbul, vol. 12, 1983.

41- "شارستانەتی (لە شارە کورد نشینەکاندا) وشەیەکی وەك مەشرووتیەت (دەستوور خوازی) ی سەروبەرندی ساڵانی 1908و 1909 پیرۆزە. ئەم وشەیە واتە تەرپووش لەسەرنان، مەی، سەما، خشڵ و بۆینباخ... بە دەگمەن چوونە مزگەوت یا رۆژووگرتن لەرەمەزاندا و چوونە نێو کۆمەڵەی فرۆکەوانی لەبریی خێرکردن بەهەژاران و یاری تۆپی پێ کردن و بەکارهێنانی پیتی تازەی لاتینی و هەموو کرەدەوەیەکی دیکەی پێوەند بەو کافرە کە سەرەنجام شکاو بەزی". بڕوانە:

- W. S. Edmonds, "Notes on atour to Diyrbakir Bitlis and Mush" , constantinople, 21. 03. 1930, FOE 2678\1279\44.

42-تورگووت ئووزال سەبارەت بە نەخشی (شارستانی) ی (رەچەڵەی تورك)لە جیهانی هاوچەرخدا لە سەرچاوەکەی پێشوو، ل 166 دا گوتوویە: "پێویستە لەسەر هێندێك ئەندامی پەرلەمانی ئەورووپا لە روانگەیەکی عەلمانییەوە فێری خوێندنەوە و لێکدانەوەی مێژوو بن، وەك چۆن ئێمە دەیکەین، ئەگەر بیانەوێ بە رێگای شارستانەتیدا مل بنێن".

43- بڕوانە:

- K. Naci , "Turk Devletide Halkcilik, in Ulku, 3.04. 1933.

44- بڕوانە:

- R. Peker, Inkilap Dersleri (1931) , Istanbul, 1982, p. 11.

45- بڕوانە: گوتارەکەمان، سەرچاوەی پێشوو ، پەراوێزی ژمارە 2.

46- ئیسماعیل بێشکچی ، سەرچاوەی پێشوو ، ل 120- 123.

47- بروانە:

O. Ergin , Turk maarif Tarihi *1954), Istanbul, vol. 5 , 1978, P. 176.;

"ئەگەر بتوانی چ کتێبێك دەسووتێنی؟" وەلامی هێندێك بیریاری تورك بۆ ئەم پرسیارەی گۆڤارێکی تورکیی مانگانە ئەمە بوو ( هەموو کتێبێك پێوەندیی بە مێژوو و رابردووە وە هەبێ" ، " هەموو ئەو کتێبانە کە پێوەندیان بە رەوشتەوە هەیە" ، "هەموو کتێبێکی پێوەندیدار بە زمانی ئەو بەرەبابە حوکم بەدەستەوە کە رووخا" ، "هەموو ئەو کتێبانە کە رێگا لە پەرەسەندنی زمانی تورکیی پەتی دەگرن" ، "هەموو کتێبێکی ئیسلامی کە بیری سەربەخۆیی قەدەغە دەکەن ".

بروانە:

- S. Albyrak, Tek Perti Donemi de Baticilik, 1989, pp. 78-79.

دەکرێت ئەم وەلامانە لەگەڵ خوتبەی هێندێك پێشەوای شۆرشی فەرەنسەدا بەراورد بکەین. بروانە:

- M. de Certeau, D. Julia, J . Ravel, in polilique de la Langue . La Revolution francaise et les patois, Paris, 1980.

48- بروانە گوتارە زۆر و بلاوکراوەکانی نێو گۆڤاری کاردۆ و هەروەها:

- P. Safa, Turk Inkilabina Bakislar, latanbul, 1938.
- S. Ay demir, Inkilap ve kadro, Istanbul, 1932.
- F. Rifki Atay, Moskova- Roma, Istanbul, 1936.
- R. Peker, O.P. cit.

49- بروانە

50- گەلێك خانەی بلاوکردنەوە و بەتایبەت "بەلگی یانیلاری) و (ئیلیتسیم یانیلاری).

51- بەلام ئەمە رێی لە رۆژنامەی وەقت نەگرت لەسەر لاپەرەکانی بنووسێ:

"جیهان سەرتاسەر ئەوە دەزانێ، ئێمە لە دوژمنایەتی رەگەزپەرستانەوە دوورین خۆمان بە ناچار دەزانین بەرگری لە خۆ بکەین دژی ئەوانە کە خیانەتمان لێدەکەن. ئەگەر دژایەتیی خەڵکانی سامی نەژاد لە ئەلمانیا بەراستیی جۆرە ناچارییەکی داکۆکی لەخۆکردن بوو بێ، ئەوانەی کە چارەنووسی یەکێك لە گەورەترین گەلان و دەوڵەتانی جیهانیان بەدەستەوەیە، دەبێ هەڵوێستیان بەرانبەر بەم مەسەلەیە پێشان بدەن".

بروانە:

- Vakit, 25. 06. 1931 in Bulletin Periodique la presse Turque, Paris, No. 85, 21. 06- 1. 08. 1931.

52- بۆ چاپی فەرەنسیی خوتبەکانی مستەفا کەمال، بروانە:

- Discours du Ghazi Mustafa Kamal, Leipzig, 1929.

53- بروانە:

- V.N. Tor, Kemalizmin Drami, Istanbul, 1977.
- S. Sinanoglu, Turk Humanizimi, Ankara, 1982.
- Ergin, Sosyalist Goginenlere karsi Ataturkculuk savasi, Istanbul, S. D.
- M. And N. Ipsiroglu, kok – Ataturkculuk, Istanbul, 1982.

سەرچاوە: مجلە (دراسات کردیة)، العدد 3-7، السنة الثامنة، باریس، 1992.

# ریشەی دیموکراسی لە کوردستاندا

■ د. ستیفن مانسفیڵد

• و: ڕەئوف کەریم پێنجوێنی

پێنج هەزار ساڵ بەرلە ئێستا ئەو خەڵکەی لەو زەوییەدا دەژیان کە ئێستا بە (کوردستان) ناوی دەرکردووە، چەند گروپێکی خێڵەکی بوون، کە بەهۆی جوگرافیاو زمان و جەنگەوە بەش بەش بوو بوون. خێڵەکانی چیاکانی زاگرۆس و دەوروبەری چەندین ناویان هەبووە، بۆ نمونە (لولوبی و کاسیتی و هوریانی).

مێژوونووسی گریکی پێشین (هیرۆدۆتس) باسی (بوسی، پاریتاسینی، ستراوچاتا، ئاریزانتێ، بوودی، ماگی) دەکا وەك بەشەکانی گروپێك خێڵ کە بە (میدەکان) ناسرابوون. دواتر میدەکان توانیان دەست بەسەر سەرتاپای ناوچەکەدا بگرن. پێشتر خێڵێکی تر هەبوون پێیان دەوترا (گوتی) یان (گوتی). ئەمانە زۆر بەهێز بوون و وەك شێوە دەوڵەتێکی سەرکەوتوو مانەوە بۆماوەی سەدساڵێك. ئەمانە زۆر پێدەچێت لە (زەوی کاردا) دا ژیابن، وەك لەسەر لەوحەیەکی گڵینی سۆمەریەکاندا هاتووە لە هەزارەی سێیەمی پێش زایین. (ئەلێگزەندەری گەورە) ئەم خەڵکەی بە (کاردوك) ناودەبرد. (پلینی) نووسیویەتی، "ئەو خەڵکە بەشێوەیەکی ڕەسمی بە (کاردۆخی) ناو دەبران، بەڵام ئێستا بە (کوردوێنی).

هەندێك لە مێژوونووسان سوورن لەسەرئەوەی کە دەڵێن: (گوتی) یەکان لەلایەن چەند دیکتاتۆرێکی بێ بەزەییەوە ڕابەرایەتی دەکران.. بەڵام بەڵگەی بەهێز هەیە بۆ سەلماندنی پێچەوانەی ئەم قسەیە. (ئای. ئێم. دایاکۆنۆف) لە (مێژووی کەمبرێج بۆ ئێران)دا The Cambridge History of Iran دەڵێ کە (گوتی) زۆرپێدەچێ لەلایەن چەند سەرۆك خێڵێکەوە ڕابەرایەتی کرابێ بۆماوەیەکی دیاریکراو هەڵدەبژێردران. گەر وابێ، کەواتە ئەم خێڵە چیانیشنە لەسەرمەشقی خەڵکانی جیهان بوون لە چەشتنی دیموکراسییەت وەك شێوازێکی حوکمڕانی.

گومان لەوەدانییە کە (میدەکان) دواتر کۆچیان کردووە بەرەو ڕۆژهەڵات بۆ (زاگرۆس) و توانیویانە خێڵەکانی ئەو هەرێمەش کۆبکەنەوەو پرنسیپە دیموکراسیەکان لەگەڵ لێهاتوویی سەربازیی بکەنە وەسیلەی دەستیان. هەر ئەوان بوون کە توانیان گەلێکی پێگەیشتوو لەو خەڵکە دروست بکەن لە

دەورووبەری (727 پ.ن) کە لە لووتکەی دەسەڵاتی دا هەر لە یۆنانەوە تا تاران حوکمڕانی دەکرد.

لەگەڵ ئەمەشدا، چەند مەملەکەتێکیان لەناو خۆیاندا دەتواندەوە وەك (ئورارتییەکان) و (مانەیەکان) بە لەبەرچاوگرتنی چەند جیاوازییەك دەتوانرێت بووترێت کە ئەو گەلەی ئێستا بە (کورد) ناودەبرێت رەهەنی* خۆی لە گەلی میدەکان دا دەبینێتەوە.

دەمەقاڵێیەکی زۆر لەمەڕ ئەم مەسەلەیە لە ئارادایە. هەرچەندە هەندێك گەشتوونەتە ئەنجامی تر، بەڵام هیچ بەڵگەیەك لە ئارادا نییە کە بیسەلمێنێ کوردەکان نەوەی میدەکان نین و لە هەمان کاتدا بەڵگە بۆ سەلماندنی پێچەوانەکەی زۆرن.

(دار ماتێستا) ی مێژوونووس لە (لێکۆڵینەوە ئێرانییەکان – Iranian Studies) پشتگیری لەم بۆچوونە دەکا. (ئارنۆڵد ویڵسن) یش لە (میزۆپۆتامیا: پێکدادانی وەلائەکان Mesopotamia: Clashes of Loyolty 1918-1920) دا دەڵێ:

(گەلی کورد نەوەیەکی راستەوخۆی میدەکانە و زمانەکەشیان یەکێکە لە زمانەکانی رۆژئاوای ئێران ).

لە (مێژووی جیهانیی مێژوونووس – The Historian's History of the World) دا پرۆفیسۆر _سایس) گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە "میدەکان جگە لە خێڵە کوردییەکان هیچی تر نەبوون و لایەنگیری زمانەوانیشیان دەگەڕێتەوە بۆ (ئاری) سەربە هیندۆئەورووپی".

(ڤلادمیر ماینۆریسکی) لە (کوردەکان و ئینسایکلۆپیدیای ئیسلام – The Kurdis Encyclopedia of Islam) دا ئەم رایەی پەسەند کردووە و (ئی . سلۆون) یش دەڵێ کوردەکان "رۆڵەی میدەکانن". بەڵگەی سەلماندنی گێڕانەوەی رەهەنی کوردەکان بۆ میدەکان ئەوەندە زۆرە کە لای ئەم نووسەرانە ئەم راستییە زۆر باش گۆش دەکرێت و دەتوانین ئازادانە ئالوگۆڕ بە وشەی (کورد) و (مید) بکەین بێ هیچ دوودڵییەك.

شایەنی باسە کوردەکانیش باوەڕیان وایە کە (میدەکان) باو و باپیرانیان بوون. کاتێك کوردەکان کەناڵێکی تەلەفزیۆنیان دامەزراند لە ئەورووپا ناویان نا(مێد یان مید تی. ڤی – Med (Mede) TV).

"دلدار"ی شاعیریش دەڵێ (ئێمە رۆڵەی میدین) و ئەمەش بووەتە سروودێکی نیشتمانیی نارەسمی گەلی کورد. کەواتە کوردەکان لەسەر تاپای جیهاندا لەسەر ئەم خاڵە کۆکن.

ئەو دەوڵەتانەی ئەمڕۆ کوردەکانیان لەگەڵ دا دەژی بە تەواوەتی دژی گێڕانەوەی ئەم (رەسەنایەتی‌یەن بۆ کوردەکان و وا مامەڵە لەگەڵ کوردەکان دەکەن نەك تەنها وەك خەڵکێکن بەبێ گەل بەڵکو وەك خەڵکێکن بەبێ مێژوو ).

کوردەکان رابردوویەکی پڕ بزاڤیان هەیە و چەندین دەستکەوتی کەلتورییان هەبوە کە خەڵکانی تری ئەو سەردەمە بێئاگابوون لێی. کەچی ئێمە زۆرجار وەك چەند تیرەیەکی شەڕفرۆش تەماشای کوردەکان دەکەین. سۆمەرییەکان وا ئامارە بە کوردەکان دەکەن کە پیشەیان نەخشەکێشان بووە لەسەر کوپەڵە لە قوڕ دروستکراوەکان. هەروەها (مێرهداد ئیزادی) ی پرۆفیسۆری پێشوولە زانکۆی (هارڤارد) و تایبەتمەند لە مێژووی رۆژهەڵاتی نزیك لە (کوردەکان: کورتە رێبەرێك – The Kurds: Aconcise Hand book) دا دەڵێ کە کوردەکان سەرەتا سەرگەرمی بەخێوکردنی ئاژەڵ و کشتوکاڵ و دەرهێنانی کانزاو چنینی سادەو ئیشی قووڕ بوون.

ئاشکراشە کە میدەکان شەش خێڵ بوون و بۆیەك مەبەستی هاویەش یەکیان گرتبوو و لە دێرینترین ئەو گەلانە بوون کە دیموکراسییەتیان وەك شێوازێکی حوکمڕانی بەکارهێنا.

(دایاکۆنۆف) دەڵێ: "ئێمە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە لەوکاتەدا ناکۆکیو کورتبینیی و سیاسەتی چاوچنۆکانەی هەڵقولاو لە بەرژەوەندی تاکەکەسی باڵی بەسەر ژیانی دراوسێ رۆژاواییەکانیدا کێشابوو. بەڵام میدەکان لە شێوەی تاکە خێڵێکی یەکگرتوودا یەکیان گرتبوو و سەرۆکێکی سەربازی هاوبەش رابەرایەتی دەکردن".

هەروەها (دایاکۆنۆف) دەڵێ: "وا دیارە لای میدەکان بەش بەش بوون بۆ چەند خێڵێك قۆناغ بە

قۆناغ رۆڵ و گرنگــی کۆمەڵایـەتی خـۆی لەدەسـت دابێت". خـۆ ئەگـەر وا نەبووایـە ئـەوا سـەرچاوە ئاشووریەکان گرنگی زیاتریان پێ دەدا. بەڵام زۆر پێ دەچێ کـە یـەکێتی خێڵــەکی میدەکــان تەنــها نــاو نـەبووبێت، بـەڵکو بۆ هــەموو کــارێکی بــە کۆمــەڵ میدەکان بە پرسی یەکێتی‌یەکەیان ئەنجامیان داوە".

لـە کـاتێکدا کـە (مانەیـەکان) و (سـۆمەریەکان) و تەنانـەت پـیرە مەملەکــەتی (هیتیــت) پرنســیپە دیموکراســـی‌یەکانیان تــاقی دەکــردەوە و لــە حوکمڕانی‌دا راوێژکـار و ئەنجوومـەنی سـەرەتایی یـان بـەکار دەهێنـا، میدەکـان سـەرکەوتووانە یەکـەم ئیمپراتۆریەتی فراوانی‌یان لەناوچەکـەدا دروست کرد کـە لای کـەم بۆماوەیـەك شـوێنکەوتووی پرنسـیپە دیموکراسی‌یەکان بوون.

پێ‌دەچێ میدەکـان لەخـەڵکانی تـری ئـەو دیـو (زاگرۆس) ەوە یان لە پێشینەکانیانەوە کـە (کوتـی) یەکان بـوون فـێری دیموکراسـی‌یەت بووبـن. رێـڕەوی رووداوەکان هەرچۆنێك بووبێت، میدەکـان هەسـتیان دەکـرد کـە زۆر پێویسـتە یـەکبگرن و نـەیاندەتوانی یـاخود نەیاندەویست لـە رێگەیـەکی سـەربازی‌یەوە بگەنە ئەو ئاکامە. هەلیان بۆ خێڵەکانی دەوروبـەریان دەڕەخساند تـا بەشداری بکـەن لـە حوکمڕانی‌کردنی ئـەو ناوچەیـەی کـە لـێ‌ی دەژیـان. ئـەم خێڵانـەش حەزیان دەکرد بەم پێشنیارە رازی ببن تـا رزگاریـان بێت لـە دەست ئـەو هێرشـەی کـە ئاشـووریەکان و ئورارتیـەکان و مانەیـەکان دەیـانکردە سـەریان و بـێ بەزەیی‌یانە لادێکانیان دەڕوخاند و لاوانیـان دەکردنـە کۆیلـە و تـەواو دەیـان چەوساندنەوەو منداڵانیـان بـە زیندوویـی دەسـووتاندو سـەرکردە دەستگیرکراوەکانیان پارچە پارچە دەکرد.

هەرچەندە جیاوازی زۆر هەیە لـەنێوان حکومـەتی ئەوسـاو دیموکراسـی‌یەتی ئـەمڕۆ.. لـە هـەمان کـاتدا چـەندین لەیـەکچوونیش هەیـە. گـەرچی دیموکراسی‌یەتی ئەمەریکا دیموکراسی‌یەتێکی پڕاوپڕ نی‌یە، بەڵام یاسایەکە بەندە لەسەر ئـەو پرنسیپانەی کە بەشێوەیەکی گشتی لەلایەن خـەڵکی ئەمـەریکاوە بەراست دانراوەو مافی کەمەنەتەوایەتی‌یەکانی خـۆی دەپارێزێت و کاربەدەستان و خـەڵکی دەبەستێتەوە بەیەکەوە. (میدەکـان) و (میدۆفارسـەکان) ی پـاش ئەوان شێوازێکی هاوشێوەی ئەم حکومەتەیان پیـادە دەکرد.. بەڵام بەشێوەیەکی دیاری‌کراو. لـە راستی‌دا توانیان شتێك پێشکەشی جیهان بکەن کـە ئـەمڕۆ بـە "یاسای میدو فارسەکان" ناسراوە.

فارسەکان کە دواتر (ئیکباتانـا) – هەمـەدان – ی پایتەختی ئەوسـای میدەکانیـان داگیرکرد لـە (550 پ.ز) بــە بــەردەوامی بەشــداریان دەکــرد لــە فراوانترکردنی بنکـەی دەسـەڵاتی میدەکـان بـەرەو باشوور و بۆ (بابل).

یـەکێك لـە فـەرمانڕەوا بەناوبانگــەکانی ئـەو ئیمپراتۆریەتە (میدۆفارسی) یە ناوی (داریوش) بوو و بـەردەوام پابـەندی خـۆی بــە یاسـاوە نیشـان دەدا تەنانەت ئەگەر ئەوکاتانەش ئەو یاسایە دژی ویستی خۆی دەبوو.

بەداخـەوە، ئـەزموونی دیموکراسـی‌یەت لـەبری بـەهێزبوونی بـەرەو تـەنکی دەچـوو. سـەرەنجام و بـەپێ‌ی تێپـەڕبوونی کـات بـەها دیموکراسـیـەکان رێگـــــەیان بــــۆ ئیســــــتبدادیەت (Totalitarianism)چۆڵ کـرد. (دایاکۆنۆف) وای بۆدەچێ کە هۆی هەڵوەشانەوەی ئۆرگانە کۆنـەکانی دەوڵـەت (وەك ئەنجوومـەنی گـەورەپیاوان و کۆمەڵـە گشتی‌یەکان و... هتد) دەگەڕێتەوە بۆ چـاوچنۆکی سـەرکردە سـەربازی‌یەکانیان کـە سـامانی مـەزنی ئاشووریەکانیان گل دەدایـەوە بـۆ خۆیـان لـەبری دابەشکردنی بەشێوەیەك کە رەچاوی بـەرژەوەندی گەلەکـەیان کرابێـت. گـەرچی لــە کۆتـایی‌دا دیموکراسی‌یەتی میدی هەڵوەشـایەوە.. بـەڵام رۆژێك هـەبووە کە فـەرمانڕەوایی جیهانیان کردووە. ئـەو پرسـیارەش کـە دەڵێت: "چـی میدەکـانی ئـەوەندە گەورە کرد؟". دەتوانرێت بە دوو خاڵ کورت و روون وەڵام بدرێتەوە:

یەکەم: میدەکان جەنگاوەری زۆر لێهاتوو بـوون و ناوبانگیـان بەسوارچاکی دەرکردبوو. یەکـەم کـەس بوون کە (گـەریلای جـەنگ) یـان بـەکارهێناوە. ئـەم جـەنگاوەرە چاونەترسانە، جـاران وەك ئێسـتا، بــە (پێشمەرگە) نـاودەبران، واتـە (ئەوانـەی ئامـادەن

بمرن)، ئاشوورییەکان ئاماژەیان بە میدەکان کردووە بە (کەسە بەهێزەکان).

دووەم: میدەکان سیستەمێکی حوکمڕانیان دەگرتە بەر کە قەناعەتی بە دوژمنەکانیان دەهێنا پەیوەندیان پێوە بکەن نەك دژیان بجەنگن. ئەمەش شێوازێکی سەرەتایی دیموکراسیەت بوو. ئەو بنەما ناوازەیەی تێدا چەسپیبوو کە دەیووت نابێ خەڵکی تەنها بە زەبری شیر حوکمڕانی بکرێن. بەڵکو بەهۆی یاساوە. (دایاکۆنۆف) سەبارەت بە حکومەتە ناوخۆییەکەی میدەکان دەڵێت: "بەناوبانگترین و گرنگترین کەسایەتی پلەی لە (فەرمانڕەوای شار) بەرزتری بەخۆیەوە نەبینیوەو پێویست بوو لەسەری جۆرە ئەنجوومەنێك لە گەورەپیاوان و ئەنجومەنێکی میللی لەبەرچاو بگرێت کە دەبوایە بۆنەو پۆستە هەڵیانبژاردایە و پشتیان بگرتایە".

دیموکراسییەتی ئەمڕۆ زۆر قەرزاری ئەو پێشینانەی حکومەتی مۆدێرنیزمن. هەرچەندە پرنسیپە دیموکراسییەکان بەدرێژایی سەدەکان دەستکاری کراون و ڕێکخراون (دەسەڵاتی یاسا) وەك بنەمای هەموو دیموکراسییەتی سەرزەوی ماوەتەوە.

کوردەکانی ئەمڕۆ ئەزموونی یادەوەری کارە توندوتیژەکانی هێرشی ئاشوورییە کۆنەکانیان دووبارە چەشتەوە.. ئەویش لەکاتی هەڵمەتی (ئەنفال) ی 1987 –1988. دەسەڵاتە دەرەکییەکانیش بۆ جارێکی تر هاندانەکانیان بەشێوەیەکی چڕوپڕ دەستپێکردەوە بۆ یەککگرتن. داهاتووی کوردستان بەهەڵپەسێردراوی ماوەتەوە. کوردەکان هەلێکی نوێیان بۆ ڕەخساوە تا ببنەوە بە گەلێکی مەزن و شوێنێکی گرنگ پڕبکەنەوە لە جیهانی میللەتانی مۆدێرن دا.

سەرگرتنی ئەمەش چ لە شێوازی پەیوەندیەکی تایبەت لە پاڵ چەند میللەتێکی هەڵکەوتووی نوێدا یان وەك دەوڵەتێکی سەربەخۆ، مەسەلەیەکە تەنها زەمەن ئاشکرای دەکات. شتێك هەیە کە گومانی تێدانییە: هیچ هێزێك نییە لەسەر رووی زەوی بتوانێت ڕێگە لە خواستەکانی 30 ملیۆن کەس بگرێت و بەلێڵی بیهێڵێتەوە. سەرەنجام دەبێ جیهان "مەسەلەی کورد" بخاتە بەرباس و لێکۆڵینەوە.

پرسیارێك لە ئارادایە.. ئەویش ئەوەیە (چۆن کوردەکان وەڵامی هەلی ئازادبوون دەدەنەوە کە سەرلەنوێ خۆی پێشکەش کردوونەتەوە؟)

بەپێی نرخاندنێکی ڕاستیانەی هەنووکەیی بارودۆخەکە دڵخۆشکەرنییە. کوردەکان بەردەوام لە جەنگدان نەك لەگەڵ ئەوانەی دەورویەریان بەڵکو لەگەڵ یەکتریش دا. سەرلەنوێ بەدرێژایی هێڵی خێڵەکی و حزبی دابەش بوونەتەوە و بەردەوام بێئومێدمان دەکەن لە گەشەسەندن بەرەو دیموکراسیەت. لە زۆر رووەوە کوردەکانی ئەمڕۆ لە پێشینەکانی (3000) ساڵ لەمەوبەری خۆیان دەچن. بۆئەوەی سەرکەوتوو بن، پێویستە یەکبگرن. بەڵام یەکگرتن تەنها سەرەتایەکە.. باشە دەبێ چ رەوتێك بگرنە بەر بۆ پاراستنی ئەو ئازادیانەی کە بە دەستی دێنن؟ تۆ بڵێی بگەڕێنەوە بۆ دیکتاتۆریەت لەبەرگی خێڵەکایەتی کوردی یان پارچەپارچەیی حزبی؟ تۆ بڵێی کەسێك یان گرووپێکی کوردی هەڵکەوێت و حوکمڕانی بکات بەشێوەی دەسەڵاتێك کە ڕەخنە وەرنەگرێت تەنها لەبەرئەوەی کە زۆرینەی هێزو ناوچەیان لەژێر دەستدایە؟

مێژوو پێچەوانەی ئەم ڕێگایەی سەلماندووە. شایەنی ئاماژە پێکردنە کە لەگەڵ زیادبوونی دەسەڵاتی مەرکەزی لەکاتەکانی پاش میدەکان، دەسەڵاتی میدەکان کەمە کەمە لەناوچوو.

سەرچاوە:

Serching for Democracy
From Media to America
By\ Dr. Stephen Mansfield
And Douglas Layton (1997).

سەرنج: چەند برگەیەك هەیە لەم بەشەدا کە وەرم نەگێڕاوەتە سەر کوردی.. ئەمەش لەبەرئەوەی ئەو برگانە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆیان نەبووە بە ناوەڕۆکی ئەم بەشەوە. بۆیە بەپێویستم زانی لێرەدا ئاماژەی بۆ بکەم. (وەرگێڕ)

# گفتوگۆ



- دەسەڵات و مۆدێرنیزم

گفتوگۆیەک لەگەڵ جۆرج بالاندیدا

# دەسەڵات و مۆدێرنیزم

# "گفتوگۆیەك لەگەڵ جۆرج بالاندیێ"دا

گفتوگۆی: هاشم سالح

• و: دارا محەمەد

**- سەرەتا سەبارەت بەکتێبی "ئەنترۆپۆلۆژیای سیاسی" دەمەوێت پرسیارێکت ئاڕاستە بکەم، ئەم کتێبە لەڕەوتی زانستی و ژیانتدا چی دەگەیەنێت؟ ئەو ماوەیە چییە کە لەکتێبەکەی دیکەتی جیا ئەکاتەوە کە لەساڵی 1980دا بەناونیشانی "دەسەڵات لەسەر شانۆ"( 1 )دا بڵاوت کردۆتەوە، کەئەمیش دەسەڵات شیدەکاتەوەو هەوڵدانە بۆ تێگەیشتنی میکانیزمەو ڕێگەکانی کارکردنی؟**

**جۆرج بالاندیێ:** پێویستە باس لەو کتێبەش بکەیت کەئەمساڵ لەلایەن (بنکەی ڤایار)ەوە لەژێر ناوی "خول" یان "وەرچەرخان" (المنعطف)دا بڵاوم کردۆتەوە. لەڕاستیدا ئەم سێ کتێبە هەموویان لەسەریەك پرس رادەوەستن کەهەمیشە سەرقاڵی کردووم ئەویش: پرسی دەسەڵاتە. مەبەستم لەدەسەڵاتە لەناو روانگە درێژخایەنەکەداو، لەناو کەلەپورە مێژوویی و رۆشنبیرییە جیاوازەکاندا، دواجار هەلومەرجێ دەسەڵات لەبەردەم مەچەکی مۆدێرنیزمدا. ئەمە ئەو شتە بنەڕەتییە کەپێویستە رۆشنبکرێتەوەو شیبکرێتەوە.

**لەدوا کتێبتدا "وەرچەرخان" تێبینی ئەوە دەکەین کەئەچێتە سەر ئەفریقیا لە پێناوی تەنها لێکۆڵینەوەی ئەفریقیا خۆیدا نییە، بەڵکو بۆئەوەی بگەڕێیتەوە سەر فەرەنساو بەشێوەیەکی باشتر تێی بگەیت...**

بالاندیێ: بێگومان پێشتر گوتم پێویستمان بەئەزمونی جیهانە کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری و سیاسییە هەمەجۆرەکان هەیە، تا کوێربوونمان لەئاست لێکۆڵینەوەی کۆمەڵگاکەماندا کەمتر

بێتەوە، تۆ ئەزانیت (ماكس ڤیبەر) بەراوردكردنی بەبنەمای زانستی كۆمەڵناسی دانا. لەبەرئەوە ئەوانەی كەباس لەتایبەتمەندێتی رەهاو داخستن بەسەر خوددا دەكەن‌و خوازیارن كۆمەڵگاكانیان لەكۆمەڵگا مرۆییەكانی دیكە جیابكەنەوە، ئەوانە كەسانێكی گومڕاكەر بیر تەسكن.

**-بەهۆی ئەم ئەزموونە بەراوردكاریەوە گەیشتیتە دامەزراندنی "ئەنترۆپۆلۆژیای سیاسی" وەك زانستێكی تارادەیەك سەربەخۆ؟**

بالاندێ: بەر لەوەی سەبارەت بەئەنترۆپۆلۆژیای سیاسی بۆت بدوێم دەمەوێ زۆر بەكورتی چیرۆكی ژیانی زانستیمت بۆ باس بكەم. كاتێك چوومە ناو ژیانی توێژینەوەی زانستیەوە لەئەفریقیا سەرەتاكانی ساڵی 1946 هیچ پرۆژەیەكی تایبەتی دیاریكراوم نەبوو، هەروەها بیرم لەپێكهێنانی ئەنترۆپۆلۆژیایەكی تایبەت ج ئابوری یان سیاسی یان رۆشنبیریی لەجۆرێكی دیاریكراو نەكردبۆوە، ئەو شتەی بیرم لێ‌ئەكردەوە بریتی‌بوو لەبەرهەمهێنانی وەسف و شیكردنەوەی ئەم كۆمەڵگا ئەفریقی‌یە یان ئەوی دی. هێشتا لەژێر كاریگەری میتۆدو رێگەكانی ئەتنۆلۆژیای كلاسیكی (یان ئەگەر بتەوێت كۆلۆنیالی)دا بووم، كەلەئەنجامی وانەی مامۆستاكانی سۆربۆن لەسەری پەروەردە بوو بووم.

**مەبەستت زانستی ئەتنۆگرافیای وەزعی‌و پۆلێنكاری "بێ‌لایەنانە"یە (التصنیفیە الحیادیە) یە (Ethnographie)؟**

بالاندێ: بەڵێ، ئەتنۆگرافیا دەبێت بەئەتنۆلۆژیا(2). یەكەمین توێژینەوەی مەیدانیم لەناوچەیەكی نزیك بە"داكار"ی پایتەختی سەنگاڵ ئەنجامداو، لەسەر گەلێكی راوچی‌و كشتوكاڵی كەپێی دەوترێت "لیبۆ". لەبەرئەوەی گەلێكی بەژمارە كەم بوون بۆ بابەتی لێكۆڵینەوەكەمم هەڵبژارد، بەلام لەناو سیستمێكی زۆر ئاڵۆز لەپێوەندیە كۆمەلایەتی‌یەكان‌و هەروەها سیستمێكی رۆشنبیریی ئاڵۆزدا دەژین. لەوێ جۆرێك لەكەڵەكەبوونی چینەكان لەسەر یەكتری هەبوو، جۆرێك لەجیۆلۆجیا..

**گەلێكی موسلمان بوون؟**

بالاندێ: كەمێك چاوەڕێكە، دەگەمە سەر ئەمەش. گوتم لەوێ جۆرێك لەكەڵەكەبوونی شتەكان‌و ریزبوونیان لەسەر یەكتری بەشێوازێكی جیۆلۆجی هەبوو. مێژووی مرۆڤایەتی - من زۆرجار حەزم لەوتنەوەی ئەم پەندە هەیە - بەرادەیەكی زۆر لەمێژووی گۆی زەوی دەچێت، كەچینە جیۆلۆجی‌یە ریزبووەكان لەسەر یەكتری بەرهەم دەهێنێت. راستە مێژووی مرۆڤایەتی خێراتر لەمێژووی زەوی‌و پێكهاتەی زەوی دەبزوێ‌و دەگۆڕێت، بەلام هەروەها ئەویش ئەو چینە ئەستورانە دروست دەكەن كەپێویستە زانستە كۆمەلایەتیەكان بیاندۆزنەوەو هەڵكۆڵینیان لەسەر بكەن.

**لێرەدا گرفتی یادەوەری بەكۆمەڵ، یادەوەری گەلان دێتە پێشەوە...**

بالاندێ: بێگومان، بێگومان. ئەوە گرفتی یادەوەری كۆمەلایەتی‌و زۆر شتی دیكە ئەخاتەڕوو. ئەو شتەشی سەرسامی كردم ئەوەبوو كە گەلە ئەفریقی‌یەكان لەچەند چینێك پێكهاتوون، یەكەمیان چینە سەرەكیە (Archaique) هەرە كۆنەكەیە، واتا چینە ئەفریقی‌یە تەواوەكە. ئەم چینە قووڵە لەژێرەوە بەهەموو رەمزیەت‌و سرووتەكانی‌یەوە جێگیرە، هەروەها {لەژێر} هەر شتێكەوە كەپێوەندی بە كەشە پیرۆزەكانەوە هەبێت. پاشان چینێكی

دووەم هەیە کە لەسەر یەکەم پێکهاتووەو، ئەویش چینی موسڵمانە — ئەگەر ئەم گوزارەیە بشێت — ئەمەش نوێنەرایەتی هەموو ئەو شتانە دەکات کەئیسلام بەقۆناغی جیاجیا بۆ ئەفریقیای هێناوە، چونکە "بەموسڵمانی کردنی" ناوچەکە لەیەك ساتداو بەیەك لێدان ئەنجام نەدراوە هەروەك هەندێك وای بۆ دەچن، بەڵکو ماوەیەکەی دوورو درێژی خایاندووە. لەڕاستیدا بەموسڵمانی کردنی ناوچەکە بەشێوەیەکی هەمیشەیی کارێکی تاڕادەیەك نوێیەو، بۆ سەدەی نۆزدە دەگەڕێتەوە.

چینی سێیەمیش ئەوەیە کەلەڕووی کاتەوە لەهەموویان نوێترەو دەرئەنجامی هاتنە ناوەوەی کۆلۆنیالیزمی رۆژئاوایە، دیاریکراوتر بڵێین کۆلۆنیالیزمی فەرەنسییە، ئەم کۆلۆنیالیزمە بەتەنها کاریگەری ئابوریو سایسی نەبووە، بەڵکو کاریگەرییە رۆشنبیرییەکانیشی خستۆتەوە، ئیدی ئەم فاکتەرانە لەبەیەکداچوونی نێوان یەکتریدا تێکەڵەیەکی ئاڵۆزیان دروست کردووە. ئەوکاتە بەخۆمم گوت: لێکۆڵینەوەی کۆمەڵگایەکی بەم شێوەیەو کردنی بەپرۆژەیەکی ئەتنۆلۆژی ئاسان نیەو، ئەوەی لەوێ بینیم پاشتر لەژینگەو کۆمەڵگاکانی دیکەشدا بۆم دەرکەوت. لەسەنگال جۆرێك لەدابەشبوونی کاری ئاینیم بەپێی رەگەز بینی: واتا کۆمەڵێك مومارەسەی ئاینی تایبەت بەپیاوان هەیەو مومارەسەی ئاینی تایبەت بەژنان هەیە. کاری پیاوان ئیسلام بوو، لەکاتێکدا ژنان ئەو ئایینانەی پێش ئیسلامیان، وەکو ئایینە ئەفریقییە رووتەکان، لەئەستۆ گرتبوو. ئەمە مانای ئەوە نیە کەژنان هیچیان لەئیسلام نەدەزانی، بەڵکو زانیاریان لەبارەیەوە لاواز بوو، ئەوکاتەشی ئیسلامی بونی خۆیان رادەگەیاند ئاماژەیان بۆ دینی مێردەکانیان دەکرد، لەکاتی تەنگانەشدا (بۆ نموونەکانی وشکانی) لەسەر پیاوانو ژنان پێویست بوو لەدژی کارەساتێکی سروشتی بجەنگن، کەهیچ دەسەڵاتێکیان بەسەردا نیە هەروەها هەموو کەرەسەکانی پیرۆزکردنیان بەکاردەهێنا (هەر لەنوێژو پاڕانەوە) تا ئەو کارەساتەیان لەسەر لابچێتو بگەنە ئەنجامێك.

**ئەم بابەتە لەوڵاتی ئێمەدا هەیەو نوێژێکی تایبەتی هەیەو پێی دەوترێت "نوێژە بارانە"**

بالاندێ: بێگومان. ئەوە لەزۆربەی کۆمەڵگا مرۆییەکاندا هەیە. کەواتە ئەمە مانای وازهێنانە لەئیسلام بەکەلەپورە بێ خەوشەکەیەوەو هەروەها لەئیسلامی میللی تێکەڵ بەسیحرو جادوو، چونکە ئەوانە جگە لەزانیارییە ئایینییە ئیسلامییەکە زانیارییە سیحرییەکانیشیان لەگەڵ خۆیاندا هەڵگرتبوو، ژنانیشیان تێکەڵ بەهەموو مومارەسە ئایینییە کۆنەکانو پەرستنی رۆحەکان دەکرد. لەبەرامبەر ئەم هەموو دیاردانەدا (کەئەمەش یەکەم دۆزینەوەی من بوو) بەخۆمم گوت: مەحاڵە جۆرێك لەئەنترۆپۆلۆژیای نامێژوویی دابمەزرێنم، واتا بێئەوەی رەچاوی رەهەندە مێژووییەکە نەکرێت(3). پێویستە مێژوو بخرێتە ناو بابەتەکەوە، نەك تەنها لێکۆڵینەوەیەکی ئێستای هاوکاتی (سنکرۆنی) ئەنجام بدرێت. هەروەها پێویستە چۆنێتی جێگیربوونی پێدراوە ئایینیو یادەوەرییە بەکۆمەڵەکان بزانین کەبەقۆناغی بەدوایەکدا دروست بوون. ئەمە یەکەمین بابەت بوو کەرۆحی زانستیمی جوڵاند، یان یەکەم بەریەککەوتنی راستەوخۆی من بوو بەواقیعی مەیدانی کۆمەڵگا ئەفریقییەکانەوە. ئەم بەریەککەوتنەش رێگەی ئەوەی بۆ واڵا کردم کەزانستانە دروست ببمو بگۆڕێمو، گومان لەو رۆشنبیرییە تیۆرییە بکەم کەپێشتر وەرم گرتبوو، لەوجۆرە رۆشنبیریانەش هێڵی مارکسیزمی نوێ بوو کەئەوکات بەسەر نەوەی ئێمەدا زاڵ بوو. فاکتەری دووەم

کەهاندەرێکی زانستی بوو کاریگەری لەسەرم هەبوو، دەرکەوتنی بزوتنەوەی رزگاریخوازی نیشتمانی بوو کەداوای سەربەخۆییان دەکردو ئەمەش هاوکات بوو لەگەڵ سەرەتای دەستپێکردنی توێژینەوە مەیدانیەکانمان، واتا لەساڵی 1946/1947دا. ژیانی نوێی سیاسی لەئەفریقادا بەیەکجار دەستیپێکردو نەدەکرا ئەو رەهەندە سیاسییە سەرقاڵم نەکاتو کار لەبایەخە زانستیو فیکرییەکانم نەکات، لێرەوە کتێبی "ئەنترۆپۆلۆژیای سیاسی" وەك کاردانەوەو وەلامێك بۆ ئەو حالەتە مێژووییە دیاریکراوە دەرکەوت. لەوکاتەشەوە لەگەڵ نەوەی یەکەمی پیاوانی سەربەخۆ خوازی ئەفریقادا هاوپەیمان بوومو دوایتر بوون بەهاورێم (وەك سەنگور یان نەدیوپ یان سیکۆتۆری، بێگومان لەقۆناغەکانی یەکەمیدا)، بەم شێوەیە خۆمم لەناو ئەو سیاسەتەدا بینیەوەو لەگەڵ چەند کەسێکی دیکەدا گۆڤاری "ئامادەگی ئەفریقی"مان دەرکرد کەتا ئێستاش لەپاریس دەردەچێت. بەلام بەشداریم لەبزوتنەوە نیشتمانیو نەتەوەییەکانی ئەفریقیادا لەئەنجامدانی لێکۆڵینەوە زانستیەکان دوری نەخستمەوە. بۆم دەرکەوت لەجەوهەری بزوتنەوە نەتەوەییە تازەکانی ئەفریقا تێناگەم گەر ماهیەتی مێژوی تازەی ئەفریقا یان گەر دەتەوێ مێژوی سیاسی ئەفریقام نەزانیبێ، نەك هەر ئەو مێژووەی ئەفریقا کە لەژێر کاریگەری دەرەوەدایە ئەمەش بەرەو لێکۆڵینەوەی سیستمە سیاسیە ئەفریقییەکانو شێوازی ئەو حکومەتانەی ئەفریقیەکان بۆ رێکخستنی کۆمەڵگاکەیان پێکیان هێنابوو، بردم. کارەکان لەسەرەتاوە بەم شێوەیە دەستپێکردو پرۆژەی "ئەنترۆپۆلۆژیای سیاسی" لەلام دروست بوو کەپاش بیست ساڵ لەو مێژووە واتا ساڵی 1969 رووناکی بینی..

لەئەنجامی خوێندنەوەی دەقە نوسراوەکانو خیبرەی ناوخۆیی و مەیدانیەوە تێبینی ئەوەم کرد کەجیهانی ئەفریقیای رەش بەمێژووی تایبەتی ئەفریقیاوە، بەشێوەیەکی سەرسورهێنەرانە خاوەن ئەزمونێکی سیاسی دەوڵەمەندە. ئەمەش ئەو بۆچونە باوانەی هەندێك لەتەوژمە ئەنترۆپۆلۆژیەکان رەتدەکاتەوە کەدەڵێت کۆمەڵگا "سەرەتاییەکان" مێژوویان نییەو خاوەنی رێکخستنێکی راستەقینەی سیاسی نین. بۆم دەرکەوت کەمێژوویان هەیەو، شێتێتییە بەڵکو مەیلێکی کۆلۆنیالیزمانەی رووتیشە گەر لەمێژوو دایانبڕین، هەروەها بەلای منەوە شێتییە کەئەوترێت فاکتەری سیاسی تیایدا جێگەیەکی دیارو گرنگ داگیرناکات. ئەوەی سەرسامی کردم ئەوەبوو کەئەفریقای باشوری بیابان، واتا ئەفریقیای رەش، خاوەنی مێژوویەکی سیاسی گەلێك دەوڵەمەندترو هەمەجۆرترە لەئەوروپا. رەنگە ئەم قسەیە سەیرو ناکۆك بێت..

**بەلام ئەوە مێژوویەکی شەفەویە نەك نوسراو؟**

بالاندێ: بێگومان. بەلام رێگری لەوەدا چییە؟ ئەگەر لەروانگەی زانستی مێژووییەوە سەیری ئەوکارانە بکەین دەبینین ئەو مێژووە تەنها کەمێکی نوسراوەتەوە، بەلام ئەگەر بەمانای مێژوویەکی فیعلی کەمرۆڤەکان لەکۆمەلگادا دروستی دەکەن سەیری بکەین، ئەوا بوونی هەیە. پێویستە لەبەرامبەر وشەی مێژوودا وریابین، ئەم وشەیە "لەزمانی فەرەنسیدا مینرێژە"و دەمانخاتە بۆسەوە. کاتێك وشەی "مێژوو" (Histoire) ئەدرکێنین، ئەوا یەکەم بیر لەزانستی مێژوو دەکەینەوە وەك ئەوەی لەزانکۆو پەیمانگاکاندا وەك سۆربۆنو ئەوانی دیکە ئەخوێنرێت.. هەروەها بیر لەکتێبەکانی مێژووی قوتابخانەییو زانکۆیی پسپۆری ئەکەینەوە، بەلام بیر لەمێژوویەك ناکەینەوە کەمرۆڤەکان

کەمرۆڤەکان لەڕۆژێکەوە بۆ ڕۆژێکی دی دروستی دەکەن، مەبەستم لەو مێژووەیە کەلەئەنجامی جوڵەی کۆمەڵگاکانیانەوە دروستی دەکەن و بەم پێیە کۆمەڵگاکانیان بەرهەم دەهێنن.

ئیدی منیش دژ بەو ئایدیۆلۆژیا ئەتنۆلۆژیە کۆنزەرڤاتیڤە تێکۆشام کەمێژووی ئەفریقیا رەتدەکاتەوە تەنها لەبەرئەوەی هیچ پەرتوکێك نییە ئەم مێژووە تۆماربکات، هەروەك ئەوەی لای ئێمەو لای ئێوەش لەوڵاتە عەرەبیو ئیسلامییەکاندا هەیە. ئەمە بەجۆرێك رەتدەکەنەوە وەك ئەوەی مێژوو کەمرۆڤەکان بەدرێژایی ئەوەیەك لەدوای یەکەکان دروستیان کردووە هیچ نەبێت! بەم شێوەیە لەتێبینییەکی وەسفگەراییەوە دەگەنە پێدانی حوکمێکی هەڵە. من دەڵێم: ئەگەر مێژووی ئەفریقیا لەکتێبەکانی قوتابخانەدا نەبێت، ئەوا وەك زانستێکی مێژوویی لەمێشکی مرۆڤەکان و لەدەزگاو کەلەپورەکاندا بوونی هەیە(4). بانموونەیەك کە پێشتر زۆر بەوردی لێی کۆڵیومەتەوە وەربگرین و ئەویش: سیستمی دەوڵەتی پادشایەتی لەڕواندا بوو. من زۆر گرنگیم بەم نموونەیەدا چونکە بۆ توێژەرەوە یان زانای ئەنترۆپۆلۆژی نموونەیەکی سەرنجڕاکێش و جوانە، لەچواردەوری پادشا (ئەمە کاتێك رواندا هێشتا سیستمێکی پادشایەتی بوو) کۆمەڵێك کەسایەتی رەسمی هەن کەبەشێوەیەك لەشێوەکان بریتین لەپاسەوانانی یادەوەری و دەستور. ئەوانە جۆرێك لە ئەنجومەنی دەستوری سیستمی پادشایەتی پێك ئەهێنن، ئەم کەسانە زانیارییەکی بێشوماریان بۆ شتەکان هەبوو، هەروەها خاوەنی کەرەسەو توانا مادییەکان بوون بۆ وەبیرهێنانەوە. لەڕاستیدا یادەوەرییە بەکۆمەڵەکان لەناو دیمەنی سروشتی و شتەکان و لەناو سرووت و دامەزراوە ناوخۆییەکاندا هەیە. کەواتە ئەو خاڵانە یان هەبوو کەکاری لەسەر بکەن و لەبۆشاییدا نەجوڵێنەوەو مێژوویەکی گێڕاوەو وتراویان هەبوو، بەڵام لەسەر شێوازی رۆژئاوایی نەبوو، بەڵکو مێژوویەك بوو لە رێگەی دامەزراوەو کەلەپورە شەفەوی و مومارەسە دەستوری و ئاهەنگە سیاسییەکانەوە کەشکۆو پیرۆزیان هەیە ئەگوێزرێتەوە و ئەوترێتەوە. ئەوانە خۆیان لەمانای ئەوە تێدەگەن و دەزانن بەچییەوە گرێدراوە. بەم پێیە مێژوویەکی شاراوەیان هەبوو کەوەك کەلەپوری رۆژئاوایی و کەلەپوری عەرەبی ئیسلامی لەلایەن پسپۆرەکانەوە نەنوسرابۆوە.

**کەواتە "ئەنترۆپۆلۆژیای سیاسی"ت لە پێناوی روونکردنەوەی ئەم هەموو کارانەدا نووسی و، هەروەها خاڵ خستنە سەر پیتەکان بوو سەبارەت بەباری کۆلۆنیالیزمی و، روانگە کۆنزەرڤاتیزمەکەی زانستی ئەتنۆلۆژیای کۆلۆنیالی..**

بالاندیێ: تەواوە. من ویستم لەڕێگەی ئەم کتێبەوە نیشانی بدەم کە نەك هەر تەنها لێکۆڵینەوەی ئەنترۆپۆلۆژی سیاسەت (یان فاکتەری سیاسی) کارێکی مومکینە، بەڵکو پێویستە و دەبێ بکرێت. ویستم تیۆری سیاسی لەتیۆری دەوڵەت بەمانا رۆژئاواییەکەی بۆ ئەم وشەیە جیابکەمەوەو، دەریبخەم کەهەمو کۆمەڵگا مرۆییەکان — نەك بەتەنها کۆمەڵگا رۆژئاواییە "شارستانیەکان" — سیاسەت بەرهەم دەهێنن و سیاسەت و مێژوو لەناویاندا هەیە. بێگومان فاکتەری سیاسی بەپێی پێکهاتە کۆمەڵایەتی و رۆشنبیرییە هەمەچەشنەکان شێوەی جیاواز وەردەگرێت. هەروەها خوازیاری سەلماندنی ئەوەبووم کەرۆژئاوا خاوەنی زانیارییەکی خوارو خێچ و کەموکورە دەربارەی سیاسەت، چونکە هەمیشە بیرکردنەوەی بۆ سیاسەت لەڕێی دەوڵەت و بەرژەوەندی دەوڵەتەوە بووە، کە بۆ بەرژەوەندی دەوڵەتی پادشایەتی کۆن، یان بۆ

بەرژەوەندی دەوڵەتی کۆماری نوێ - کەپاش شۆڕشی فەرەنسی دەرکەوت - بیری لێکردۆتەوە، لێرەدا ئەم دیاردەیە پتر ئاشکراو دەرکەوت‌و دەسەلاتی دەوڵەتی بۆرژوازی نوێ زیادی کردو وەك (ئەختەبوت) باڵی بەسەر هەموو شتێکدا کێشا (5).

بۆ نموونە دەبینین سەرجەم فیکری کۆمەلایەتی فەرەنسی لەسەدەی نۆزدەدا (ئەوەی تایبەتە بەسیاسەت) بریتی‌بوو لەفیکری دەوڵەت، یان ئەو فیکرەی لەدەوری دەوڵەت‌و رێکخستنی دەوڵەت کۆئەبووەو، .. هتد. هەروەها فەلسەفەی فاکتەری سیاسی بریتی‌بوو لەفەلسەفەی دەوڵەت. هیگڵیش ئەم ئاراستەیەی بەهێزکردو پاشان مارکسیش، کە هەرچەندە روانگەی هیگڵی هەڵگێڕایەوە، بەلام هەر لەرێی دەوڵەتەوە بیری لەسیاسەت کردەوەو، بیری لەکاری شۆڕشگێڕانە کردەوە ئەویش بەدەستبەسەراگرتنی دەوڵەتی ناوەندی‌و پاشان نەهێشتنی دەسەلاتی دەوڵەت خۆی‌و، دامەزراندنی سیستمێکی کۆمۆنیستی نموونەیی، یان بەهەشتێکی سەرزەمینی لەسەردەمی داهاتوودا کەبەتەواوی نازانین کەی دەبێت.. هەموو ئەمانە وای لەرۆژئاوا کرد بیرکردنەوەی بۆ سیاسەت و فاکتەری سیاسی لەرێگەی دەوڵەت‌و میکانیزمەکانیەوە بێت، پێموایە ئەمە هێشتا تارادەیەکی زۆر بەردەوامەو بەلام کەمتر لەجاران، ئەمەش لەبەرئەوەی جیهان گۆڕاوەو شتەکانیش گۆڕاون. لەساتەکانی دەستپێکردنیشمان بەلێکۆڵینەوەی سیستەمە کۆمەلایەتی‌و رۆشنبیرییەکانی دەرەوەی رۆژئاوا، بۆمان دەردەکەوێت کەسیاسەت لەسەر شێوەی جیا لەشێوەی دەوڵەت بوونی هەیە، واتا لەسەر شێوە خێڵەکی‌و هۆزگەرییەکان‌و، .. هتدیش بوونی هەیە. بەم شێوەیە دەبینین هیچ کۆمەلگایەکی مرۆیی نیە لەفاکتەری سیاسی رزگاری ببێت یان بێ‌ئەو بژی مەبەستم لەمە ئەوەیە هیچ یەکێك لەکۆمەلگاکان ناتوانێت بەخۆی بلێت: من بەتەنها کۆمەلگایەکی مەدەنیم، پۆلیس‌و حکومەت‌و دەسەلاتم ناوێت.. ئەمە شتێکی مومکین نیە. لەهەموو شوێنێك هەمیشە چەند ئەندامێکی دیاریکراو هەن کە ئەرکیان پیادەکردنی چالاکیە سیاسی‌یە رووتەکانە، ئیتر ئەو کەسانە پادشا بن یان سەرەك کۆمار یان سەرەك هۆز یان خێڵ بن، ئەمە هیچ لەمەسەلەکە ناگۆڕێت. لێرەدا سەرنجێکی دیکە زیاد دەکەم سەبارەت بەبیریارێکی فەرەنسی کەبەر لەماوەیەك مرد ئەویش: پیەر کلاستەرە. (پیەر کلاستەر) لەسەر ئەو خێڵە هیندیانەی ئەمریکای لاتین کاری‌کرد کەلەچەند گروپێکی بچووکی خاوەن رابردوویەکی ئالۆزەوە دروست بووبوون، هەر لەو لێکۆڵینەوە مەیدانیانەشیەوە کتێبێکی بەناوی "کۆمەلگا دژی دەوڵەت"(6) بلاوکردەوە. کە لەم ناوونیشانەدا خوازیاری وروژاندن‌و ختوکەدان بوو، بەلام کتێبێکە هەلگری تیۆرەیەکی دیاریکراوە، ئەم تیۆرەیەش پێی وایە "کۆمەلگا توانای رێگرتنی لەسیاسەت هەیە کاتێك بیەوێت خۆی وەك دەسەلاتێکی بەهێز دابمەزرێنێت". ئەمە رەنگە بۆ هەندێك کۆمەلگای بچووکی تایبەت بەخێلە هیندی‌یە ئەمریکی‌یەکان راست بێت، بەلام بۆ زۆربەی کۆمەلگا مرۆیی‌یەکان راست نابێت. لەڕاستیدا کۆمەلگای مەدەنی توانای رێگرتنی لەسیاسەت نی‌یە لەوەی خۆی وەك دەسەلات دابمەزرێنێت، ناتوانێت رێگە لەفۆرمەلەبوونی دەسەلات بگرێت، چونکە بۆ بەرێوەبردنی کارەکانی‌و پیادەکردنی ئەرك‌و میکانیزمەکانی بەشێوەیەکی سروشتی پێویستی پێیەتی. رەنگە وێناکردنی کۆمەلگایەك کەکارەکانی بەخودی خۆی بەرێوە ببات‌و، چارەسەرکردنی کێشە توندەکانی بەبێ حکومەت‌و دەسەلاتێك لەسەرەوە، کارێکی گران

بێت. هیچ کۆمەڵگایەك نییە بۆ خۆیو بێ توندوتیژیو رقو پێشبڕکێ بەڕێوەبچێت، ئەمە یۆتۆپیاو شێتییە، ئەم کۆمەڵگایەش بوونی نیەو کۆمەڵگایەکی مردووە.

**جارێك گوێم لێبوو دەتووت دەوڵەت "بەکارهێنانی توندوتیژی شەرعی مۆنۆپۆلیزە دەکات".**

بالاندێ: ئەمە قسەی ماکس ڤیبەرە(7)، نەك من. ڤیبەر دەڵێ: حوکم کردن بەمانای مۆنۆپۆلیزەکردنی (قۆرغکردنی) بەکارهێنانی توندوتیژی شەرعی، یان توندوتیژی ماڵیکراو (العنف المدجن) دێت. واتا دەسەڵات ئەو توندوتیژییەی لەجەستەی هەر تاکێکی دەوڵەتدا هەڵگیراوە "دەدزێت" و لەدەستی خۆیدا کۆی دەکاتەوەو، رێگە لەبەکارهێنانی ئەم توندوتیژییە لەلایەن کەسەکانەوە دەگرێت، چونکە دەوڵەت لەبری تاكو لەبەرژەوەندی ئەو بەکار دەهێنێت. ئەگەر ئەو تاکە تووشی گرفتێك هات تۆڵەی بۆ ئەکاتەوەو، رێ لەوە ئەگرێت بەشێوەیەکی راستەوخۆ تۆڵە بکاتەوە. بەمانایەکی دی کۆنترۆڵی بەکارهێنانی توندوتیژی دەکات.

**لەڕاستیدا ئەو پرسیارە گرنگەی کەدەخوازم ئاڕاستەی بکەم بریتییە لە: کاتێك لای ئێمەو (بەگشتی لەجیهانی سێدا) باس لەسیاسەت دەکەین، هیچمان نیە تەنها ئەوە نەبێت کەئاماژە بۆ دیاردەی دیموکراتیەت لەڕۆژئاوادا بکەینو، شانسی رۆژئاوا لەوەدا کە لەناو دیموکراتیەت و چەندێتی فیکریو سیاسیدا دەژین (فرە مینبەرو رۆژنامەیی، فرەحیزبی سیاسی، فرە سەندیکا کرێکاری و پیشەییەکانو سەربەخۆبوونیان، فرە تەوژمە رۆحیو ئایینییەکان)... هتد. ئێستا ئێمە لە جیهانی عەرەبیدا خەون ئەگەر "بەتنۆکێك لەو دیموکراتیەتەشەوە" بێت دەبینین، بەڵام خەون شتێکەو واقیع شتێکی دیکە...**

بالاندێ: دیموکراتیەت بریتییە لەشێوازی کارکردنی سیاسەتو پیادەکردنی سیاسەت بەشێوەی رێزلێنانی زێدەتر بۆ تاكو چەندێتی (فرەیی)و داواکارییەکانی تاك بۆ ئازادیو بەشداریکردنی لەدەرکردنی بڕیارەکاندا.. بەڵام دیموکراتیەت دەسکەوتێکی مێژوویی زۆر گەورەیەو، پێویستە کۆمەڵ بەسەختیو پاش کاروانێکی درێژ بیگاتێ، پێموانیە بتوانرێت بەبڕیارێك لەسەرەوە بسەپێنرێت، ئەمە شتێکی مەحاڵە. پێویستە لەبنکەی کۆمەڵەوەو لەناوەوە لەگەڵیدا بژیتو پێ بەپێو رۆژ بەڕۆژ لەلایەن هاوولاتیانەوە پیادە بکرێت، ئەمەش لەسەر هەموو ئاستو چالاکییەکان دەبێت پێش ئەوەی ببێتە راستییەكو گەڕانەوەی نەبێت. کەواتە دیموکراتیەت تەنانەت لەو کۆمەڵگایانەی کەلەبواری دیموکراتیدا جێگیرو دێرینن هەڕەشەلێکراوە. سەرنجبدە لای ئێمە لەنێوان راستو/ چەپدا (شیراك/میتیران)(8) چی روودەدات کەهەردووکیان بەتوندی هەوڵی دان بەخۆداگرتن دەدەن تا کارەکان لەدەست دەرنەچنو، پەنا ببرێتە بەرهێز لەبری بەکارهێنانی چارەیەکی عەقڵانیو دیموکراتی راست. هەروەها ئەوەشی پەیوەندی بەگۆڕانکاری شۆڕشگێڕانەوە هەیە بریتییە لەپرۆسەیەکی پلەیی درێژخایەن کەناکرێت لەئانو ساتێکدا ئەنجامبدرێت، پێموایە یەکێك لەو هەڵە گەورانەی بیریارە سیاسییەکان (هەروەها سیاسییەکان) لەم سەدەی بیستەمەدا باوەڕبوونیانە بەوەی کەرەنگە مەیلی ئیرادەگەری سەرچڵانە سەرکەوتووبێت. مەبەستم ئەوەیە لەسەدەی بیستداو بەتایبەتی لەنیوەی دووەمیدا گرفتەکان بەهۆی ئیرادەیەکی فەردییان بەکۆمەڵەوە بیری لێکرایەوە، پێیان وابوو ئیرادە فەردیو بەکۆمەڵەکان توانای دروستکردنی هەموو شتێکیان هەیە تەنانەت. کۆمەڵێك کەس هەن

لـەبری میللـەت دەخـوازن‌و دەزانـن‌و بـیریش دەکەنەوە.. پاشان پێیان وایە ئەگـەر گـەل باش میلیتاریزە بکرێت ئەوا ئـیرادەی گۆڕینـی واقیعـی ئابوری‌و سیاسی کۆمەڵ فەراهەم دەبێت. پێموایە تاڕادەیـەك ئـەم وەهمـە مەترسیدارە هەیـە، مـن نـاڵێم لـەمێژوودا پێویستمان بـەئیرادە نیـە، یـان ئـیرادەی فـەردی‌و بەکۆمـەڵ شتێکی نێگەتیڤـە، نەخێر. بەڵکو دەڵێم ئیرادە سنوردارو دیاریکراوە، چونکە شتەکان لەسەر ئاستی کاروباری سیاسی‌و کۆمەڵایـەتی‌و ئـابوری تەنـها بـەپێ ئـیرادەو سووربوونی ئیرادەو ئارەزووی ئیراد نـاگۆڕێت‌و ناجولێتـەوە، بـەڵکو لەسـەر ریتمـی تایبـەتی‌و خێرایی خودی خۆی دەگۆڕێت و دەجولێتەوە.

لەسـەرەتای ئـەم باسـەدا مەسـەلەی یادەوەری‌و، یادەوەری بەکۆمەڵم هێنایە کایـەوە، ئـەم مەسـەلەیە ئێستا سـەر لـەنوێ سـەرقاڵم دەکاتـەوەو، پێشـتریش سۆسـیۆلۆژە فەرەنسـییەکان لەسـەردەمی قوتابخانـەی دۆرکهایمدا پێوەی سەرقاڵ بوون. لێرەدا دەڵێم: نابێت ئەوەمان لەیادبچێت کەهەموو کۆمەڵگایـەك بەشێك لەقورسایی رابـردوو یـان قورسـایی رابردووی لەخودی خۆیدا هـەڵگرتووەو، ناتوانێت تەنها بەهـەبوونی ئیرادە وا هەڵسوکەوت بکـات وەك ئـەوەی ئـەم رابـردووە بوونـی نـەبێت. لەبەرئـەوە پێویستە کۆمـەڵگا ئێستاو داهـاتووی خۆی دروست بکات‌و رابردووش لەبەرچاو بگرێت، هەرگیز ناکرێت ئەم خاڵە پشتگوێ بخرێت.

**ئێستا دەبینین رابردوو لای ئێمـە لەهـەموو لایەکـەوە دەتەقێتەوە...**

بـالاندێ: لەهـەموو شـوێنێك دەتەقێتـەوەو دەگەڕێتەوە، بۆچی؟ چونکە بەشێکی شاراوەو نادیار بووەو بەشەکەی دیکەشی نووستووبووەو چاوەڕێی بوژانەوەو دەرکەوتن بووە، خۆ ئەگـەر هەلومەرجی مێژوویی لەبار بێت، ئەوا هێزو بزێوی پـێ دەبەخشـێ تابتەقێتـەوە. لەسـەرەتای ئـەم باسـەدا گـوتم یـادەوەری کۆمـەڵگا لەچینـە جیۆلۆجیـەکانی زەوی دەچێـت‌و، چینـەکانی کاتیش لەچینەکانی زەوی دەچێت لـەریزبوونیاندا لەسـەر یـەکتری، ئەمـەم لـەلای گـەلانی "لیبـو" لەسەنگال تێبینی کرد. لەڕاستیدا ئەم "لیبو"یانە بەپێی بارودۆخ پشت بەیەکێك لەچینەکانی مێژوو یـان (یـەکێك لەیادەوەرییـە بـە کۆمەڵـەکانیان) دەبەستن، بۆ نموونە ئەگەر وشکانی روویدا یـان لـەوەرزەکانی راودا ماسی کـەم بـوو ئـەوا ژنـان هـەموو تواناکـانی پـیرۆزکردن‌و سـرووتە کۆنـە ئەفریقییـەکان بـەکاردەهێنن. لـێرەوە قوڵـترین یـادەوەری بەکۆمـەڵ، واتـا قوڵـترین چـین، دەردەکەوێتە سەرەوە، کـاتێکیش هـەموو شتێك وەك خۆی لێدێتەوە ئەوا بۆ ئیسلام دەگەڕێنـەوە کەلـەڕووی کاتـەوە چینێکـی نوێـترن‌و، لەسـەر چینی یەکەم پێکهاتوون. لێرەدا پێگـەی ئافرەت دێتـە دواوە بۆئـەوەی پیـاوان پێشـەوەی شـانۆ داگیربکەن. پاشان لەهەندێك کاتی دیکـەدا پشت بـەیادەوەری سـێیەم (یـادەوەری مۆدێرنـیزمی فەرەنسایی) دەبەستن، ئەگەر بارودۆخ پێویسـتی بەمەبوو بەم شێوەیە کارەکـان زۆر لـەوە وردتـرو ئاڵۆزترن کەئەیبینیت.

**رات سەبارەت بەگۆڕان چییەو چۆن روودەدات؟**

بالاندێ: سەبارەت بەگۆڕان داوای پتر وریایی‌و نـەرمی دەکـەم، چونکـە ئەگـەر بمانـەوێت مێـژوو داگیر بکەین ئەوا مێژوو بەسەرخۆیدا دادەخرێـت‌و وشك دەکـات‌و.. "خـۆی نابەخشێت". ئەمـەش کارێکی ئومێد بڕانەیـە بەتایبـەتی بۆئەوانـەی زۆر بـەخێرایی خوازیـاری روودانـی گۆڕانـەکانن، مرۆڤایـەتیش لـەمێژوودا نرخێکـی گـەورەی لەبەرامبەر ئەو ئەزمونە سەرچڵیانەدا داوە.

**ئەمە دەڵێیت. بێ ئەوەی بکەویتە بۆسەی مەیلە کۆنزەرڤاتیڤەکەوە کە بۆ خۆی دژایەتی گۆڕان دەکات..**

بالاندێ: بێگومان، بێگومان، من کۆنزەرڤاتیزم نیم و، ڕۆژێك لەڕۆژان کەسێك بەمنی نەوتووە کۆنزەرڤاتیزم یان دژ بەگۆڕان! ڕەنگە پێچەوانەی ئەمەیان وتبێت، لەزۆربەی پەرتوکەکانمدا جەختم لەسەر گرنگی دینامیکیەتی کۆمەڵگاکان و ئەو تێکچونە ناوەکی یە کردووە کەئەچێتە ناو خودی کۆمەڵگاکان و گۆڕان دروست ئەکات. بەڵام پێموایە ڕاسترین شێوازو تاکە ڕێگە بۆچوونە ناو مێژوو گۆڕینی ڕەوتی ئەم مێژووە ئەوەیە کە لەدروستکردن و بەدیهێنانی ئەم ڕەوتەدا هەلومەرجە واقیعی و بەرهەستەکان ڕەچاو دەکات، چونکە ئەگەر ئەم ڕاستی یە بنچینەییانە لەبەرچاو نەگیرێت ئەوا مێژوو بەتوندی تۆڵەی خۆی ئەکاتەوە. ڕووداوە مێژوویی یە مەزنەکان و زانستە کۆمەڵایەتی و سیاسی یەکانی ئێستاش ئەم ڕاستی یە ئەسەلمێنن.

**بەڵام بونیادگەراییش جەختی لەسەر بیرۆکەی جێگیربوون و سیستمی وەستانی هاوسەنگ و نەتوانینی خود لەگۆڕین و پاڵپێوەنانی مێژوودا کردەوە، بەڵکو لەمە زیاتر ملکەچبوونی خود بۆ بونیادو زەبرەکانیشی..**

بالاندێ: ئەو بونیادگەراییەی باسی ئەکەیت شتێکی زۆر بێزارکەرە، ئێستاش خۆشبەختانە کۆتایی هاتووە. بەڵام هەروەك دەزانیت من و لیڤی شتراوس دوو کەسی جیاوازین و یەکناگرینەوە..

**ئەی فۆکۆ؟**

بالاندێ: فۆکۆ بابەتێکی دیکەیە. فۆکۆ لەتونس کاتێك وانەی ئەوتەوە زۆر باش ناسیم و، هەروەها لەپاریسیش ناسیم. دەمەوێ بڵێم بونیادگەرایی فۆکۆ لەسەر شتێکی تایبەتی و زۆر دیاریکراو جێبەجێکراو، وەك بونیادگەرایی لیڤی شتراوس نەبوو کە لەسەرهەمەیی {کلیانیە} فاکتەری کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیریی جێبەجێکرد، بونیادگەرایی فۆکۆ بەسەرزانین (مەعریفە)دا جێبەجێکرا، واتا زانینی سیستمەکانی زانین، یان کەپێویست بوو بڵێت سیستمەکانی فیکر، ئەمەش بریتی یە لە "ئارکیۆلۆژیای زانین". هەروەها بۆدۆزینەوەی هەندێك سیستمی دامەزراوەیی جێبەجێکرا وەك نەخۆشخانەی عەقڵی و بەندیخانەوە.. هتدو بەرهەمێکی باشی بەدەستهێنا. بەم شێوەیە فۆکۆ "بونیاد گەرایی" یەکەی بەسەر بوارێکی تەواو دیاریکراودا جێبەجێکردو، نەیووت هەموو شتێك ئەگرێتەوە یان کلیلێکی سیحری یەو هەموو گرفتەکان چارەسەر دەکات.

**بەڵام ئێستا هەندێکیان (بەتایبەتی ڕاستڕەوە موحافیزکارەکان) ئەڵێن فۆکۆ تێکدەربوو؟...**

بالاندێ: نەخێر، نەخێر. ڕەنگە بێزارکەرترین شتی فۆکۆ سەرەڕای ڕێزی زۆرم بۆی بریتی بێ لە: دەرکردنی بکەری کۆمەڵایەتیەکە لەگۆڕەپاندا (acteur'L)، واتا بەپێی زاراوەی فەیلەسوفەکان کوشتنی بۆ خود (Le sujet) (9). خۆت دەزانیت کە سۆسیۆلۆژیا وشەی بکەری کۆمەڵایەتی یان وەکیل (agent'L) بۆ ئاماژەدان بەکەسێکی کارتێکەر لەناو کۆمەڵدا بەکاردەهێنێت، بەڵام فەیلەسوفەکان زاراوەی خود بەکاردەهێنن، ئەمەش لەخودی خۆیدا ئاماژەیەکی گەورەیە. ئەمە ئاماژەیە بۆ ئارەزووی فەیلەسوفەکان بۆ ئەبستراکت و، ئارەزووی سۆسیۆلۆژەکان بۆ دیاریکردنێکی بەرهەست. با بۆ نموونە پەرتوکی "ئارکیۆلۆژیای زانین"ی فۆکۆ وەربگرین و سەیری بکەین بزانین چی ئەدۆزینەوە؟ دەبینین فۆکۆ لەبایەخی ئەو زاناو ڕۆشنبیرانە کەم ئەکاتەوە کەلەساتێك لەساتەکاندا زانین بەرهەم دەهێنن و

دەڵێ: ئەپستیم (episteme) یان سیستمێکی فیکریی (Systeme de pensee) هەیە کەدروست دەبێت و کۆنترۆڵی هەموو شتەکان دەکات و ژیانی تایبەتی خۆی هەیەو، ڕێگاکانی چارەسەرکردنی گرفتە زانستیو ڕۆشنبیرییەکان کۆنترۆڵ ئەکات و بەڕێگەیەکی دیاریکراو ئاراستەی دەکات. من لێرەدا فیکری فۆکۆ زۆر ساکار ئەکەمەوەو وێنەیەکی نایەکسان پێشکەش ئەکەم و داوای لێبوردن ئەکەم، چونکە فیکری فۆکۆ زۆر لەوە قووڵترو نەرمترە کەبتوانرێت بەم شێوازەی ئێستای من پێشکەشی ئەکەم بخرێتە ڕوو.

بەڵام هەرچۆنێك بێت بینینی شتەکان بەم شێوەیە مانای ئەوەیە: ئەگەر من ڕۆشنبیرو کۆمەڵزان بم و بدوێم ئەوا من نیم کەئەدوێم، بەڵکو ئەوە "ئەپستیمی"یە کەئەدوێت. پاشان ئەو فیکرانەی دروستی ئەکەم من خاوەنی نیم، بەڵکو ئەوە سیستمی فیکریی سەردەمەکەمە کەدروستی ئەکات و لەڕێی منەوە دەری ئەخات. من تەنها بونیادێکی لەناوچووم کەلەژێر فشارو هەیمەنەی بونیادێکی دیکەی گەورەتردام، کەزۆر لەمن بەهێزترو بەزەبرترە. "ئەپستیم" (episteme) وەك کەرەسەیەك بەکارم دەهێنێت و تەنها دەمکات بەقسەکەرێك بەناوی خۆیەوەو هیچیتر. من "شتێکم" بەناوی شتێکی دیکەوە ئەدوێم کەمنی تێپەڕاندووەو، من دروستکەرو داهێنەر نیم.

بونیادگەرایی بڕوای بەبلیمەت و داهێنان نیە. ئەپستیم بەدرێژایی چەند سەدەیەك بەزەبری خۆی باڵ بەسەر هەمواندا دەکێشێ، پێش ئەوەی ئەمەش هەرەس بهێنێ و لەناو بچێ ئەپستیمێکی دیکەی نوێ جێگەی دەگرێتەوە. بەڕای من توندڕەوی فۆکۆ لێرەدا خۆی حەشارداوە، بەڵام ئەم توندڕەوییە لەبلیمەتیو گرنگی دۆزینەوەکانی لە"وشەکان و شتەکان"و ئەوانی دیکەیدا کەم ناکاتەوە(10).

ئێستا بونیادگەرایی کەوتو، هەمان کاریگەریو هێزو زەبری نەماوە. چونکە ئەگەر ڕاستی بدوێین، بونیادگەرایی لەساتێك لەساتەکاندا زەبروزەنگێکی ڕۆشنبیریی دروست کردبوو، ئەمە گومانی تیانیە. ئەم زەبرو زەنگەش خۆی لەوەدا دەبینیەوە کەهەرچی لەژێر ئاڵای ئەودا نەبوایە فڕێ دەدرایە ناو بازنەی زانیارییە بەسەرچووەکانەوەو، پێیان وابوو ئەمانە لەهەموو ڕەسەنایەتیو داهێنانێکی زانستی خاڵین!

**تەنانەت (فۆکۆ)ش لەدوایین قۆناغیدا پاشەکشەی لەبونیادگەرایی کردو، وتی ئەو ڕۆژێك لەڕۆژان بونیادگەریی نەبووە، بەڵام ئەو ڕۆژنامەنووسانەی حەزیان لە پۆلێنکردن و سادەکاریی هەیە بەوشێوەیە وەسفیان کرد...**

بالاندێ: بەڵێ، فۆکۆ پاشەکشەی لێکرد، هەروەها جۆرج دیمۆزیل کەزانایەکی گەورەی ئەفسانەکانە هەستی بەوەکرد کەبڵێت بونیادگەریی نیەو، ئەوەی دەیکات زۆر لەوە جیدی ترە، هەر لەم بارەیەوە پێشەکییەکی ناسراوی دیمۆزیل هەیە(11). پاشەکشەی بونیادگەرایی وای لەزانستی کۆمەڵناسیو تەنانەت فەلسەفەش کرد کەسەرلەنوێ پرسی خود (Lesujet) بەهەند وەربگرن، واتا لێکۆڵینەوەی مومارەسە کۆمەڵایەتیەکان و گەمەو ڕۆڵی تاکەکان و.. هتد.

**ئەگەر باش تێت گەیشتبم دەتەوێت بڵێیت: پێویستە خود سەرچڵ و هەرزەکار نەبێت و پێی وابێت توانای گۆڕینی جیهان و سەرموژێرکردنی هەموو شتەکانی لەڕێگەی ئیرادەوە هەیە، هەروەك فەلسەفەی ئایدیالیزم و مرۆڤگەرایی جاران (هیومانیزم) پێی وایە، هەروەها دەبێت نەکەوینە لایەنی بەرامبەر کە هیچ گرنگیەك بۆ ئەم ئیرادەیە دانانێن وەك بونیادگەرەکان، یان هەندێك لە شێوەکانی بونیادگەرایی..**

بالاندیَ: زۆر تەواوە. لەڕاستیدا ئەگەر بتەوێت جۆرێك لەدیالەكتیك هەیە، دیالەكتیكێك هەیە كەلەلایەك ئیرادە فەردیو بەكۆمەڵەكانو، لەلایەكی دی هەلومەرجە ئابوریو كۆمەڵایەتیو رۆشنبیرییەكانو هاوسانگییەكانی هێزو دەسەڵات پێكەوە گریَ دەدات، ئەمەش جوڵەیەكی بەردەوامو هەمیشەییە. خۆ ئەگەر لایەنی تاك یان فاكتەری كۆمەڵایەتیمان پێشخستو پێمان وابوو خاوەنی ئیرادەی دروستكردنی مێژووە، ئەوا ئەكەوینە زیادەڕۆییەوە. ئەگەر لایەنی هەلومەرجی بابەتیشیان پێشخست ئەوا زیادەڕۆیی لەگرنگی بونیادو ئۆرگانەكاندا كە تایبەتە بەزانستی كۆمەڵناسی دەكەین یان زیادەڕەوی لەمەسەلەی سیستەمەكانی فكردا دەكەینو وەك لای فۆكۆ، ئەمانەش هەموو موبادەرەیەك لەدەست مرۆڤ دەستێننەوە. ئەمە لەكاتێكدا كە مەسەلەكە پەیوەندی بەدیالەكتیكێكی بەردەوامو هەمیشەییەوە لەنێوان ئەم دوو جەمسەرەدا هەیە: لەلایەك جەمسەری تاكو ئیرادەی تاكو كۆمەڵو، لەلایەكی دیكە هەلومەرجە مادییەكانی پێكهێنانی مێژوو، ئەمەش گەمەیەكی زۆر وردە كەتەنها كەمێكی كەم دەیزانن. خۆ ئەگەر بەڕێوەبردنی كاروباری مێژوو ئەوەندە سانا بوایە ئەوا دەركەوتنی مرۆڤ لەسەر رووی زەوی پێش چەندین سەدە دوا چارەسەری نموونەیی دەدۆزییەوەو لەو كۆمەڵگایا تەواوانەدا دەژیاین كەهەر بۆ خۆیو بەشێوەیەكی میكانیكیو بیَ گرفت بەڕێوەدەچوون. بەڵام دەبینی لەكۆمەڵگا سەركوتكەرو زۆردارەكاندا دەژین، ئەو كۆمەڵگایانەی لەهەر كاتێكی رابردوو پتر شەپۆلاویو گرگرتووە.

**ئەی پرسی پێشكەوتن، دەبینم ئێستا لەمەیدانی زانستەكانی نوێی رۆژئاوادا و نە. جەختێكی گەورە لەسەر رەخنەگرتنی لایەنە نێگەتیڤەكانی رۆشنگەری رۆژئاوایی هەیە (بۆ نموونە قوتابخانەی فرانكفۆرت یان فۆكۆ یان تەنانەت هابرماز)یش. بەڵام پرسی پێشكەوتنو پەرەپێدان لای ئێمە لەكۆمەڵگاكانی جیهانی سێدا گرنگییەكی زۆر گەورەی پیَدەدرێت، بەڵام ئێوە لە پێشكەوتن پڕبوون، راتان لەسەر ئەم جیاكارییە چییە؟**

بالاندیَ: وای بۆدەچم تۆ هەمان رەوت پیادە دەكەیت كەمن لەدوا پەرتوكدا "وەرچەرخان" یان "خول" یان "لاریبوونەوە" (Le de'tour)دا باسم كردووە. بۆ نموونە تۆ كە لە كەشوهەوای رۆشنبیریی عەرەبی ئیسلامییەوە هاتویتو دیراسەی رۆژئاوا دەكەیت، هەروەك من دیراسەی ئەفریقیام كرد! تۆ بەشێوەیەك لەشێوەكان "حاڵەتێكی ئەنترۆپۆلۆژی دەژیت"، لەبەرئەوەی ماوەیەك لەكۆمەڵگای ئەوروپی جیات دەكاتەوە چونكە تیایا لەدایك نەبوویتو واقیعێكی دەرەوەی خۆت دیراسە ئەكەیت، بەم پیَیە هەمیشە هەڵوێستێكی بەراوردكارانە (comparatiste) وەردەگریت. هەرچەندە ئەمە هەڵوێستێكی عەفەوییانەیە بەڵام سەرەتاكانی بنەمای لێكۆڵینەوەی ئەنترۆپۆلۆژی پێك دەهێنێت. بەمانایەكی دی تۆ چاودێری كۆمەڵگای رۆژئاوایی - ئەوروپی من دەكەیت تا لەڕووداوەكانی كۆمەڵگای عەرەبی خۆت تێبگەیت.. ئەمەش هەمان ئەو رەوتەیە كەمن گرتومەتەبەرو، هەر یەكێكمان بەدوای چارەسەری كۆمەڵگاكەیدا دەگەڕیَو، بەپیَی توانا تێگەیشتن لەمەسەلەكانو رۆشنكردنەوەیان.

**- راستە. ئێمە چەند باسی ئەو گرفتو قەیرانانە بكەین كەلەسەر ئاستی جیاجیا دووچاری كۆمەڵگای تۆ دێت، بەڵام دیسانەوە تۆ سەر بەكۆمەڵگایەكی زۆر پێشكەوتووتری.**

**ئەمە لەكاتێكدا من سەر بەكۆمەڵگایەكی عەرەبیم كەلەبارودۆخێكی سەختدا دەژیو، لەداهاتوویەكی بەرچاودا ئاسۆكانی نیمچە داخراون، من دەزانم كۆمەڵگای فەرەنسیش هەمان بارودۆخ ژیاوە، بەڵام لەئێستادا نا، بەڵكو لەقۆناغەكانی پێشووتردا...**

بالاندیێ: زۆر پێشكەوتووتر مانای چییە؟ من بێوتوویژ ئەم گوزارشتە رەتدەكەمەوە. من لەكۆمەڵگایەكدا دەژیم كەبەهۆی سەركەوتنی هەندێك بارودۆخی جیاوازەوە توانیویەتی هێزو هەیمەنەی مێژوویی خۆی بەسەر كۆمەڵگاكانی دیكەدا بسەپێنێ، بەهەموو شتە پۆزەتیڤو نێگەتیڤەكانی ئەم كۆمەڵگایانەوە. یەكەم كەس بووم كەدیاردەی كۆلۆنیالیستیم لەسەر ئاستی زانستیو سیاسی مەحكوم كرد كاتێك كەچوومە پاڵ هێزە ئەفریقیە پێشكەوتووەكانەوە (12)و، یەكەم لێكۆڵینەوەم لەم بارەیەوە ساڵی 1952 نووسی: "حاڵەتی كۆلۆنیالیستی، نزیكبوونەوەیەكی تیۆرییە" (مقاربة نظرية) (Le Situation Colonial approche theorique) ئەوەم روونكردەوە كەناكرێت هیچ زانستێكی كۆمەڵناسی بەسەر وڵاتێكی داگیركراودا جێبەجێبكەین ئەگەر ئەو زەبرو زۆرەی حاڵەتە كۆلۆنیالیە كەدروستی كردووە رەچاو نەكەین. ئەمەش وای كرد لەگەڵ بزوتنەوە رزگاریخوازەكانی ئەفریقادا یەكبگرم.

بێگومان پاشتر شتەكان پێشكەوتو ئایدیۆلۆژیای جیهانی سێ دەركەوتو (هەروەك وتم یەكەم كەس بووم كە ئەم زاراوەیەم داهێنا) هەندێكیان هەموو بەرپرسیارێتیەكەیان خستە سەرشانی كۆلۆنیالیزمو، گرنگی فاكتەرە ناوخۆییەكانو بەرپرسیارێتی دەسەڵاتە سایسییەكانی پاش سەربەخۆیی حوكمیان گرتە دەست لەبیركرد ناكرێت بەرپرسیارێتی ئەو دارمانەی ئەمرۆ تەنها بدرێتە پاڵ فاكتەرە دەرەكییەكان، بەڵكو دەبێت فاكتەرە ناوخۆییو سیاسەتە پەیڕەو كراوەكانیش لەبەرچاو بگیرێت.

**لێرەدا حەزدەكەم ئەم پرسیارە وردەت ئاڕاستە بكەم: پێتوایە رێنیسانسی جیهانی عەرەبی روونادات تەنها لەبەرئەوەی ئیمپریالیزم نایەوێت؟ بەمانایەكی دیكە: ئایا ئیمپریالیزم (یان فاكتەرە دەرەكییەكان) ئەوەندە بەهێزو بەزەبرن كەهیچ شتێك لەژێر دەستیان دەرناچێتو هیچ شتێكیان لێگیرنابێت؟ ئەگەر وایە ئیدی بانگەشەكردن بۆ تێكۆشانو خەباتو كاركردن بۆچی، كاتێك بزانین چارەنووسی ئەمەش لەدواییدا هەر كەوتنە؟ لێرەدا جارێكی دیكە لەگەڵ ئەو پرسە بنچینەییەدا یەكنەگرینەوە كەبونیادگەرایی پێوە قاڵ بوو: پرسی حەتمیەتو ئازادی..**

بالاندیێ: بەهەموو ئەمانەتێكی زانستییەوە وەڵامی ئەم پرسیارەت دەدەمەوە. ئیمپریالیزمو فاكتەرە دەرەكییەكان گومانی تیادا نیە رێگری دروست دەكەن، بەڵام هەڵەیە گەر وابزانین لەتوانای شێوازەكانی هەیمەنەی ئیمپریالیزمدا هەیە كەرێ بەهەموو هەوڵو تێكۆشانێك كەگەلان پێی هەڵدەستن بگرێت. ئەوكاتە ئێمە وێنەیەكی كاریكۆتۆری گەورە دەربارەی ئیمپریالیزم پێشكەشدەكەین، وێنەی (ئەختەبوتێك) كەلەهەموو شوێنێكدا بڵاوبۆتەوەو توانای بەسەرهەموو شتێكدا هەیە، ئەمەش وێنەی "خواوەندی ئەمریكایە".. بەڵام من پێموایە دەكرێت ئەم كۆسپو تەگەرە ئیمپریالیانە تێبپەڕێنین ئەگەر سەركردەكان باش هەڵسوكەوتیان كردو، گەلان رەوتو هێڵی تایبەتی خۆیان دۆزییەوە. پێویستە گەلان ئازایەتی موبادەرە بخەنە دەستی خۆیانەوەو، پاشان پرۆژەیەكی فراوان بۆ سەرجەم كۆمەڵگا بدۆزنەوە، كە بەم شێوەیە لەتوانای پێشڕەوایەتی سیاسیو رۆشنبیریدا هەیە كەزۆرترین بەشی گەل "بهێننە" سەر رێگەی

رزگاریو گۆڕان بەڕای من سەرباری هەموو فشارە ئیمپریالیو دەرەکیەکان ئەمە لەتواناداییە، بەڵکو دەکرێت ناکۆکیە ئیمپریالیەکان بەکاربهێنرێتو بازی بەسەردا بدرێت.

دەبێت ئەوەمان لەیادبێت کەئەمرۆ یەک سەنتەر بۆ ئیمپریالیزم نیە، وەک لەپەنجاکاندا هەبوو، بەڵکو دوو سەنتەر هەیە: یەکەم ئیمپریالیزمی ئەمریکییە، دووەم ئیمپریالیزمی سۆڤێتییە. وەک دەبینین هێزە گەورەکانو سەنتەرە جیهانیەکانی هەیمەنە سەرەڕای ئەوپەڕی هێزیان هێشتا سنوردارنو، لەهەندێک ناوچەی جیهانیشدا زۆرجار تووشی کەوتنی گەورەدەبن، نموونەش بۆ ئەمە زۆرن. هەروەها ئەم دوو هێزە گەورەیە تا ئێستا نەیانتوانیوە کۆنترۆڵی قەیرانەکانیان بکەن: مەبەستم قەیرانی سیاسی لەلایەن یەکێتی سۆڤیەتەوەو، قەیرانی ئابوری لەلایەن جیهانی سەرمایەداری،و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاوە. بەم شێوەیە زۆرباش دەبینین ئەم دوو هێزە گەورەیە زیاترو زیاتر سنوودار دەبن، ئەگەر ئەم سنورداریەش راستییەکە، کەواتە توانای موبادەرە لەدەستی نەتەوەو گەلانی دیکەدا دەمێنێت. کاتێک ئەمە دەڵێم بیر لەئەورووپاو یەکێتی ئەورووپی دەکەمەوەو، بەلای منەوە هەڵەو مەترسیدارە گەر ئەورووپا خۆی بداتە دەست ئەم لایەن یان ئەولایەنو خۆیو یەکێتییەکەی لەبیربکات، چونکە ئەوکاتە ئیرادەکەی (13) لەدەست دەدات. پێویستە ئەو رێڕەو و رەوتانە ببینرێن کە ئەم دوو جەمسەرە گەورەیە دەیگرنەبەر و خاوەن موبادەرە بێت، هەروەها ئەو کەموکوڕیو ناکۆکییانە ببینرێنو لەسەر ئەم ناکۆکییانە یاری بکرێتو بۆ بەرژەوەندی گەلە زۆر لێکراوەکان بەکاربهێنرێت. لێرەدا حەز دەکەم بڵێم سەرکردایەتیکردنی مێژووش بەشێوەیەک لەشێوەکان بریتییە لەهەڵخەڵەتاندنی مێژوو، پێویستە بزانین چۆن مێژوو ئەخەڵەتێنین، یان چۆن لەگەڵیدا یاری هاوسەنگییەکان بکەین..

**ئایا میتۆدو زاراوەی زانستە کۆمەڵایەتیەکان کەلەرۆژئاوادا دروست بوون بەسەر جیهانی عەرەبیو کۆمەڵگا عەرەبیەکاندا جێبەجێ دەبێت، یان پێویستە پێش جێبەجێکردن چاکبکرێتو چۆن؟**

بالاندێ: ئەگەر وشەی "زانست" مانایەکی هەبێتو قبوڵبکرێت ئەوا زانینی زانستە کۆمەڵایەتیەکان گەرەکە بەسە سەرجەم کۆمەڵگا مرۆڤایەتیەکاندا جێبەجێبکرێت، ئەگەر تیۆری فیزیاوی یان تیۆری مادە لەئەمریکا پێشکەوتووتر بێت، ئەمە مانای ئەوە نیە کەتەنها بەسەر کۆمەڵگای ئەمریکیو کەشوهەوای ئەمریکیدا جێبەجێ دەبێت! هەموو کەسەکان بەشداری لەپێشخستنی تیۆری ماددەدا دەکەن بەدەر لەو ژینگە رۆشنبیریو کۆمەڵایەتیەی تیایدا دەژین.

**بەڵام زانستە مرۆییی کۆمەڵایەتیەکان زانستە وردەکان نینو، هەمان پێگە لەڕووی ئەپستمۆلۆژییەوە داگیر ناکەن؟**

بالاندێ: بێگومان، بێگومان. ئەوەی دەڵێم سەبارەت بەزانستە وردەکان راستە، بەڵام سەبارەت بەزانستە کۆمەڵایەتیەکان تاڕادەیەک بارەکە جیاوازە. پێمبوایە جێبەجێبوونی وشەی "زانست" بەسەر دیاردە مرۆییو کۆمەڵایەتیەکاندا تاڕادەیەک شتێکی هەڵخەڵەتێنەرانەیە، چونکە هیچ حەتمیەتێکی هۆکاری تیادا نییە وەک لەزانستە وردەکاندا هەیە، هەروەها لەبەرئەوەی زانستە کۆمەڵایەتیەکان سەرەڕای هەموو شتێک بەرهەمی مێژوویەکی رۆشنبیریی دیاریکراوو قاڵبێکی رۆشنبیریی تایبەتە. دەتوانین بڵێین مێژووی زانستە کۆمەڵایەتیەکان لەئەورووپادا بەلانی

کەمەوە بۆ سەدەی هەژدەهەم دەگەڕێتەوە، هەر لەوکاتەدا شۆڕش‌و دابڕانە گەورەکان روویانداوە، ساتەکانی تەقینەوەو گەشەکردنە ئابوریەکان بەهۆی دەرکەوتنی کارگەکانەوە (مانیفاکتۆرە) روویدا. بەم شێوە دەبینین زۆر هەلومەرجی بابەتی‌و ناوخۆیی هەیە کەرێگا بۆ لەدایك بونی شێوازێکی نوێ‌و میتۆدێکی نوێ بۆ لێکۆڵینەوەی گرفتە کۆمەڵایەتیەکان ئەکاتەوەو، ناکرێت هیچ زانستێکی کۆمەڵایەتی لەو ژینگەیەی تیایدا دروست بووە جیا بکەینەوە. ئەو پرسیارەشی لێرەدا دێتە کایەوە ئەوەیە: ئایا دەکرێت ئەم زانستە کۆمەڵایەتیانە بۆ ژینگەیەکی دیکە جیا لەو ژینگەیەی تیایدا دروست بوون بگوێزرێنەوە؟ ئەمە پرسیارە سەرەکی‌یەکەیە.

من لەلای خۆمەوە دەڵێم ئەمە دەکرێت بەڵام بەمەرجی هەندێك شت دەستکاری بکەین. پێویستە جیاوازی لەنێوان دوو بابەتدا بکەین:

1- ئەو میتۆدو تەکنیکانەی کەلەسازدانی توێژینەوە مەیدانیەکاندا بەکاردەهێنرێن‌و جیاکردنەوە ئەم توێژینەوانەو دەرهێنانی ئەنجامەکانی.

2- لایەنی تیۆری‌و فەلسەفی ئەم توێژینەوە زانستیانە. پێم وایە لێکۆڵەرەوە عەرەبەکان پێویستە بەشێوەیەکی نیمچە تەواو سوود لەبەشی یەکەم وەربگرن چونکە خیبرەیەکی مرۆڤایەتی جیهانیە، ئەگەر ویستت لێکۆڵینەوەی شارێکی دیاریکراو (عەرەبی بێت یان رۆژئاوایی) لەرووە مادی‌یەکانی‌و رێکخستنی گەڕەك‌و خەڵکەکانی بکەیت، ئەوا ئەو تەکنیکە دیاریکراوانەم هەیە بۆ سازدانی ئەو پشکنینە مەیدانیانەی لەهەردوو رووەوە جێبەجێدەبێت. بەڵام ئەو شتەی کەلەوانی دیکە پتر جێگەی تێڕوانین‌و وردبوونەوەیە بریتی‌یە لەلایەنە تیۆری‌یەکەیان دەسکەوتە تیۆری‌یەکان، چونکە ئایدیۆلۆژیا توانای بڕین‌و چوونە ناو تیۆرەکانی زانستە کۆمەڵایەتیەکانی زیاترە وەك لەتیۆرەکانی زانستە وردەکان، هۆکەشی ئەوەیە کەبەهەلومەرجی گشتی پێشکەوتنی کۆمەڵگا ئەوروپیەکانەوە گرێدراوە. لێرەدا بەتایبەتی دەبێت ئەوەی بۆ ژینگەی عەرەبی باشە هەڵبژێرین‌و ئەوەی بێسوودە وازی لێ‌بهێنین‌و، ئەو دەستکاریانە ئەنجام بدەین‌و ئەو کەرەسانەش بدۆزینەوە کەئەتوانرێت بەهۆیەوە تیۆرە تایبەتیەکانی کایەی عەرەبی دابڕێژین کە لەگەڵ چوارچێوەی مێژوویی‌و پێشکەوتنی رۆشنبیریی ئەودا دەگونجێت، ئەمەش بەتەنها ئەرکی توێژەرەوە عەرەبەکانە.

**- راستیەکەی لێرەدا کاری راستەقینە دەردەکەوێت‌و، جیاوازی لەنێوان توێژەرەوە جیدی‌یەکان‌و توێژەرەوە هەلپەرست‌و بەپەلەکاندا دەردەکەوێت..**

بالاندێ: من دەڵێم ئەم قسەیە بەسەر ئەوروپاشدا راست دەردەچێت، باکەمێك سەیری چارەنووسی تیۆری‌یە گەورەکان بکەین کەهەر لەپەنجاکانەوە کاریگەری لەسەر وتووێژە گرنگەکان هەبووە. باسەیری وجودی‌یەت بکەین: تاڕادەیەکی زۆر چووەتە ئۆباڵی مێژووەوە..

**- بەڵام ئایا هیچ پاشماوەیەکی بەجێنەهێشتووە؟**

بالاندێ: بێگومان پاشماوەی بەجێهێشتووە، هەمیشە هەندێ شت دەمێنێتەوەو شتێك لەناو ناچێت. سەبارەت بەمارکسیزم، یان بابڵێین مارکسیزمی نوێ (Neo – Marxisme) هەمان شت روویدا، ئەو مارکسیزمەی کەئالتۆسێر لەماوەیەك لەماوەکاندا کردی بەبونیادگەرایی، چی لەمارکسیەتی ئالتۆسێر مایەوە؟ هیچ. تەنانەت بونیادگەراییش وەك وتمان کات بەجێی هێشت، بێگومان خێڵ‌و هۆزە بچووکەکانی ماوەکە میحرابەکەی ئەپارێزن...کەواتە لەناوەندی فیکری

ڕۆژئاواشدا سەرنجی ئەم دیاردەیە دەدەین: ئەو دیاردەیەی کەتیۆرە گەورەکان یەك ئەوی دی بەبێ وەستان دەردەکات، ئێستاش ئەو شتە سەرسوڕهێنەرو جێسەرنجە ئەوەیە کە (ژان فرانسوا لیوتارد) بەون بوونی حیکایەتە گەورەکان ناوزەدی (15) دەکات: واتا ونبوونی تیۆرە گەورە گشتیو سەراپاگیرییەکان کەجیهان تەفسیر دەکاتو هەموو شتێك تەفسیر دەکات، ئیدی ئەم تیۆرە گشتگیرییانە تەواوبوونو ئێستا توێژەرەوەکان زۆر ناخوازن: بەڵکو لەسەر ئاستێکی تەسکترو هەریەك لەبواری تایبەتی خۆیداو بەشێوەیەکی پراکتیکیو مەیدانی دوور لەشێواندنی تیۆریو قسەی فەلسەفی ڕەهاو سەراپاگیری تیۆریزە دەکەن.

مارکس لەتێزی یانزەی دەربارەی فویرباخ دەڵێ "گرنگ تەفسیکردنی جیهان نیە، بەڵکو گۆڕینیەتی". بەڵام لەم وەرچەرخانە نوێیە مێژوییەی تیایدا دەژین (کەبەدرێژی لەدوا کتێبمدا باسمکردووە) پێموایە دەبێت ئەو تێزەی مارکس بەتەواوی هەڵگێرینەوەو بڵێین: "گرنگ گۆڕینی جیهان نیە، بەڵکو تەفسیرکردنێتی"!

**- ڕاستە. من بەتەواوەتی لەگەڵتدا دێمەوە، بەڵام ڕەنگە ئەم قسەیە بەسەر کۆمەڵگای ڕۆژئاوایی ئێوەدا ڕاست بێت کەچەندین شۆڕشی جۆراوجۆری یەك لەدوای یەکی بینیوەو گۆڕانێکی بنەڕەتی گۆڕراوە لەچاو سەدەکانی ناوەڕاستدا یان تەنانەت سەردەمی کلاسیکیش. لەڕاستیدا هەموو بونیادی ئابوریو کۆمەڵایەتیو خێزانیو ئایینیو سیاسی سەرو ژێربوو.. ڕەنگە ئێستا ئێوە پێویستتان بەکەمێك پشوو هەبێت لەماندوێتی ئەو گۆڕانە یەك بەدوای یەكو خێرایانە، پاشان لەسلبیاتو ئیجابیاتی ئەو ماوە گەورەیەی بڕیوتانە ڕا بمێنن. بەڵام ئێمە، چی بڵێم! ئێمە بێگومان پێویستمان بەتەفسیرکردنو شیکردنەوەی بارودۆخی خۆمان هەیە (ئەوەی بەتوندی داوای ئەمەمان لێدەکات کەوتنی زۆربەی سیاسەتەکانی گۆڕەپانەکەیە)، بەڵام دیسانەوە گۆڕا نمان لێدەخوازێت. زۆر لەو بارودۆخەی تیایداین هەروەك سەدان ساڵ لەمەوپێش وایە. من لێرەدا تەنها بیر لەنوێکردنەوەی کشتوکاڵو هێنانە ناوەوەی پیشەسازیو مەکینەی نوێ ناکەمەوە، هەروەها بیر لەگۆڕینی عەقلیەتو میتۆدو جیهانبینییەکانو پەیوەندی مرۆڤ بەئایینەوەو.. هتد دەکەمەوە.**

بالاندێ: بێگومان. بەڵام سەرنجبدە چۆن جیهانی دەوروبەرمان دەگۆڕێت، دەبینیت بەتەنها ناگۆڕێت بەڵکو لەهەموو شوێنێکدا بەکێشەی خوێناوی دەتەقێتەوە! ئەمە مانای ئەوە نیە کەهەمیشە بەشێوەیەکی ئیجابی دەگۆڕێتو، ئێمەش دەکەوینە ژێر کاریگەری ئەم گۆڕانە گەورانەو، خۆمان بەبێ چەك دەبینینەوە. بەڵام سەبارەت بەکۆمەڵگاکانی ئێوە دەڵێم: دینامیکیەتی تایبەتی خۆی هەیەو، وەستاو و نەگۆڕنیە، سەرنجبدە ئێستا بەهۆی ئایین، یان ئایدیۆلۆژیای ئایینییەوە دەبوژێنرێتەوەو چالاکدەکرێت..

**- بەڕای تۆ هۆی ئەمە چییە؟**

بالاندێ: کاتێك واز لەفیکری نوێگەری دەهێنرێت گەڕانەوەیەك بۆ بنەماو دەقەکانو یادەوەری مێژوویی دروست دەبێت، ئێستاش چینی ژێرەوەی (16) یادەوەری بەکۆمەڵ بەهەموو هێزی خۆی دێتە سەرەوە، چونکە قۆناغی رابردوو هەوڵیدا باز بەسەریدا بداو، بەبێ ڕووبەڕووبوونەوەو بەبێ ئەوەی گرفتەکانی بەشێوەیەکی سروشتیو مێژوویی ماقوڵ بخاتەڕوو، بیسڕێتەوە. ئەم چینە ڕۆژێك لەڕۆژان لاواز نەبووە، بەڵکو نووستوو بووەو، ئێستا بەهۆی گونجانی بارودۆخەوە هەڵدەستێتو، لەهەستانیدا خەفەبوونی مێژوو دەتەقێتەوە. ئایا ئەم تەقینەوەیە نێگەتیفەیان پۆزەتیفە؟ ئەمە

مەسەلەیەکی دیکەیە کەئێستا حوکمی بەسەردا نادەم.

بەڵام لەلایەکی دیکەوە دەبینین کۆمەڵگاکانی ئێوە زۆر جوڵاوەو لەسەدەو نیوێکەوە گۆڕاوە (1830—1980). هێنانە ناوەوەی تەکنیكو ئەنجامدانی ئەو پرۆسانەی کە لەگەڵ ژینگەی عەرەبیدا دەگونجێتو، ڕوودانی زۆر بزوتنەوەی سیاسیو، بەریەککەوتن بەهەموو ئیجابیاتو سلبیاتەکانیەوە لەگەڵ دەرەوەدا، پاشان ئێستا گفتوگۆ دەربارەی سیستەمە سیاسی یەکان دەکرێتو هەستکردن بەپێویستیبوونی شێوەی دیموکراتیتر وەك لەوەی ئێستا هەیە.

**- زۆرجار وا هەست دەکەم ئەوەی لای ئێمە ڕوودەدات تاڕادەیەك لەو بزوتنەوانە دەچێت کە لەڕۆژئاوادا پێش دوو سەدە یان سێ سەدە ڕوویداوە: مەبەستم لەو هەموو ژانو ئازارانەیە کە لەگەڵ دەرکەوتنی مۆدێرنیزمدا هاتن‌و، ئەو عەقلانیەت و تێڕوانینە بۆ بوون کە لەگەڵ جیهانبینی کۆندا کەوتنە کێشەوە...**

بالاندێ: ئەمە ڕاستە. بەلای منەوە (کەپرسی مۆدێرنیزم زۆر سەرقاڵم دەکات) دەبینم ئەوروپاو بەتایبەتی فەرەنسا سێ‌جۆری یەك لەدوای یەکی مۆدێرنیزمی عەقڵیو مادی بینیوە، ئەمە دەڵێم بێ‌ئەوەی بکەومە ناو بۆسەی فەلسەفەی پەرسەندن (17)و مێژووگەرایی‌یەوە کەلەسەدەی نۆزدەدا باوبوو: قۆناغی یەکەم: لەسەدەکانی ناوەڕاستەوە تا سەردەمی ڕێنیسانس دەستپێدەکاتو دواجار لەقۆناغی فیکری سکۆلایی (قوتابخانەیی) دووبارە بووەوە بۆ قۆناغی فیکری زانستیو پۆزەتیڤی دەگوێزرێتەوە.

**- ئەم قۆناغەش لەگەڵ ساتەکانی دیکارتیدا هاوکات بوو؟**

بالاندێ: بێگومان. بەڵام جگە لەدیکارت کەسانی دیکەش هەبوون، بۆ نموونە لێرەدا سەبارەت بەسیاسەتو فاکتەری سیاسیو شوێنەوارەکانی بیر لەماکیا ڤیللی دەکەمەوە، هەروەها بیر لەو تازەگەری‌یە زانستیو تەکنەلۆژیانە دەکەمەوە کە لەو ساتەوە خۆیان سەپاندووەو، بیر لەگەشەکردنی بیناسازیو شارەکانو، کارگەو سەرمایەو.. هتد دەکەمەوە. ئەمانە هەمووی وەرچەرخانێك بوون لەمێژووی ڕۆژئاوادا، ئەم وەرچەرخانەش دەکەوێتە نێوان سەدەی پانزەو شازدەوە.

قۆناغی دووەم یان نوێگەری دووەم ئەو قۆناغەیە کەبزوتنەوەی ڕۆشنگەری لەسەدەی هەژدەدا هێنایە کایەوەو لەشۆڕشی گەورەی فەرەنسی‌دا لوتکەی گرت کەپێش ئەمیش شۆڕشی ئینگلیزی هەبوو. لێرەدا خۆمان لەبەردەم وەرچەرخانێکی گەورەدا دەبینینەوە کە ئەکەوێتە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەو سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەوە(18)، کەتیایدا بزوتنەوەکانی فیکر بەهۆی زانستو تەکنیکەوە دۆزرایەوەو لەسەر شێوەی ئایدۆلۆژیای پێشکەوتن تەعبیری لەخۆی کرد. ئەم وەرچەرخانەش بووە هۆی ڕووکردنە دیموکراتیەت یان ئەوەی کە(تۆکفیل) بەپێویستی یەکسانبوونی شانس لەنێوان مرۆڤەکاندا (هاوتابوونی هەلەکان) ناو زەدی کرد، ئەمەش بریتی‌یە لەنوێگەری دووەم.

**- مەبەستت ئەوەیە کەئەوە بووە پاڵپشتو تەواوکەری نوێگەری یەکەمو، دابڕانێکی لەگەڵدا دروست نەکرد( 19 )؟**

بالاندێ: بێگومان بەو مانا حەرفی‌یەی وشەکە بریتی نەبوو لەدابڕان، بەڵام وەرچەرخانێکی دیکە بوو لەمێژووی ڕۆژئاوادا. دەسکەوتەکانی نوێگەری یەکەمی بەکارهێناو سوودی لێوەرگرت، لەهەمان کاتدا دابڕانو درێژە پێدان بوو.

پاشان نوێگەری سێیەم (بەگشتی لە 1950)ەوە هات: ئەمیش ئەو قۆناغەیە کەئەمڕۆ تیا دەژین، کەبەتەقینەوەی تەکنیکە ئاڵۆزە هەمەجۆرەکان و، چاوخشاندنەوە بەکارکردنی تەقلیدی فاکتەرە سیاسیەکاندا دەناسرێتەوە، ئەم سێ قۆناغی نوێگەرییە بەگشتی بەم خەسڵەتانەدا جیا دەکرێنەوە:

1- بریتییە لەقۆناغەکانی وەرچەرخان و گۆڕان (= دابڕانی مێژوویی یان ئەپستمۆلۆژی).
2- لەم قۆناغانەدا جارێکی دیکەو بەزاراوە تەواو نوێیەکان، گرفتەکانی راڤەکردن و چالاکی رۆشنبیریی و فیکرو ئەفراندنی هونەری و حوکم و سیاسەت دەخرێنەوەڕوو.
3- لەم تێڕوانینەی پێشووەوە دەبینین ئەو نوێگەرییەی لەناوچەکانی دەرەوەی رۆژئاوای رۆژئاوادا یان رۆژئاوای رۆژهەڵاتدا (مەبەستم یەکێتی سۆڤیەت و دەوڵەتانی چواردەوریەتی) دێتەدی، ئەو گرفتانە دەخەنەڕوو کەبەشێوەیەکی بنچینەیی لەگرفتەکانی لای ئێمە جیاوازنین. تەنانەت ئەگەر پێتان وابێت لەقۆناغی پێکهێنانی نوێگەری دووەمدان (واتا وەرچەرخانی 19/18، وەرچەرخانی رۆشنگەری) نەك سێیەم، ئەوا ئەمە هیچ لەمەسەلەکە ناگۆڕێت، هۆیەکەشی ئەوەیە ئێمە لەجیهانێکی بەناچار پێکەوە گرێدراودا لەڕێی کەرەسەکانی راگەیاندن و ئاڵوگۆڕە ئابوری و سیاسییەکان و، گواستنەوەی کەسەکان لەوڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی دیکەو لەکیشوەرێکەوە بۆ کیشوەرێکی دیکە بەفڕۆکە، دەژین.

-هەروەك لەیەكێك لەکتێبەکانمدا وتم جیهان بووەتە "گوندێکی گەورە"، ئێمە لەجیهانێکدایین هەموو شتێك پەیوەندی بەشتەکانەوە هەیەو، ئاجار شوێنەوارەکانی نوێگەری سێیەمی رۆژئاوا لی خۆی لەسەر ئێوەش پیادە دەکات.

**بەڵام ئێمەی عەرەب خۆمان لەبەردەم ئەوەدا دەبینینەوە کەدەبێت بەیەکجار بچینە ناو هەرسێ نوێگەرییەکەوە لەکاتێکدا لای ئێوە پلە پلەو لەماوەیەکی دوورودرێژدا هاتۆتەدی. ئایا بەڕای ئێوە ئەمە تەفسیری رادەی ئەو ئازارو ژانە توندانە یان گرگرتووانە ناکات کە ئەمڕۆ ناوچەکەی ئێمە تیایدا دەژی؟**

بالاندێ: بێگومان. بەڵام ئێوە ئێستا لەقۆناغی تازەگەری یەکەم تەواوبوون، ئەمە لەکاتێکدا کەدووەم هێشتا تەواو نەبووەو، ئەمڕۆ لەگەڵ نوێگەری سێیەمدا تێکەڵ بووە، پێموایە تۆ مەسەلەکان بەشێوەیەکی باش هەڵدەسەنگێنیت، یان هیچ نەبێت هەست بەمە دەکەم، چونکە زانیاریم سەبارەت بەوڵاتە عەرەبییەکان زۆر نیە تا ئەو رادەیەی بتوانم لەم بوارەدا بەتەواوی رای خۆم بدەم، بەڵام پێموایە وێناکردنی تۆ بۆ شتەکان راستن.

سەبارەت بەکات و پەرەسەندنی پلەیی گەلان ئەوا حەزدەکەم پێت بڵێم کەیەکێتی سۆڤیەت لەسەر زمانی خرۆتچۆف رایگەیاند کەلەماوەی 20-30 ساڵدا بەئەمریکا دەگاتەوە، بەڵام ئەمە نەهاتەدی. تەنانەت چینی میللیش رایگەیاند کەلەنزیکترین کاتدا لەڕووی پێشکەوتنی مادی و تەکنەلۆژییەوە بەئاستی رۆژئاوا دەگاتەوە، بەڵام ئەمڕۆ ئەوە نالێت و، واقیعیانەتر بووەو دەڵێ مەسەلەکە کاتێکی درێژتری دەوێت. پێم وایە ئێمە بەشێوەیەکی دی بۆ ئەو گرفتە دەگەڕێینەوە کەلەسەرەتادا وروژاندمان واتا: گرفتی دیموکراتیەت و چۆنێتی پێکهێنان و چەسپاندنی بەشێوەیەکی پلەیی. هیچ شتێك لەمێژوودا بەبێ رەچاوکردنی کات روونادات و دەرەوەی ئەمەش جگە لەسیحرو ئایدیۆلۆژیا هیچی دیکە نیە. بێگومان ئەمە بانگهێشت نیە بۆ دۆگماو وەستان! پێموایە باش تێم دەگەیت. من دەڵێم: دەتوانین پەلە لەکاتدا بکەین بەڵام ناکرێت

مەسەلەی کات پشتگوێ بخەین‌و قورسایی واقیع و مێژوو بدەین بەزەوی‌دا، لەبەرئەم هۆیە ئێستا کار لەسەر مەلەسەی کات (La Temporalite) دەکەم.

**- لەم ماوەیەی دواییدا ( پۆل ریکۆر ) کتێبێکی گەورەی لەسێ بەشدا دەربارەی ئەم بابەتە بڵاوکردۆتەوە( 20 ).**

بالاندێ: بەڵێ. لەو کتێبەدا دەربارەی هونەری گێڕانەوەو حیکایەت یان "کات‌و حیکایەت" (Tempset re'cit) زۆر بەباشی دەربارەی ئەم بابەتە دەدوێت، بەڕای منیش دەبێت جارێکی دیکە سەرلەنوێ بیر لەم مەسەلەیە بکرێتەوە.

**- هەرچۆنێك بێت پێموایە گرفتی نوێگەری لەکۆمەڵگا ڕۆژئاواییەکانی ئێوەدا هەمان ئەو گرفتە نیە کە لەکۆمەڵگا عەرەبییەکانی ئێمەدا هەیە. ئێوە خاوەنی ناوەندێکی بەهێزی ئابورین‌و، شارەزاییەکی مێژوویی‌و سیاسی درێژتان هەیە، سەرەڕای ئەمەش لەسەر ئاستی نێو دەوڵەتی پێگەیەکی باڵادەست داگیردەکەن. بەڵام ئێمە لەقەیرانێکداین کەهێشتا لەبەڵگەنەویست‌و سەرەتای کارەکان دەدوێ‌و، وای بۆدەچم لەڕوانگەیەکی بینراویشدا ئاسۆکانی داخراون..**

بالاندێ: وەك لەدوا کتێب (وەرچەرخان)دا وتومە نوێگەری بریتی‌یە لەتۆژینەوەیەکی زۆر پەرش‌و بڵاوو هەمەلایەن. بەڵام راستە گەر بوترێت کۆمەڵگا ئەورووپی‌و ڕۆژئاواییەکانی ئێمە بەگشتی جیاوازیەکی گەورەی هەیە کەئەویش خۆی لەهێزی تەکنیکی و ئابوری‌دا دەبینێتەوە، هەر ئەمەشە وادەکات - سەرەڕای قەیرانی ئابوری‌و تراژیدیای بێکاری - لەبەردەم "لێدانەکانی" نوێگەری یان هێرشەکانی نوێگەری‌دا خۆڕابگرێت، لەبەرئەمە باری ئێمە هەر بەباشی دەمێنێتەوە چونکە ئێمە ماوەیەکی دوورە خاوەنی ئەم بنەما پتەوانەین، بەڵام سەبارەت بەکۆمەڵگاکانی ئێوە ئەوا پێویستە لەسەریان کە لەیەك کاتدا بنەما ئابوری‌و تەکنەلۆژی‌یەکانیان بینابکەن‌و لەهەمان کاتیشدا بەرپرسیارێتی چارەسەرکردنی گرفتەکانی نوێگەری لەئەستۆ بگرن !...

ئەمەش بارودۆخێکی زۆر سەخت‌و هیلاك کەرەو رووبەڕووبوونەوەیەکی گەورەیە.

**- هەندێك لەئابوری ناسە گەورەکان لەم دواییەدا ئەوەیان وت قەیرانی ئابوری کە لە ساڵی ( 1973 )ەو دەستپێیکردووە پتر لە پشتی جیهانی سەرمایەداری ڕۆژئاواوەیە وەك لەوەی لەبەردەمیدا بێت. بەمانایەکی دی ئەم قەیرانە گەیشتۆتە لوتکەو هەرئەوە ماوە وردە وردە بچوك بێتەوە. ئایا راتان سەبارەت بەم بابەتە چی‌یە؟**

بالاندێ: ماوەیەکی درێژە وا دەڵێن، زۆر ئەوە رادەگەیەنن کە: کۆتایی تونێلەکە دەستی پێکردووەو، بەدڵنیاییەوە لەساڵی داهاتوودا گەشەکردنێکی ئابوری دەست پێدەکات.. پێموایە گرفتی نوێگەری وامان لێدەکات یان پێشبینی بەداهاتووەوە بکەین‌و ئەوکاتەش راستگۆیی لەدەست دەدەیت، چونکە رەنگە داهاتوو تووشی بێ‌هیوایمان بکات‌و بەپێچەوانەی پێشبینی‌یەکانمانەوە بێت، یان دەبێت شتەکان بەشێوەیەکی عەقڵانی ببینین ئەوکاتەش لێدوانمان بۆ ئاسۆکانی داهاتوو و نەبینراوەکانی وریایانەتر دەبێت. لەدوا کتێبمدا خۆم لەم بابەتە داوەو وتومە "نوێگەری قەوارەیەکی بێ‌شومار لەنەزانراو بەرهەم دەهێنێت"، ئەو نەزانراوانەش بەڕادەی نەزانراوی ئەو وڵاتانەیە کەجاران زانا ئەنترۆپۆلۆژی‌یەکان گەشتی دۆزینەوەیان بۆ دەکرد. هەروەها وتم یەکەم ئەرکێك کە پێویستە پێی هەستین بریتی‌یە لەوێنەکێشانی نەخشەکانی نوێگەری: واتا وێنەکێشانی نەخشەی ئەو شوێن‌و بۆشایی‌و شتانەی کەبەقوڵی نوێگەری گۆڕیونی. پێویستە لەمانە هەمووی بکۆڵینەوەو

راڤەی بکەین، ناتوانین لەم دیاردانەی ئێستا لەسەر رووکاری کۆمەڵگاکانمان تێبگەین ئەگەر بەم کارە هەڵنەستین: واتا مەبەستم لەهێرشی وێنە نوێیەکان (لەراگەیاندنو، پروپاگەندەو، مانگی دەستکردو، ... هتد)و سیستمی زانیارییەکانە کەهەموو لایەنەکانی ژیانمان داگیرکردووە. هەروەها دەبێت لەوەی ناوم برد بەکۆتایی سیاسەتو، گەڕانەوەی پیرۆزکردن یان "ئایین" بەشێوازی درندانە (واتا لەدەرەوەی کەناڵە رەسمییەکانو دەزگا شەرعییەکانی کڵێسا) بکۆڵینەوە، خۆت دەزانیت لەکۆمەڵگا رۆژئاواییەکانی ئەورووپیو ئەمریکیدا بڵاوبوونەوەیەکی ترسناکی "هۆزەکان" (21) (Les Sectes) هەیە.

پێویستە ئەوە بوترێت کەئێمەش خاوەنی گروپە دەمارگیرو وشکەکانین، بەڵام تەوژمێکی بەرفراوانو بەهێز لەچاو سەرجەم کەرتەکانی کۆمەڵگادا دروست ناکەن، بەڵام شتی بەهێز ئەو هەوڵی جوانکارییە (Bricoluge) ئایینی یانەیە کەلێرەو لەوێ سەرهەڵدەدەنو بە"هۆزەکان" ناودەبرێن.

ئێستاش ماوەیەکی زۆر نیە گەڕانەوەیەکی بەرچاوی کڵێساکان هەیە گەڕانەوەیەکی لاوان بۆ کڵێساکان هەیە، لەکاتێکدا ئەمە جاران نەبوو، هەرچەندە ئەم گەڕانەوەیە زۆر گەورە نیە، بەڵام گەڕانەوە هەیەو، پێش بیست یان بیستوپێنج ساڵ لەمەوبەر لەکۆمەڵگاکانی ئێمەدا ئەمە نەدەبینرا. دواجار سەبارەت بەئایینو ئەم گەڕانەوەیە وشەیەك دەڵێم: من گەڕانەوەی ئەم فاکتەرە ئایینییەم زۆر پێ سەیر نیە، چونکە لەکاتێکدا نوێگەری ئەورووپی بەهاکان پێشێل دەکاتو، پێدراوەکان سەروژێر دەکاتو نەخشەو پنتەکان دەگۆڕێو، تیۆرییە گەورە شرۆڤەکارییەکانی جیهان تێك دەشکێنێ، ئەوا "گرفتی مانا" زۆر بە توندی خۆی ئەخاتەروو.

ئەگەر سەیری مێژووی درێژی مرۆڤایەتی بکەینو بپرسین: ئەو شتە چییە کەمانا دەبەخشێتو ئەوەی مانا بەبەری بوونی مرۆییدا دەکات؟ ئەوا وەڵامەکە بریتییە لە: ئایین. واتا ئەوە ئایینە کەدوا مانا بەبوونی مرۆڤ لەسەر زەویدا دەبەخشێت.. ئایین ناوکێکی پتەوو توندوتۆڵی مانا پێشکەشدەکاتو بەسەر سەرچڵییە فەردیو بەکۆمەڵەکانی مرۆڤدا دایدەبڕێت. کەواتە ئێستا ئێمە لە ڕێی بوونمانەوە بۆ مانایەك بۆ بوونمان لەناوەراستی ئەو نوێگەرییە گرگرتووەدا دەگەڕێین، لەبەرئەوە زۆر کەس بۆئەوەی مانایەك بۆ بوونیان بدۆزنەوە دەگەڕێنەوە بۆ کڵێسا یان ئایین. ئەمە سەبارەت بەو کۆمەڵگایانەی ئێمە کەلەرووی ئابووریو مادییەوە تێرو تەسەلن، بەڵام سەبارەت بەکۆمەڵگاکانی ئێوە ئەوا رەنگە هۆیەکی دیکەش هەبێت ئەویش: داخرانی ئاسۆ ئابوورییەکانو، نەبوونی ئەو چوارچێوە کۆمەڵایەتیو سیاسییە پێویستەیە بۆ خستنەگەڕو بەشداریکردنی لاوان لەجوڵەی مێژوودا.

**- ئایا بەڕای تۆ رۆژئاوا هەڵەی کرد کاتێك جیهانی خۆی لەفاکتەری ئایینیو پیرۆزی بەتاڵکردەوە؟ هەموو ئەمانەش لە پێناوی سەرخستنی فاکتەری بایۆلۆژیو ئابووری بەرخۆری و بەتەواوەتی جەخت کردنە سەرچێژی مادیو لەزەت کەجگە لەخودی خۆی هیچ مەبەستێکی دیکەی نیە...**

بالاندێ: من باوەڕم بەمە هەیەو، پێموایە بەردەوام بوونی کڵێساو دەزگای رەسمی کڵێسا بەهەموو کارمەندە قەشەکانیەوە شتێکی باشترە، چونکە قەشەگەرێتی (الکهنوت) بەلای منەوە بریتییە لەپیشە وەك پیشەی پزیشکی یان ئەندازیاری یان فێرکردن،... هتد. پیشەیەکە پێویستی بەزانینی هەندێك پیادەکردنی تەکنیکی هەیە: وەك بەڕێوەبردنی کاروبارە ئایینییەکانو

یاریکردن (نەك بەمانا نێگەتیڤەکەی بەڵکو بەمانا بێلایەنەکەی) بەکاڵا ڕەمزییەکەیو بەڕێوەبردنو بەکاربردنی ئەم کاڵا ڕەمزیو ڕۆحییە.

دەڵێم باشتر وایە ئەم کارە لەڕێگەی پیشەگەرو کارمەندە تایبەتمەندەکانی پیاوانی ئایینەوە بەڕێوەبچێت، وەك لەوەی لەڕێگەی ئەو هۆزە دڕندەو کۆنترۆڵ نەکراوانە بەڕێوەبچێت، کەلێرەو لەوێ وەك ڤایرۆس بڵاودەبنەوەو کوڕو کچەکان لەخێزانەکانیان دەکەن.

**- بەڵام لێرەدا جیابوونەوەی ئایین لەدەوڵەت ناخەینە ژێر گومانەوە، واتا ئەوەی لە ڕۆژئاوا پێی دەوترێت مەسەلەی عەلمانە؟...**

بالاندێ: نەخێر بەهیچ شێوەیەك! عەلمەنە دەسکەوتێکی بنەڕەتییەو بەهیچ جۆرێك پاشەکشەی لێناکرێتو، ڕازی نیم بەپاشگەزبوونەوە. عەلمەنە یەکێکە لەدەسکەوتەکانی نوێگەری دووەم. نوێگەری یەکەم لەچاو سەردەمە سکولاییەکاندا (قوتابخانەگەرایی) کە لەسەدەکانی ناوەڕاستدا زاڵ بوو، هەروەها لەچاو ڕاڤەکردنی تیۆلۆژی (ئایینی) دیاردەکاندا ئازادییەکی فیکریی بەدەستهێنا، کەئەمەش لەسەردەمی ڕێنیسانسدا بوو، بەڵام نوێگەری دووەم بووە هۆی جیاوازی لەنێوان ئەو بوارەی کەتایبەتە بەقەیسەرو ئەو بوارەشی کەتایبەتە بەخودا، سەدەی نۆزدەش سەرکەوتووانە سەدەی عەلمانیەت بوو.

**- ئێستا ئێمە لەو ڕووبەڕووبوونەوە گەورەیەدا دەژین کەخۆی لەئەنجامدانی نوێگەری دووەمدا دەبینێتەوە: واتا چۆن دەتوانین کۆمەڵگا بکەین بەدوو دنیاوە، دنیایەك بۆ ژیانی مەدەنیو کۆمەڵایەتی، دنیایەك بۆ ژیانی ئایینیو ڕۆحی، و چیدی هەموو جارێك ئەمە تێکەڵ بەوی دی نەکەین، یان ئایین تەنها وەك کەرەسەیەکی سیاسی بەکاربهێنین..**

بالاندێ: پێموایە ئێوە دەتوانن ئەمە بەدی بهێنن بەپێچەوانەی بانگەشەی هەندێك لەو چاودێرانەی لەدەرەوەی ئیسلامن. ئەو چاودێرە دەرەکیو ڕۆژنامەنووسە ئەوروپیانە کۆمەڵێك زانیاری زۆر سەرپێیان دەربارەی ئیسلام هەیەو، سڵ لەدەرکردنی ئەو حوکمو گشتگیریو کلێشە دووبارە بووانە ناکەن دەربارەی ئیسلامو کۆمەڵگا عەرەبییەکان. ئەوانە جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کەئیسلام ئاینێکە جیاوازی لەنێوان فاکتەری سیاسیدا ناکاتو بەهیچ شێوەیەك بەمە ڕازی نابێت، دواجار دەگەنە ئەوەی بڵێن دژ بەپێشکەوتنو پەرەسەندنە. لەکاتێکدا ئەمە دەزانین کە ئیسلامیش وەکو مەسیحیەت هەر لەهەمان زەویو ژینگەدا دروست بووە، لەبەرئەوە دەتوانین هەمان شت سەبارەت بەکاسۆلیکیەت یان مەسیحیەت بڵێین کەلەساتەکانی مێژووییدا ئەم دووانەی تێکەڵ کردووە و هەمان شتی کردووە. ئینجا پاش ئیمپراتۆر کۆستانتین چی ڕوویدا؟ بەدرێژایی سەدەکانی ناوەڕاست لەڕۆژئاوادا چی ڕوویدا؟ بەدرێژایی فەرمانڕەوایی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی - جێرمانی چی ڕوویدا؟ هەمان شت ڕوویدا وەك ئەوەی لەسایەی سیستمی خەلافەتو دەسەڵاتدارێتی عوسمانی لای ئێوە ڕوویدا... کەواتە. لەڕووی ئەزموونی مێژووییەوە هیچ جیاوازییەکی جەوهەری لەنێوان ئایینو کۆمەڵگا لای ئێمەو، ئایینو کۆمەڵگا لای ئێوە نیە، میرو پادشا ئەوروپییەکانیش بەئارەزووی خۆیان ڕازی نەبوون بەجیابوونەوە لەدەسەڵاتی ئایینی، چونکە ئەمە ڕەوایەتییەکی گەورەی پێ دەبەخشین کە بەهیچ نرخێك ناپێورێ. ڕەنگە بزانیت پادشاکانمان - پادشاکانی فەرەنسا - ڕەوایەتی ئایینی خۆیان پێش نیشتەجێکردنیان لەسەر کورسی لەئەنجامی سرووتێکی ئایینییەوە وەردەگرت کە لەکڵێسای شاری ڕانس (Reins)

بۆیان دەکرا. ئەوکاتە پیرۆزی خوداو رەوایەتی خواوەندیان دەستدەکەوت‌و، کاردینالی گەورەی فەرەنساش ئامادەی ئەم ئاهەنگە دەبوو. جیابوونەوەی نێوان هەردوو دەسەڵاتی ئایینی‌و سیاسی تەنها بەهاتنی ئەو دابڕانە گەورەیەی کەسەدەی هەژدەی لەسەدەی نۆزدە جیاکردەوە دروست بوو: واتا شۆڕشی فەرەنسی. سەربڕینی پادشا لویسی شانزە مانای رووداني دابڕانە لەگەڵ سەرجەمی جیهانی تیۆلۆژی سەدەی ناوەڕاست، کاتێك ئێمە سەری پاشامان بڕی وەك ئەوە وابوو لەیەك کاتدا ئەو شکۆ رەمزی‌و پیرۆزی‌یە ببڕین کەکڵێسا بەکەسێتی ئەوی بەخشیوە. ئەم پیاوە بەستەزمانە واتە لویسی شانزە کوژرا، تا ببێتە قۆچی قوربانی‌یەکی ناچار، یان بەلانی کەمەوە مێژوو بەم شێوەیە رۆیشت. ئەمە مەسەلەیەکی گەورەیە‌و عەقڵی تیادا ون دەبێت. سەبارەت بەمن، هەروەك لەناو فیکری فەرەنسی‌دا هەوڵی دامەزراندنی ئەنترۆپۆلۆژیای سیاسیم داوە، لەسەرەتاوە جەختم لەسەر گرنگی خەیاڵ (المخیال) لەداڕشتنی کاری سیاسی‌و دیاردەی سیاسیدا کردووە، ئەمە شتێکی زۆر گرنگە. ئەمەش دەمانگەیەنێتە دۆزینەوەی ئەو پێوەندی‌یە توندو تۆڵانەی لەلایەك لەنێوان فاکتەری پیرۆزکردن‌و لەلایەکی دیکەوە لەنێوان فاکتەری سیاسیدا هەیە، کارگەیشتە ئەوەی بڵێم: پێویستە کڵێسا لەدەوڵەت جیا بێت، بەڵام هێشتا شتێك لەپیرۆزی لەسیاسەتدا دەمێنێتەوە!... ئەمە شتێکی حەتمی‌یە، چونکە ئەگەر وانەبێت سیاسەت "کارناکات"و بەردەوام نابێت...

**-ئەمەش بەشێوەیەکی تایبەتی لەکتێبەکەتدا "دەسەڵات لەسەر شانۆ"دا کە لەسەرەتای ئەم لێدوانەدا باسمان کرد جەختت لەسەر کردەوە...**

بالاندێ: بێگومان. لەوێدا گوتومە هیچ سیاسەتێك بەبێ دەرهێنانێکی شانۆگەری‌یانە یان دەرهێنانێکی سینەمایی‌و بەبێ دراماتیك بوون‌و بێ‌ئەو سرووت‌و دیاردەو شکۆیانەی کەترس‌و تۆقاندن ئەوروژێنن، بوونی نی‌یە. دەسەڵات شتێکە "پتر" لەدەسەڵات، شتێکی تەواو جیاوازە لەوەی خەڵك‌و تەنانەت فەرمانڕەواکان خۆشیان ئەزانن. لەهەموو شوێن‌و کاتێکیشداو لەژێر هەموو ئاسمانێکدا دەبینین سیستمەکان کۆتاییان دێت، بەڵام "فەرمانڕەوایەتی شانۆگەری‌یانە" دەمێنێتەوە دەبینین دەبێت حاکم لەسەر شێوەی ئەکتەرێکی سیاسی هەڵسوکەوت بکات تا دەست بەسەر دەسەڵاتدا بگرێت‌و پارێزگاری لێ‌بکات. هەروەها دەبێت ئەو وێنەیەی لەبارەیەوە دروست ئەکرێت‌و ئەو شوێنەوارەی دروستی دەکات لەگەڵ ئارەزووی رەعیەت‌و جەماوەردا بگونجێت.

حاکم ناتوانێت حوکم بکات ئەگەر دەسەڵات رووت بێت، واتە پێویستە دەسەڵات پەردەپۆش‌و دەمامکراو بێت‌و، بەشێوەیەکی جیا لەوەی هەیە دەربکەوێت‌و، زۆر شتی ناڕاست بخاتەوە. دەسەڵات بریتی‌یە لەشانۆ: بڕوانە ساتی گرتنەدەستی، بڕوانە میر یان پادشا لەئاهەنگی دانانیدا چۆنەو، چۆن بالادەستی ئایینی لەپێناو رەوایەتیدا پێ‌دەبەخشرێت. بڕوانە هەموو دیاردەکانی شکۆداری‌و مەزنی‌و پاشان ئەو شوێنەوارە سایکۆلۆژیانەی کار لەسەر دەروونی بینەرو هاوولاتیان دەکات. بەمانایەکی دیکە خەیاڵ رۆڵێکی گەورە لەکارکردنی میکانیزمەی دەسەڵاتدا دەبینێت، ئەکتەری سیاسی گەورەش (= قارەمانی بەهێز، سەرۆکی گشتی،... هتد) ئەو کەسەیە کەدەزانێت چۆن بەهۆی خەیاڵەوە واقیع بەڕێوەببات. دواجار دەڵێم دەسەڵات لەهەموو کۆمەڵگا مرۆیی‌یەکاندا پەیوەندی‌یەکی بەپیرۆزی‌و رەگەزی ئایینی‌یەوە هەیە. تەنانەت کۆمەڵگا نوێ‌یە رۆژئاواییەکانی ئێمەش. بڕوانە ئاهەنگی دانانی سەرەك کۆماری فەرەنسا، کاتێك میتیران گوتاری "عەرش" یان وەرگرتنی دەسەڵات

لەدەستی (جیسکار دیستان) پێشکەش دەکات، تۆپەکانی ناو باخی (تۆیلەری) گوللەکانی خۆی دەتەقێنێت بۆ دروست کردنی شکۆمەندی و پاڵپشتیکردنی گوتاری رەسمی سەرۆکی گەل و، پاشان بەسواری ئۆتۆمبیلێکی کراوە هەموو شەقامەکانی (شانزیلزێ)تا(کەوانی سەرکەوتن) دەگەڕێت و، سەردانی "پانتیۆن" دەکات کەگۆڕی مەزنەکانی فەرەنسای تیادایەو دەچێتە خواری خوارەوە و لەبەردەم گۆڕی سەرکردەی بزوتنەوەی سۆشیالیستی فەرەنسی "گۆریس"دا سەردادەنەوێنێت هەموو ئەمانەش لەتەلەفزیۆنەوەو بۆ بەردەم چاوی ملیۆنان بینەر خولەك بەخولەك دەگوێزرایەوە..

**- ئەو شتەی کە لەگۆڕەپانی عەرەبی - ئیسلامیدا سەرقاڵمان دەکات بریتی یە لە پەیوەندی نێوان دەسەڵات و رەوایەتی یان باڵادەستی ئایینی. هەندێك گروپی سیاسی هەن کەرەوایەتی ئایینی بۆ خۆیان قۆرغ دەکەن و بەهەموو ناڕاستەکانی دیکە دەڵێن: هەمووتان بێدەنگ بن! ئەوە ئێمەین کەنوێنەرایەتی رەوایەتی باڵای پیرۆزی دەکەین و ئێوە نوێنەرایەتی هیچ شتێك ناکەن.. لەبەرئەوە ملکەچی ئێمەبن و لەگۆڕەپانەکە دەرکەون...**

بالاندێ: لەڕاستیدا ئەو گروپانەی باسیان دەکەیت و ئێستا گۆڕەپانەکەیان داگیرکردووە، لەبەرئەوەیە کەهەلومەرج لەبەرژەوەندیانە، و ئەگەر بشێت خۆیان بۆخۆیان یاسادانەرن، بەڵام پێویستە ئێوە لەرەخنەگرتنتاندا سۆسیۆلۆژی بن، مەبەستم ئەوەیە دەبێت رەهەندی سۆسیۆلۆژی بهێننە ناو تەفسیرو راڤەکردنەکانەوە. ئەوەی ئێستا لای ئێوە روودەدات دیاردەیەکی زۆر بەچێژە بۆ زانای ئەنترۆپۆلۆژی: ئەمە ئاماژەیە بۆئەوەی "کەهێشتا دابڕینی رەوایەتی بەسەر شتەکاندا بەهۆی پیرۆزکردن و فاکتەری ئایینی یەوە چەکێکی کاریگەرە، هەروەها دابڕینی رەوایەتیەك بەسەر خود دا بەهۆی دەقە بنەڕەتیەکانی ئیمانەوەو، پاشان قۆرغکردنی ئەم دەقانە".

ئەمە ئەو شتە گرنگەیە کەپێویستە راڤەبکرێت و لێی بکۆڵرێتەوەو، پێویستە ئەم دیاردەیە رەچاوبکەن، ئەمەش نەك بەمانای سەرسوڕمان و ترسان و پاشگەزبوونەوە لێی، چونکە دەتوانن ئەوە بسەلمێنن کەئەمە تاکە سەرچاوەی رەوایەتی نی یە، لێرەدا داگیرکردنێکی زۆرە ملێیانەی رەوایەتی هەیە. بۆ نموونە - ئەگەر وامان دانا - کەبەڕاستی رەوایەتیەکی ئایینی هەیە، ئەوا ئەوکاتە نابێتە موڵکی یەك کەس یان تەنانەت کۆمەڵێك کەس، بەڵکو دەبێتە موڵکی هەموو کەسێك و هەموو ئیماندارێك، ناکرێت ئەمە ببێتە موڵکی ئەو گروپانەی کەخۆیان بۆ خۆیان دروست بوون و بەبێ هۆ رەوایەتی قۆرغ دەکەن، چونکە لەم کاتەدا دەکەوینە ناو پرۆسەیەکی بکوژانەی دۆزەخی یەوە کە کۆتایی نابێت.. رەنگە گروپی دیکە دروست ببێت و هەر لەڕێی ئایینەوە رەوایەتی لەگروپی یەکەم بسێنێت و بەم شێوەیە بەردەوام دەبێت....

لەڕاستیدا جیاکردنەوەی نێوان دەسەڵاتی ئایینی لەدەسەڵاتی سیاسی رووت لەڕۆژئاوادا وای لەڕۆژئاواییەکان کرد دان بەپتر لەسەرچاوەیەك بۆ رەوایەتی دابنێن، نەك یەك سەرچاوە. لەوێ بۆ ئیمانداران و ژیانی تایبەتی خۆیان، برێك لەرەوایەتی بۆ کڵێسای رەسمی هەیەو. رەوایەتیەکی سیاسیش لەڕێی دەستورو بەڵگەنامەی دیموکراتیەوە کەڕای گشتی جێگیری دەکات هەیە، هەروەها رەوایەتیەکی رۆشنبیریی لەڕێی قوتابخانەو فێرکردن و رۆشنبیریی و بڵاوکردنەوەو گەیاندنەوە هەیە... ئەم هەموو سەرچاوانەش لەیەك کاتداو پێکەوە "رێ

دەکەن". پێم باشتربوو کە لەکەشوهەوای ئیسلامیدا بەشێوەیەکی چاکتر گفتوگۆ لەسەر رەوایەتی بکردایە ئەگەر هاتوو دانپیانانێك بەفرە سەرچاوەی رەوایەتی هەبووایە، ئەوکاتە لەتوانادا بوو سیستمێکی نوێی نەرمترو لێبوردوانەتر بۆ کەسەکانو سەرجەم کۆمەڵگا دروست ببێت.

پەراوێزەکان:

1- بالاندێ لەم کتێبە گرنگو ئاسانە بۆ خوێندنەوە (کەهیچ سەرچاوەو پەراوێزێکی تیا نییە) لەچاو کتێبی یەکەمدا پێشکەوتنێك بەدەست دەهێنێو، تێڕوانینی خۆی راست دەکاتەوە. لەکتێبی یەکەمدا دەسەڵات لەسەر شێوەی کۆمەڵێك میکانیزمە نیشان دەدات کەدژایەتی بێکاری کۆمەڵایەتی لەکۆمەڵدا دەکات، واتا دژی ئاشووبو لەبەریەك هەڵوەشاندنەوەو رۆچوون. بەم شێوەیە بالاندێ کۆمەڵگاکانی بەو ئامێرە ئاڵۆزانە چواند کەوزە بەکاردەهێنن، کەبەمەش ملکەچی هەمان ئەو یاسایانەیە کەوزە ملکەچێتی "ئەمەش تێڕوانینی داینامیکای گەرمییە، هەندێ جار ئامێرەکە دەکەوێتە گرژبوونی گەرمی (ئینترۆپی) و لەجوڵە دەکەوێت، هەروەها کۆمەڵگاش بێدەسەڵات لەجوڵە دەکەوێت". بەڵام لەکتێبی دووەمدا کەپاش یانزە ساڵ لەکتێبی یەکەم دەرچوو، بالاندێ دیدی خۆی دەگۆڕێتو کۆمەڵگا بەشانۆ دەچوێنێ.

شانۆکار بۆدروستکردنی تێڕوانینو شوێنەوارەکان لەسەر دەروونی بینەران دەکات لەڕێی تەکنیكو دیکۆرو نواندنەوە، هەروەها دەسەڵاتیش ئەو شوێنەوار و وەهمانە بەرهەم دەهێنێت تا کۆمەڵگای پێ رازی بکات. ئاهەنگە گەورەکانی دانانی پادشاکان جگە لەدروستکردنی شکۆمەندیو تێڕوانینی بەهێزو رازیکردنی کۆمەڵ بەدەسەڵاتو دابڕینی رەوایەتی بەسەریدا لەڕێی قەشەو ئایینەوە هیچی دیکە نەبوو.. لەڕاستیدا خوێندنەوەی ئەم کتێبە زۆر بەچێژە پێویستە.

"Le Pouvoir sur Sce'ne" balland, 1980.

2- هەموو زانستێ لەزانستە نوێیەکان دەکرێن بەدوو بەشەوە: بەشێك بۆ بەڵگەنامەو پۆلێنکردنو کۆکردنەوەی تێبینیو پێدراوەکان لەواقیعداو، بەشێك بۆ شیکردنەوەو لێکدانو دەرهێنانی ئەنجامەکان، ئەمەش بەسەر زانستی رەگەزەکان یان ئەتنۆلۆژیادا جێبەجێ دەبێت. لقێك لەلقەکانی ئەم زانستە بە"ئەتنۆگرافیا" ناودەبرێتو، لایەنی وەسفگەرایی زانستی ئەتنۆلۆژیا پێك دەهێنێت، پێدەچێت ئەم زاراوەیە بۆ یەکەم جار لەئەڵمانیا ساڵی 1791 دەرکەوتبێت، پاشان لەناو ژینگە زانستییە جۆراوجۆرەکانی رۆژئاوادا بڵاوبۆوە. ئەم زاراوەیە لەسەدەی نۆزدەدا گرنگییەکی فراوانی بەدەستهێنا. واتا لەسەردەمی لوتکەی کۆڵۆنیالیزمو باڵادەستبوونی فەلسەفەی رەگەزپەرستیدا ئیدی زانستی ئەتنۆلۆژیا بەشداری لەپۆلێنکردنی گەلاندا بۆ توێژو گروپەکان بەپێی رەگەزکرد، ئێستاش دەبینین زانستی ئەنترۆپۆلۆژیا یان سۆسیۆلۆژیا جێگەی زانستی ئەتنۆلۆژیا دەگرێتەوە کە دڵسۆز بوو بۆ ئەو بەڵگە نەویستانەی سەردەمی کۆڵۆنیالیزم.

3- ئەمە وەڵامێکی ئاشکرایە بۆ لیڤی شتراوسو میتۆدە بونیادگەراییەکەی کە کۆمەڵگاکان لەمێژووی خۆیان دادەبرێت، بەڵکو پێی وایە کۆمەڵگا رۆژئاواییە دوورەکان (واتا نارۆژئاواییەکان) کۆمەڵگا بێمێژووەکانن، تەنها ئێستایەکی هەمیشەیی بەردەوامیان هەیە. ئەم تێڕوانینەش بەهیچ جۆرێك بەدڵی جۆرج بالاندێ نییە.

4-ئێستا لەکتێبی قوتابخانەکاندا هەیە پاش ئەوەی دەوڵەتە ئەفریقییەکان سەربەخۆ بوون‌و لەسەر شێوەی کۆلۆنی جاران سیستمی دەوڵەتی ناوەندییان پێك هێنا، واتا لەسەر شێوەی سیستمی ناوەندی یەعقوبی کۆماری سێیەمی فەرەنسا.

5- لەم بارەیەوە بڕوانە کتێبی میشیل فۆکۆ: "چاودێری و سزا: لەدایکبوونی زیندان". لێرەدا تەنها باس لەدروستبوونی زیندان لەکۆتاییەکانی سەدەی هەژدەدا ناکات، بەڵکو باس لەدروستبوونی دەوڵەتی نوێی بۆرژوازی دەکات کە بەهەموو شێوازێك هەوڵی خەفەکردنی تاك‌و جەماوەری ئەدا لەترسی کارەکانی یاخیبوون‌و ئاشووب، کەلە سەردەمە کۆنەکاندا روویداو، بووە هۆی هەلگێڕانەوەی لەتەقینەوەی شۆڕشی فەرەنسیدا.

Michel Foucalt: “Surviller.et Punir: Naissance de laprison”

Gallimard, 1975

6- ئەو کتێبەی ئاماژەی پێدراوە ئەمەیە:

Clastres (Pierre) : “La Societe contre ‘etat: recherc hes d’ anthropologie Politique” e’d: Minuit, paris, 1974.

7- سەیر نییە ئەگەر ئەم قسەیە لە (ڤیبەر)ەوە کەیەکێك لەگەورەترین زانا کۆمەڵناسەکانی مێژوو، دەربچێت. ئەو شێوازی لێکچون بۆ پێشکەشکردنی پێناسەکان دەگرێتە بەر. ئابەم شێوەیە کلێسای پێناسە کردووەو دەڵێ: "ئەو دەزگایە یە کەکالاکانی رزگاربوون یان شیکەکانی ئیمان قۆرغ دەکات"؟ ئەم پێناسەیەش هیچ رقلێبوونێکی بۆ کلێسا تیانییە، بەڵکو سەربەخۆیانەو واقیعیانە وەسفی رۆڵی کلێسا لەکۆمەڵگادا دەکات وەك هەر دەزگایەکی دیکەو، کالا رۆحییەکانی مرۆڤ دابین دەکات وەك چۆن بازاڕ کالا مادییەکان دابین دەکات.

8- لێرەدا بالاندێ ئاماژە بەدیاردەی پێکەوە ژیانی نێوان سەرەك کۆماری چەپڕەو (میتیران)و سەرەك وەزیرانی سۆشیالیستی (شیراك) دەدات. وەك دەزانرێت ئەم پێکەوە ژیانە سەیرو گرانە بۆ یەکەم جارە لەفەرەنسادا پیادە دەکرێت‌و، لەهەموو ساتێکدا هەڕەشە لێکراوە، بەلام فشاری رای گشتی‌و بەرژەوەندی بالای گەل تا ئێستا بواری نەداوە ئەم بارە رووبدات.

9- دەڵێن فۆکۆ لەدووەم کتێبیدا لەبیرۆکەی مردنی خود یان "کوشتنی مرۆڤ" پاشگەزبۆوەو، رێزو شوێن‌و ئیرادەی بۆ خود گەڕانەوە، کەزۆر کەس بەمە دڵخۆش بوون...

10- بالاندێ‌و گەورە بیریارە هاوچەرخەکان دان بەوەدا دەنێن گە گرنگی "ئەپستیمی" بۆ لایەن‌و خەسڵەتە شوێنییەکەی (المکاني) دەگەڕێتەوە، نەك بۆ خەسڵەتە کاتییەکەی (الزمني). فۆکۆ لە(وشەو شتەکان) دا دەڵێ گومانی تیادا نییە کە ئەپستیمی بەیەك جار کۆمەڵێك پسپۆڕیی کۆنترۆڵ دەکات، بەلام هەروەك فۆکۆ دەڵێ بەیەکجارو بەو خێراییە هەرەس ناهێنێت، بەمانایەکی دیکە دابڕان بەپلەیەکی وا توند روونادات بەڵکو پلە بەپلە دەبێت، بەلام ئەپستیمی سەدەکانی ناوەڕاست هەیەو ئەپستیمی نوێگەری فیکریش هەیەو دەکرێت بەئاسانی‌و بەشێوەیەکی سۆسیۆلۆژیانە لەمە دڵنیابین. فۆکۆ لێرەدا راستە.

11- دیمۆزیل دەڵێ: "چەند ساڵێك دەبێت وشەی "بونیاد" تەمو مژاوییەو، لەکاتێکدا پارێزگاری بەچەمکە کۆنە وردەکەیەوە (کەبەسەر بونیادی بەڵگەیەکی ماتماتیکی دیاریکراودا یان بونیادی دەوڵەتدا جێبەجێدەکرا) دەکات، ئەوا ئەمڕۆ چەمکێکی تەکنیکی زۆر گەورەتری وەرگرتووەو. چووەتە چوارچێوەی سیستمێکی فەلسەفییەوە کە ئەمڕۆ دەردەکەوێتو، ناوێکی پێبەخشیوە واتا (فەلسەفەی بونیادگەرایی). لێرەشەوە جۆرێك لەتێکەڵیو شێواندن دروست بوو و کارەکانی منیان لەناو پەرژینی بونیادگەریدا پۆلێن کرد. (...) بەڵام ئێستا هەوڵ دەدەم سنورێك بۆ ئەم پروپاگەندانە دابنێم: من بونیادگەری نیمو، لەمن نەخوازراوە کەبونیادگەری بم یان نا، من فەیلەسوف نیم بەڵکو مێژوونووسم، مێژوونووسی کۆنترین جۆرەکانی مێژو (...). بێگومان ئەوەی ژیانی خۆی بۆ لێکۆڵینەوەی بەرهەمەکانی رۆحی مرۆیی تەرخان بکات، پێم وایە ئارەزووی خۆئامادەکردن دەکات بۆ رۆژێك کەمیکانیزمەکانی ئەم رۆحە دەبێتە مادەیەك بۆ زانستێکی نوێو نهێنییەکانی رۆحی مرۆییمان بۆ دەخاتەڕوو، بەڵام دەبێت ئەوە بزانێت کەرۆژێکی وا لەئاسۆی بینراودا دیار نییە". پاشان دیمۆزیل لەشوێنێکی دیکەدا دەڵێ: "زانستە مرۆییەکان هێشتا گەشەیان نەکردووە سەرەڕای ئەو پێشکەوتنە گەورەیەی بەدەستیان هێناوە". لەبەرئەوە دەبێت پەلە نەکەینو، پێویستە چاوەڕێ بین.

Dume'zil (Georges) Mythes ete'pope'e (III) Gallimard, 1973,p.14-15.

12- جۆرج بالاندێ لەگەڵ سیاسەتی جەنەڕاڵ دیگۆڵدا دەربارەی کینیا ناکۆك بوو کاتێك دیگۆل لەبەرچەند هۆیەکی سیاسی هەوڵی پچڕینی پەیوەندیدا، ئیدی بالاندێ هەموو پەیوەندییەکی لەگەڵ دەسەڵاتدا بڕیو تەداخولی لەکاروباری سیاسی ئەفریقیدا نەدەکرد، لەکاتێکدا ئەم تەداخولەی لەپێناوی بەرژەوەندی رزگاربوون دا بوو نەك لەبەرژەوەندی دیدە کلاسیکییە کۆلۆنیالییەکە. بالاندێ لەوڵاتە ئەفریقییەکاندا بەشێوەیەکی بنەڕەتی گرنگی بەڕادەی کاریگەرییە دەرەکییەکان لەسەر فاکتەرە ناوخۆییەکان دەدا.

هەر لەبەر ئەم هۆیەش لەسایەی ئیدارەی (پیرمەندیس فرانس)دا رازی بوو بەبەشداریکردن لەئەزموونی توێژینەوەی زانستیدا، مەندیس فرانس چەپرەوێکی زیرەك بوو، تێڕوانینێکی جیاوازی بۆ وڵاتانی کۆلۆنی سێیەم هەبوو، لەبەرئەوە ئەرکی بەڕێوەبردنی توێژینەوەکان لەم بوارەدا بەبالاندێ سپێررا...

13- ئەمە جۆرج بالاندێ دەربارەی ئەورووپاو گەلانی ئەورووپاو یەکێتی ئەورووپا وا دەڵێت، ئەی دەبێت ئێمە دەربارەی عەرەبو یەکێتی عەرەبی بڵێین چی؟ ئایا سەیر نییە ئەورووپایەك کە لەنەتەوەو زمانی جیاجیا (ئەڵمانی، فەرەنسی، ئینگلیزی، ئیتاڵی) پێکهاتووە لەپێناوی یەکێتی ئابوریو سیاسیدا رێگەیەکی گەورەی بڕیوە، بەڵام عەرەب ناتوانێت لەهیچ ئاستێکدا وزەکانی یەکبخات؟ رەنگە ئەمە سەیر دیاربێت، بەڵام لەڕاستیدا سەیر نییە. ئەورووپا. هیچ هەنگاوێك بەئاراستەی کامڵبوونی ئابوریو یەکگرتندا نانێت ئەگەر بەتەواوی ئامادە نەبێت، پاش ئەوەی بەشێوەیەکی سایکۆلۆژی جەماوەرەکەشی (جەماوەری فەرەنسی و جەماوەری ئیسپانی...) ئامادە دەکات، عەقڵانیەتو نەخشەیەکی پرۆگرامکراو بۆ هەنگاونان بەرەو یەکگرتن هەیە، خۆ ئەگەر بارودۆخ لەبارنەبوو ئەوا سەرکردەکان لەم هەنگاوە دووردەکەونەوە تاوەکو پرۆژەی

یەکێتی ئەوروپی لەبەردەم جەماوەردا نەکەوێت و هەرەس نەهێنێت و راستگۆیی خۆی لەدەستبدات...

14- ئەمە مانای ئەوە نیە کەزانستە کۆمەڵایەتیەکان وەك هەندێك پێیان وایە تەنها کۆمەڵێك ئایدیۆلۆژیان! لەراستیدا یاسا "زانستیەکان" لەکۆمەڵگادا دەدۆزرێتەوە بەلام زانستیبوونی رەهاو حەتمی نیە بەرادەی زانستیبوونی زانستە فیزیاوی و ماتماتیکی یەکان.

15- لیوتارد (Lyotard) مەبەستی لەمە ئەوەیە کەچیدی ئایدیۆلۆژیا گشتگیری و سەراپاگیری یەکان باوەڕپێکراونین و، بەحیکایەت و چیرۆکە گەورەکانی دەچوێنێ.

16- کۆمەڵگاکانی ئێمەش هەروەها لەچەند چینێك یان یادەوەری یەکی مێژوویی پێکهاتووە: چینی یەکەم، کەکۆنترینیانە، بۆ نموونە سەبارەت بەمیسر بریتی یە لەچینی فیرعەونی میسری و، چینی دووەم بریتی یە لەمەسیحیەت پاشان ئەو چینە دێت کە لەپاش فەتحی عەرەبی ئیسلامی یەوە دروست بووەو، چینی چوارەم چینی تازەگەری یە. بێگومان چینە کۆنەکە بەهۆی ماوەیەکی دووری زۆرەوە دەپوکێتەوە، بەلام بەتەواوەتی نامرێت، بەڵکو ئەگەر بارودۆخ بۆی لەباربێت جاروبار بەهێزدەبێت و دەژێتەوە...

17- فەلسەفەی پەرەسەندن جەخت لەسەر چەمکی پێشکەوتن دەکاتەوەو پێی وایە هەموو گەلان بەهەمان ئەو قۆناغانەدا دەڕۆن کە گەلانی ئەوروپی تا قۆناغی شارستانێتی پیایدا رۆیشتوون. ئەم سێ قۆناغەش بریتین لە: قۆناغی هۆڤی درندایەتی (الوحشیة الهمجیة) قۆناغی بەربەریەت کەلەپێشووی کەم هۆڤیترە قۆناغی شارستانێتی. لەگەڵ (ئۆگەست کۆنت)دا ئەم پرسیارە کەوتەڕوو: ئایا رەوتی بەرەو پێشەوەچوون مانای ئەوەیە کەهەموو گەلانی دنیا دەبێت بەهەمان ئەو قۆناغانەدا بڕۆنەوە یان دەکرێت باز بەسەر هەندێك لەو قۆناغانەدا بدرێت؟ ئەو قۆناغانەش ئەمانەن: قۆناغی پەرستنی بتەکان و سیحر

قۆناغی فرەخواوەندی ← قۆناغی ئایینی تەوحیدی (مەسیحیەت) ← قۆناغی وەزعی (پۆزەتیڤیزمی).

(کۆنت) پێی وابوو کەگەلانی دیکە دەتوانن قۆناغەکان ببڕن و راستەوخۆ لەقۆناغی بتێتی یەوە بچنە قۆناغی وەزعی یەوە بێئەوەی بەقۆناغی مەسیحیەتدا بڕۆن.

18- دەبینین دابەشکردنی بالاندێ بۆ مێژووی تازەگەری ئەوروپی و سێ قۆناغە یەك بەدوای یەکەکانی، تەواو لەدابەشکردنە زەمنی یەکەی (فۆکۆ) دەچێت کەلە کتێبی: "وشەو شتەکان" دا بۆ مێژووی فیکری رۆژئاوایی دیاری کردووە، دەبینین دابەشکردنەکان وەك لای ئێمە پەیوەندی بەمێژووی ئەو وەچە پاشایەتیەوە نی یە کەفەرمانڕەوایەتی ئەوروپایان کردووە، کاتێك ئێمە دەڵێین (سەردەمی ئەمەوی، سەردەمی عەبباسی... سەردەمی عوسمانی.. هتد)، بەڵکو بەمێژووی فیعلی تازەگەری فیکری و مادی یەوە پەیوەندیدارە. دەرکەوتنی کەسێکی وەك دیکارت یان کانت زۆر لەهاتنە سەر حوکمی دە پادشا گرنگترە.

19- رەنگە کەموکوری کتێبە ناوبراوەکەی فۆکۆ لێرەدا بێت، فۆکۆ باس لەسێ ساتەکانی تازەگەری (یان سێ سیستمی فیکریی) (ئەپستیمی) دەکات وەك ئەوەی بەتەواوەتی لەیەکتر پچڕاوبن و هیچ پەیوەندی یەکیان لەنێواندا

نەبێت. بەڵام فۆکۆ لەکتێبی دواییدا (ئارکیۆلۆژیای مەعریفە) ئەم بابەتەی دەرك پێکردو داوای لێبوردنی لەم کەموکوڕی‌یە کرد. لە"وشەو شتەکان" دا ئەم سێ ساتە کاتە وەك چەند دابڕانێکی عەدەمی دەردەکەوتن کە لەبۆشایی مێژوودا باز دەدەن‌و، دواجار ئیمکانیەتی بەدوای یەکداهاتن یان بیرۆکەی پێشکەوتن رەتدەکاتەوە.

20- ئەم کتێبە لەسێ‌بەشی بەدوای یەکدا دەرچووە:

Paul RICOEVR:

1-Temps et r'ecit tome I, 1983.

2- Temps et re'cit tome. II,1984,ED. Seuil, Paris.

1- Le Temps raconte' tome III, 1985.

21- لێرەدا چەمکی "هۆزەکان" بەتەواوەتی جیاوازە لەو چەمکەی لای ئێمە لەرۆژهەڵاتی عەرەبیداهەیە. لەچوارچێوە رۆژئاواییەکەیدا بەمانای پێکهاتنی گروپە پەراوێزی‌یە "هۆڤی‌یەکان" دێت کەبیروباوەڕەکانیان بەئایینی مەسیحی نامۆیەو، بانگەشەی ئەوە دەکەن کەخاوەنی رێگەی رزگاربوونن. ئەم هۆزانە زۆرجار ژمارەیەکی گەورە لەلاوانی ونبوو گۆشدەکەن‌و، خێزانەکان لەکوڕو کچەکانیان دەکەن‌و، وایان لێدەکەن کەحاشا لەباوکەکانیان بکەن‌و، بەگیانێکی دەمارگیری‌و عەقڵیەتێکی تەسك پەروەردەیان دەکەن...

* ئەم گفتوگۆیە لەگۆڤاری: الفکر العربي المعاصر، ژمارە 41، 1986دا بڵاوبۆتەوەو، لەلایەن (هاشم صالح)ەوە گفتوگۆکە سازکراوەو پەراوێزی بۆ نووسراوە.

# لەئەدەبی گەلانەوە

- قەسیدەی (جۆن دۆن)

جۆزیف برۆدسکی

- خەزێنە

چیرۆکی: سۆمەرسێت موام

# جۆن دۆن

## - لاواندنەوەیەك-

جۆزیف برۆدسكی

• و:عەبدوڵا قادر دانساز

هیوا قادر

جۆن دۆن دەنویٚو هەموو شتیٚكی دەوروبەریشی نوقمی خەودەبیٚ.
دیوارەكانو ئەردەكەو چەرپاكانو تابلۆكان، نوستوون،
مێزەكەو قاڵیەكانو سورگیەكانو قوفڵەكان، نوستوون.
دۆلابی جلو مێزی میوانو مۆمەكانو بەرتاقەكان، هەموو نوستوون.
هەموو شتیٚ خەوی لیٚكەوتووە، بوتڵو پەرداخو گوڵدانەكانو نانەكە،
كێردی نان قاشكەرەكەو فەخفوریو شتە كریستاڵیەكانو دەووریی سەر مێزەكە،
شەوچراو چەرچەفی چەرپاو دۆلابو شوشەی پەنجەرەكانو كاتژمێرەكە،
پیٚپلیكانەكانو دەرگاكان نوستوون، شەو گەشتۆتە هەموو جێیەك.
لەهەموو جێیەكدا شەوە: لە سوچەكانو چاوی ئاگردانەكانو چەرچەفی چەرپایەكان
لە كاغەزەكانو مێزی نووسینەكەو پەندە نووسراوەكەدا،
لە پەیڤەكانیدا، هێزمەكانو لە مقاشی ئاگردانەكەو لەسوچی موحەیرییەكەدا شەوە،
لەو شوێنەی ئاگرەكەی تیا دامركاوەتەوە، لەهەموو جێیەكدا هەر شەوە.
لە بلوزو پیٚڵاوەكاندا، لەگۆرەویو سێبەرەكاندا،
لەپشتی ئاوێنەكەو كورسیەكانو سەر چەرپاكە.
دووبارە لەنێو گوڵدانەكانو سەر خاچو نێو بەرگە لێفەكاندا،
نەعلەكانو گسكی پشت دەرگاكە، هەموو شتیٚ نوستووە.
نووستووە هەموو شتیٚ، پەنجەرەكانو بەفری نیشتووی سەر چینكۆی لێواری پەنجەرەكان،

گوێسوانەکان سپی وەك چەرچەفی سەر مێزی ماڵە هاوسێ، ستارەکان نوستوون،
کۆڵان سڕە وەك سڕی مردوو،
دیمەنی گەڕەك لەناو چوارچێوەی بە بەفر گیراوی پەنجەرەکەدا نابینرێ.
خەوتوون گومبەزەکانو دیوارو پەنجەرەکان، هەموو، هەموو شتێ نووستووە.
بەردی سەر شۆستەو کاریتەکانو شیشەبەندی پەنجەرەکانو گوڵزارەکان نوستوون.
چەپەرو زنجیرە بەئاڵتون زاخدراوەکان، لەمپەری بەر ڕێگان، نوستوون.
هیچ روناکاییەك لەم شەوەدا تیشك ناخاتەڕوو، جیرەی هیچ چەرخێك ناگاتە گوێ.
دەرگاکانو دەسکەکانیان، زەنگەکان نوستوون، کێلونی پەنجەرەکان،
قوفڵەکانو پشتیوانی دەرگاکان نوستوون، سورگیەکانو کلیلەکان.
نە دەنگێك، چرپەیەك، سرتەیەك نابیستی.
تەنها خرمەی بەفر نەبێ کە عومری شەو درێژ ئەکات.
بەندیخانەو قوفڵەکان، تەرازوی دووکانی ماسی فرۆشەکان نوستوون.
کەلاکی هەڵواسراوی بەرازەکان نوستوون.
خانووەکانو حەوشی پشتماڵو سەگە پەتکراوەکان نوستوون.
پشیلەکان بە خۆیانو گوێ قوتەکانیانەوە.
مشکەکانو مرۆڤەکان نوستوون، لەندەن سەرتاپا نوقمی گێژاوی خەوبووە.
لە بەندەرەکەدا بەلەمێکی چارۆکەدار نوستووە،
ئاوی دانار دانار بە بەفر، بە بەر قوڵاخی بەلەمەکەدا دێتو دەچێو
بەناو قوڵایی دەریادا دەهیسێنێو
هاودەم لەتەك هەورەکانی قوڵایی ئاسماندا بۆ دوور دوور ئەوقدەدات.
جۆن دۆن نوستووەو دەریاش لەگەڵ ئەودا نوستوو،
کەنارە گلگەچیەکە لەپاڵ دەریادا نوستوو،
زۆربەی ئەم دورگەیە لەئامێزی بێدەنگیدا نوستووە،
لێ باخچەکانیش بەسێ قوفڵ کلۆمدراون،
کەڤوتەکانو دار سنەوبەرەکان، قرژاڵەکان، لاریکسەکانو بێتوولاکان نوستوون.
پێدەشتی کێوەکانو جۆگەلەو تولە ڕێگاکان نوستوون،
لەو دەمەدا ڕێویو گورگو ورچەکان نوستوون،
بەفر لەبەر ئەشکەوتەکاندا مۆڵ دەخوا.
باڵندەکان بێ جوکە جوكو ستران نوستوون.
قیفەی قەلەڕەشکەکانو پێکەنینی کونەپەپوو نابیسترێ،
مەلەکوتی دڕندانەی شەو گومبەزێك بەسەر ئینگلتەرادا هەڵدەدا.

لەکاتێکدا تەنها ئەستێرەیەك دەجریوێنێو جرجێك دەڕوا تا دان بە گوناهەکانیا بنێ.
هەموو شتێ نوستووە، مردووەکان لە گۆڕەکانیاندا،
زیندووەکانیش لەنێو دەریای کراسی خەویاندا راکشاون.
نوقمبوو لەناو وڕێنەکانیاندا. دوو بەدوو یان تەنها نوستوون.
هەموو، هەموو شتێ نوستووە، رووبارەکان، چیاو دارستانەکان،
گیانلەبەرە دڕندەکانو باڵندەکان، تێکڕا نوستوون.
دامێنی ئاسمانە رەشەکانو هەموو شتێ کە مردووەو هەموو شتێ کە زیندوو، نوستوون.
تەنیا هەر بەفرە سپیەکەیە باوەخولێ دەکاو فریشتەکانیش نوستوون،
((پیرە نورانیەکە)) زۆر دوور لە پەژیوانییەکانی دنیا
لەخەوی پیرۆزو بێشەرمیدا دەنوێ.
نوستووە دۆزەخ، بەهەشتیش لەنێو شکۆی خۆیدا نوستوو.
لەم ساتەدا کەسێك نیە لەماڵەوە دەستەوداماني خەو نەبووبێ.
خوا نووستووەو زەویش ئێستا بەخۆی غەریبە،
چاوەکان نابینن، گوێکانیش ئەشکەنجەکان نابیستن،
لەسەر بەفری کێڵگەکانی ئینگلستاندا
شەیتانو کینە لەپاڵ یەکدیدا نوستوون.
سوارەکان نوستوون، سەردەستەی فریشتەو کەڕەناکەی نوستوون،
ئەسپەکان بەدەم خەوەوە لەترەدەن،
تەنانەت پۆلە فریشتەی زارۆی بەیەکا ئاڵاوی
ژێر قوبەی کڵێسای سان پولسیش نوستوون.
جۆن دۆنو هەر هەموو شیعرەکانی نوستوون،
حوزنو ئازارەکانی لەنێو رەزمی بەیتەکانیدا دەڕازێن.
هەر دێڕەو وەك براو هاوڕێیەکی ئازیز بەگوێ ئەوی تردا دەچرپێنێ:
تۆزێ بڕۆ بەولاوە، پێویستە بەردەوام بین.
بەڵام رێگا گەلێ دوورە تا دەروازەکانی بەهەشت،
دێڕەکانو بێهەواو لوتبەرزی لەیەکدی دەئاڵێنو
لەسەر ژێیەك تێکڕا ئەوق دەدەن.
هەموو کۆپلەکان نوستوون.
هەروەك پاسەوانێك لەکاتی تێپەڕبوونی مارشێکی درێژدا
بەلاتەنیشتا قافیەو دوو دێڕی هیجاکان ئاوڕ دەدەنەوە.
گومەزی قایمی لاشانی دەروازەکان نوستووە،

نیگای تێڕوانینی ناوی ((لیسیس)) نوستووەو
سەربەرزیش دوور لەو نیگایە نوقمی خەوە.
هەموو خەمو مەینەتیەکانیش بەبێ جوڵە نوستوون.
خێرو شەڕ ئامێزیان بەیەکدا کردووەو
پێغەمبەرەکان نوستوون، تاوی بەفری داکردوو
لەسەر ئەو پانتاییە بەربڵاوەدا بەدووی رەشاییەکی بچوکدا دەگەڕێ داکا بەسەریا.
هەموو شتێ نوستووە، کتێبەکان لەناو دێڕە سەختەکانیاندا نوستوون،
رووباری پەیڤەکان کە بەفری لە بیرچوونەوە دایپۆشیون نوستوون
گشت وتارەکان، لەتەك هەموو ئەو راستیانەی کە هەڵگرینی نوستوون،
زنجیرەکان نوستوونو بەئاستەم زڕە لە ئەڵقەیانەوە دەبیسترێت.
هەموو لە بێدەنگیەکی قوڵدا نوستوون، ((پیرە نورانیەکە))
شەیتانو خواو، خزمەتکارە بەدەکانیانو هاوڕێکانیانو منداڵەکانیان نوستوون.
لەسەرتاپای زەمیندا بەدرێژایی رێیە تاریکەکان،
هیچ نابیسترێ تەنها خاشەخاشی بەفر نەبێ.
دواتر چی..! گوێت لێیە.. لەناو تاریکایی ئەو سەرمایەدا
ئینسانێك دەگری، لەترسا بە چرپە دەدوێ
کەسێك لەبەر زیللەتی زستاندا بەجێماوەو
دەگری.. کەسێك وا لەو تاریکییەدایە،
بەندییەکە لەناو زیندانی زستاندا
نوزەیەکی باریك، باریك وەك دەرزی، لێ بێ دەزوو..
لەهەموو جێیەك سەرماو سۆڵە تاریکییە..
بەتەنها بەسەر بەفردا دەخزێو شەو بە سپێدەوە دەداتەوە دەمیەك.
((ئەوە کێیە لەوێدا هەنسك ئەدا؟ ئەوە تۆیت ئەی فریشتەکەم
چاوەڕێی ئەو هاوینەیت کە لەژێر بەفری زستاندایە؟
چاولەرێ بۆ گەڕانەوەی خۆشەویستی من؟
بەم تاریکو نوتەکە دەگەڕێیتەوە بۆ ماڵ؟
ئەوە تۆیت بەتاریکی شەودا هاوار دەکەی؟... هیچ وەڵامێك نییە.
((ئەوە ئێوەن، فریشتە منداڵەکان؟
ئەم گریانە وام لێدەکات بیر لە کۆڕاڵە غەمگینەکانتان بکەمەوە))
ئێوەن کە لە هاکرا بڕیارتان داوە کاتێدراڵیە خەوتووەکەم بەجێبێڵن؟
بەراست تۆ بڵێی ئەوە ئێوە بن؟.. بێدەنگی.

دەکرێ ئەوە تۆ بیت، پاول؟
پاش خوێندنی ئەو هەموو پەندانە بۆ وا دەنگت نووساوە؟
ئەوە تۆیت کە لەو تاریکییەدا سەرە بۆزەکەت نەوی دەکەیتو
دەگریت؟ ((هیچ شتێك نییە جگە لە دەنگدانەوەی بێدەنگی.
ئەو دەستەی کە کەونو کائنات دەبات بەڕێوە،
هەر هەمان دەست نییە کە دەموچاوی خۆی لە لەپیا دەشارێتەوە؟
ئاه.. هزرێکی سەرگێژگەر،
ئەوە تۆیت ئەزبەنیم؟ خوای گەورە، کە لەو گەردوونە بالآیەدا دەگریت.))
چەند بەکپی! ئەم بێدەنگیە دەکشێ،
ئەوە تۆ بوویت، جبرایل، کە فوت کرد بە کەڕەناکەتدا؟
سەگەکان دەستیان کرد بەوەڕین. منم تەنها بێدار لەخەو.
سوارچاکەکان ئەسپەکانیان زین دەکەن.
هەموو شتێ گەمارۆدراوەو لەو تاریکییە قوڵەدا نوستووە.
لەئاسمانەوە گەلە سەگی راو بەردەبنە خوارەوە،
ئایا ئەوە تۆیت، جبرایل،
لەو تاریکی زستانە ترسناکەدا هەنسك دەکەیتە کەڕەناکەتەوە؟))
((نا، ئەوە منم، گیانی تۆم، جۆن دۆن.
من، گیانی تۆ، کە بەتەنها ئالێرە لەئاسماندا بەجێهێڵراوم،
بەقورسێتی هزرەکانی خۆمەوە، بەسەختی شەتەکدراوم.
بەم بارە گرانەوە لەنێوان هەڵچونو داچوونی مەبەستێکی بەرزدا
بەئازادی باڵدەگریتەوەو لەم دەڤەرەدا دەفرییت.
تۆ وەکو باڵندەیەك وابوویت، دوور لەسەربانە لێژەکان،
هەموو گەلەکەی خۆت بینی، هەمو دەریاکانت بینی
هەموو وڵاتە دوورەکان، تۆ دۆزەخت بینی.
—سەرەتا لەخودی خۆتداو دواتر لای هەمووان.
تەنانەت تۆ بە چاوەکانی خۆت بەهەشتی درەوشاوەت بینی
کە پێکهاتبوو لە سورگەی هەستە غەمبارەکانی خۆت.
تۆ بەچاوی خۆت بینیت: ژیان وەك دوورگەکەت وابوو،
ئیدی خۆتکرد بە چاوساغی ئەم ئۆقیانووسە.
جیهان جگە لە تاریکییەکی قیژەکەر هیچی تر نەبوو.
تۆ بەدەوری خوادا فڕیتو بەربوویتەوە خوارێو دیسان بەرەو ئاسمان بەرزبویەتەوە.

لێ ئەوەی کە باری گرانکردویت، ئەوەیە کە ڕێتنادا بگەیتە ئەو بەرزاییانە،
لەوێ هەموو ئەوەی کە لەسەر زەوی ماوەتەوە، تەنها چەند رووبارێکی پێچەبەدەورەو
قوللەی زراقن، لەوێ دەڵێی ئەمە ئاخرزەمانەو
کەچی ئەو ترسەش نییە تۆقێنەر.
لەم وڵاتەدا هەوا لەجێی خۆیدا کپو وەستاوە.
هەموو شتێ بەخەونێکی ناخۆشو پڕ زۆڵ براو دەچێت.
خوا لەشەوێکی تەماویدا ڕووناکیەکی دوورە دەستی سەر پەنجەرەیەکە.
هیچ گاسنێك لەوێدا کێڵگە ناکێڵێت،
هیچ گاسنێك ساڵ لەوێدا ناکێڵێت، سەدە لەوێدا ناکێڵێت
دارستانە بەرەڵاکان حەسارێکی ئێجگار گەورە دروست دەکەن.
بارانیش لەنێو گیا زۆروزەبەندەکاندا سەمادەکات.
ڕۆژێك دێت داربڕێك بە ئەسپێکی لەڕەوە
سەری لێ بشێوێو بێتە ئەم بێشەڵانە پڕ لە بەفرو ترسناکیەوە
دەبێ ئەو بەدار سەروییەکدا هەلگژێ و لە پڕ لە دۆڵەکەی خوارخوارەوە
چاوی بکەوێت بەشەوقی ڕووناکییەك.
بەڵێ دووری هەموو شتێکە. ئێرە ناوچەیەکی تاریکو ناثارامە.
نیگا بەهێمنی بەسەر سەربانە دوورەکاندا دەخزێت.
ئێرە هێندە ڕووناکە، حەپەی هیچ سەگێکو
زرنگەی زەنگی هیچ کاتژمێرێك نابیسترێ.
لێ دەرك بەوە دەکات، دوور، دووری زۆر دوور هەموو شتێکەو
بەتەکانێکی بەگوڕو قوڵاخی ئەسپەکەی بەتوندی دیسانەوە وەردەگێڕێتەوە بۆ دارستان.
لێرەدا ڕەشمەو، تاخورکو شەو، خۆیو ئەسپە لەڕەکەی
دەبنە خەونێك لەناو ئینجیلدا.

ئاوا، من دەگریمو دەگریم.. من مەحکومم بەژیانێك لەناو ئەم بەردانەدا.
من ناتوانم بەم کاڵا گۆشتینییەی خۆمەوە بۆ ئەو بەرزاییە بفڕم
پێشان دەبێ بمرم، دەبێ فەرامۆشیبکەم،
ئەم روناکییە شێدارەی زەوی لەیادکەم ڤێجا دەتوانم بفڕم.
بەتاسەی گەیشتن بەتۆ گرم تێبەربووە
تا لەگەڵ گۆشتەکەمدا دیسانەوە بماندووریتەوە بەیەکەوە.
بێسودە تاسەم، ئەز دەزانم،

پاشان؟ گریانی من ئارامی شەوت دەشێوێنێو
((با))ش وەك دەرزییەكی هەرگیزاو هەرگیز كەنەفت نەبوو
بەناو تاریكەشەودا دەڕواو دەماندووریێت بەیەكەوە.
ئەوە من نیم كە دەگریم، ئەوە تۆیت،، تۆیت جۆن دۆن.
تۆ بە تەنها راكشاویتو دەوری سەر مێزەكە لە دۆڵابەكەدا نوستووە.
كلوكلوی بەفریش لەناو تاریكەسەڵاتدا وندەبێو
بەسەر خانوە خەو لەچاوكەوتووەكەتدا دەبارێ.
وەك باڵدارێك لەناو هێلانەكەتدا
وەك ئەستێرەگەت كە بەهەورێك داپۆشراوەو
بۆ تاسەی گەڕان بەدووی ژیانێكی راستەقینەدا،
شادمانی خۆت پێ سپاردووە، نوستوویت.
بێگەردە رۆحی تۆ، رێگەی تۆ ئازادنییە لەناهەقی.
لێ ئەو وەك قەلەڕەشكە لەهێلانەكەیدا
لەسەرو هێلانە بۆرەكانی ریشۆڵەكانەوە خۆی ناشارێتەوە.
رۆژێك هەر دەبێ بێدار بێتەوە، وەك بێداربوونەوەی باڵدارەكان.
ئەوتا هەنوكەش لەژێر لێفە سپیەكەیدا راكشاوە
لەنێوان رۆحی ئەمو جەستەی نوستوویدا
گەردوون بە بەفرو خەو دوراوەتەوە.
هەموو شتێ نوستووە. دوو سێ دێڕە شیعر نەبێ
بەڕیشخەنەوە چاو لەڕێی تەواو بوونن:
عەشقی خوایی جگە لە گۆشتی پیری جەستەی
سەردەستەی رەبەنەكان چی تر نییە.
لەم گەردوونەدا هەر بەرداشێك كە تافەتافی ئاو بیسوڕێنێ
هەمان باراشی ئارادە.
دەتوانین هاوماڵ ژیانمان بەش كەین، بەڵام لەگەڵ كێ مەرگ بەش كەین؟
ئەو قوماشە دارزاوە، رێزەڕێز دەكەینو دایدەدڕین،
فڕێی دەدەینو هەڵیدەگرینەوە، دیسان پارچەپارچەی دەكەینەوە
لەگەڵ دوا راتەكاندا! ڤێجا ئەو ئاسمانە یەك پارچەییە
لەو تاریكییەدا دەكارێ دەرزییەك بگرێت بە دەستیەوە...
بنوو، بنوو، جۆن دۆن. رۆحی خۆت ئەشكەنجەمەدەو بنوو.
عابا دارزاوو كونكونەكەت بەخەمبارییەوە هەڵواسراوە..

بڕوانە لەناو هەورەکاندا ئەستێرەکەت خۆی پیشاندەدا
ئەو ئەستێرەیەی عەیامێکە ئێشکی تۆ دەگرێت.

1963

جۆزێف برۆدسکی

جۆن دۆن: شاعیرێکی ئینگلیزە، لەساڵی 1572—1631 ژیاوە، ژیانی لاوێتی لەنێوان خوێندنی باڵاو عەشقێکی لەرادەبەدەر بۆ سێکس بردۆتە سەر. لەساڵی 1601دا کچێکی بێ ویستی خانەوادە گەورەو بەدەستەڵاتەکەی خواستووە، ئەمەش بۆتە هۆی دابەزینی پلەوپایەی کۆمەڵایەتی. لەساڵێ 1615دا دەستی کردووە بە خزمەتکردن لە کلێسادا، ساڵێ 1621 پلەیەکی ئاینی بەرزی لەکلێسای ((سان پاول)) پێدراوەو بۆتە باشترین خەتیبی هەموو ئینگلستان، مردن لە شیعرەکانی جۆن دون-دا پانتاییەکی گەورەی داگیرکردووە، بەچەشنێ کە ترسو حاڵلێهاتن لە شیعرەکانیان هاوشانی یەکترن.

هیزمەکان: پارچەداری سوتەمەنی
موحەیری: زۆپای گڵینی قەد دیوار
کەڤوت، لاریکس، بێتوڵا. ناوی سێ درەختن.
پیرەنورانیەکە: پێدەچێ مەبەستی ((جان پۆل)) بێت کە گۆڕەکەی لەناو کلێسادایە.
لیسیس: ناوی پیرۆزی کلێسایە.
تاخورک: گالیسکەی سەر بەفر
سەرچاوە:

Josif Brodskij

Oas I oknan

I urval av Werner Aspenstrom och tolkade tillsammans med Anna Aspenstrom

FRIBs Lyrikklubb/ Tidens forlag. Stockholm, 1987

# خەزێنە

▪ سۆمەرسێت موام

▪ و: موحەمەد رەمەزانی

ریچارد هەرینجە[1] بنیادەمێکی بەختەوەر بوو. پیاو لەقسەی رەش بینەکان (لەفەرمایشتەکانی کتێبی حەزرەتی سولەیمان[2] بەم لاوە) گەڕێ، پیاوی بەختەوەر شتێك نیە لەم دونیا پڕ لەکلۆڵی‌یەدا پەیدا نەبێ، بەڵام ریچارد هەرینجە ئەمەی دەزانی‌و ئەوەی راستی بێ شتی واش هەر زۆر کەم پەیا ئەبێ. ئەوەی کە هەر شتێك لەبەین دابێ باشە[3]، قسەیەکە کەپێشینیان زۆریان بایەخ بۆ داناوە، بەڵام ئەمڕۆ دابی بەسەر چووەو ئەوانەی وە شوێن ئەو قسەیە بکەون دەبێ خۆڕاگرن بۆ تەوس‌و توانجی بەئەدەبی ئەوانەی کەوا خۆڕاگری‌و ئەقڵی سەلیم یان پێ هیچ نی‌یە. کاتێ قسەی وا بهاتایەتە گوێ ریچارد هەرینجە، بەئەدەب‌و بۆ گاڵتە شانی هەڵدەتەکاند. کوڕە باخەڵك هەر ژیانێکی پڕ لەمەترسی بگرنەبەر، با خەڵك ئاگرێکی سووری وەك یاقووت لە ناخیانا بلێسە بستێنێ[4]، با خەڵك بەتاقە وەرەقێکی قومارکایە بەسامانەکەیان بکەن، با بەسەر تەنافێکا بڕۆن کە یان لێی تێ‌پەڕن‌و نێو دەرکەن یان بکەونە خواری‌و ملیان وردبێ، کوڕە با خەڵکی لەڕێی ئاواتێکی بەرز هەستی دەروون یا گێڕەو کێشەیەکا گیانی خۆیان بەخت کەن. خەڵك ئەگەر بەهۆی کارە گرینگەکانیانەوە ناوبانگیان دەرکردایە، ریچارد هەرینجە ئێرەیی پێ نەدەبردن. بێتوو رەنج بەخەساریش بان بەزەیی پێ‌یان دا نەدەهات.

بەڵام لەم قسانە نابێ وا تێ‌بگەن کەریچارد پیاوێکی خۆ خۆشەویست‌و بێ رەحم بوو. هیچکام لەم شتانە نەبوو. ریچارد هەرینجە پیاوێکی باش‌و دڵاوا بوو. دایم بەگیان‌و دڵ تێدا بوو کار بۆ هاوەڵانی بکا. ئەوەندەشی ماڵو

سامان هەبوو کە لەخۆشی‌یەکی وەك یارمەتی بەخەڵك کردن بەهرەمەند بێ. پووڵو پارەی بوو لەوەزارەتی ناوخۆ[5] مەقامێکی وای بوو کەمووچەکەی بەشی بکا. کارەکەش بە بەژنو باڵای برا بوو. کارێکی رێكوپێكو خۆشو جێگای لێپرسینەوە بوو. هەموو رۆژێ هەرکە لەئیدارە دەهاتە دەرێ، دەچووە کلووبەکەی‌و دوو سەعاتێك برێجی[6] دەکرد. شەممەو یەك شەممانیش خەریکی گۆیەن[7] دەبوو. لەکاتی هەینی‌دا دەچوو بۆ وڵاتانی دیکەو لەهۆتێلی باش باش دەماوەو و دەچوو نێو کڵێساو گالۆری‌و مۆزەکان دەگەڕا، هەر کونسێرتێ درابا یان شانۆیەك لەسەر سێن با، هەوەڵ شەو دەچوو. زۆری لەدەرێ نان دەخوارد. هاوەڵەکانی خۆشیان دەویست. پیاو زۆر بەهاسانی دەیتوانی لەگەڵی بدوێ. زۆری کتێب خوێندبۆوە، زۆری شت دەزانی، پیاو لەقسەی تێر نەدەبوو. رواڵەتێکی جوانیشی هەبوو، بەڵام بڵێی زۆریش جوان بێ، نا، پیاوێکی بەلەباریکە بوو، قیت بەرێدا دەرۆیی، دەمووچاوێکی کزی قوت‌و وریای هەبوو. تووکی سەری خەریك بوو تەنك دەبوو چونکێ لەپەنجا نزیك ببۆوە. بەڵام، چاوە قاوەیی‌یەکانی هەر ئەو بزەیەی جارانی تێدا بەدی دەکرا، ددانیشی هەموو هی خۆی بوون. ئەندامی باش هەڵکەوتبوو، دایمەش پارێزگاری خۆی دەکرد. جا بۆیە بۆنەوە نەدەبوو کە ئەم کابرایە بنیادەمێکی بەختەوەر نەبێ. خۆ ئەگەر تۆزی لەخۆ رازی با، پیاو دەیگوت وەڵڵاهی هەقی خۆیەتی بەختەوەر نەبێ.

ئەوەندی ماڵو سامان هەبوو کە لەدورگەی پڕ لەمەترسی‌و بێ ئۆقرەی ژن هێنان، پاپۆڕەکەی بەسەلامەت تێپەڕێنێ. زۆر پیاوی باش‌و ئاقڵ لەو دورگەیە کەشتی شکاوبوون. لەسەرەتای تەمەنی بیست ساڵی بەبۆنەی ئەوینەوە ژنی هێنابوو، پاش چەند ساڵ ژیانێکی کە پیاو دەتوانێ بڵێ بەختەوەرانە بوو، وردە وردە لێك کشانەوە. خۆ نە ئەم دەیویست ژن بێنێتەوەو نەئەو نیازی شووکردنەوەی هەبوو، جا بۆیە باسی تەڵاق هەر نەهاتەگۆڕێ (ئەوەی راستیش بێ پلەو پایەی ریچارد هەرینجە لەکاری دەوڵەتی‌دا ببووە هۆی ئەوە، شتێکی وەك تەڵاقی لێنەکاڵێتەوە). بەڵام لەبەرئەوەی کارەکە لەشان خۆش بێ، بەیارمەتی وەکیلی تایبەتی خاو خێزان، لێك هەڵبڕان‌و دایاننان، هەرکامیان بەکەیفی دڵی خۆی ژیان بباتەسەرو هیچیان کاری بەسەر ئەوی دیکەوە نەبێ. زۆر بەخۆشی‌و رێزو حورمەتەوە لێك جیابوونەوە.

ریچارد هەرینجە ماڵەکەی لەخیابانی جۆونز وود[8] فرۆشت‌و لەشوێنێك ئاپارتومانی گرت کەپیاو دەیتوانی بەپێیان لەوێوە بچێتە وایت هۆڵ[8]. ئاپارتومانەکە وەتاغێکی دانیشتنی بوو کەچین چین کتێبی لێدانابوو، هۆدەیەکی نان خواردنی تێدابوو کەشت‌و مەکەکەی زۆر لێدەکالاوە. وەتاغ خەوێکی باشیشی بۆ ئەم هەبوو. لەپشت ئاشپەزخانەکە دوو هۆدەی تایبەتی پێش خزمەتی لێبوو. ریچارد، ئاشپەزەکەی (کە ساڵهای ساڵ چێشتی بۆ لێنابوو) لەجۆوند وود را هێنا ناو ئەم ئاپارتومانە. بەلانیکەم ئەوەندەی دەست‌و پێوەند نەدجا بوت، جا ئەو ئەوانی دیکەی جواب کردو لەئیدارەی (لەت‌وپەت‌وپێوەند دۆزینەوە) داوای پێش خزمەتێکی کرد. بۆخۆی جوان لێی حاڵی‌بوو چی دەوێ، جا بۆیە سەرپەرشتی ئیدارەکەی جوان تێگەیاند کەچ جۆرە پێش خزمەتێکی دەوێ. لەپێش خزمەتێ دەگەڕا زۆر هەرزەکار نەبێ، یەکەم لەبەرئەوەی ژنی هەرزەکار، جێی بەقا نی‌یەو دووهەمیش لەبەرئەوەی کە ئەم بائەوەی پیاوێکی کامڵ و ماقووڵ بوو، خەڵك (هەرنەبێ کۆڵ کێش‌و کابرای کاسب) قسەیان بۆ هەڵدەبەست.

ریچارد لای وابوو کە ئەگەر پێش خزمەتەکەی گەنج بێ، دەبێ گەیشتبێتە تەمەنێ چاك‌و خراپ لێك هەڵاوێرێ. لەیەکێ دەگەڕا بتوانێ. زێو خاوێن کاتەوە. دایمە دڵی بەزێوی کۆنەوە بوو،

هەقیشی بوو کەوچكو چنگاڵێ کەژنێکی ماقووڵی زەمـانی مەلەکـە ئـان [10] شـتی پـێخواردبوو، دەبایە بەزەریفیو بەڕێزو حورمەتەوە ئـەم بـارەو بار کرابا. ریچارد هەرینجە پیاوێکی میوانگر بوو و پـێی خـۆش بـوو هەرنـەبێ حـەوتووی شـەوێ، ئەماڵەکەی بانگێشتن بێو میوانیش لەچوار کەمتر نەبنو لەهەشت کەسیش تێنەپـەڕێ. خـاتر جـەم بـوو لـەوەی کەئاشپەزەکەی چێشتێ دەنێرێتـە ژووری کەمیوانـەکان بەئیشـتیاوە دەیخـۆنو دەبویست پێش خزمەتەکەی بـەڕێوجێو گـورجو گۆڵی لەخزمـەتیان بێو بچێ. پێش خزمـەتێکی باشیشی دەویست کە بەجلوبـەرگی ئـەم رابگـا. ریچارد بـەجێوڕێ بـەرگی لەبـەردەکرد، وابـوو کەلەگـەڵ تەمـەنو دۆخـی کۆمەڵایـەتی بێتـەوەو پـێی خـۆش بـوو یـەکێ هـەبێ جـوان ئاگـای لەلیباسەکانی بێ. پێش خزمەتێکی کە ئەم لێی دەگـەڕا، دەبایـە بیتوانیبـا شـەڵوارو کـراوات ئوتووکـاو سـەیر لەسـەر ئەمـە سـووربوو کـە کەوشەکانی جوان بۆیاغ کرێ. لاقی چکۆلە بـوو و بۆ پەیاکردنی کەوشێ شێوەی دوورینەکەی جوان بێ؛ سەیر تووشی تەنگو چەڵەمە دەهات. زۆری کـەوش بـوونو لەسـەر ئەمـە سوور بـوو کەهـەر ئەوەندەی کەوشەکانی داکەند، دەبێ هەڵواسرێن. دوا هەموو ئەم قسانە،ئاپارتومانەکە دەبا خاوێن کرابایـەوەو ولاتەکـەی هـەڵوەژێردرێت. دیـاربوو هەموو کەس دەیزانی ئەوەی بـۆ ئـەم کـارە بێتـە بـەرەوە، دەبـوو بنیادەمێ بـێ قسـەی خراپـی نەیەتەوە سەر؛ دەبا ئـاقڵو دەستو چـاو پـاكو رەزا شیرین بێ. ریچارد حـازر بـوو لەبەرانبـەر هـەموو ئـەم شـتانە، مووچـەی بـاش، ئـازادی تاڕادەیەکی ئاقڵانەو مەڕەخسـیی زۆربـدا بـەپێش خزمەتەکەی. سەرپەرشتی ئیـدارەی (دەسـتو پێوەند دۆزینـەوە) جـوان گـوێی بۆ شـل کـرد بێئەوەی چاوی لـێبترووکێنێ و خاترجەمی کرد کەیەکێ باشی بۆ پەیا دەکاو چـەند کەسێ کـەبۆ پێش خزمەتی هاتبوونە بەرەوە، ناردەلا. دیاربوو ئەو ژنە سەرپەرشتە، گوێی نـەدابووە قسـەکانی ریچارد. ریچارد دانـە دانـە چاوی بـەو کەسـانە کـەوت. جـارێ برێکیـان هـەر بـەکاری کارەکـە نـەدەهاتن، برێکیان وادیار بوو بەهەڵپەهـەڵپن، برێکیشیان زۆر پـیربوون، ئـەوانی دی زۆر جحێڵ بوون. هێندێکیشیان هێنـدە رەزا سووكو خوێن شـیرین نـەبوون تاقـە کەسـێکیان تیانـەبوو کەتەنانەت بەتاقیشـی کاتـەوە. ریچـارد پیـاوێکی میهرەبانو بەئـەدەب بـوو و لـەکاتێکدا جوابـی دەکردن بزەیـەکی دەگرتو بەقسەیەکی خـۆش داوای لـێبووردنی لـێدەکردن. تەمای بوو چاوی بەزۆر پێش خزمـەتان بکـەوێ هـەتا یـەکێ باشـی لـێ هەڵدەکەوێ.

ژیان شـتێکی خۆشی لەلایە ئـەویش ئەوەیـە کاتێ هیچت نەوێ جگە لەو شتە کەیەکجار باشە، زۆرجار وەگیرت دەکـەوێ. پیـاو ئەگـەر بێتـو ئەوەی گـیری دەکـەوێ ڕێو راست نەیـەوێ، زۆر لەوانەیە ئەوەی دەیەوێ وەگیری بکەوێ. دەڵێی چارەنووس ئەڵێ: (ئا ئەمە زۆر گەوجە، داوای زۆر دەکا.) و پاشان لەبـەر لاساری ژنانـەی خـۆی، شـتەکە دەخاتـە کۆشـی کـابراوە. رۆژێ، دەرکەوانی ئاپارتومانـەکان بـەریچارد هەرینجـەی گوت:

(قوریـان بیسـتوومە لـەپێش خزمـەت دەگەڕێی.

مـن کەسـێکم پـێ شك دێ کـە لـەکارێکی وا دەگەڕێ.)

– تۆ بۆ خۆت پێت چاکە؟

ریچـارد هەرینجـە فکرێکـی ئاقڵانـەی بـوو. ئەویش ئـەوەبوو کـەبێتوو پێش خزمـەتێ، پێش خزمەتێکی دیکـەی پـێ بـاش بـێ گەلـێ باشـترە لەوەی کەخاوەن کار بەباشی بزانێ.

دەرگاوانەکـە گوتـی: (مـن زەمانـەتی بـاش بوونـی دەکـەم. تـا ئێسـتە.کـاری بـاش باشیشـی هەبووە.)

– سەعات لەدەوروبەری حەوت دێمەوە بەرگ بگۆڕم. ئەگەر بۆی دەکرێ، دەمەوێ هەر ئەوکاتە چاوم پـێی بکەوێ.

– بەچاوان، قوربان. فرمایشتەکەتی پێ رادەگەیەنم.

هەر تاقە پێنج دەقیقە بوو ریچارد هاتبۆوە، لە زەنگیان دا. ئاشپەزەکە چوو دەرکەی هەلگرت. پاشان هاتەوە ژوورێو گوتی ئەو ژنەی وا دەرگاوانەکە باسی کردبوو، هاتووە.

ریچارد گوتی: (پێی بلێ، بێتە ژوورێ.)

چەند چرای دیکەی هەلکرد، هەتا لەبەر رۆشناییەکەیان بزانێ ئەو ژنە چۆن بنیادەمێکە. هەستاو پشتی نابە کوانووەکەوەو راوەستا. ژنێك هاتە ژوورێو بەئەدەب لەنێو دەرکەکەدا وێستا.

ریچارد گوتی: (ئێوارەت باش. نێوت چییە؟)

– قوربان نێوم پریچاردە[11].

–تەمەنت چەندەیە؟

– سیوپێنج، قوربان.

– باشە، تەمەنێکی باشە.

فوویەکی لەسیگارەکەی کردو جوان لەژنە فکری. ژنە، کەلەگەت بوو، لەوانەبوو بەقەت ئەم کەلەگەت بێ. بەلام گوتی بێتو نەبێ کەوشی پاشنە بلێندی لەپێدایە. لیباسە رەشەکەی لێدەکالاوە. جوان بەخۆی راگەیشتبوو. دەموچاوی جوانو لەبار هەلکەوتبوو و رەنگی پێستی یەکجار رۆشن بوو.

ریچارد گوتی: (تکایە، کلاوەکەت دانێ.)

ژنە، کلاوی داگرت. ریچارد دیتی کەقژی سەری قاوەیی‌یەکی کەم رەنگە. قژی زۆر جوانو رێکو پێك رازاندبۆوە. وەك ئافرەتێکی ساغو بەهێزی هاتە بەرچاو. نەکزبوو نەقەلەو. رۆپۆشێکی باشی بکردایەتە بەر، زۆر جوان دەبوو. جوانی‌یەکەی وانەبوو کەسی لەبەر وەڕەز بێ، بەلام هەرچی بێ بەراستی جوان بوو. ئەم ژنە ئەگەر لەباتی قەرەواشی کارێکی دی کردبا، پیاو دەیتوانی بلێ بەراستی جوانە. ریچارد چەند پرسیارێکی لێکرد. ئەمیش هەر ولامێکی دەیداوە بەجێبوو. ئەم ژنە هۆیەکی باش بوو بۆئەوەی کەبۆچی دەستی لەکارەکەی پێشووی هەلگرتووە. لەژێر دەستی گەورە نۆکەرێکدا لەکار هاتبووەدەرو لەوە دەچوو زۆرباش لەکاری خۆیا شارەزابێ. کاری ئەمجارەی دوایی ئەوەبوو بەسەر سێ پێشخزمەت رادەگەیی، بەلام لەبەری گران نەبوو ئەگەر کاری ئاپارتومانەکەی بەتەنیاش کردبا. پێشخزمەتی ئاغایەك دەبێ کەدەینێرێتە لای خەیات تا ئوتوو لێدان فێربێ. ئەم ژنە، برێك حەیا بەخۆبوو بەلام شەرمێۆن نەبوو. ریچارد هەرئەو جۆرەی عادەتی خۆی بوو بەزمانی خۆشو لەسەرخۆ پرسیاری لێدەکردو ئەمیش لەسەرخۆو بێفیزو هەوا وەلامی دەداوە. ژنە، سەیری کار لەریچارد کردبوو. لەژنەی پرسی کێ دەبێتە زامنت. زامنەکانیش وادیاربوو زۆر جێی باوەڕن.

ریچارد گوتی: (چاو زۆرم پێخۆشە دات مەزرێنم. بەلام رقیشم لەئالو گۆڕە. ئەو ئاشپەزە دوازدە سالە لەلامە. ئەگەر بەکارم بێیو بۆ خۆشت ئێرەت بەدل بێ، خوا بیەوێ هەر لێرە دەمێنیەوە مەبەستم ئەوەیە من نامەوێ سێچوار مانگێ لێرەبی، پاشان بلێی دەڕۆم مێرد دەکەم.)

ژنە گوتی: (قوربان، زۆر جێی مەترسی نییە. من بێوەژنم. لام وانی‌یە کەسێك، بارو دۆخی ژیانی وەك هی من بێ مێردکردن بەکاری‌بێ. مێردەکەم لەو رۆژەوە مێردم پێکرد هەتا ئەو رۆژەی مرد، دەستی لەرەشو سپی نەداو ناچاریش بووم لەلای بم. مالێکی باش بێتیا هەلکەم هیچی دیکەم ناوێ.)

ریچارد بەبزەیەکەوە گوتی: (قسەکەتم بەدلە. ژن هێنانو مێردکردن شتی چاکە بەلام پێم وایە هەلەیە کەبنیادەم کارو پیشەی هەر ببێتە ئەوە.)

ژنە زۆر ئاقلانە بێدەنگی لەم باسە هێنا،و مەحتەل ما بزانێ ریچارد چ رێیەك بۆ کارەکە دادەنێ. لەوە نەدەچوو بەشتەکەوە ماندووبێ. ریچارد بیری لەوە کردەوە کەئەگەر ئەم ژنە وەك ئەو جۆرەی کەبەروالەت دیارە کارزان بێ ئەبێ خۆشی لێی سوور بێ کە بێدەردی سەر جێگایەکی دەست دەکەوێ تیابحەوێتەوە. پێی

گوت چەندی مووچە بۆ دەبڕێتەوەو ژنە پێی ڕازیبوو. ریچارد باسی بارودۆخی ماڵەکەی بۆ کرد، بەڵام ژنەکە پێی گوت لەوەپێش باسی هەموو ئەو شتانەی بیستووە. ریچارد هەستی کرد ئەم ژنە بەر لەوەی بێو داوای کار بکا، سەبارەت بەماڵەکەی ئەم، لەمو لەو پرسیاری کردوەو کابرا سەری لەم شتە سوورنەما بەڵکوو پێی کەیف خۆش بوو. بەو کارەیدا دیاربوو ژنێکی ئاقڵو خوردو وردە.

ریچارد گوتی: (ئەگەر دات مەزرێنم کەی دێی؟ ئێستا کەسم بەدەستەوە نییە.)

(قوربان، بڕیار بوو حەفتەیەك بچمە مەرەخەسی، بەڵام لەبەر خاتری ئاغایەکی وەك جەنابتان، قەیدێ ناکا ناچم. ئەگەر پێت خۆش بێ سبەینێ بەخزمەتت دەگەم.)

ریچارد هەرینجە، وەك هەمیشە، بزەیەکی جوانی هاتە سەر لێوو گوتی: (نا من نامەوێ چاو لەو مەرەخەسییە بپۆشی، ئەویش دەزانم لەوەپێش چاوەڕوانی بوویی. حەفتەیەکی کەش من هەر ئاوا گوزەران دەکەم. بچۆ بۆمەرەخەسییەکەت. پاش ئەوەی تەواو بووی، وەرەوە بۆ لای من.

—قوربان گەلێ سوپاست دەکەم. حەفتەکەی دیکە ئەم دەمانە بێمەوە باشە؟

— ئەرێ، زۆر باشە.

کاتێ ژنە ڕۆیی، ریچارد هەرینجە هەستی کرد کاری ڕۆژێکی زۆر جوان جێبەجێ کردووە. وادیار بوو ڕاست ئەوەی وا لێی دەگەڕا، وەگیری کەوتووە. بەتەلەفوون بەئاشپەزەکەی گوت کەئاخری پێش خزمەتێکم دامەزراند.

ئاشپەزەکە گوتی: (قوربان، لام وایە ئەو ژنەت وەبەر دڵ بکەوێ کە ئەم دوانیوەڕۆیە هاتە ژووری‌و لەگەڵم دوا. دەست بەجێ زانیم لەکاروباری خۆیا گەلێ شارەزایە. لەو ژنە هەڵەو هەرزانە نییە.)

—تا نەیبینین نازانین چۆن دەبێ، خاتو جێدی. هیوادارم بنیادەمێکی باشت بۆ هێنابێتم.[12]

— قوربان پێم گوت جەنابت کار توند دەگری. پێم گوت جەنابت ئاغایەکی پێت خۆشە کار بەدڵی خۆت بچێتە پێش.

— وەڵا وایە.

— گوتی قەیدێ ناکا. گوتی پیاوێکم خۆش دەوێ بزانێ چاكو خەراپ لێك بکاتەوە. دەیگوت هیچ خۆش نییە ئینسان کارێکی بەجێو ڕێ بکا بەڵام کەس پێنەزانێ، هیوادارم ببینی چەندێ شایەن بە کارەکەیەتی.

— منیش هەر ئەوەم لەو دەوێ. لام وایە کاروبارەکەمان باشتر لەجاران بچێتە پێش.

— قوربان هەر واش دەبێ. هەنار تا نەیشکێنی نازانی نێوەکەی چی تێدایە. بەڵام ئەگەر لەمن دەپرسی، ئەو ژنە بەڕاستی دەبێتە خەزێنە بۆ ئەم ماڵە.

بەڕاستی دوایش دەرکەوت کەپریچارد، خەزێنەیەکە بۆ خۆی. کەوشی جۆرێك بۆیاغ دەکرد، کەس شتی وای نەدیبوو. بەیانییەکیان هەواکەی زۆر خۆش بوو ریچارد بەپێیان چوو بۆ ئیدارەو گەلێ بە کەیف خۆشی هەنگاوی دەنا چونکێ پێڵاوەکانی وای بریقەدەدا پیاو خۆی تێدا دەدی. ژنە وا بەجلوبەرگی ریچارد رادەگەیی کەهاوکارەکانی سەریان دەخستە سەرو دەیانگوت لەئیدارەی ناوخۆدا کەس وەك تۆ شیك پۆش نییە. ڕۆژێ کوتوپڕ هاتەوە ماڵێ، دیتی کە ئەوە کۆڵێ گۆرەوی‌و دەسرە، لەحەمام بەتەنافدا دراون تا وشك بنەوە. پریچاردی بانگ کردو گوتی:

(پریچارد، بۆ خۆت گۆرەوی‌و دەسرەکانمت شتوون؟ من لام وایە ئەوەندەت کار هەیە سەرت ناپەرژێتە شتیوا.)

— قوربان لە لیباس — شۆری خراپیان دەکەن. ئەگەر ئیجازەت لەسەربێ، بۆ خۆم لەماڵێ دەیان شۆم.

ریچارد بۆ هەر شوێنێك چووبا، پریچارد زۆر جوان دەیزانی دەبێ کام جلوبەرگ بکاتە بەری‌و بێئەوەی پرسی پێبکا دەیزانی کە شەوێ ئایا

چاکەتی شێوکردنو کراواتی رەشی بۆ بێنێتە دەرێ یان کۆتێكو کراواتێکی سپی، ریچارد کاتێ بۆ میوانی‌یەك چووبا کەپیاو دەبوو خشلٚ بەخۆیا هەڵواسێ، دەیدی بێ‌ئەوەی بۆخۆی بزانێ، ئەوە رەدیفێ میداڵی چکۆلەو جوان لەملیوانی کۆتەکەی دراوە. هێندەی پێنەچوو، ریچارد ئیدی بەیانیان بۆخۆی کراواتی لەگەنجەکە دەرنەدێنا، چونکێ پریچارد هەر راست کراواتێکی بۆ دەردێنا کە بۆ خۆی نیازی بوو هەڵی بژێرێ. سەیر ژنێکی بەسەلیقە بوو. لای وابوو پریچارد نامەکانی دەخوێنێتەوە چونکێ هەمیشە دەیزانی بۆ کوێ دەچێو بۆ کوێ ناچێو بێتوو لەبیری چووباوە کە لەکام وەختو سەعاتدا بڕیارە چاوی بەکەسێ بکەوێ، ئیدی پێویست نەبوو چاو لەدەفتەرچەی یادداشت بکا، چونکێ پریچارد پێی دەگوت. دەیزانی لەپشت تەلەفوون لەگەلٚ کێ چۆن قسەبکا. لەگەلٚ هەموو کەس بەحورمەت بوو جگە لە تاجران کەپێی خۆش بوو بەدەستوورەوە لەگەڵیان بدوێ. لەگەلٚ دۆستانی ئەدیبی ریچارد بەجۆرێك دەدوا و لەگەلٚ ژنی فلانە وەزیری کابینە بەجۆرێکی دیکە.. پریچارد لە دلی دەدا کەریچارد پێی خۆشە لەگەلٚ کێ قسەبکاو لەگەلٚ کێ نەدوێ. ریچارد لەوەتاغی دانیشتنەکەیەوە گوێی تێوە دەبوو کەپریچارد بەشێوەیەکی کە هەر دەتگوت راست دەکا، بەو کەسەی وا هاتبوو سەر لەئاغای هەرینجە هەڵێنێ دەگوت کە ئاغا تەشریفیان لەماڵەوە نی‌یە. پاشان دەهاتە ژوورێو بە ریچاردی دەگوت فلانە کەس بوو تەلەفوونی کرد، بەلام پێم وابوو پێت خۆش نی‌یە سەرو دلٚت بگرن.

ریچارد بەزەردەخەنەیەکەوە دەیگوت: (چاکت کرد، پریچارد.)

پریچارد دەیگوت: (دەمزانی ئەو خانمە دەیویست بەهۆی ئەو کۆنسێرتەوە سەرو دلٚت بگرێ)

وای لێ‌هاتبوو کەهاوەلانی ریچارد ئەبوو لەپێشا چاویان بەپریچارد کەوتبا بۆئەوەی نۆرە بگرنەوە بۆ دیتنی ئەو و شەوانەش کەریچارد دەگەڕاوە ئەو شتانەی کردبووی، بۆی دەگێڕاوە:

(قوربان خانمی سۆومز[13] تەلەفوونی کردو پرسی ئایا دەتوانم رۆژی پێنج شەممەی هەشتەم لەگەلٚ ئاغای هەرینجە نیوەرۆژە بکەم؟ گوتم بەداخەوە لەگەلٚ خانم فرسینده[14] نیوەڕۆژە دەکەی. ئاغای ئۆکلی[15] تەلەفوونی کردو پرسی ئایا سێ‌شەممە سەعاتی شەش تەشریفت دێ بۆ سافۆی[16] و دانیشی لەگەڵیان بخۆیەوە. گوتم ئاغا ئەگەر بتوانێ دێ بەلام لەوانەشە بچێ بۆلای ددانساز.)

– چاکت کرد.

– لام وابوو کاتی خۆی دەزانی پێت دەکرێ بچی یان نا.

پریچارد ولاتی وەك دەستەی گولٚ خاوێن رادەگرت. تازە هاتبووە ئەم ماڵە، رۆژێك ریچارد لەتەحتیلات هاتبۆوە، کتێبێکی لەقەفەسەکە هەلگرت دیتی تۆزیان لێ‌تەکاندووە. لەزەنگی‌دا.

– لەبیرم چوو بلێم کاتێ لەماڵەوە نیم، نابێ بەهیچ جۆرێ دەست لەکتێبەکانم دەی. کتێبێك بۆ تەکاندن بێتەدەرێ، لەجێی خۆی دانانرێتەوە. قەیدی ناکا با کتێبەکانم پیس بن، بەلام زۆرم رق هەڵدەسێ ئەگەر بێتوو دەست بۆ کتێبێ بەرمو نەیدۆزمەوە.

پریچارد گوتی: (ببوورە قوربان. من دەزانم هێندێ لەئاغایان هەن کار توند دەگرن. من هەر کتێبێکی دەرمهێنابێ هەر لەشوێنەکەی خۆیم داناوەتەوە.)

ریچارد هەرینجە تەماشایەکی کتێبەکانی کرد.، هەتا ئەو جێیەی دەیزانی، دیتی هەر کتێبێ راست لەجێی خۆی دانراوەتەوە. بزەیەکی گرت.

– بم بوورە، پریچارد.

–قوربان، زۆر شپرزەبوون هەر کامیانت لێك کردایەتەوە دەستت رەش‌و پیس دەبوو.

پریچارد شت‌ومەکە زێوەکانی جوان راگرتبوو، ریچارد بۆخۆی قەتی نەتوانی بوو ئە ئاوایان پێ رابگا هەستی‌کرد دەبێ سوپاسی لەپریچارد بکا.

گوتی: (زۆربەی ئەم شت‌و مەکە زێوانە هی زەمانی مەلەکە ئان جۆرجی [17] یەکەمن.)

-قوربان دەزانم. وەختێ پیاو شتێکی ئاوا باشی هەبێ، زۆر خۆشە ئەو جۆرەی شایانی‌یەتی، بەدەوری‌دا بێ.

- خوا هەڵناگرێ جوانی لێ‌دەزانی. هیچ خزمەتکارێکم نەدیوە وەك تۆ جوانیان راگرێ.

پریچارد بەخۆبەکەمزانی‌یەوە لەوەلامدا گوتی: (قوربان ئەو تاقەتەی ژنان لەکاردا هەیانە پیاوان نیانە.)

ریچارد هەر ئەوەندەی زانی، پریچارد شانی لەکاری ماڵەکە گەرم داهاتووە، وەك جاران حەوتووی جارێ هاوەڵەکانی بۆ شێو بانگێشت دەکرد. دەیزانی ئەم خزمەتکارە ئەزانێ بەدەوری سفرەو میواندا بێ. بەلام کاتێ کەبەوەی زانی ئەم ژنە میوانداری هەر لە خۆی جوانە، بەراستی هەستی بەسەر بەرزی کرد. بەدەست‌و بردو بێدەنگ‌و ووشیار بوو. هەر ئەوەندەی میوانێ بەمێشکیدا بهاتبا کەشتێکی دەوێ، هەر ئەوەندەی چاوترووکانێ دەگەیشتە سەری دەیگوت چت دەوێ. هێندەی پێ‌نەچوو لەسەلیقەی یەك یەکی هاوەڵانی نزیکی ریچارد بەڵەد بوو. دەیزانی یەکیان لەجیاتی سۆدا [19]، پێی خۆشە ئاو لەگەڵ ویسکی‌یەکەی تێکەڵ کا، یان فلانە هاوەڵ لەڕانە بەرخدا لای گوێزنگەکەی پێ‌خۆشە. دەیزانی هاك [20] دەبێت هێندە سارد بێتەوە کەتامەکەی نەگۆڕێ‌و شەرابی سووری خەست چەندێ لەوەتاغا بمێنێتەوە بۆنی بڵاودەبێتەوە. هەر شیرین بوو چاوی لێ‌کەی کەچۆن شەرابی بۆرگوندی وا لەبتری بەتاڵ دەکا کە نایڵاکێنێ.

- بتریەکەم هەڵپچڕی قوربان. تۆزێك هەڵپچڕابوو، جا بۆیە شەرابە چێمبرتینەکەتم [18] هێنا، گوتم وا باشترە.

- چاکت کرد، پریچارد.

هێندەی پێ‌نەچوو ریچارد ئەم کارانەی بەتەواوی بەپریچارد سپارد، چونکێ زانی ئەم ژنە دەزانێ میوانەکان کێ چ شەرابێکی پێ‌خۆشە. پریچارد بێ‌ئەوەی ریچارد پێی بڵێ، باشترین شەراب‌و کۆنترین ئارەقی لەژێر زەمینەکە دەردێنا بەو مەرجەی کابرای میوان لێی حاڵی‌با چی‌چاکە. سەلیقەی ژنانی لەشەراب ناسینا پێ هیچ نەبوو و کاتێ میوانیەکە ژنی لێ‌بان، پریچارد پێی خۆش بوو شامپاینیان بۆ تێکا. شامپاینیش دەبێ بەرلەوەی تام‌و بۆنەکەی بچێ، بی‌خۆیەوە. هەروەك هەموو خزمەتکارێکی ئینگلیسی، بەدڵ دەیزانی پلەی کۆمەڵایەتی کێ لەگەڵ هی کێ جیاوازی هەیە، کابرا باپلەی کۆمەڵایەتی بەرز بوایە، یان پارەی زۆری هەبا، ئەم هەر دەیزانی کە ئەوە پیاوێکی ماقووڵ نی‌یە، بەلام هێندێکیشی لەهاوەڵانی ئاغای هەرینجە خۆش دەویست‌و بێتوو یەکێکیانی زۆر خۆش بویستایە، لەکاتی شێو کردنا، زۆر بەدزی‌یەوە (وەك پشیلەیەکی قەناری خواردبێ) بتری‌یەك لەشەرابێکی بۆ تێدەکرد کەهەرینجە بۆ هەلێکی زۆر تایبەت داینابوو.

ریچارد دەیگوت: (کوڕە بزانە پریچارد خۆشی دەوێ. لەم شەرابە بەهەموو کەس نادا.)

پریچارد وای لێ‌هات هەموو کەس دەیناسی. بەناوی خزمەتکارێکی گەلێ لەکارزان نێوبانگی دەرکرد، خەڵك بە هیچ شتێکی هەرینجە بەقەت پریچاردی قەرەواش بەخیلیان پێ‌نەدەبرد. دەیان گوت بۆئەوە دەبێ بەزێڕ بیکێشی، دەیانگوت لەیاقووتیش بەبایەخترە. ریچارد هەرینجە کاتێ گوێی لەم تاریفانە دەبوو، گەزگەز باڵای دەکرد.

بەکەیف خۆشی‌یەوە دەیگوت: (ئاغای باش هەر خزمەتکاری باشی دەبێ.)

شەوێکیان، میوانەکان دانیشتبوون شەرابی پۆرتیان [31] دەخواردەوە. کاتێ پریچارد لەدیوەکە چووە دەرێ، باسیان کرد.

— بێتوو ئەم خزمەتکارە بەجێت بێڵێ، ماڵ وێران دەبی.

— جا بۆ بەجێم بێڵێ؟ یەك دوو نەفەر ویستوویان پریچاردم لەدەست بکەنەوە، بەڵام بەقسەی نەکردوون. ئەو بۆخۆی باش دەزانێ کەلەکوێ‌ی باشی بۆ دەگوزەرێ.

— کوڕە هەر لەم ڕۆژانەدا مێرد دەکا.

—پێم وانی‌یە ئەو لەو جۆرە ژنانەبێ.

— ژنێکی جوانە

— ئەرێ، زۆریش پاكو ڕاستە.

— ئەرێ ئەوە ئێوە دەڵێن چی. ئەوە یەكجار جوانە. بێتوو خزمەتکار نەبا دەبوو بەمەلەکەی جوانیو وێنەیان لەگۆڤارەکانا لەچاپ دەدا.

لەوکاتەدا پریچارد قاوەی هێنا ریچارد هەرینجە چاوێکی لێ‌کرد. چوار ساڵ بوو هەموو ڕۆژێ پریچاردی دیبوو، کەچی لەبیری نەبوو چۆنە. لەوەنەدەچوو لەچاو هەوەڵ ڕۆژی کەدیتبووی، گۆڕابێ. لەچاو ئەو وەختی قەڵەوتر نەبوو، هەر واسپیکەلانە بوو. هەروەك جاران ڕێكو پێك بوو. یونیفۆرمە رەشەکەی زۆر لێ‌دەکاڵاوە. پریچارد لەوەتاغەکە چووە دەرێ.

— وەڵا پیاو دەبێ ڕێو شوێنی لێ‌هەڵگرێ.

هەرینجە لەوەڵامدا گوتی: (وەڵا وایە. ئینسانێکی بەرزە. لێم دیار نەبێ، ماڵ وێران دەبم. بەڵام سەیر ئەوەیە من زۆرم خۆش ناوێ.)

- ئاخر بۆ؟

— پێم وایە تۆزێك ددان بەجەرگی‌دا دەنێ کە لەگەڵم هەڵکا. هەتا پرسیاری لێ‌نەکەم قسە ناکا. چوار ساڵە قەت نەبووە بەویستی خۆی قسەیەکی لەگەڵ کردبێتم. نازانم خۆشی دەوێم یان هەر وانازانێ سەریشم پێ‌وەیە. دەڵێ‌ی بنیادەمی دەستکردە. ڕێزو حورمەتی لای من هەیە. بڕوام پێ‌ی هەیە. ئەوەی خووی باش لەدونیایا هەبێ، هەیەتی، بەڵام زۆرجار لەخۆم پرسیوە کە بۆ سەرەڕای هەموو ئەو شتانە وانازانم سەریشی پێ‌وەیە؟ لێم وایە هۆیەکەی ئەوەبێ کە ئەو ژنە، هیچ دڵڕفێن نی‌یە.

ئەو قسانە لێرەدا دوایی هات.

دوسێ ڕۆژ دوای ئەم قسانە، هەرینجە بەتەنێ لەکلووبەکەی‌دا شێوی کرد چونکێ پریچارد ئەو شەوە لەمەرەخەسی بوو و ئەمیش بڕیاری چاوپێکەوتنی بەکەس نەدابوو. کوڕێکی خزمەتکار هاتە لای و گوتی لەئاپارتومانەکەوە تەلەفوونیان کردووە دەڵێن بێ‌کلیل هاتوویتە دەرێو ئایا پێت خۆشە بەتاکسی بێن و کلیلەکانت دەنێ؟ دەستی کرد بەگیرفانی‌دا. دیتی وایە، کلیلەکانی لێ‌بەجێ‌ماوە. کاتێ جلوبەرگی گۆڕی بوو و کۆتو شەرواڵە ئاوییە پەشمەکەی کردبۆبەر، بەرلەوەی وەدەرکەوێ بۆ شێوکردن، لەبیری دەچێ کلیلەکان لەگیرفانی لیباسەکانی پێشووی دەرهێنێ. ویستبووی بچێ بریج (قومار) بکا، بەڵام ئەو شەوە یەکێ لەشەوانی هەینی کلووبەکە بوو و وادیار بوو بۆئەوە نەدەبوو پیاو کایەیەکی بەجێ‌و ڕێ بکا. ریچارد هەرینجە لێبڕا بچێ تەماشای فیلمێ بکا کەتاریفی بیستبوو. جا بۆیە بەو کوڕە خزمەتکارەدا هەواڵی نارد گوتی نیو سەعاتی دیکە بۆ خۆم دێمەوە بۆ کلیلەکان.

لەزەنگی ئاپارتومانەکەی‌دا، پریچارد دەرگای لێ‌کردەوە. کلیلەکانی پێ‌بوو.

پرسی: (پریچارد ئەوە لێرە چ دەکەی؟ ئاخر خۆ ئەمشەو مەرەخەسی.)

— بەڵێ قوربان. من هێندەم حەز لەچوونە دەرێ نەدەکرد جابۆیە بەخانم جێدیم گوت تۆ لەباتی من وەدەرکەوە.

ریچارد هەروەك جاران چووبووە ماڵی فکرەوەو گوتی:

(دەبێ هەر کاتێ هەڵێکت بۆ هەڵکەوێ، وەدەرکەوی. هیچ باش نی‌یە بیستو چوار سەعاتە خۆت لەماڵی‌دا زیندانی کەی.)

- جارویار کە کارێکم دەبێ وەدەردەکەوم، بەڵام مانگێکە شەوانە نەچوومەتە دەرێ.
- ئاخر بۆ؟
- هیچ خۆش نیە؟ ئینسان بەتەنیا دەرکەوێو جارێ کەسی واش ناناسم پێم خۆش بێ لەگەڵی وەردەکەوم.
- جارویار دەبێ بچی رابوێری. بەقازانجتە.)
- هەرچی بێ وازم لەسەری نەماوە.
- چاو، من دەچم بۆ سینەما. پێت خۆشە لەگەڵم بێی؟

ئەم قسانەی کوتوپڕ لەڕووی مێهرەبانی‌یەوە بەزاردا داهاتو دەست بەجێش برێك پەشیمان بۆوە.

پریچارد گوتی: (بەڵێ قوربان، پێم خۆشە.)
- کەوابێ زووکە بچۆ کڵاوێ بکە سەرت.
- ئەوە دێم.

پریچارد وون بوو. ریچارد چووە وەتاغی میوانانو سیگارێکی داگیرساند. تۆزێك سەری لێ‌ماسی بوو نەیدەزانی چ بکا، لەلایەکی دیکەشەوە کەیف خۆش بوو. زۆر خۆشە پیاو بتوانێ ئاوا بێ دەردی سەر بنیادەمێکی دیکە کەیف خۆش کا. پریچاردیش بنیادەمێکی وانەبوو سەری لە شتەکە سوورمابێ یان کەوتبێتە داوی دوو دڵی. ریچاردی پێنج دەقیقە، مەحتەل کرد. کاتێ هاتەوە لای، ریچارد دیتی جلوبەرگی گۆڕیوە. کۆتێکی درێژی ئاوی کردبووە بەر کەبەئەقڵی ریچارد لەوەدەچوو لەهەورێشمی دەستکرد تەواوکرابێ. کڵاوێکی رەشی چکۆلانەی لەسەر کردبوو. گیرەیەکی ئاوی لەکڵاوەکە دابوو. مل بەندەکەی رێویەکی زێوی پێوە هەڵواسرابوو. ریچارد تۆزێك دڵی حەساوە لەوەی کەبەرگ لەبەر کردنەکەی پریچارد نەشلو شەوێق بوو نەوابوو خەڵك قوشقی کا. بێتوو کەسێ بی‌دیبایەن نەیدەزانی ئەمە مەقامێکی پایە بەرزی وەزارەتی ناوخۆیەو خەریکە لەگەڵ خزمەتکارەکەی دەچێ بۆ سینەما.

-قوربان، بم بوورە مەحتەلم کردی.

ریچارد بەلێبووردنەوە گوتی : (قەیدێ ناکا.)

دەرکەی پێشەوەی ئاپارتومانەکەی بۆ کردەوەو ئەمیش وە پێش ریچارد کەوت. ریچارد کەوتەوە بیری حکایەتێکی بەناوبانگی لویسی چواردەهەمو یەکێ لەدەرباریانیو زۆری پێ‌خۆش بوو کەپریچارد بێ‌ئەوەی فوو لەدۆ بکا وەپێشی کەوتبوو. سینەماکەی بۆی دەچوون لەئاپارتومانەکەی ئاغای هەرینجەوە دوور نەبوو و بەپێ‌یان چوون. ریچارد باسی هەواو وەزعی جادەکانی دەکرد. ئەمجار لەسەر هیتلێر رۆیی. پریچارد بەجێ‌وڕێ وڵامی دەداوە. کاتێ گەیشتنە سینەما، تازە خەریك بوو کارتۆنی مشکێ بەناوی میکی [22] دەستی پێ‌دەکردو زۆریان کەیف بەم پێش پەردەیە خۆش بوو. ریچارد هەرینجە لەماوەی ئەو چوار ساڵەدا کە ئەم ژنە لەماڵی ئەوا کاری کردبوو، لەوانەیە تەنانەت نەشی دیبوو بزەیەکی بێتەسەر لێوانو لەوەی کەدەیبیست پریچارد قاقا پێ‌دەکەنێ، سەیر کەیفی سازببوو. پاشان فیلمەکە دەستی پێ‌کرد. فیلمی چاك بوو و هەردووکیانی شاگەشکە کردبوو. ریچارد قوتووی سیگارەکەی دەرهێنا، سیگارێکی داگیرسێنی، بێ‌ئاگا. خولکی پریچاردی کرد سیگار هەڵگرێ.

پریچارد سیگارێکی هەڵگرتو گوتی: (سوپاست دەکەم.)

ریچارد سیگارەکەی پریچاردی داگیرساند. پریچارد هەرچاوی لەفیلمەکە بوو و وەك بڵێی ئاگای لەم کارەی ریچارد نەبوو. فیلم تەواو بوو و وێڕای خەڵکەکە رژانە خیابان. بەپێ‌یان بەرەو ئاپارتومانەکە گەڕانەوە. شەوێکی خۆش بوو. ئاسمان پڕبوو لەئەستێرە.

ریچارد گوتی: (فیلمەکەت پێ‌خۆش بوو؟)
- یەکجار زۆر، قوربان. زۆر خۆش بوو.

ریچارد فکرێکی بەمێشکدا هات:
- ئەرێ شێوت کردووە؟
- نەخێر قوربان، پێم نەکرا.
- برسیت نی‌یە؟

- بابچینەوە ماڵی، تۆزێ نان و پەنیر دەخۆم و فنجانێ کاکاویش لێدەنێم.

ریچارد گوتی: (ئاوا زۆر ناخۆشە.) هەر دەتگوت هەموو دونیا کەیف خۆشە و ئەو بنیادەمانەی بەپەنایانا تێدەپەڕین وەك شتێك دەتگوت بەجۆرێ دڵ خۆشن. ریچارد لەدڵی خۆیا وتی کوڕە هەرچی بادا باد و بەپریچاردی گوت: (چاو، پێت خۆشە پێکەوە بچین لەشوێنێ، شێوبکەین.)

- قوربان ئەگەر تۆ پێت خۆشە.

- دەبا بڕۆین.

ریچارد بانگی تاکسی کرد. هەستێکی گەلێ بەشەر دۆستانە لەناخیا پێك هاتبوو و هیچ رقیشی لەو هەستە نەبوو. بەلێخوڕەکەی گوت بیانبا بۆ رێستۆرانێ کەهەڵپەرکێی لێبوو بەلام هەرینجە دڵنیابوو کەلەوێ تووشی ناسیاو نایەن. رێستۆرانەکە ئورکیستری لێبوو و خەڵك تیا هەڵدەپەڕین. پریچارد لەدیتنیان کەیف خۆش بوو. کاتێ دانیشتن گارسۆنێك هاتەلایان.

ریچارد گوتی: (لەم رێستۆرانە شێو بەشێوەی دەستێکی تەواویش دەدەن) و پێی وابوو پریچارد ئەوەی پێخۆشە و لەپاشگری قسەکەیا لێپرسی: (بەقسەی من بێ، دەشێ لەو شێوە بخۆین. تۆ چت پێخۆشە بخوێنەوە؟ لەگەڵ تۆزێ شەرابی سپی چۆنی؟)

پریچارد گوتی: (لیوانێ ئابجۆی زەنجەفیل دار دەخۆمەوە.)

ریچارد هەرینجە دەستووری ویسکی و سۆدای بۆ خۆیدا. پریچارد زۆر بەئیشتیاوە شێوی کردو ریچارد با ئەوەی برسی نەبوو لەبەرئەوەی پریچارد شێوەکەی وەگیان بکەوێ، پرووشەی دەکرد. هەر ئەو فیلمەی دیتبوویان بووە هۆی ئەوەی شتێك لەگۆڕێدا بێ باسی لەسەر بکەن. ئەوەی شەوی پێشوو میوانەکان سەبارەت بەجوانی ئەم ئافرەتە گوتبوویان پڕ بە پێستی بوو و تەنانەت ئەگەر کەسێکیش ئەمانی پێکەوە بدیبا، بۆ ریچارد گرینگ نەبوو. کوڕە هاوەڵەکانی ئەقڵێکی خۆشیشیان وەگیر دەکەوت و ئەویش ئەوەبوو کەریچارد هەرینجە لەگەڵ بنیادەمێکی لەخۆی خوارتر چووە بۆ سینەما و پاشان پێکیشەوە لەدەرێ شێویان کردووە.

ریچارد گوتی: (پێت خۆشە هەڵپەڕین؟)

پریچارد گوتی: (کچی کەس لەهەڵپەڕیندا تای منی نەدەکرد. پاش ئەوەی مێردم کرد، ئیدی هێندە هەڵنەدەپڕیم. مێردەکەم هێندێ لەمن کورتتر بوو و بێتو پیاوەکە کەڵەگەتتر نەبێ بەکارنایە، نازانم لەمەبەستم حاڵی هەی یان نا. پێم وایە بەینێکی دیکە پیردەبم و ئیتر هەڵپەڕین بۆ من نابێ.)

ریچارد هەڵبەت لە خزمەتکارەکەی کەڵەگەتتر بوو، ئەم جووتە لێك دەکاڵانەوە. ریچارد زۆری کەیف لەهەڵپەڕین بوو و جوانیش دەڕەخسی. بەلام تێدامابوو، نەیدەزانی چ بکا. نەیدەویست روو لەخزمەتکارەکەی بنێ کەلەگەڵی بڕەخسێ. رەنگ بوو واباشتر بێ زۆر پێی لێ رانەکێشێ بەلام بۆ هێندەی فوو لەدۆکردبا؟ ئەم ژنە ژیانێکی بێتامی هەبوو. بنیادەمێك زۆر ئاقڵیش بوو و ریچارد سوور دەیزانی ئەگەر پریچارد رەخسینی پێکارێکی ناحەز بێ بیانوویەکی وا دێنێتەوە کە لەدڵ گران نەبێ.

کاتێ خەڵکەکە دیسان ملیان ناوە لە هەڵپەڕین، ریچارد گوتی: (نایەی دەورێ هەڵپەڕین، پریچارد؟)

- لەمێژە هەڵنەپەڕیوم، قوربان.

- قەیدێ چ دەکا؟

زۆر لەسەرخۆ وەلامی داوە: (ئەگەر لای تۆ شتێك نییە، من حازرم قوربان.) و لەسەر کورسییەکەی هەستا. دەنگێ شەرمی نەدەکرد. هەر لەوە دەترسا بەپێی ریچارد دەرنەچێ. بەرەو شوێنی سەما کردنەکە کەوتنەرێ، ریچارد دیتی پریچارد زۆر جوان هەڵدەپەڕێ.

گوتی: (پریچارد، خۆ زۆر جوان هەڵدەپەڕی.)

- خەریکی وەبیرم دێتەوە.

پریچارد بائەوەی ژنێکی زەلام بوو، باوی لاقی گەلێ خۆش بوو و هەر بەدڵ لەهەوای هەڵپەڕینەکەی دەزانی. زۆریش خۆش بوو پیاو لەگەڵی هەڵپەڕێ. ریچارد لەو ئاوێنانەدا لەدیوارگیرابوون سەرنجێکی خۆیانیداو بەخۆی نەبوو ئەم بیرە بەمێشکیدا هات کەهەردووکیان زۆر لێك دەکاڵێنەوە. لەئاوێنەدا چاویان بەچاوی یەك کەوت. ریچارد لەدڵی خۆیا پرسی بلێ ئەویش هەر ئەو بیرەی منی بەمێشکدا بێ. دوو گەڕی دیکە پێکەوە هەڵپەڕینو ریچارد هەرینجە گوتی بابڕۆین. ریچارد پووڵی خاوەن رستورانیدا. وەدەرکەوتن. ریچارد دیتی پریچارد بێئەوەی بۆخۆی بزانێ زۆر بەزەریفی بەنێو خەڵکەکەدا شەقاو هەڵدێنێ. تاکسیێکیان گرتو پاش دە دەقیقە گەیشتنەوە ماڵێ.

پریچارد گوتی: (بەدەرکەکەی پشتەوە را دێمە سەرێ، قوربان.)

- جا بۆ وا دەکەی؟ هەر لەگەڵ من وەرە سەرێ.

ریچارد، پریچاردی لەگەڵ خۆی بردە سەرێ.

بەساردو سڕی چاوێکی لەدەرکەوانەکەی شەوێ کرد، هەتا سەری سووڕنەمێنێ لەوەی کە ئەم بەو نیوەشەوەو ئاوا درەنگ وەخت لەگەڵ خزمەتکارەکەی هاتۆتەوە ماڵێ. ریچارد دەرکەی ئاپارتومانەکەی بۆ پریچارد کردەوە.

پریچارد گوتی: (دەی، قوربان، شەوت خۆش. سوپاست دەکەم. شەوێکی خۆش بوو.)

- ئەزقەزا ئەمن سوپاست دەکەم، پریچارد. بێتوو ئەمشەو بەتەنیا بام زۆر وەڕەز دەبووم، هیوادارم لەدەرێ خۆشت لێگوزەرابێ.

- قوربان، خۆشم لێگوزەرا. ئەوەندە خۆش بوو ناتوانم بەزمان بڵێم.

- دیاربوو کارەکە زۆر جوان چوو بووەسەر. ریچارد هەرینجە گەلێ رازی بوو لەوەی کردبووی. کارێکی مێهرەبانانەی کردبوو، زۆر خۆشە پیاو کەسێك ئاوا دڵ خۆش کات.

بەبۆنەی ئەو پیاوەتی‌یەی کردبووی، شایی لەدڵی گەڕاو تاوێك ئاگری ئەوینی ئینسانەکان لەناخیا بڵێسەی سەند.

گوتی: (شەوت خۆش، پریچارد.)و چونکێ شادو کەیف خۆش بوو باسکی لەنێو قەدی پریچارد هاڵاندو لێوی ماچ کرد.

لێوی پریچارد وەك پەڕەی گوڵ نەرم بوو، لێوی پریچارد لەسەر لێوی ریچارد ماوەو پاشان ئەویش لێوی ریچاردی ماچ کرد. باوشی پریچارد، باوشی گەرمو پڕ نشتیای ژنێکی سالم بوو لەباشترین قۆناغی ژیانیدا. ریچارد باوەشی ئەم ژنەی گەلێ بەکەیف بوو وبڕێکی دی لەخۆی نزیك کردەوە. پریچارد باسکی لەگەردنی ریچارد هاڵاند.

ریچارد جاران هەتا وەختێ کەپریچارد دەهاتە ژوورێو نامەکانی بۆ دێنا، لەخەو هەڵنەدەستا. بەلام، بەیانی پاش ئەو شەوە، سەعاتی حەوتو نیو هەستا. هەستێکی سەیرو نامۆی هەبوو. شەوان دوو بالنجی دەنا ژێر سەری، بەلام لەپڕ بەم راستەقینەیە گەیی کەشەوی پێشوو تاقە بالنجێکی لەژێر سەرابووە. پاشان هەموو شتێکی هاتەوە بیرو بەحەپەساوی سەرنجی ولاتی دا. بالنجەکەی دیکە، لەپەنا بالنجەکەی خۆی دانرابوو. دیتی سوپاس بۆ خوا، ئەو بالنجەی پەنای وی، سەری کەسی لەسەر نیە، بەلام سوور دیاربوو کەلەوەپێش یەکێ سەری کردۆتە سەر. دڵی داکەوت. ئارەقەیەکی ساردو سڕ لەشی داگرت.

هاواری کرد: (هاوار، من چەندێ گەوج بووم)

دەیگوت من چۆن کاری ئاوا گەوجانەم کردووە؟ چۆن خەیاڵیوا لەکەللەی داوم؟ ئاخر کێ جگە لەمن لەگەڵ قەرەواشو شت خەریك دەبێ؟ ئای لەم شوورەیی‌یە جا ئەویش پیاو ئە لەو عومرەداو پلەیەکی ئاواشی هەبێ. گوێی لەخشپەی پریچارد نەبوو کەبلێ رایکردووە.

دەشی گوت لەوانەیە لەخەو دابوو بێتمو ئاگام لێنەبوو بێ. هەر دەشت گوت پریچاردی خۆش

نەویستووە. ئاخر خۆ پریچارد هاوشانی ئەو نەبوو. و هەروەکی شەویکیان گوتبووی، بریکیش لەم ژنە وەڕەز بوو. تەنانەت ئێستەش لەلای ئەم، ئەو ژنە هەر پریچاردەکەی جاران بوو. هێشتا نێوی چکۆلەی ئەوی نەدەزانی.

کوڕە تۆ تەماشا ئەو شێتییە بڵێی کارەکە بەکوێ بگا؟ کوڕە شتیوا هەرنابێ. دیاربوو ئیدی نەیدەتوانی ئەم ژنە راگرێ، بەڵام ئەگەریش ئەم ژنە بەهۆی ئەو کارەساتەی کە بۆ خۆی بەقەرا ژنە تیا تاوانبارە، دەرکا دەبێتە بێئینسافی. جا چەندێ گەوجانەیە ئەو کارە کەپیاو خزمەتکاری ئاوا بێوێنە لەبەر خاتری سەعاتێ کەریەتی خۆی، دەرکا!

بۆڵاندی بەسەر خۆیا: (هەمووی لەژێر سەری ئەو دڵە بەزیاد نەبووەم دایە.)

کوڕە جاکێی دیکەی دەست دەکەوت وەك ئەم ئاگای لەجلوبەرگەکەی بێتو شتومەکە زێوەکانی ئاوا خاوێن راگرێ. پریچارد شومارە تەلەفوونی هەموو هاوالەکانی ئەمی دەزانیو شەرابی جوان دەناسی. بەڵام هەرچی بێدەبێ لەم ماڵە نەمێنێ. پریچارد دەبێ بۆ خۆی بزانێ دوای ئەو شتەی دوێنێ شەو قەوماوە، ئیدی جێی لەم ماڵەدا نییە.ریچارد ئەبێ بە دیاریەکی جوانەوە لەو ماڵە دەریکا.

ها ئەوە ئەلحان نا ئەلحان پریچارد دێتە ژوورێ.

بڵێی یەکجار گەرمو گوڕ بێ بڵێی گفتولفتەکەی وەك جاری جاران بێ؟ بڵێی بەسەرخۆی بێنێ؟ لەوانەش بوو ئیدی وەك جاران بەخۆیو نامەکانی ئەمەوە نەیەتە ژوورێ، جا چەندێ ناخۆش دەبێ ئەم لەزەنگ داو خانم جێدی بێتە ژوورێو بڵێ: (قوربان پریچارد هێشتا لەخەو هەڵنەستاوەو لەدوێ شەوەوە لێی راکشاوە.)

—کوڕە تەماشا ئەو کەریەتییەی من! تەماشا ئەو ژنە تیوە ناجسنە هیچو پووچە!

لەدەرکەیان دا. رۆحی پێنەما.

- وەرە ژووری.

ئەورۆ، ریچارد هەرینجە پیاوێکی گەلێ رۆژە رەش بوو

پریچارد لەگەڵ زرینگەی سەعاتە دیواریەکە هاتە ژووری. هەرئەو بەرگەی لەبەرابوو کەهەموو رۆژێ سەر لەسبەینان لەبەری دەکرد.

گوتی: (قوربان، بەیانیت باش.)

- بەیانیت باش.

پریچارد پەردەکانی لاداو نامەکانو کاغەزەکانی دایە. هیچ شتێك لەدەمو چاویا بەدی نەدەکرا. پیاو هەر وەك جاری جارانی دەهاتە بەرچاو. رەفتاری هەر وەك جاران، بەجێو رێبوو.

- قوربان بەرگە خۆڵەمێشیەکەت لەبەردەکەی؟ دوێنێ لەلای خەیات هێناویانەوە.

- ئەرێ.

ریچارد بەقەستی خۆی خەریکی خوێندنەوەی نامەکان کردبوو، ئەما سیلەی چاویشی لەپریچارد بوو، پریچارد پشتی لەم بوو. کۆتو شاروالەکەی ئەمی هەڵگرت، دای بەسەر کورسیەکەدا. دۆگمەی کراسەکەی کە ریچارد رۆژی پێشەکی لەبەری کردبوو، کردەوەو لەکراسێکی خاوێنی دان. چەند گۆرەوی خاوێنی بۆ دەرهێنا، بەکێشەکانیانەوە بەکورسیەکەیدا دان. پاشان کۆتو شاڕواڵە شینکییەکی دەرهێناو بەندەکانی بە دوگمەکانی پشتەوەی شاڕواڵەکە داخست. گەنجە کەی کردوەوەو پاش برێك بیر لێکردنەوە، کراواتێکی هەڵبژارد کە لەکۆتو شاڕواڵەکە بکاڵێتەوە ئەو کۆتو شاڕواڵەی کە ریچارد رۆژی پێشوو لەبەریابوو، دا بەسەر دەستیاو کەوشەکانی هەڵگرت.

- قوربان نانو چای بەیانی دەخۆی یاحەمام دەکەی؟

- نانو چای دەخۆم.

- زۆر باشە قوربان.

پریچارد لەسەرخۆ، بێهەستو بێخشپە، لەدیوەکە چووە دەرێ. نیگای هەر وەك جاران و

پڕ لەحورمەت بوو بەڵام هیچ هەستێکی تیابەدی نەدەکرا. ئەوەی شەوی پێشوو هاتبوو بەسەردا، لەوانەبوو هەر خەو و خەیاڵ بوو بێ. دەمو چاوی لەوەنەدەچوو بیری شەوی پێشووی تیابەدی بکرێ. ریچارد بەدڵێکی ئاسوودەوە هەناسەیەکی هەڵکێشا. وا دیار بوو شتەکە بەخێر گوزەراوە. پێویست نەبوو پریچارد لەم ماڵە بڕوا، کوڕە نەوەڵلا پێویست نەبوو بڕوا. پریچارد خزمەتکارێکی بێوێنەبوو. ریچارد دەیزانی ئەم ژنە نە بەقسەو نەبە هەستان‌و دانیشتن، باسی ئەو راستەقینەیەی نەدەکرد کەساتێ نێوانی ئەم جووتە لەئاغاو قەرەواشی دەرچووبێ. ریچارد هەرینجە پیاوێکی گەلێ بەختەوەر بوو.

. Richard Harenger

. Ecclesiastes

. ئەرەستۆ، فەیلەسوفی یۆنانی کۆن دەیگوت بەختەوەری لەمەدایە کەپیاو لەهیچ شتێکدا زیادەڕەوی نەکا.

. وڵتەر پیتەر walter peter (1839-1894) نووسەری ئینگلیسی، کەڕەخنەگری ئەدەب‌و هونەربوو لەئاخری کتێبەکەیا کەناوی (رێنسانس)ە بەخوێنەرانی خۆی دەڵێ: (باناگرێکی سووری وەك یاقووت لەناختانا بڵێسە بستێنێ.)

. Home office ئیدارەیەکی ئینگلیسە کەبەکاروباری ناوخۆ ڕادەگا. مەقامە پایەبەرزەکانە، هۆم ئۆفیس لەبەرچاوی خەڵکی ئینگلستانیش بەرزن.

. Bridge جۆرە قومارێکی چوار کەسیە کەبەوەرەق دەیکەن. (و.)

. golfجۆرە کایەکی وەك گۆیەن یان کاشۆ (و.)

. Jones Wood

. White Hall

. Queen Anne

. Prichard

. Jeddy

. Soames

. Virinder

. Oakley

. Savoy

. George I

. chamberitin

. Soda

. hock شەرابی سپی ئاڵمانی

. port شەرابێکی شیرینە لەپورتوگاڵ دروست دەکرێ.

. Mickey

# لێکۆڵینەوەیەک و دەقێک

(پۆست مۆدێرنیزم)

- چیرۆکی پۆست مۆدێرن

- راپۆرت (کورتە چیرۆک)

# چیرۆکی پۆست مۆدێرن

شەهریار وەقفی پوور

• و: عەتا نەهایی

(( **پۆست مۆدێرنیزم چییە؟** ))

بەراست پۆست مۆدێرنیزم ئاماژە بۆ کامە بابەت دەکا؟ دۆنالد بارتلمە، کە یەکێکە لە نووسەرە بەناوبانگەکانی پۆست مۆدێرنیزم گەمە بەم زاراوەیە دەکاو دەڵێ: ئەگەر مۆدێرنیزم بوونە لە هەنووکەو زەمەنی ئێستادا. پۆست مۆدێرنیزم بوونە لەداهاتوودا. کەواتە چیرۆکی پۆست مۆدێرنیستی چیرۆکێکە کە هێشتا نەنووسراوە.

بەپێی بۆچوونێکی تر پۆست مۆدێرنیزم پێداگرتنە لەسەر مۆدێرنیزم. جان گاردنێر دەڵێ: ((لە راستیدا پۆست مۆدێرنیزم بەمانای نوێیە، بەمانای پێشکەوتوو.)) هەروەها بروک رۆز پێی وایە: ((پۆست مۆدێرنیزم مۆدێرنترە لە مۆدێرن)) دوای ئەم بۆچوونانە رەنگە چاکتر وابێ لەبری ((پۆست مۆدێرنیزم)) (لەدوامۆدێرنیزم) لە ((زۆر مۆدێرنیزم)) (most modernism) بدوێین [1].

بەبڕوای من ئەگەر لەروانگەیەکی ترەوە بۆ ئەم زاراوەیە بڕوانین، دەتوانین چاکتر راڤەی بکەین. واتە لەبری ئەوەی بمانەوێ وەك بارتلمەو گاردنێر ئەم زاراوەیە بەشێوەی ((پۆست مۆدێرن)) یزم بخوێنینەوە، بەشێوەی پۆست ((مۆدێرنیزم)) یان پۆست ((مۆدێرن))یزم بیخوێنینەوە. بەم شێوەیە چاکتر دەتوانین لەگوتاری (discourse) سەردەم تێبگەین. لەم دۆخەدا پۆست مۆدێرنیزم بەمانای دابڕانێکی مێژوویی نیە، بەڵکو حەتمی بوونی مۆدێرنیزمە.

پۆست مۆدێرنیتە هەمیشە لەرووبەڕووبوونەوە لەگەڵ مۆدێرنیتەدا وەبیر دێتەوە. لەبەر ئەوەی چاك ئاگادارە ((مۆدێرنیزم هەتا هەتاییە)) یان مۆدێرنیزم لە بنەڕەتەوە پرۆژەیەکی بێ کۆتاییەو ئێمە ناچارین لە کەلاوەکانی مۆدێرنیتەدا بژین. بەکارهێنانی پێشگری ((پۆست= لەدوا)) ئەوەمان بیر دەهێنێتەوە کە ئاخاوتن لەمەڕ پۆست مۆدێرنیتە بڕواهێنانە بەوەی کە مۆدێرنیزم هێشتا نەگەیشتۆتە کۆتاییو وێڕای هەموو قەیرانەکانی هێشتا زیندووە. هەر وا کە ریچارد کۆستلانتێز

ئاماژەی بۆ دەکا؛ ((پۆست پێشگرێکی مەخابن ئامێزە. بزاڤە گەورەکان هەمیشە بەتایبەتمەندیەکانی خۆیانەوە پێناسە دەکرێن، نەک بە پەیوەندیان بە شتەکانی ترەوە.. هیچ هونەرمەندێکی پێشڕەو حەزناکا لەدوای خۆیەوە شتێك لەئارادا بێ.)) بەپێی ئەم یاسایە چاکتر وایە لەبری پۆست مۆدێرنیزم زاراوەی مۆدێرنیزمی هوشیار بەکاربێنین[2].

بەرەچاوگرتنی ئەم بۆچوونانە پۆست مۆدێرنیزم بەمانای دەوامەی خودی مۆدێرنیزمە، نەوەك دەوامەی ئەوەی لەدوا مۆدێرنیزم دێ. لێرەدا پرسیارێك دێتە ئاراوە. چیرۆکی پۆست مۆدێرنیستی چۆن وەلامی پرسیارەکانمان لەمەڕ وێنە، گێڕانەوە، کاراکتەرو.. دەداتەوە؟ ئەگەر نموونەکانی ئێمە بۆ پێناسەکردنی چیرۆکی پۆست مۆدێرن نووسراوەکانی بارتلمە، براتیگانو کالوینۆ بێ، دەبێ چیرۆکی پۆست مۆدێرنیستی بە بزاڤێك بزانین کە سەنعەتە سەرەکیەکانی لەبەرامبەر سەنعەتەکانی مۆدێرنیزمی سەرەتای سەدەی بیستەمدا دەوەستێ.

بەبۆچوونی فۆرمالیستەکان دەبێ مێژووی ئەدەب وەك مێژووی بالادەستی سەنعەتێك لەبەرامبەر کۆمەڵێ سەنعەتی ترو، پرسیارێك لەبەرامبەر پرسیارەکانی تر[3]، لێك بدەینەوە، بەم بۆچوونە مێژوو دەبێتە خوێندنەوەی ((ورد بوونەوەی هەر سەردەمێك لەیاساکان، پێناسەکانو، تەکنیکەکانی)) هەروەها نیشاندەری دەسەلاتی ڕێگاچارەیەکە بەسەر ڕێگاچارەکانی تردا.

کەسانێکی وەك دەیوید لاج پێنج تایبەتمەندی بۆ دەقێکی پۆست مۆدێرنیستی ناو بردە دەکەن. دژایەتی (تناقض)، بێنەزمی (عدم انسجام)، ڕێکەوت، زێدەڕەویو پەیوەندی کورت[4] (Short Circuit). کەواتە بۆ ئەوەی دەقێك لە ژانرێکدا جێی ببێتەوە پێویستە لەگەڵ تایبەتمەندیگەلێك بگونجێ. بەم بۆچوونە، کاتێ ڕووبەڕووی ئەو دەقانە دەبینەوە کە تەکنیکو سەنعەتی تازەتریان بەکارهێناوە، لەڕاستیدا ڕووبەڕووی چیرۆکی پۆست مۆدێرن یان هاوشێوەکانی بووینەتەوە. هەروەها پێشتر لەسەر ئەوە ساغ بووینەتەوە کە پۆست مۆدێرنیزم جۆرێك قوتابخانەیە نەك باروودۆخ[5].

ئیهاب حەسەن لەبوارێکی ترەوە بۆ بابەتەکە دەچێو حەوت سەردێڕ بۆ چیرۆکی پۆست مۆدێرن ناوبردە دەکا، کە بریتین لە: خووگرتن بەژیانی شاری (urbanism)، ناچاری کەڵك وەرگرتن لە تەکنۆلۆژی، سڕینەوەی مرۆڤ (dehumanization)، حەز کردن لە ژیانی سەرەتایی (بدوێت)، ئێرۆتیزم، دژایەتی ئەخلاق (antinomianism)، و ئەزموونگەریوون. ئالێم ئەم دابەشکردنانە بێسوودن، بەلام ئێمە هەرگیز ناتوانین بەیارمەتی ئەمانە دەقێك بخوێنینەوە، یان شی بکەینەوە. کەواتە چاکتر وایە دیسان ئاوڕ لە بۆچوونی پێشوو بدەینەوەو، هەر سەردەمێك بەبالا دەستی پرسیارێك بەسەر پرسیارەکانی تریدا هەڵسەنگێنین. بۆ ئەم مەبەستە پێویستە بزانین مۆدێرنیزمو پۆست مۆدێرنیزم پێ لەسەر کامە پرسیار دادەگرن[6].

بەخوێندنەوەی بەرهەمە مۆدێرنیستیەکان وەك ((هێڵنج))ی سارتەر، (توورەییو هەراو هوریا))ی فۆکنەر، ((بەرەو فانووسی دەریایی)) ڤیرجینیا وۆڵفو، ((دوو بلینیەکان))ی جیمز جۆیس، ڕووبەڕووی ئەو دەقانە دەبینەوە کە بەشێوەیەکی ناتەواون. واتە لەم بەرهەمانەدا کۆتاییو ئەنجام (وەهاکە لەدەقە کلاسیکیەکاندا بەمەرگی پاڵەوان، یان بەئەنجام گەیشتنی کارێك دیاری دەکرێ) ونەو، دەقەکان بەجۆرێك ناکامڵن. کەسایەتیەکان (کاراکتەر) گومان لە تێگەیشتنی خۆیان لەجیهان دەکەنو، هەمیشە هەوڵی ئەوە ئەدەن رادەو بارنەی وشیاری خۆیان دیاری بکەن. پاڵەوان لە ناسنامەی (هویت) ڕاستەقینەی خۆی دەگەڕێو نیازی ڕاڤەکردنی جیهانی هەیە. بەم بۆنەوە دەشێ بگوترێ لۆژیکی چیرۆکی مۆدێرنیستی هەمان لۆژیکی چیرۆکی پۆلیسیە. پاڵەوان زنجیرەیەك لە ڕووداوەکان پێکەوە گرێ دەدا تا بە ئەنجام (واتە دۆزینەوەی ڕەمزو ناسنامەی تایبەتی خۆی) دەگا. نموونەی بالای پاڵەوانە مۆدێرنیستیەکان ((شێرلووك هۆلمزە)). واتە پاڵەوان شایەتەکانو

ئەوکەسانەی ئاگاداری ڕووداوەکەن دەپشکنێ، تا ڕووداوەکە (تاوانەکە) دووبارە سازی بکاتەوەو لەکۆتاییدا پەی بە ڕەمزو نهێنی مەسەلەکە ببات. کەواتە لەم جۆرە دەقەدا هەمیشە مەترسی ئاشکرابوونی ڕەمزو نهێنییەکان لەئارادایە. چیرۆك وەك بەڵگەیەکە ئەگەر بەردەستی خوێنەرکەوێ کۆتایی پێدێ. خەمی سەرەکی پاڵەوان -لەم چیرۆکانەدا- نهێنیو پەیبردن بەنهێنی، یان هەمان ناسنامەیە (هویت)، بەگوتەیەکی تر چیرۆکی مۆدێرنیستی گێڕانەوەی جووڵەیەکە لە قەیرانی هەوییەتەوە بەرەو وشیاری.

هەر بۆیە ئەم جۆرە پرسیارانەمان لا دروست دەکا: پێویستە لەچی بگەین؟ چۆناو چۆن لەو شتە بگەینو چەند بڕوامان بەراستی ئەو تێگەیشتنە بێ؟ سنورەکانی وشیاری مومکین کامانەن؟ چۆناو چۆن دەتوانین ڕاڤەی جیهانێك بکەین کە خۆشمان بەشێك لەو جیهانەین؟

بەم شێوەیە بۆمان دەردەکەوێ کە پرسیاری سەرەکی مۆدێرنیستەکان، پرسیارێکی ئەپستمۆلۆژیکە. بۆیە بابەتگەلی وەك ئامادەبوونی مرۆڤ بۆ وشیار بوونەوە، بنەما جیاوازەکانی زانینو کێشەی مل بەناسین نەدان (شناسایی ناپزیر) یان سنوورەکانی وشیاری دەگرێتەوە. لەم ڕووەوە هەوڵ بۆ دۆزینەوەی ئەو ڕێگاچارانە دەدا، کە لە ئەنجامیاندا چیرۆك گرفتی ئەپستمۆلۆژیکی خۆی لەڕێگای کەسایەتیەکانەوە بۆ خوێنەر بگوێزرێتەوە.

کەسایەتیەکان قەیرانو گرفتی شوناسیان هەیەو لەچوارچێوەیەکی دیاریکراوی وشیاریدان. ئەم قەیرانو گرفتانە بەشێوەی مۆدێرنی چیرۆك (واتە کەلك وەرگرتن لە تەکنیکی جێگۆڕکەی زەمەنیو شوێنی -ئاگاداری ناراستەوخۆ- فراوان کردنی دیدگاکان، مۆنۆلۆگی ئالۆزی دەروونیو..) بۆ خوێنەر دووبارەسازی دەبنەوە. بەزمانێکی تر. کەسایەتیەکان بەسەرهاتەکانی خۆیان بۆ نووسەر دەگێڕنەوە. تا بەهۆی ئەوەوە خوێنەر لەراستی ڕووداوەکان بگات. ئەڵبەت مەرجی ئەم کردەیە. بڕواهێنانە بەوەی کە هەڵسو کەوتی کەسایەتیەکان بەهۆی چەشنێك وشیاریەوەیەو، مانایەك دەگرێتەخۆ. هەروەها خوێنەرەکانیش کەرەسەی دۆزینەوەو لێکدانەوەی ئەو مانایەیان لەبەر دەستدایە. بەڵام خودی ئەم کردەیەش پارادۆکسیکاڵە. چونکە لەلایەکی تریشەوە پێیوایە وشیاریو زانین ئیعتباریان نیەو هەرکەس لەڕوانگەی خۆیەوە لەجیهان دەڕوانێو هیچ حەقیقەتێك لەئارادا نیە. کەواتە ئامادەبوونی مانا، خۆی گوتەیەکی بێمانایە. لێرەدایە کە بڕوا بە بوونی مانا لە کردەوەو، دیاردە مرۆڤانەکاندا بنەمایەکی پارادۆکسیکاڵ بەچیرۆکی مۆدێرنیستی دەبەخشێ.

کە سیقە (اعتبار) بە وشیاری زانین نەما، کەسایەتیەکان جیهانێکی مومکین بۆ خۆیان ساز دەکەنو، دەق ئەم جیهانە دەکاتە جیهانێکی چیرۆکی. لێرەدا ئەوەی دێتە ئاراوە مەسەلەی وشیاری نیە. بەڵکو شێوەکانی ژیان لەم جیهانە جۆراوجۆرانەدایە. هەروەها ئەو پرسیارە کە، ئەم جیهانە جۆراوجۆرانە بە بونیادو یاسا جیاوازەکانیانەوە چۆن لەگەڵ یەکتر هەڵدەکەن. بەم شێوە پرسیاری ئەدەب لە پانتایی مەعریفەت ناسیەوە (epistemology) بۆ پانتایی بوون ناسی (Ontology)دەگوێزرێنەوەو، پرسیارەکانی دەقیش بەم شێوە دەگۆڕێن. لەجیهانێکی بەم شێوەدا چی دەکرێ؟ ئەم جیهانانە چۆن قەوارە وەردەگرن؟ کاتێ جیهانە جیاوازەکان لەگەڵ یەکتر ڕووبەڕوو دەبنەوە چی ڕوودەدا؟ کە ئەم چەشنە پرسیارانە هاتنە ئاراوە. ئەوانەی وا لە پەراوێزی جیهانی مۆدێرنیستی دەژیان دەکەونە ناویەوەو، پێمان وادەبێ کە یاسا ئەخلاقیەکانی لەوەپێش پووچەڵ دەبنەوە.

2-ئەزموونو پۆست مۆدێرنیزم بۆ منداڵان.

لەگەڵ سەرهەڵدانی سەردەمی ڕۆشنگەری، مرۆڤ خۆی لێ بووە سووژە (خود)و، خۆی بەناسینی جیهانەوە سەرقاڵ کرد. بەڵام دەسەڵاتی ئەم کۆژیتۆ[7] (cogito) یان خودی وشیارە زۆری نەخایاندو، لەگەڵ فرۆیددا دەسەڵاتی وشیاری مرۆڤ گوێزرایەوەو، دەرکەوت کە هەست لەژێر دەسەڵاتی نەستدایە. بونیادگەراکان لەوەشیان تێپەڕاندو گوتیان بونیادی نەست بەهۆی بونیادی

زمانەوەیە. ئەم جێگۆڕکانە لە بونیادی وشیاریدا، جێگەی مرۆڤی لەجیهاندا گوێزایەوەو. وەك دەڵێن تەنانەت زاراوەی ((مرۆڤی)) هەڵوەشاندەوە[8] ئەم تاکتیکە، کە مرۆڤ بەناوی ((خود)) (Subject) هەوڵی ناسینی بابەت (subject) دەدا، رەگەزی بۆ بیری دابەشکردنی جیهان بەدوو بەشی ((خود))و ((ئەویتر)) دەگەڕێتەوە. لەگەڵ سەرهەڵدانی مۆدێرنیزم. لەهەر پانتایەکدا هەوڵی دروست کردنی ((ئەویتر)) دراو، بەم کردەیە مرۆڤ توانی ((ناسنامەیەك)) بۆ خۆی دروست بکا. بەلام لەگەڵ بۆچوونەکانی بونیادگەراکان، ستوونەکانی مۆدێرنیزمیش لەرینەوە. ئەوان (بونیادگەراکان) لەوە گەیشتن کە دژایەتی نێوان ستوونەکانی مۆدێرنیزمیش لەرینەوە. ئەوان (بونیادگەراکان) لەوە گەیشتن کە دژایەتی نێوان ((خود))و ((ئەویتر)) دژایەتیەکی جەوهەری نیەو لەدیدی ئەپستمۆلۆژیەوە بالادەستی ((خود)) بەسەر ((ئەویتر))دا ئیسبات ناکرێو، تەنیا هەڵبژاردنێکی ئەخلاقیە. کەواتە ئەو عەقڵە کە مۆدێرنیزم پرۆپاگەندەی بۆ دەکا لەبنەڕەتەوە شتێکی ناعەقلانیە.

پاڵەوانی ئەدەبی مۆدێرنیستیش هەوڵی ناسینی جیهانو دۆزینەوەی ناسنامەی خۆی داوەو، لەم پرۆسەدا هەمیشە خەریکی دروست کردنی دوانەی ((ئەویتر/ خود)) بووە. بەلام کەسایەتی پۆست مۆدێرنیستی بەپێچەوانەوە دەبێ پێش تاقیکردنەوەکانی رایگەیەنێ کە بڕوای بە دابەشکردنی ((ئەویتر/ خود)) نیە. ئەم نەبوونی بڕوایە تەنیا بەمانای نووسین دەربارەی ژنان، رەش پێستانو هاوجنس بازەکان نیە، بەڵکو پێویستە واز لە جیهانی تەواو عەقلانی وەك تاقە جیهانی مومکین بهێندرێو جیهانەکانی تریش تاقی بکردرێنەوە. بۆ ئەم تاقیکردنەوەش دەبێ واز لە گێڕانەوەی مەزن[9] (grand narration) بهێندرێ. چونکە ئەم جۆرە گێڕانەوانە بۆ ئەوەی بتوانن لە سیستەمێکدا جێ بۆ جیهان بکەنەوەو بیناسن، هەمیشە لەیەکسان کردن دەگەڕێن. بەلام بەپێی ئەزموون هیچ شتێك شتێکی تر نیە. کەواتە ئەدەبی پۆست مۆدێرنیستی هەڵوێست وەرگرتنە لە بەرامبەر گێڕانەوە مەزنەکانو، ئەدەبێکە بۆ رووخاندنی دیکتاتۆریەتی تاك سیستەمی. ئەم ئەدەبە کۆیەکە لە گێڕانەوە بچووکو تاکە کەسیەکانو خولیای ناسینی گشتی نیە. ئەدەبی پۆست مۆدێرنیستی ئەدەبێکە کە لە تێکەڵاوی جیهانە جیاوازەکان دەدوێ. ئەو پانتایانە کە بەناوی ((ئەویتر)) سڕابوونەوە بۆ ناوەندی دەق دەگەڕێنێتەوەو، خۆش ویستنی مەرگ، ونبووەکانو پەراوێز نشینەکان دەهێنێتەوە ئارا. (لەئەدەبی پۆست مۆدێرنیستیدا) دەق ناسیاویەکی گشتی لەگەڵ جیهاندا نیە. کەواتە جووڵەو بزووتن رەوتی تاقانەی نامێنێو بەرەو ((ناهاوئاهەنگی بوون)) دەڕواو، هەموو شتێك بێنەزم دەنوێنێ.

میشل فۆکۆ بۆ وەسفی ئەم بێنەزمیە باسی ((شوێنەکانی تر))[10] (heterotopia) دەکا:: شوێنەکانی تر ترسناکن. رەنگە لەبەر ئەوەی کە بەشێوەیەکی نائاشکرا زمان تووشی مەترسی دەکەن. ناوە گشتیەکان (اسامی عام) دەشکێنن یان دەیانشێوێنن. نەحوی زمان وێران دەکەن. نەك هەر ئەو نەحوە کە رستەکانیان پێ سازدەکەین. بەڵکو ئەو نەحوە کەمتر دیارەش کەوا دەکا وشەکانو شتەکان (لەلای یەکترو لەبەرامبەر یەکتر) کۆببنەوە.. شوێنەکانی تر زمان وشك دەکەن. وشەکان لەرەوتی خۆیاندا رادەگرن. لەگەڵ مومکین بوونی رێزماندا بەشەڕدێن. ئەوان ئوستوورەکانمان دەتوێننەوەو لیریکی رستەکانمان نەزۆك دەکەن.))[11]

دروست کردنی ((شوێنی تر)) بوتیقای ئەدەبی پۆست مۆدێرنەو، کۆتایی بەو خولیایانە دێنێ کە دەیانەوێ دەق لە جیهانی واقیع بچێ. (لەم ئەدەبەدا) دەق ئاوێنەی جیهانی واقیع نیەو لەگەڵ چەمکی ((نووسەر))یش (author) بەشەڕدێ. لەدەقە کلاسیکیەکاندا خولیای دووبارە دروست کردنەوەی جیهانی واقیع لە دەقدا بۆ ئەو مەبەستەیە کە نووسەر (مۆلف) زیاتر لەخودا بچێ. بەلام دەقی پۆست مۆدێرنیستی بۆ ئەوەی بتوانێ بگەڕێتەوە سەرخۆی، ئامادەبوونی داهێنەر رەت

دەکاتەوە. ئەدەبی پۆست مۆدێرنیستی بەشێوەیەکی تر لەگەڵ چەمکی ((دووبارە نوێنی)) (representation) رووبەڕوو دەبێتەوە. بۆ روونکردنەوەی ئەم چەشنە رووبەڕووبوونەوەیە، وا و چاکە ئاوڕێك لەقسەکانی بۆدریار لەسەر چەمکی ((دووبارە نوێنی)) یان ((وێنە)) بدەینەوە. بۆدریار بەم شێوەیە قۆناغە یەك لەدوایەکەکانی ((وێنە)) دەستەبەندی دەکا:

ئـ-وێنە رەنگدانەوەی (پەرچ) واقیعێکی سەرەتاییە

ب-وێنە واقیعێکی سەرەتایی دەشارێتەوە یان دەیگۆڕێ

ج-وێنە ونی (غیاب) واقیعێکی سەرەتایی دەشارێتەوە

د-وێنە هیچ پەیوەندیەکی بەهیچ واقیعێکەوە نیە. بەڵکو نواندنەوەی رەهای خۆیەتی.

بەبڕوای بودریار لەقۆناغی چوارەمدا وێنە بەهیچ شێوەیەك هی سیستەمی جیلوەکان نیە. بەڵکو هی سیستەمی ((نواندنەوەیە))[12] ئێستا ئەگەر بەسەرنج دان بەم بۆچوونە ئاوڕێکی دووبارە لەمێژووی ئەدەب بدەینەوە: دەکرێ قۆناغی یەکەم بە ریالیزمی سەرەتایی (باڵزاك، ستاندالو، دستۆڤیسکی) بزانین، رەخنەی بەرهەمەکانی ئەو سەردەمەش ئەم دیدە دەسەلمێنن. بۆ نموونە میخاییل باختین دوا خوێندنەوەی بەرهەمەکانی دستۆڤیسکی بەو دەرئەنجامە دەگا کە دەقی لاسایی‌کردنەوەی کردەی کەسایەتیەکانە. کەواتە رۆمانی چەند دەنگەی دستۆڤیسکی واقیعیانەتر لە تۆلستۆی جیهان دەگێڕێتەوە. بەپێی ئەم تێزە ئەدەب دووبارە نوێنی جیهانی واقیعە.

لەدوای بڕینی ئەم قۆناغە، ئەدەب بیر لە گۆڕینی (تەحریف) واقیعەکان دەکاتەوە. بۆ تیقای سوریالیزم ئەم ئامانجە دەپێکی. ئەگەرچی خەمو مەبەستی سوریالیزمیش گێڕانەوەیە، بەلام واقیعەکان ناگێڕێتەوە. یان بابڵێین بەو شێوەیە کە خۆی دەیخوازێ دەیانگێڕێتەوە. ئامۆژگاری ((لۆترە ئاموون)) بۆ لەپاڵ یەکتر دانانی چەرخی دروومانو مێزی تەشریح لەچوارچێوەی ئەم بوتیقایە دایە.

قۆناغی سێهەمی ئەدەب، شاردنەوە، یان داپۆشینی ونی واقیعە سەرەتاییەکانە. ئەگەر بەرهەمەکانی ((نووسەرانی رۆمانی نوێ)) وەك رۆپ گرییەو، کلود سیمۆنو.. بەئەدەبی ئەم قۆناغە بزانین، بەهەڵە نەچووین. رۆمانی نوێ ئەڵێ: ((جیهان نە مانا دارەو نەبێ مانایە. بەڵکو تەنیا هەیە.)) ئەم دەقانە دەیانەوێ ونی خودی جیهانی واقیع بشارنەوە[13].

قۆناغی چوارەم نواندنەوەی ئەدەب لەخۆیایەتی. ئەمە تایبەتمەندی سەردەمی پۆست مۆدێرنە لەئەدەبدا. بۆرخس لەشیعری ((بەورێکی تر))دا. باسی سێ بەور دەکا: بەوری رۆخەکانی چۆمی گۆنگ، بەوری شیعرو، بەورێکی تر کەوەك ئەوانی پێشوو بینایەکە لە وشەکان سازکراوە[14]. واتە نیشانە (دال)ی بەور نەك لەبەر ئاماژەی بۆ مەدلوولێکی تایبەت، بەڵکو تەنیا بەهۆی نیشانە بوونیەوە بەکارهاتووە. بزووتن لەداڵەوە بۆ دال دەبێتە هۆی گەڕانەوەی ئەدەب بۆ سەر خۆیو خولقاندنی دەقێك کە پەیوەندی بە واقیعەکانەوە نیە. کەواتە ئەم ئەدەبە دەتوانێ واز لە دابەشکردنی جیهانە جیاوازەکان (وجوب، امکان و امتناع) بهێنێ.

بۆرخس لەچیرۆکی ((تام کاسترۆی ساختەچی))دا دەڵێ: ((ئەو دەیزانی هەر لە یەکچوونێك -تەنانەت ئەگەر زیرەکانەش کرابێ- دەبێتە هۆی نەبوونی لەیەکچوونە بەڵگە نەویستەکانی تر. بۆیە ((بۆگێل)) کێشەی لەیەکچوونەکانی بەگشتی وەلانا.))[15] چیرۆکی پۆست مۆدێرنیستی بۆ ((نێوان دانان)) ئەم تەکنیکە بەکاردەهێنێ، تانیشانی بدا چیرۆك بۆ واقیعەکان ناگەڕێتەوەو، دەسەڵاتو توانا لەگەڕانەوە بۆ سەرخۆی، وەردەگرێ. بۆ نموونە لەبەشێك لەرۆمانی ((راوی ماسی سپی لە ئەمریکا))، لە کۆنەفرۆشی کلیۆلەند. تاقگەکانو رووبارەکان وەك دەسرۆکەی کلینێکس کۆدەکرێنەوەو بەمشتەریەکان دەفرۆشرێن.[16].

بەلام نووسەر ئەم کارە نامومکینەی بە کارامەییەوە نەکردووە کە خوێنەر ناچار بێ بڕوای پێ بکا (وەك

چیرۆکەکانی مارکین). ئەو دەیەوێ خوێنەر هەر لەسەرەتاوە تێبگا کە رووبەڕووی پەرچی جیهانی واقیع نەبۆتەوە. بەڵکو رووبەڕووی گەمەی ئازادانەی نیشانەکان کراوەتەوە.

3-دووبارە نوێنیو بارودۆخی پۆست مۆدێرن.

بۆ مەبەستی لێکدانەوە، دەکرێ لەسەر رەوتێکی تایبەت ئەدەب قۆناغ بەندی بکرێ. رەنگە ئەم هەوڵە بۆ شەرحی رووداوێك بێسوود نەبێ. بەڵام پێویستە وەڵامی ئەم پرسیارانەش بدرێتەوە. بۆ ئەم رووداوە تایبەتە. لەم کاتە تایبەتەدا رووی‌داوە؟ ئایا بەهۆی سیخناخی فۆرمەکانەوە بووە یان پێویستیەکی کۆمەڵایەتی؟ بێ ئەوەی بمانەوێ وەك مارکسیستەکان بەسووکی لە بابەتەکان بڕوانین، یان وەك ((تری ئیگلتۆن)) پۆست مۆدێرنیزم بەپاشەکشەکردنی باڵی هزرمەند لەبەرامبەر باڵادەستی رەوتی تازەی بورژوازی، بزانین، تەنیا دەمانەوێ لەسەردەمێك بدوێین کە تیایدا دەژین.. سەردەمێك کە سەردەمی ((پۆست)) (لەدوا)یە.

پۆست مۆدێرنیزم بەمانای سەرهەڵدانی سەردەمێکی نوێ نیە. بەڵکو بەمانای نەبوونی ئیمکانی ئەو سەرهەڵدانەیە. بەکورتی، مێژوو کۆتایی هاتووە. گریمانەی سەرەکی پۆست مۆدێرنیزم ئەوەیە کە واقیعێك بوونی نیەو، ئێمە ناتوانین شکلێك بۆ گۆڕانی دابهێنین. کەواتە دەبێ لەگەڵ شکڵەکانی پێشوو گەمە بکەین.

لیۆتار سەردەمی پۆست مۆدێرن بەسەردەمی قەیرانی گێڕانەوە دەزانێ. ئەو دەیەوێ بڵێ مێژوو رۆمانێکە کە هەر سەردەمێك بەشێوەیەکی تایبەت دەیگێڕێتەوە. بەڵام گومان کردن لەبەکار هاتوویی ئەم گێڕانەوانە بۆتە هۆی ئەوەی کە ئیمکانی دروست کردنی گێڕانەوە (رەوایەت) یەکی بڕوا پێکراوو، بەکارهاتوو نەمێنێ. کەواتە مێژووش کە گێڕانەوەیە (نەوەك زانست) رووبەڕووی قەیرانێکی جیدی بۆتەوەو، ئیتر لەگۆڕان نایەت.

بۆدریار سەردەمی پۆست مۆدێرن بەسەردەمی ونبوونی سەرچاوە (مەرجەع)و نواندنەوە دەزانێو، پێی‌وایە نیشانەکان بەسەر مەدلولەکاندا زاڵ بوونو ئێمە لە واقیعەکان دابڕاوین. لەم روانگەشەوە سەردەمی پۆست مۆدێرن لەگەڵ کۆتایی هاتنی مێژوو یەك دەگرێتەوەو ئیمکانی هەموو جۆرە ناسینو گۆڕانێك رەت دەکاتەوە. کەواتە دیسان دێینەوە سەر قسەکەی پێشوومان. واتە لەسەردەمی پۆست مۆدێرندا هیچ شتێکمان جگە لە گەمە کردن بە شکلەکانی (فۆرم) پێشوو بۆ نەماوەتەوە.

دەقی پۆست مۆدێرن بۆ سازکردنی یاریەکی تازە تەکنیکی ((واقیع نوێنی) بەکار دەهێنێ. بۆ نموونە لەچیرۆکێکی بارتلمەدا تۆلستۆی دەردەکەوێ. تۆلستۆی چیرۆکە کە هەمان تۆلستۆی نووسەرە، کە لە بیرەوەری ساڵە خۆشەکانی نووسینی دەدوێو، هەوڵ بۆ بەرزکردنەوەی نۆستالۆژیای خوێنەر بۆ سەردەمی کلاسیك دەدا. بەڵام لە پڕێکدا دەقەکە وشیارمان دەکاتەوە کە ئەم رووداوانە هیچکامیان رووداوی واقیع نینو دەسکردی جیهانی دەقەکەن. واتە دەق یاری بە ئەسڵی ((واقیع نوێنی)) دەکا، بۆ ئەوەی بیکاتە دژی خۆی.

((ریمۆن فێدرمەن)) بەشێوەیەکی تر درێژە بەم یاریە دەدا. لەچیرۆکی ((بیگرە یان بەریدە)) نووسەر دوای ئەوە پەیتاپەیتا گێڕانەوەی چیرۆکەکەی وەلا دەخا. لەناوەڕاستی چیرۆکەکەدا دەڵێ: ((من دەبێ بڕۆم بۆ حەمام.. نا.. گاڵتەم کرد. دەبێ بڕۆم یەکێ لە هاوڕێکانم ببینم. هاوڕێی خۆشەویستم دانی، رۆناڵد ساکنیك. دڵنیام ئێوە کۆمەڵە چیرۆکی ((98.6))، ((لای سەروو))و ((دەرەوە)) تان بینیوە. دانی بۆ نووسینی چیرۆکێکی تووشی گرفتێك بووەو داوای لێ کردووم بچم یارمەتی بدەم. من دەڕۆمو زوو دەگەڕێمەوە.))[17].

رۆناڵد ساکنیك نووسەری کتێبی ((98.6))، ((لای سەروو-up))و (دەرەوە-out))یە. کەخۆی لەچیرۆکێکی تردا دەردەکەوێ، دەرکەوتنی ساکنیك -کەکەسێکی واقیعیە- لەچیرۆکێکی تردا، بۆ ئەوەیە پێمان بڵێ؛ ئەوە هەر چیرۆك نیە کە شتێکی ناواقیعە. بەڵکو خودی ساکنیکیش واقیعیەتی نیە.

بەگشتی دەق دەیەوێت یاری بەحەزی ئێمە بۆ گەڕاندنەوەی چیرۆك بۆ جیهانی واقع بکاو، لەئەنجامدا ئەو حەزو خولیایە بڕوخێنێ. دەوربینینی کەسایەتیە چیرۆکیەکان لەگەڵ ئەو کەسانەی کەلەدەرەوەی جیهانی دەقەکە دەیان ناسین، ئەو بیرۆکەیەمان لادروست دەکا کە هەم جیهانی دەق جیهانێکی دوور لە واقیعە. هەم ئەو جیهانەش کە پێمان وابووە جیهانی واقیعە، وەهمیە. کەسایەتیەکان بۆ ئەوەی پەرە بەم بیرۆکەیە بدەن، بەردەوام پێ لەسەر ئەوە دادەگرن کە ئەوان ئەو ئەکتەرانەن کە لە وشەکان دروست کراونو لەدێڕەکانی دەقدا جێیان بۆتەوە.

دەق هیچ پەیوەندیەکی بەواقیعەوە نیەو ناشیەوێ بەگێڕانەوەی ژیانی خەڵکانێکی وەك خۆمان، حەقیقەتێك دەربارەی ژیانو جیهان بدرکێنێ. ڕۆناڵد ساکنیك لەچیرۆکی ((مەرگی نۆڤلێت)) دا دەنوسێ: ((دیسان واقیعیەکان گەڕانەوە. کچەکە بەهەمان شێوە کە هەستەکانی (احساسات) خۆی بەجێ هێشتبوو بۆلایان گەڕایەوە. من پێویستیم بەکۆمەڵێ هاوڕێ هەیە کە حەزبکەن کەسایەتی سەرتاپای چیرۆکێکم بن. ڕەنگە بتوانم چەند کەسێکیان بەکرێ بگرم تاناچارین دەوری کرێگرتەی کەسایەتیەکم ببینن.)) لێرەشدا چیرۆك ئەو بیرۆکەیەی کە گوایە ئێمە لەگەڵ شەرحی واقیعەکاندا ڕووبەڕوو بووینەتەوە، پووچەڵ دەکاتەوە. هەروەها وە بیرمان دێنێتەوە کە هەموو ئەم یاریانە بۆ ئەوەیە چیرۆکێك بنووسرێ.

چیرۆك جگە لەوەی گەمە بەژانێری بیۆگرافیاو ئۆتۆبیۆگرافیا دەکا، لەگەڵ ژانێرە جیدیەکانیش دەکەوێتە یاریکردن، بۆرخس بۆ چیرۆکی ((نزیکبوونەوە لە بارەگای ئەلموعتەسەم)) چوارچێوەی وتارێکی ڕۆژنامەیی هەڵدەبژێرێ. ئەو وتارێك لەسەر ڕۆمانی ((نزیکبوونەوە لەبارەگای ئەلموعتەسەم)) نووسینی میر بەهادور عەلی، پارێزەرێکی خەڵکی بەمبەئی دەنووسی. تەنانەت لەدووجار چاپی جیاوازی کتێبەکەش (چاپی 1932و، چاپی 1934) دەدوێو، دوای ئەوە باسی بۆچوونی چەند ڕەخنەگرێك دەکا، چیرۆکەکە دەگێڕێتەوەو ڕاڤەی دەکاو لەتەك ((منطق الطیر))ی عەتاردا بەراوردی دەکاو هەروەها لەپەراوێزیشدا چەند ڕستەیەك لەسەر کتێبەکەی عەتاریش دەنووسن. ((ئیقاعی)) جیدی گێڕانەوەی بۆرخس ڕێگەی ئەوەمان پێنادا تەنانەت بۆ ساتێکیش گومان لەوە بکەین کە نووسەر نیازی نووسینەوەی بابەتێکی جگە لەڕەخنەی کلاسیکی هەیە. بەڵام لەئەنجامدا لەوە دەگەین کە یاریمان پێکراوەو هەموو ئەم چیرۆکە بۆ مەبەستی گەمەکردن بەرەخنەو تەنانەت ڕۆمانیش نووسراوە.

حەزی پۆست مۆدێرنیستەکان بۆ یاری کردن لەگەڵ شکڵەکاندا. وامان لێدەکا بیر لەوە بکەینەوە کە ڕەنگە بنەمای چێژی هونەری یاریو گەمەبێ. یاری نایەوێ بۆ شتێکی ترمان بگەڕێنێتەوە. بەڵکو ئەوەندەی مەبەستە یاریەك کرابێو هەر ئەمەش ستوونی سەرەکی دەقێکی پۆست مۆدێرنیستیە. لیۆتار لە نووسینێکیدا باسی منداڵێك دەکا کە بۆخۆشی خۆی دەنکە شقارتەیەکی هەڵکردووە. ئەو منداڵە چێژ لە جوولەو، گۆڕانی ڕەنگەکانو خۆڵەمێشی دەنکە شقارتەکە وەردەگرێ. پاشان دەڵێ ئادۆرنۆ یاری کردن بەئاگری بەلاوە گەورەترین هونەر بوو. بەم بۆچوونە هەموو شتێكو هەموو وێنەیەك لەجیهاندا دەکرێ ببێتە دەسمایەی یاری کردن. لێرەدا پێویستە باسی ((یاری پازڵ)) بکەین. وێنەیەك کە کراوە بە چەندان پارچەو دوا تێکەڵ کردنو شێواندنیان دەبێ سەرلەنوێ وێنەکەیان لێ ساز بکرێتەوە. بەڵام ئەگەر بمانەوێ لەو چەندان پارچەیە لەبری وێنەیەك، چەند وێنە سازبکەین. ئەوا لە بوتیقای ئەدەبی پۆست مۆدێرن نزیك بووینەتەوە. چونکە ئەگەر مانایەك وجوودی نەبێ، کەواتە پەیوەندیەکیش لەنێوان شتەکاندا (پارچەکاندا) نیە تابتوانین لەپاڵ یەکتر بیانچنین. بەزمانێکی تر، نەبوونی یاسا (یان بەگوتەی بۆ دریار: سەرچاوە) کۆمەڵێ یاسا دادەهێنێ کە هەموو جارێك دەتوانین بێدووپات کردنەوە، کەڵك لەیەکێك لەو یاسایانە وەربگرین. کەواتە ڕەنگە وا چاك بێ بڵێین. پۆست مۆدێرنیزم یاری کردنە بە

((یاسای یاساوەرگری)) بەم شێوە ڕووبەڕووی سیستەمێك دەبینەوە كە دەكرێ هەموو شتێك لەناویدا ڕووبدا. كاتێك كێشەی ((واقیع))مان وەلانا هەموو پێش گریمانەكان بێمانا دەبنو، سیستەمی بەهاكان هەرەس دەهێنن، پەیوەندیمان لەگەڵ ((واقیع)) دەپسێو لەئەنجامدا ناوی یاریش دەسڕدرێتەوەو، تەنیا شتێك كە بۆمان دەمێنێتەوە نەبوونی حەتمیەتو سەرەگێژەیە چونكە ئیتر ئێمە هیچ نازانین، هەر بۆیە ئاخاوتن دەربارەی چیرۆكی پۆست مۆدێرن، ڕەنگە وەك نوكتەیەكی (جوك) بۆشو بێمانا بێ.

4-دیسانەوە كێشەی دووبارە نوێنێ.

ئەگەر بەردەوام بین لەباسی كێشەی دووبارە نوێنی، نواندنەوەو ئەدەبی پۆست مۆدێرن، دەگەینە نامومكین بوونی ئەم جۆرە ئەدەبە. بەلام جارێكە واز لەم بابەتە دەهێنینو، هەمدیسان ئاوڕ لە كێشەی دووبارە نوێنێ دەدەینەوەو، ئەمجارەیان لەڕوانگەیەكی ترەوە سەیری دەكەینو لەگەڵ كێشەی وشیاری سەردەمدا موتوربەی دەكەین. بەم شێوە بمانەوێ یان نا، دیدێكی فۆكۆییمان دەبێ.

فۆكۆ لە ئەپیستمە (معرفت) یان شكل بەندی وشیاری هەر سەردەمێك دەدوێو، هەر سەردەمێك بە ئەرشیفێك لەوشیاری دیاری دەكا. بەم دیدە دەكرێ لەسەردەمی كلاسیك، ڕێنسانس، مۆدێرنو.. بدوێین. سەردەمی كلاسیك دەیەوێت بۆ پەرچی نەزمی جیهانو سیستەمی هەستی، لەڕێگەی ڕێكو پێك كردنی نیشانەكانەوە، بڕواو حەتمیەتێك بدۆزێتەوە لەم سیستەمی وشیاریەدا مرۆڤ داهێنەر نیە بەڵكو لەشتەكان دەدوێ. كێشەی سەرەكی سەردەمی كلاسیك ئەوە بووە، كەرەسەی دووبارە نوێنی نەزمی جیهان ئاشكراو بڕواپێكراو بێو، ئەركی مرۆڤیش ئەوە بووە وەسفی ئەم نەزمە بكا. بەلام لەم سیستەمەدا مرۆڤ دووبارە نوێن نیە. یان بەزمانێكی تر لەم مۆدێلی كردەی دووبارە نوێنیەدا. دووبارەنوێنو بینەر جێیان نابێتەوە. ئەمەش بنەمایەكی پارادۆكسیكاڵی دەداتێو، دەبێتە هۆی ڕووخانی سیستەمەكە لەناو خۆیدا.

لە سیستەمی وشیاری كلاسیكدا، بەو شێوە سەیری مرۆڤ ناكرێ كە هەم لە هەموو وێنەی جیهان گەیشتبێو، هەم توانای چوونە ناو ئەو وێنەشی ببێ. لەسەردەمی دواتر، واتە سەردەمی مۆدێرن، مرۆڤ وەك كەسێك كە ئەركی ناسینی لە ئەستۆیە دێتە ئاراوە. بۆیە پەیوەندی نێوان مرۆڤو بوونەوەرەكانی ترو، جیهان دەپچڕێ، بەلام مرۆڤ لەوە دەگا كە لەم ئەپیستمەدا نەوەك هەر ئەركی گێڕانەوەی جیهان، بەڵكو ناسینو تێگەیشتن لەخۆشی لەئەستۆیە. بەگوتەیەكی تر سەردەمی مۆدێرن، سەردەمی مرۆڤ بەمانای خودی (سووژە) گشتیو بابەتی (ئەبژە) گشتیە.

لەسەردەمی مۆدێرن، نووسەر وەك ((خود= سووژە)) ئەركی ناسینو نووسینی لە ئەستۆیەو، دەیەوێ لەم ڕێگایەوە لەجیهان وەك ((بابەت)) تێبگا. ئەم هەوڵەی بۆ ناسین تەنیا بە تێگەیشتن لەجیهان كۆتایی نایەت، بەڵكو مەبەستی تێگەیشتن لەخۆیو مرۆڤیش دەپێكی.

نووسەر دەیەوێ پەی بە حەقیقەتێكی قووڵ دەربارەی جیهانو خۆیو مرۆڤ بباتو لەم ڕێبازەشدا وەك بەركاری شناسایی لەبابەتی شناسایی بڕوانێ. چونكە ئەو خاوەنی كەرەسە گەلێكە كە پێویستە دەسەلاتیان بەسەر ((بابەت))دا بسەپێنێ تا بە ئەنجامی ناسینی بگات. لەم ڕێگایەدا مرۆڤو تەنانەت رابووردوی خودی نووسەریش ((ئەویتر))ن. ((هێلێنج))ی سارتەرو ((عاشق))ی دۆڕاس دوو بەرهەمی دیارن بۆ نواندنی ئەم وشیاریە.

بەلام لەم جووڵەی بەرەو تێگەیشتن لەجیهان. جێیەك بۆ ناسینی مرۆڤێك كە لەهەمان حاڵدا نووسەری چیرۆكیشە دیاری نەكراوە. چونكە ئەم كردەیە بە دووركەوتنەوەی نووسەر لە خودی خۆی بەستراوەتەوە. واتە نووسەر لەیەك كاتدا دەبێ هەم ((خود))و هەم ((بابەتی)) هەمان ((خود)) بێو، ئەم كردەوەش بنەمایەكی خوارو خێچو پارادۆكسی بەچیرۆك دەبەخشێ.

لە چیرۆكە مۆدێرنیستیەكاندا دەكرێ نووسەر خۆی بەژووری چیرۆكەكەدا بكا. بەلام نەوەك نووسەرێك كە لەو كاتەدا خەریكی نووسینی هەمان

ئەم بنەمایە دژایەتی دەبێتە جیاوازیو بەرگری لەپەرەسەندنی ئازادانەی رەگەزەکان دەکرێ.

یاسای پیاو سالاری هەمان یاسای سیستەمە پۆلیسیەکانە. پێویستە شوناسی هەموو کەس ئاشکرا ببێو، دەرکەوێ کە ((لە ئێمەن)) یان ((دژی ئێمەن)). ئەم یاسایە لەهەمان حەزی ((بچوك کردنەوەی جیهان بۆ ناسینی)) سەرچاوە دەگرێ. بەڵام کاتێك بوونی ((خود))ی وشیارمان رەد کردەوە، ئەم یاسایەش لە ئیعتبار دەکەوێ. چیرۆکی پۆست مۆدێرنیستی دەیەوێ وا نیشان بدا کە هیچ پەیوەندیەکی بەواقیعەوە نیە. لەهەمان حاڵدا گەمە بەوەهمی واقیع نوێنیش دەکاو، لەگەڵ دەسەڵاتی ئەو شتەی کە پێی دەگوترێ واقیع، دەکەوێتە کێشەوە. چیرۆکی پۆست مۆدێرنیستی نایەوێ لەشتێکی دەرەوەی خۆی بچێ، یان ئیمکانی رووداني ببێ، کەواتە بۆ ئەوەی بتوانێ لەژوور ئەم پەیوەندیانەوە بێتە ئاراوە، واز لە مۆدیلی ((واقیع/ ناواقیع)) دەهێنێ. دیارە ئەم کردەیەش تەنیا بە لابردنو، سڕینەوەی سنوورەکانی نێوان (وجوب، امکان وامتناع) دەکرێ.

لابردنو سڕینەوەی ئەم سنوورانە دەبێتە هۆی لەبەین بردنو نەمانی ((حەتمیەت)). بۆیە چیرۆکی پۆست مۆدێرن لەبازنەی نەبوونی حەتمیەتدایەو. یەکێك لەو شوێنانە کە ئەم نەبوونی حەتمیەتە ئاشکراتر خۆی نیشان دەدا، کۆتایی چیرۆکەکەیە.

بەپێی دیدگای یەزدان ناسانەی سامی، مانا لەکۆتاییدا خۆی ئاشکرا دەکا. بڕوا بەبوونی رزگاریدەر لەئایینی جوولەکەو، مەسیحیو، ئیسلامدا (مسیانیزم)؛ بڕوا بە عەقڵانی بوونی جیهانو کۆتایی مێژوو لای هیگڵو؛ بڕوا بەسەرکەوتنی چینی کرێکارو دروست کردنی کۆمەڵگای یەکدەست لای مارکس؛ هەموویان بەشێوەی جۆراوجۆر هەمان حوکمی (سامی) دەسەلمێنن. مۆدێرنیزمیش بە قەرز وەرگرتنی ئەم بڕوا ئایینیە، سیستەمی وشیاری خۆی بەجۆرێك بینا دەکا کە وەك حەرەکەو جووڵەیەکی بەردەوامو لێك نەپساو بەرەو عەدالەتو عەقڵ باوەڕی سەیری مێژوو بکرێ. بەڵام لەلایەکی تریشەوە مۆدێرنیزم پێ لەسەر خەسڵەتی بێکۆتایی بوونی خۆی دادەگرێو رەخنە بە بەشێك لەماهیەتی خۆی دەزانێ.

ئەم بڕوا دووانە لەئەدەبی مۆدێرنیستیشدا دووبارە دەبێتەوە؛ لەلایەکەوە چیرۆك گێڕانەوەی گەیشتن بەشوناسەو، پاڵەوان لەهەر هەنگاوێکیدا زیاتر لەو شوناسە نزیك دەبێتەوە، بەڵام لەئەنجامدا جگە لە کۆمەڵێ وێنەی پەرشو بڵاوو نامەعلووم هیچی تری دەست ناکەوێو، چیرۆکەکەش هەروا دەوامەی دەبێ. بۆ نموونە لە ((تووڕەییو هەراو هوریادا)) مۆنۆلۆگی دەروونی کەسایەتیەکان، ئێمە لەپەیبردن بەشوناسی پاڵەوان (بنەماڵە؟) نزیك دەخەنەوە. بەڵام لە کۆتاییدا ئەم رەوتە بە ئەنجامێکی ئاشکرا ناگاتو، شوناس هەروا نادیارو چیرۆك بێکۆتایی دەمێنێتەوە.

ناتەواوبوون لەم ئەدەبەدا دەرئەنجامی ((ئەپستمۆلۆژی)) پرسیارەکانیەتیو، هەروەها ئەو راستیەش کە شوناس گشتێکی نەگۆڕنیە. بەڵکو کۆی پرشو بڵاوو ناڕێكو پێکی وێنەکانو تەئویلەکانە.

ئەدەبی پۆست مۆدێرنیستی لەگەڵ پانتایەك پرسیاری ((ئەپستمۆلۆژی)) رووبەڕوو دەبێتەوە. دەستەویەخەی ئەم پرسیارەیە کە جیهانە جیاوازەکان چۆن دروست دەبن؟ هەروەها لەبەر ئەوەی بڕوای بەبوونی راستاییەکی هێڵی نیە. سەرپێچی لەئەنجام دەکا. لەلایەکی تریشەوە لەبەر ئەوەی دەیەوێ ئیمکاناتێکی جیاواز تاقی بکاتەوە، یان بوونیان بهێنێتە ئاراوە. ناتەواوبوون بەشێوەی مۆدێرنیستیش رەد دەکاتەوە. کەواتە کۆتایی لەم چیرۆکانەدا چەند جۆرە.

لەچیرۆکێکی بۆرخسدا هاتووە: ((کاتێك کەسێك رووبەڕووی چەند جێگیر (ئالترناتیو) دەکرێتەوە، یەکیان هەڵدەبژێرێو، واز لەوانی تر دەهێنێ. ((تسۆئی پێن)) بەپێچەوانەوە، هەموو ئەم جێگرانە هەڵدەبژێرێ.

بەشێك لەچیرۆکە پۆست مۆدێرنەکان ئەم تەکنیکەیان بەکارهێناوە. بۆ نموونە رۆمانی ((ژنی ستوانە فەرانسەییەکە)) بەرهەمی ((جان فاوڵز))

بەچەند شێوەی جیاواز کۆتایی پێدێو، خوێنەر ئازادە هەر کامەیانی پێخۆش بێ هەڵیبژێرێ.

لێرەدا دەکرێ بپرسین ئەم چەند جۆرە کۆتاییەی چیرۆك ئاماژە بە چ گریمانەو ئەگەرێك دەکا؟

گوتمان پۆست مۆدێرن واتە بڕواهێنان بەکۆتایی مێژوو، بەڵام لەوە دەچێ ئەم گوتنەش زۆر تەواو نەبێ؛ چونکە بەشێوەیەکی تاك رەهەند بۆ بابەتەکە دەڕوانێ. بەگوتەیەکی تر پۆست مۆدێرنیزم پێش ئەوەی بڕوای بە کۆتایی مێژوو ببێ، رەخنە لەم بڕوایە دەگرێو، لە بەرئەنجامی گوتنەکەیدا دەڵێ: ئێمە پەیوەندیمان بە واقیعەکانەوە نەماوەو، لەمێژوو هاتووینە دەر. (واتە لە جەغزی مێژوودا نەماوین). رەنگە بەم بۆنەوە بێ کە وەك کۆتایی مێژوو سەیری مۆدێرنیزم دەکرێ.

بیرکردنەوە (اندیشیدن) تەقەلایەکە بۆ بەجۆرێکی تر بوون. هەر بۆیە دەشێ کۆمەڵێ ئەنجامو کۆتایی تر بۆ مێژوو وێنابکرێ. ئەوەی کە چیرۆکی پۆست مۆدێرنیستی خاوەنی چەند جۆرە کۆتاییە، وەك ئاواتێك دێتە بەرچاو. ئاواتی کۆتایی هاتنی ((پرۆژەی هەتاهەتایی مۆدێرنیزم))و، ئاواتی گەیشتن بە کۆتاییە جیاوازەکان کە بەیەکەوە ئامادەبن.

6- کۆتایی بەئازار!!

مرۆڤ لەرێگای دۆزینەوەی شوێنە تازەکاندا هەمیشە کۆمەڵێ نیشانە لەدوای خۆی بەجێ دێڵێ، تا کاتی هەست کردن بە مەترسی رێگای گەڕانەوەی لێ ون نەبێ، یان خەڵکانی تر بەهۆی ئەو نیشانانەوە، بەهاواریەوە بچن.

هەموو جۆرە نیشانەدانانێك لە جەوهەری خۆیدا لەبەر ئەم مەترسییەیەو کردەوەیەکە بۆ ((پارانۆیا)) دەگەڕێتەوە. ئێمە هەمیشە لەشوێنە نەناسراوەکان دەترسینو، ئەم سیستەمی نیشانە دانانە یارمەتیمان دەدات تا ئەو نەناسراوانە بخەینە سیستەمی وشیاریمانەوەو، کەمتر بترسین بۆیە سیستەمی نیشانەکان نیشاندەری حەزی ئێمەن بۆ دۆزینەوە، بۆ بەسیستەم کردنو، چاودێریو سەپاندنی دەسەڵات بەسەر جیهاندا. بەڵام لایەکی تری ئەم دەسەڵاتە بەرەو خۆمان دەگەڕێتەوە.

ئێمە ناچارین لەخۆشماندا نیشانە دابنێین، بۆ ئەوەی بتوانین چاودێری لەخۆمان بکەینو، نەهێڵین ئەو نەزمە گشتیە دوچاری نوقسان ببێ. بەڵام لەئاست ئەم سەپاندنی دەسەڵاتەش بەرهەڵستیەك هەیە. تاقمە پەڕاکەندەکان هەمیشە لەم سیستەمەدا شوێنە مەمنوعو چۆڵەکان هەڵدەبژێرنو، ئەمەش ئەو گشتی (کلێت)و دەسەڵاتە تووشی کێشە دەکا. هەر بۆیە خودی ئەو سیستەمی نیشانە دانانو دەسەڵاتە، خەریکی دووبارە نیشانەدانان دەبێ، بۆ ئەوەی ئەزمێکی تازە بسەپێنێ. دیسانەوە ناو لە تاقمە یاخیەکان دەنێ. بۆ ئەوەی بتوانێ لە سیستەمی نیشانەکاندا جێیان بۆ بکاتەوە.

((بێکت)) هەمیشە خۆی لە ((ناو لێنراوی)) دەشاردەوە. ئامادەی وتووێژ کردن نەدەبوو، بەردەوام شوێنگەلێکی دروست دەکرد کە بە شێوەیەکی هیوا لێبڕاوانە چۆڵ بوون. بەڵام ئەویش زۆر زوو بووبە نیشانەیەکو، ناوی ئاوانگارد ((پێشڕەو))و، ئابزۆرد (پووچیخوان)و، پۆست مۆدێرنیان لێنا. رەخنەگرانی ئەدەب (کاربەدەستانی ئەو سیستەمی دەسەڵاتە) لەوەی کە توانیان ئەویش بخەنە ناو سیستەمی پۆلێنکردنەوە، دەبێ شانازی بە خۆیانەوە بکەن.

ڕووبەڕووبوونەوەی ئێمە لەگەڵ چیرۆکی پۆست مۆدێرنو، تەقەلا بۆ لێکدانەوەو بچووك کردنەوەی تارادەی چەند نیشانە، لەم تەکنیکە سەرچاوە دەگرێ. واتە ئێمە حەزی ئەم چیرۆکانەمان بۆ سەرپێچی کردنو لادان لەیاسا سەپاوەکان - بەیارمەتی دۆزینەوەی یاسای نوێ بۆیان- پووچەڵ کردەوەو، خۆمان بووینە کارگێڕی ئەو سیستەمی دەسەڵاتە.

بەڵام لەکۆتاییدا ئێمە ڕووبەڕووی گەلێ ناتەبایی دەبینەوە. بۆ نموونە لەوەرنەگرتنی سەرچاوەو مانا دوایین؛ لەم حاڵەتەدا قسەکردن لە ((چیرۆك)) دۆخێکی پارادۆکسیکاڵ بەخۆی دەگرێ. چونکە ئەی چۆن دەتوانین شتێك بەناوی ((چیرۆك)) دەستنیشان بکەینو لەگوتار، یان شیعر، یان هەر بابەتێکی تری جودا بکەینەوە.

ئێمە باسی سیستەمەکانی گوتارمان کردو، ئاشکرایە کە هەر نیشانەیەك لەهەر سیستەمێکی

تایبەتدا، ئاماژە بەمانایەکی تایبەت دەکا. لەم ڕووەوە لێکدانەوەی گوتاری خەڵکی تر هەوڵێکی بێهوودە دەبێ. چونکە ئێمە لەدیدگای خۆمانەوە - کە لە گوتارێکی تردابین- ڕەخنە لە گوتاری خەڵکی تر دەگرین. جگە لەوەش ئێمە لێکدانەوەی گوتاری خۆشمان پێ ناکرێ، چونکە لەناوەوەی سنوورەکانی ئەو گوتارەداینو، تا لێی دوور نەکەوینەوە ناتوانین لێکی بدەینەوە. کەواتە ڕەخنەگرتن لە ئەدەبی پۆست مۆدێرن. ڕەخنەگرتنە لە ((ئەدەبێك لە بارودۆخی رابووردوو))، کە هیچ قسەیەکی دەربارەی ((ئەدەب لەبارودۆخی ئێستا))دا نەگوتووە. بەڵام ئێمە بەردەوام وامان دەنواند کە لەنێو ئەو گوتارە داین و ئێستا ڕەخنەی لێدەگرین. لەهەر حاڵدا ئەم دژایەتیانە دەتوانن هەموو دەقێك لەدەروونەوە بتەقێنەوەو، ڕەنگە ئەمەش خەسڵەتی دەروونی هەموو دەقێك بێ: ((حەزکردن بەتەقینەوەو لەبین چوون.))

1-Brian Mchall, Postmodernism Fiction, P4.

2-پێم وایە ئەم ڕستەیە هی لیوتارە؛ بەڵام سەرچاوەکەیم بۆ نەدۆزرایەوە.

3-فۆرمالیستەکان باسی پرسیار ناکەن. بەڵام ئەگەر بمانەوێ بەشێوەیەکی ڕەخنەگرانە لە فۆرمالیزم دوور بکەوینەوەو، بەچاوێکی هایدگەری یان فۆکۆیی سەیری مەسەلەکە بکەین، دەتوانین لە ((پرسیاری هەر سەردەمێك)) پرسیاری زاڵیش بدوێین.

4-دەیوید لاج-تیۆری ڕۆمان، وەرگێڕ: حسێن پایندە ل 159 تا 186

5-دەبێ لەبیرمان بێ کە ((پۆست مۆدێرن)) بارودۆخی وشیاری لەم سەردەمەدایە. لیۆتار بەم بۆنەیەوە لە ((پۆست مۆدێرن))و سەردەمی بێئیعتباری گێڕانەوە مەزنەکان دەدوێو، وەك بۆ خۆی دەڵێ هەرگیز باسی ((پۆست مۆدێرنیزم)) ناکا. چونکە بڕوای بە فەلسەفەیەکی مێژوویی هەیە کە مێژوو ڕەد دەکاتەوەو، ئەمەش بێمانایە. قسەکردن لەچیرۆکی پۆست مۆدێرنیستیو پۆست مۆدێرنیزم لە ئەدەبیشدا ڕەنگە دووچاری هەمان مەترسی ببێ (وەها کە دەیوید لاج تووشی ئەم هەڵەیە دەبێ) بەڵام مەبەستی ئێمە لە ئەدەبی پۆست مۆدێرنیزم، ئەدەب لە بارودۆخی پۆست مۆدێرندایە.

6-Brian Mchall, Postmodernism Fiction, P7.

7-کۆژیتۆ (Cogito) ((بیردەکەمەوە)) یان ((خودی بیرمەند)). دیکارت بەم ڕستەیە دەست پێدەکا ((بیردەکەمەوە کەواتە هەم)) دەکرێ ئەم ڕستەیە بەسەرەتای مۆدێرنیستە بزانین. ڕستەیەك کە ((عەقڵی مرۆڤ)) بە پێشتر لە ((بوونی مرۆڤ)) دادەنێو، بوونی بەبیرکردنەوەیەوە دەبەستێتەوە. کۆژیتۆ دەکرێ خوازەیەك بێ بۆ خودی بیرمەند.

8-ئاماژە بەقسەیەکی لیڤی شتراوس دەکا: ((دوا مەبەستی زانستەکانی مرۆڤایەتی ئەوە نیە کە قەوارە بە مرۆڤ ببەخشێ بەڵکو ئەوەیە مرۆڤ هەڵوەشێنێتەوە.

9-لیۆتار باسی ئەو فەلسەفانە دەکا کە ڕەوتێکی گشتی بۆ مێژوو دادەنێنو بەشێوەیەك دەدوێن کە گوایە ئاگاداری سەرەتاو کۆتایی مێژوو هەن. ئەم گێڕانەوە مەزنانە جگە لەوەی بەتەواوی مێژوو دەگێڕنەوە، بەڵکو دەسگایەکیش سازدەکەنو دەیانەوێ وەڵامی هەموو پرسیارەکانیش بدەنەوە.

10-دەقی ((شارە نادیارەکانی -کالڤینۆ)) باسی ئەو شارانە دەکا کە لەوپەڕی سنوورەکانی ئەم جیهانە دروست دەبن: شاری مردووەکان. ئەو شارانەی کە ناو دەیانتوێنێتەوەو.. هەرکام لەم شارانە دەتوانن ((شوێنێکی تر)) بن کە بونیادی ئەپستمۆلۆژی ئێمە دەڕوخێنن. لەلایەکی تریشەوە دەبێ بزانین کە ((فۆکۆ)) بەردەوام وەك شوێنێك باسی نووسراوە دەکا کە خود لەوێدا دووبارە نوێنی دەبێتەوە.

11-ڕەزا بەراهەنی -گۆڤاری ئادنیە- ژ 107 ل 21، سەرچاوەکەی Order of thinys

12-ژان بۆدریار، سەر لێشێواوی نیشانەکان ل 3-92، وەرگێڕ مانی حەقیقی.

13-سەرنج بدرێ لە بۆچوونەکانی بۆدریار دەربارەی ((ڕسانە سالاری)) لەدنیای نوێداو، ونی شتە واقیعیەکان.

14و15-خورخێ لویس بورخس، ((باغ گزرگاههای هزار پیچ)) وەرگێڕ ئەحمەد میر عەلایی

16-ڕیچارد براتیگان، ((هەچیزو هیچ چین)) وەرگێڕ حەسەن ئەفشار.

# راپۆرت

دۆناڵد بارتلمه

• و: عەتا نەهایی

**"وڵفگناك کیزەر" دەربارەی ماهیەتی گرۆتێسك دەڵێ: "گرۆتێسك رەنگدانەوەی ئەم دنیا پەرێشان و لە خۆبێگانە بووەیە. بینینەوەی دنیایەکی ئاشنا لە روانگەیەکی سەیرو سەمەرەوە. گرۆتێسك یاری کردن لەگەڵ پووچییەکاندا. بەو مانایە کە نووسەر لەکاتێکدا ترس و نەفرەتی خۆی بە پێکەنینێکی رواڵەتی دەشارێتەوە، گەمە بە پووچییەکان دەکا. گرۆتێسك گەمەیەکە بۆ ئاشکراکردن و فرێدانی رەگەزە پیس و شەیتانیەکانی دنیا.."[2]**

**"راپۆرت" وەك زۆربەی چیرۆکەکانی "دۆناڵند بارتلمە" چیرۆکێکی گرۆتێسکە. گێڕانەوەی پەلۆخیی نەزمی کۆمەڵایەتی جیهانێکی بێنەزم و یاسا. جیهانێکی میچکوت لە کەل و پەل و (زبڵ) کە تەنگیان پێهەڵچنیوین. "دۆناڵد بارتلمە" لەبەرهەمەکانیدا گەمە بەم جیهانە دەکا. گەمە بە زمان و گێڕانەوەو، تەنانەت خودی چیرۆکش.**

**راپۆرت نموونەی چیرۆکێکی پۆست مۆدێرنستیە کە پرسیاری پۆست مۆدێرنیستیش دەهێنێتە ئاراوە.**

دەستەکەی ئێمە لەگەڵ شەڕ نەیارە، بەڵام شەڕ هەروا بەردەوامە. منیان نارد بۆ "کلیولەند" تا لەگەڵ ئەندازیارەکاندا قسەبکەم. ئەوان لە "کلیولەند" کۆبوونەوەیان بوو. بڕیاروابوو من رازیان بکەم واز لەو کارە بێنن کە دەیانویست بیکەن. سەعات 45و4 دەقیقە سوار (فڕۆکەی) یونایتێد، (لە فڕۆکەخانەی) لاگاردیا (لەنیۆیۆرك) بووم و، سەعات 13و3 دەقیقە لە کلیولەند دابەزیم. لەم کاتەدا کلیولەند شینێکی تاریکە.

یەکەورێ چووم بۆ موتیلێك کە شوێنی کۆبوونەوەی ئەندازیارەکان بوو. سەدان ئەندازیار بەشداری ئەو کۆبوونەوەیان کردبوو. زۆربەیان ئەندامێکی لەشیان شکابوو، یان برین پێچ

کرابوو. شەش کەسم دی ئێسقانی مەچەکی دەستیان شکابوو. چەند کەسێکیش باسک، یان پاژنەی پێیان شکابوو، یان سمتیان دەرچووبوو. هەروەها چەند کەسێکیش ملیان وەرگەڕابوو. هۆی ئەم شکاو و شکستەم نەدەزانی. ئەندازیارەکان سەرقاڵی حیسابات کردن و ئەندازەگرتن بوون و، لەسەر تەختە ڕەشێك شکڵیان دەکێشایەوە و، لەگەڵ ئەوەشدا ئاوجۆ (بیرە) یان دەخواردەوە و، پاروویان دەگرت و لەگەڵ فەرمانبەرەکاندا دەدوان و، بەرماوەی پیاڵەکانیان دەڕشتە کوورەکە و، گەرم بوون.

گەرم بوون. پڕ لە عەشق زانین بوون. ئەندازیاری گەورە چاویلکەیەکی ڕەشی بەرهەتاوی لەچاودابوو. ئێسکی کەشکەڵەی ئەژنۆی وەك سەدەفێکی دووفلیقانە شکابوو، بەستبووی. لە ناوەڕاستی کۆڵانێك لە بتڵە ئاوجۆکان و، سیمی مایکرۆفۆنەکاندا راوەستابوو. گوتی:

"میوانی بەڕێز تۆزێك لەم مریشکە برژاوە بەشێوەی ئەندازیاری مەزن" ئیزامبارد کینگدام برۆنێل" بخۆو، بفەرموو کێیت و چیت دەوێ. هەروەها هەڵوێستت چیە؟

گوتم: "ئەرم ئامێرم [3]. لە هەموو بارێکەوە. من وەك نوێنەری دەستەیەکی بچووك لە هۆگران هاتووم بۆئێرە. ئێمە هۆگری شتەکەی ئێوەین کە بە رواڵەت کاردەکا. کارکردن لەناو ئەو هەموو هەڵەکاریەدا سەرنج راکێشە. وادیارە شتەکانی خەڵکی تر کارناکەن. شتەکەی وەزارەتی دەرەوە بە رواڵەت کارناکا و شتەکەی سازمانی نەتەوە یەککرتووەکانیش بە رواڵەت کارناکا. شتەکەی چەپی دیموکراتیکیش بە رواڵەت کارناکا. شتەکەی بودا..."

ئەندازیاری گەورە گوتی:

"دەربارەی شتەکەی ئێمە کە بەرواڵەت کاردەکا. چیت پێخۆشە لێمان بپرسە. ئێمە دڵ و مێشکمان بۆئێوە، جەنابی ئەرم ئامێر، دەکەینەوە، چنکا حەزدەکەین خەڵکی بە شەرەفی کۆڵان و بازاڕەکان لە ئێمە بگەن و، خۆشیان بوێین و، بۆ موعجیزەکانمان ستایشمان بکەن. هەر ئەو خەڵکە کە ئێمە بەبێ هیچ خەڵات و بەراتێك بە خەروار موعجیزەی تازەیان بۆ دادەهێنین و، کە یەك لە یەك چاکتر و بەسوودترن. چیت پێخۆشە لێمان بپرسە.

حەزدەکەی لەگەڵ میتالۆژی پێستەی ناسکی بە هەڵم بوون [4] ئاشنابێ؟ یان لەگەڵ پرۆسەی تاك تەوەرەی یەکپارچە و موتوربەکراو؟ یان جەبری نایەکسانیەکان؟ تیۆری چاکتر کردنەوە. سیستەمی ئاڵقەیی کراوە و داخراوی ورد چنراوی تێکەڵ؟ کولفە دۆزەرەوەی ماتماتیکای بگۆڕ و نەگۆڕ؟ رژانی بنچینەیی کەرەسەی نیمچە راگەیەنەر. پشکنینی فەزایی نێو رەهەندیی گشتی؟ ئێمە کەسانێکمان هەیە کە پسپووڕی گوڵی تەڕەتیزە و دڕەماسی و گوللەی دەم دەمن [5]، کە لەگەڵ چەند لایەنی تەکنەلۆژیای پێشکەوتووی ئیمڕۆدا پەیوەندی دەگرن و، لە راستیدا پەیوەندیەکی باشیشیان هەیە.

ئەوسا من دەربارەی شەڕ لەگەڵیاندا دوام. ئەو شتانەم گوت کە ئەوکاتەی خەڵك دژ بە شەڕ دەدوێن، دەیڵێن. گوتم شەڕ چاك نیە. گوتم وڵاتە گەورەکان نابێ وڵاتە بچووکەکان بە ئاگرەوە بنێن. گوتم دەوڵەت تووشی زنجیرەیەك هەڵە بووە. گوتم ئەم هەڵانە ئەگەرچی لە سەرەتاوە بچووك بوون و دەکرا لێیان خۆش ببین، بەڵام ئێستا گەورەبوون و بۆ لێخۆشبوون نابن. گوتم دەوڵەت خەریکە هەڵەکانی پێشووی لەژێر چینێك هەڵەی تازەدا دەشارێتەوە.

گوتم دەوڵەت بەم هەڵانە تووشی گووگێژە بووە. گوتم تا ئێستا دەهەزار سەربازی ئێمە بەهۆی هەڵەکانی دەوڵەتەوە گیانیان بەخت کردووە. گوتم دەیان هەزار چەکدار و بێچەکی

دوژمن بەهۆی هەڵەی ئێمە و خۆیانەوە کوژراون.
گوتم ئێمە بەرپرسی ئەو هەڵانەین کە بەناوی ئێمەوە دەکرێن. گوتم نابێ رێگابدەین دەوڵەت لەوە زیاتر هەڵە بکا.

ئەندازیاری گەورە گوتی:

"بەڵێ، بەڵێ بێگومان ئەم قسانەی تۆ لە حەقیقەتەوە دوور نیە. بەڵام ئێمە نابێ شەڕەکە بدۆڕێنین. وانیە؟ راوەستاندنی شەڕیش واتە دۆڕاندنی. وایە؟ مەگەر ئێمە وەك رەوتێکی بەروپێش سەیری شەڕناکەین و، راگرتنی بە لەباربردنی نازانین؟ راستیەکەت دەوێ ئێمە نازانین چۆن شەڕ بدۆڕێنین. بەپێچەوانەی ئەو هەموو کارامەییەمانەوە، لەمەدا پسپۆڕ نین. هەر ئەوەندە دەزانین کە سوپای ئێمە سوپای ئەوان لە بەین دەبا و، ئەمەش باری کارەکەمانە. هەر ئەمە و هیچی تر.

بەڵام رێگابدە واز لەم باسە رەشبینانە، کە دڵساردکەرەوە و زیانباریشن، بێنین. من لێرە چەند موعجیزەیەکی تازەم هەیە کە حەز دەکەم بە کورتی بۆتی باس بکەم. چەند موعجیزەیەکی تازە کە ئامادەن چاوی پڕ لە ستایشی خەڵك غافلگیر بکەن. بۆ نموونە بە هەڵم کردنی ئاواتەکان بەشێوەی کۆمپیۆتەری. بە هەڵم کردنی ئاوات، بۆ وەلامدانەوە بە ئاواتی نەتەوەکانی جیهان کە رۆژ لە دوا رۆژ زیاتر دەبێ، گرنگییەکی تایبەتی هەیە.

لەم کاتەدا چەند کەس لە ئامادەبووان کە ئێسقانی شانیان شکابوو، سەرنجیان راکێشام. ئەو درێژەی بە قسەکانی دا:

"دروست کردنی گەدەی شێوە کاوێژکەر بۆ نەتەوە دواکەوتووەکان یەکێکە لەو کارە چاکانەی ئێمە کە دڵنیام بە دڵتان دەبێ. ئێوە دەتوانن بە گەدەی شێوەکاوێژکەر، کاوێژبکەن، واتە بلەوەڕێن. پەسندترین رەنگ لە هەموو دنیادا شینە. هەربۆیە ئێمە خەریکین لەسەر چەند جۆر "پۆئاپراتن سیس" واتە ئالفی سەوز شینی ناوچەی کۆنتاکی ئێوە تاقیکردنەوە دەکەین. ئەمە مادەیەکی سەرەکیە بۆ داهێنانی گەدەی شێوەکاوێژکەر، کە خوێنێکی تازە دەڕژێنێتە دەمارەکانی حیساباتی تیجاری ئێمەوە.

دڵنیام ئێوە لەمە بێئاگان.. " لەم کاتەدا چەند کەس بەرەپێی شکاویان بە تەختە هەڵبەستبۆوە سەرنجیان راکێشام." شێوە کانگورۆ.. پەروەردەکردنی هەشت سەد هەزار شێوە کانگورۆ لە ساڵێکدا.. زۆرترین رێژەی پرۆتۆئینی ئاژەڵ کە تا ئێستا مۆتالای لەسەر کراوە.. "

"جۆری تازەی کانگورۆ پەروەردەکراوە؟"

ئەندازیار سەیری کردم و گوتی:

" من لە رق و ئیرەیی ئێوە بۆ شتەکەی خۆمان دەگەم. خەڵکی دەستەوستان هەمیشە رقیان لە شتەکەی ئێمە دەبێتەوە و، بە دژمرۆڤانەی دەزانن. ئەڵبەت ئەمە قسەیەکی نارەوایە... " لەکاتێکدا خاڵە کارەباییەکان بەسەر شیشەی چاوێلکەکەیەوە دەبریسکانەوە، درێژەی بە قسەکانی‌دا. "من ئاگام لەم شتە میکانیکیانە هەیە. بە بۆچوونێك منیش مرۆڤم و ئەوەی دروستی دەکەم مرۆڤانەیە. جا هەر شتێك بێ. با پێتان رابگەیەنم جەنابی نەرم ئامێر، سەبارەت بەو شەڕە بچووکە کە نازانم بۆ ئێوە بەلاتانەوە گرینگە، ئێمە زۆر بەسەبر بووین و دیانمان بە جەرگماندا گرتووە. داخوازی هەموو لایەك کارکردنە و، شتەکەی ئێمەش کاردەکا.

ئێمە دەمانتوانی زۆر کاربکەین و نەمانکردووە. ئەگەر بە وشیاریەوە سەیری ئەم کارانە بکرێ، تێدەگەین کە تەواو لەپێناوی هاوتەریبی بەرژەوەندی گشتی و، بەرژەوەندی تایبەتیدا دەبوون، زۆر کاری چاك. ئەڵبەت دەکرا تووڕە ببین. دەکرا سەبرو قەرارمان نەمێنێ.

دەكرا هەزاران تێلی تیتانیۆمی خزۆكی خودكار، بە درێژایی 18 ئینچ و، باریكایی 0٪.0005 سانتی مەتر (لە راستیدا نادیار) ئازاد بكەین، هەر كە بۆنی دوژمنیان كرد لە دەرەلنگی شەرواڵەكانیانەوە بچنە ژوور و، بە لەشیاندا هەڵگەڕێن و، لە ملیان بئاڵێن. ئێمە ئەم شتانەمان هەیە. هەموو كارێكمان لە دەست دێ. دەكرا لە حەواوە ژەهری تازەی مەشكەماسیان بەسەردا بڕێژین.

ئەو ژەهرە كە یارمەتی تەنینەوەی قەیرانی شوناسی دەدەن. ئێمە هەموو ئەمانەمان پێدەكرا. دەكرا لە بیست و چوار سەعاتدا وابكەین برینجەكانی دوژمن دوو ملیۆن كرم هەڵێنن. كرمەكان ئامادەن. لە ئامادەگاكانی "ئالاباما" ن. ئێمە تیری بچووكی ژێر پێستمان هەیە كە دەتوانن پێستی لەشی دوژمن خاڵ و بەڵەك بكەن. ئافات و كەڕووی وامان هەیە كە دەتوانن هێرش ببەنە سەر ئەلفوبێی خەتی دوژمن. سەیرن ئەم شتانە.

مادەیەكی كیمیاویمان هەیە كەپرەكان بچووك دەكەنەوە. لە رەگ و ریشاڵی دار خەیزەرانەكانەوە دەچنە ژوور و، وادەكەن كەپرەكان دانیشتووەكانیان بخنكێن. ئەوان لە سەعات دەی شەو بەولاوە، كە هەموو دانیشتوانی كەپرەكان خەوتوون، دەست بەكاردەبن، ماتماتیكای ئەوان چێشتەی رەگەزی هەناسەسواریەكە كە ئێمە دامانهێناوە. تیرەیەكی ماسیمان هەیە كە بۆ پەلاماردانی ماسیەكانی ئەوان پەروەردە كراوە. هێڵێكی برووسكەی گون تەقینەمان هەیە. شەریكە مەخابەراتیەكان یارمەتیمان دەدەن. مادەیەكی سەوزمان هەیە كە... نا، وا چاكە هیچ دەربارە نەڵێم.. وشەیەكی نهێنیمان هەیە ئەگەر بیدركێنین، لە پانتاییەكی بەقەدەر چوارمەیدانی یاری تۆپی پێ، دەبێتە هۆی شكان و تێكڤرمانی ئەندامەكانی لەشی هەموو بوونەوەرێك..."

"كەواتە بۆیە..."

"بەڵێ، گەمژەیەك زمانی خۆی پێنەگیرا. مەبەستم ئەوەیە هەموو بونیادی ژیانی دوژمن لەژێر دەسەڵاتی ئێمەدایە. دەتوانین هەڵیدڕین، هەڵیلووشین، وردی بكەین و، لەبەینی ببەین. بەڵام هێشتا ئەمە شتە سەیرەكە نیە."

"بە چ ئیشتیایەكەوە باسی ئەم داراییانە دەكەی."

"بەڵێ پێی لێدەنێم كە ئیشتیا زۆرە. بەڵام ئێوەش دەبێ بزانن ئەم تواناییانە لەخۆیاندا كۆمەڵێ كێشەو گرفتی ئاڵۆز و فەننی دروست دەكەن، كە كورەكانی ئێمە هەزاران سەعات كاری سەخت و تازەگەرانەیان لەپێناودا سەرف كردووە. كەچی قوربانیە بەرپرسی ئەناسەكان زۆرجار زێدەگۆیی دەربارەی دەكەن. ئەڵبەت هەموو ئەم شتانە نیشاندەری زنجیرەیەك سەركەوتنی سەیرو سەمەرەیە بۆ تیمی (دەستە) هەموو كارە و چارەسەركەری ئێمە.

"تێدەگەم"

"ئێمە دەمانتوانی هەموو ئەم تەكنەلۆژیایە لەساتێكدا بەكاربهێنین. بیربكەنەوە لەوكاتەدا چی روویدەدا. بەڵام هێشتا ئەمە شتە سەیرەكە نیە.

"ئەی شتە سەیرەكە چیە؟"

"شتە سەیرەكە ئەوەیە كە ئێمە ویژدانێكیشمان هەیە. لەسەر كارتەكانمان هەڵكەندراوە. رەنگە ئەمە پێشكەوتووترین و، پڕهەست ترین ویژدانێك بێ كە جیهان بەخۆیەوە دیوە."

"لەبەرئەوەی كە لەسەر كارتەكانتان هەڵكەندراوە؟

ئەو گوتی:

"هــەموو ســەرنجەكان بــە هــەموو وردەكاريەكانيەوە لەبەرچاو دەگـرێ. تەنانـەت مامڵەش دەكا. بەم ئامێرە ئەخلاقيە تازەوە چۆن دەكرێ بەهەڵە بچين؟ من بەدڵنياييەوە پێشبينی دەكـەم. ئەگـەرچی دەتوانـين هـەموو ئـەم چەكـە چاكانە وا باسم كردن، بەكاريهێنين، بەڵام هەرگيز بەكاريان ناهێنين.؟

ســەعات 5.44 دەقيقــە ســواری فرۆكــەی "يونـايتێد" بـووم و ســەعات 7،19 دەقيقــە لــە "نيۆئارك" دابەزيم. "نيۆجێرسی" لەو ســەعاتەدا ئاڵێكی درەخشانە. بوونـەوەرە زيندووەكـان لـەو ســەعاتەدا لـە جـم و جووڵـدان و ، لــە رێگـا هەميشــەييەكانەوە موزاحيمــی يــەكتر دەبــن. راپۆرتەكـەم بـە دەستەكەی خۆمـان راگـەياند و، باسی ميوانداری گەرمی ئەندازيارەكانم كرد. گوتم نيگەران مەبن. گوتم ئێمە ويژادنێكيشمان هەيـە. گـوتم هـەرگيز ئـەو شـتانە بــەكارناهێنين. بــەڵام بڕوايان نەكرد.

1) دۆناڵد بارتلمـە (1933– ) نووسـەری ئەمـەريكايی، جگـە لـە رۆمـانی (سـفيد برفـی - 1967) دوو كۆمەڵـە چـيرۆكی بــەناوی (اعمــال ناگفتنی، كارهـای غـيرطبيعی - 1967) و (دكـتر كاليگـــاری - 1974)، بڵاوكردۆتــەوە. چــيرۆكی "راپۆرت" لە كتێبی (هەچيز و هيچ چيز - ترجمە حسن افشار) وەرگيراوە.

2) كتێبی: (گروتسك درادبيات - نوشتە فيليب تامپسون - ترجمە غلامرضا امامی).

3) نەرم ئامێر (نرم افـرار) ئـەو بەرنامانـە كـە دەدرێ بە كۆمپيوتەر (Soft ware).

4) ئەم زاراوە و كۆمەڵێ زاراوەی تر، شـێوەی شێواوی زاراوە زانستيەكانن.

5) دەم دەم ناوی شارێكە لە نزيـك كەلكەتـە. بريتانيا بۆ يەكەم جار ئەو گوللەی لـەوێ دروست كرد و لە شەڕ لەگەڵ ئەفغانەكاندا بەكاری هێنـا.

# ویستگەکانی سەردەم

- جۆرج شتاینەر
- بۆرخس، ئەفسانەی شکۆداری ئەدەب
- نامەی کراوەی ڤۆڵتێر بۆ ڕۆسۆ
- ڕێزگرتن لە ئاهانوێل بۆ
- ئەو کەسانەی خەڵاتی پۆلیتزەری 99 یان پێ بەخشرا
- مەرگی ئایریس مۆردۆك
- یادی سەد ساڵەی هەمەنگوای
- کورد لەبەردەم ڕێژنەگوللەی دوژمنانیدا
- پیدرۆ پارامۆ: جیهانی نغرۆ لە گۆشەگیریدا
- کیژی کاپیتان
- کیمیاگەر، بەرەو بەدیهێنانی ئەفسانەی خود

خوان ڕۆلفۆ
پیدرۆ پارامۆ

پاولۆ کوێلیۆ
کیمیاگەر

ئەلیکساندەر پووشکین
کیژی کاپیتان

ئیسماعیل بێشکچی
سیوسێ گوللە

# جۆرج شتاینەر:

## رۆشنبیریی جەماوەر ئەسپرینی خەڵکە

● و: لەفەرەنسیەوە: ئارام سەعید



جۆرج شتاینەر

● شتاینەر هێرش دەکاتەسەر هەموو ئەوانەی ئایدیاڵ لە مرۆڤ هەڵدەماڵن، ئەو بەهایانەی لەلاشەی مێژوو دەدەن...

دیدارێك لەگەڵ ئانارشیستێکی ئەفلاتونی.

EDJ: مەڕمەڕ ورد دەبێت، برۆنز ئەتوێتەوە، بەڵام نوسین بۆ نوسەرەکەی هەر دەمێنێتەوە. خۆتان دەڵێن: "فلۆبێر وەك سەگێك مرد بەڵام (بۆڤاری سۆزانی) هەرمایەوە، کەواتە کتێب ئەبەدی‌یە؟

شتاینەر: جیاوازیەکی گەورە لەنێوان ناسکیی رووکەشی پێچراوەیەکو دەستنوسی تێکستێکو مانەوەی نوسینێکدا هەیە. پیندار Pindare کە شاعیرێکی گەورەی گریکە بەشانازیو لەخۆبوردوویی‌یەوە دەڵێت" گۆرانیەکەم بەسەر ژیاندا ئەڕوات بۆ ئەو شارەی گۆرانی‌یی بۆ دەڵێم "کەواتە دەفرێکی ئاسمانی‌یە، ئامرازی گەیاندنی

ئەو جیاوازی مانەوەیەیە. ئەو موعجیزە مەزنەیە کە لەگیرفاندا هەیەو لەوانەیە لەسەر شۆستەی گەراجێك بەهەرزان دەنگە مرۆیی‌یەیە کە سی هەزار ساڵە هەیە.

EDJ: ئێوە کتێبی گیرفان (LIVRE DE POCHE)[1] وەك بەرهەمێك سەیر دەکەن کەمایەی فڕێدانو، بەپێچەوانەی کتێبی راستەقینەوە یادەوەریەك دروست ناکات...

شتاینەر: دەقێکی میتافیزیقی، قەسیدەیەکی جوان، رۆمانێکی مەزن، خوێندنەوەیان پێویستی بەهێمنیو بێ دەنگیو کاتێکی دیاریکراو هەیە. راستە گیرفان دەتوانێت ئەو شتانەی تێدا هەڵبگیرێتو لەوەدا کە بەئاسانی بەدەستەوە دێت موعجیزەیە، بەڵام کتێبخانە نی‌یە. من لەوە دەترسم کتێب ئەرکەکەی خۆی لەدەست بدات. لە فەوتانی کتوپڕ دەترسم، بەڵام ئەوەش دەبێتە سنۆبیزم SNOBISME[2] کە مایەی قبوڵکردن نابێت ئەگەر من لەبەر کتێبی گیرفان یان BD(چیرۆکی وێنەدار)، ملیۆنەها کەس رەت بکەمەوە، شەکسپیریان قبوڵە بەرمەجێك هەنگاوێك بێت بۆ سەرکەوتن بەسەر پلیکانەی خوێندنەوەی جیدی.

● لەوەناچێت دڵنیا بێت؟

● نەخێر دەسەڵاتی میدیاکان درندەیی ئاگادارکردنەوە رۆژانەیی‌یەکەیان لەوە ئەچێت بیانەوێت لە BDدا بمێننەوە. ناتوانم ببمە دۆگماتیك، خۆشمان ناچار ناکەین دۆگمای لیبراڵی بەرزکردنەوەی ئاستی رۆشنبیری قبوڵ بکەین.

● یەکێکیت لەوانەی دژی رۆشنبیری جەماوەریت، خۆشت دەڵێیت "ئامانجی یەکسانیو پۆپۆلیستی کۆمەڵە بەکاربەرەکان".

● ئەوە پرسیارێکی سەنتەرییە ئێمە بەگیانو بەرۆح دژی مەترسی‌یەکانی سانسۆر کاردەکەین. بەڵام من داوا دەکەم گەر سانسۆرێکی تر-ئەویش هەر بەهێز بێت- دروست نەکرێت بۆ بازاڕو میدیاکان، ئەوا بەهاکان هەرگیز ناگانە ئەوەی باس لەئازاری بیرکردنەوەی مرۆڤایەتی بکەن. هەر ئەو بازاڕەیە کە لەماوەی دوو تاسێ ساڵی رابردوودا دوو ناوی لەسەر هەسارەکەمان لەهەمووان زیاتر ناساندووە کە ئەوانیش: مارادۆناو مادۆنایە.... لەبەرامبەر ئەوەشدا تەنها 40 تا 50 کەس کانت دەخوێننەوە.. کەواتە پێوانەکە بەو شێوەیە دەبێت کە پارە جوڵێنەر (مۆتۆر)ی سەرەکی‌یە. سەرکردەکانی پۆپۆلیزمو دەسەڵاتدارە رێکخراوەکانی تەلەفزیۆنەکان کە لەهەموو شوێنێك هەن هیچ ئامانجێکیان نی‌یە تەنها بەدەستهێنانی نێچیر نەبێت. ئەوان رقێکی قووڵیان بەرامبەر مرۆڤ هەیە. هەڵسەنگاندنێکی خراپیان هەیە بۆ رۆشنبیرکردن، رقیان لەوەیە زیتر قووڵبیننەوەو لەرووی رووناکبیریەوە. دەوڵەمەندیان بکەن.

● جگە لە رق هیچی تر نی‌یە؟.

● نەخێر تەنها رق نی‌یە، بەڵکو رقێکی گەورەیە لەتوانای مرۆڤایەتیو متمانەیەکی کەلبی‌یانەیە بەدەسەڵاتی پارە. مرۆڤی جیهانی پیشەسازیی هاوچەرخ ئێواران دەگەڕێتەوە ماڵەوە هیلاكو ماندوو بێتاقەتە، بەرامبەر تەلەفزیۆنەکەی دادەنرێت بەبێ ئەوە باس لە ژیانی لەوەدا بکرێت.. کۆڵەکەکانی (رۆشنبیری جەماوەر)یش هەندێك پشوو خەونیان پێ دەبەخشێ، وەك ئەسپرینێکی بەردەوام کە رۆحیان پێویستی پێ‌یەتی.

● ئەو تاوانبارکردنە وەك زەنگی بەرهەڵستی‌یەکی شۆشگێڕانەیە..

● پێم خۆشە وەك ئانار شیستێکی ئەفلاتونی پێناسە بکرێم، بەلای منەوە ئەو سەرمایەداریەی سوپەرمارکیتی رۆشنبیری داهێناوە بەرپرسیارە لەتاوانێکی گەورە: ئەو دەیەوێت مرۆڤ لە هەوڵەکانی بۆ ئایدیالی بوون داماڵێت. لەمارکسیزمدا، سەرەڕای هەموو

ئەوانەی بە مرۆڤایەتی کردووە، ترسێکی فراوان هەیە کە ئومێد بەمرۆڤ دەدات: بەوەی زیاتر ئەلتوریست[3] دەبێت کە ئەویش کارێکی تەواوە.... ترۆتسکی لەدوا بەشی (ئەدەبو شۆڕش)دا لەسەر ئەو شاخانە دەدوێت کە ئەوانیش گۆتەو ئەرستۆن، دەڵێت ئەوان چەند تاشەبەردێکی گەورەی ئەلپ دەبن بە بەراورد لەگەڵ مرۆڤی ئایندەدا. مرۆڤی ئایندەش نە پاڵەوانێکی فتبۆڵێنە نە ئەستێرەیەکی سینەمایی کە ملیارەها لە دەقیقەیەکدا وەردەگرێت.

- بەم پێیەش بە (نخوبی) وەسفت دەکەین.
- ئەوە مانای ئەوەیە بزانیت چی لەوی تر باشترەو منیش ئەو پێناسەیەم قبوڵە.
- لەیەکێك لەدەقەکانتدا نوسیوتە "ئەکرێت کتێبێك خەتەرناك بێت". هیتلەر وەك سەربازێکی پیادە لەسەردەمی جەنگی 14 تا 18 لەناو کۆڵە پشتەکەیدا کتێبێکی هەڵگرتبوو دەیخوێندەوەو دەیخوێندەوە ئەویش کتێبی جیهان وەك ئیرادەو وێناکردنی شۆبنهاوەر بوو..
- هیتلەر لەو کتێبەدا نامرۆییەکی رادیکاڵی دەبینێ، بەڵام تۆماس مان شتێکی تری تیا بەدی دەکرد. پێویستە بەبەردەوامی سەرکێشی بەخەتەرناکی خوێندنەوەوە بکەین. فیکر شتێکی زۆر ئاڵۆزە، ترسناکترین شتی جیهانیشە چەند دێڕە شیعرێکی شاعیرێکی جولەکەی هەژار کە ناوی ئۆسیپ ماندێلستان OSSIP MANDELSTAN بوو بەلای ستالینەوە رژێمەکەی لەرزاندبوو. بەراستیش هەر وابوو بۆیە ستالین کوشتی. زۆر حەز دەکەم بزانم چ شاعیرێك توانیویەتی سەرۆکێکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا نیگەران بکات لە سەردەمی شەڕی ڤێتنامدا. کام شاعیر ئەمڕۆ دەتوانێت سیستمێکی دیاریکراوی دیموکراتی نیگەران بکات. کام کۆمەڵ سازشی لەگەڵ لەرزینی کردووە بەهۆی دەقێکی گەورەوە، تابلۆیەکی مەزنەوە، ئەگەر وابێت ئەوا پێدەچێ لە بارودۆخێکی تراژیدیدا بووەو ئەوەش مایەی پێداچوونەوەیە.
- هیچ جۆرێك لە نۆستالژیات هەیە لە تەمەنێکی زێڕیندا، کاتێك چەند بیریارێك توانیویانە رووی جیهان بگۆڕن؟
- من دەزانم یەکێك لەو لۆمە گەورانەی دژی ژیانو فیکرم هەیە، کۆنییەتی، یان وەك خۆت ئاماژەت پێدا نۆستالژیایە. لە پرسیارەکەت راناکەم بەڵام دەمەوێت ئەوەت پێ رابگەیەنم کە لەناخی پرسیارەکانمەوەیە. لەنێوان 3ی ئابی 1914 سەرەتای جەنگی جیهانی یەکەمو 8ی ئایاری 1945 کۆتایی جەنگی جیهانی دووەم بەگوێرەی ئامارە مێژووییەکان 80 ملیۆن کەس کوژران، بەدیل گیران، رووبەڕووی نەخۆشیو برسێتیو ئافاتو کامپەکانو بۆردوومان بوونەوە.. نازانم پاش ئەو تاریکییە بێهاوتایە، دەتوانین رێنسانس لەمێژوودا بکەین. ئاوشڤیتز[4]، بیرگن-بیلسن.. مێژووی ئێمەی ئەوروپییە. هەموو ئەوانەش بەسەرچوو وەك ئەوەی هیچ رووی دەابێتو جۆرێکی تر لەوێرانکاریو مردن دروست بۆوە. وەك ئاژەڵێکی رەقتر بووین لەو پشیلە ئەفسانەییەی کە بە پشیلەی حەوت رۆح ناسراوە،

لەبەرهەمەکانی:

تۆلستۆی ودیستۆفسکی 1963

مارتن هیدگەر 1987

ئەنتی گۆنەکان 1986

چەند لێکۆڵینەوەیەك 1993

(1)کتێبی گیرفان- Lelivre de poche

(2)شانازی کردنی مرۆڤ بەشتێکەوە کە نیەتی: Snobisme

(3) Alturisme ئەلتوریست/ خۆشەویستی ئەوانی دی

(4) Auschwitz یەکێکە لەو کامپانەی جولەکەکان تێدا دەستگیر کراوە.

سەرچاوە/

L'EDJ 22-28 Mai 1997

# بۆرخس، ئەفسانەی شکۆداری جیهانی ئەدەب

نوسینی: جەیمز ڤودل

• و: سیاوەش

خورخێ لویس بۆرخس لەکاتی مەرگیدا لەساڵی **1986** یەکێك بوو لەبەناوبانگترین نوسەرانی دونیا. زۆربەی خەڵکانی ئەو وڵاتانەی کەزمانیان ئیسپانی نەبوو دەیانویست هۆی ئەو ناوبانگە بزانن، بەڵام تەنها بەزمان ناوهێنانی ئەو، کە لوتکەی ناوبانگدا هەمیشە بۆرخس بوو، ئەفسانەیەکی ئەدەبی بەهەیبەتی، لەزەیندا دەنەخشاند.

ئەو هەرگیز رۆمانی نەدەنووسی. لەکاتی مەرگیشیدا گرنگترین بەرهەمی، کورتە چیرۆکە سەیرەکانی بوو، کەسەر بەچل ساڵ پێشتر بوون و خانەبەندی نەدەکران. لەگەرەکێکی دوورەدەست دا، واتە لەبۆنیوس ئایرس دەژیا، بەڵام لەڕوانگەی ئەوانەی کەبەرهەمەکانیان خوێندبووەوە، بۆرخس نوسەری هەموو خەڵکی جیهان بوو. کاریگەریەکی قووڵی لەسەر نووسەرانی سەرانسەری جیهان دانا، بۆ نمونە لەسەر گابریل گارسیا مارکیز، کارلۆس فۆنتس، ئامبەر تواچۆ، گونتر گراس، ئیتالوکالوینۆ، جان بارثو هەندێکیتر. بۆرخس نمونەی کامڵی یەك نووسەر بوو بۆ هەموو نووسەرانیتر.

لەگەڵ ئەوەیشدا ئەو ناوبانگە بەربڵاوەی ئەو بەهۆی یەك بەدحاڵیبوونەوە بوو. کێشەکە تاڕادەیەك پەیوەندی بەگارسیا مارکیزەوە هەیە. ئەم نووسەرە کەخەڵاتی نۆبڵی لە**1982** دا بردەوە رایگەیاند کەلەساڵی **1960**دا ئەوکاتەی

نووسینی چیرۆکە خەیاڵیەکانی دەست پێکردووە ژوورەکەی بەکتێبی بۆرخس ئاخنرابوو. کاتێ کەناوی مارکیز یەکسان بوو لەگەڵ گەشەی ئەدەبیاتی ئەمریکای لاتیندا، زۆربەی خەڵك ئەویان لەگەڵ بۆرخسدا بەهەڵە وەردەگرت.

شەش ساڵ لەمەوبەر کە بۆ نووسینی ژیان نامەی بۆرخس دەستم بەتوێژینەوە کرد کە(کتێبی پیاو لەناوێنەی کتێبدا) دەرچوو، هەندێ کەس لایان وابوو مەبەستم نووسینی ژیاننامەی نووسەری کتێبی "سەدساڵ تەنهایی"یە.، ئێستا تا چ رادەیەك خەمهێنەرەکە ئەفسانە تەماوییەکانی ئەم کۆڵۆمبیاییە هەموو لایەنەکانی ئەدەبی ئەمریکای لاتینی خستوەتە ژێر رکێفی خۆیەوە، خەمهێنەرتر لەوە ئەوەیە کەدەستەواژەی ترسناکی "ریالیزمی جادویی" لەبەرهەمەکانی گارسیا مارکیزەوە راگویزراوە بۆ بەرهەمەکانی بۆرخس. بۆرخس ریالیستێکی جادویی نەبوو. ئەو نووسەرێك بوو کەبەزمانی ئیسپانی بەشێوەیەکی شۆرشکارانەو سەرسوورهێنەر دەینووسی، بەڵام ئەمە هەرگیز ئەوی نەکردوەتە ریالیستی جادویی، یان هیچ نەبێت، دامەزرێنەری ئەو قوتابخانە بێ شەرتو بەندو کەمتەرخەمە.

جگە لەوەش ئەگەر خوێنەرێك پێی وابێ کە بەخوێندنەوەی کتێبی "La byrinths" ی (کەبەناوبانگترین کتێبێتی بەزمانی ئینگلیزی) کەکتێبێکی کەم مایەو پینەوپەڕۆ کراوە، بۆرخسی خوێندوەتەوە، ئەوە ئەو خوێنەرە لەوپەڕی هەڵەدایە.

بۆرخس بەرهەمی یەکجار زۆر بەرزتری لە **La byrinths** ی نوسیوە. هەر لە شیعرە هەژێنەرەکانی ساڵی 1920ەوە بیگرە هەتا چیرۆکە سەرسوورهێنەرەکانی دواترو کتێبە پڕ گوتارەکانی ساڵی 1980، هەموویان ئەوە دەسەلمێنن کەبۆرخس یەکێکە لەکەڵە پیاوانی ئەدەبیاتی ئیسپانیا. خۆ ئەگەر لەدەرزەنێك نووسەری ئیسپانی داوا بکەی کەلەنێوان ئەو دوو نووسەرەدا یەکێکیان هەڵبژێرن، بێگومان وەڵامیان ئەمەیە: واز لەگارسیا مارکیز بێنن، بۆرخس مامۆستاو و رابەری بێچەندو چوونە.

بۆرخس لە24ی ئابی ساڵی 1899 لەبۆینس ئایرس لەدایك بووە. دایکی باوکی ئینگلیز بووە: بۆرخس باوباپیرانی دایکی لەریزی ئەو شۆرشگێرانە دادەنێ کەبەشداری جەنگە بێکۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەمیان کردبوو، ئەوەی کەئەرژەنتین تێیدا چەند پارچەکرا. بنەماڵەی ئەوان لەماڵەوە بەئینگلیزی دەدوان. یەکەمین برادەری راستەقینەی بۆرخس کتێبخانەکەی باوکی بوو، کەزۆربەی کتێبەکانی بەرهەمی ئەدەبیاتی ئینگلیزی بوون. لەساڵی 1914دا بەبێ ئەوەی ئاگاداری نزیك بوونەوەی جەنگی یەکەمی جیهانی بن بنەماڵەی بۆرخس بەرەو جێنێڤ کەوتنەرێ.

باوکی بۆرخس بەدوای دەمانێکدا وێڵ بوو کە بۆ چارەسەری کزبوونی سۆمای چاوی بکات- نەخۆشییەك کەوەك میراتی بۆ بۆرخسیشی بەجێهێشت تاپێش کۆتایی دەیەی 1950 خورخێ بۆرخس بەتەواوەتی بینایی لەچاوەکانیدا نەما.

لەگەڵ دەستپێکردنی جەنگی گەورە، ئەم بنەماڵەیە بەناچاری لەسویسرا مانەوە.خورخێ لویسی گەنج (یان "جۆرجی" ناوێك کەبرادەرەکانی تا مرد، بەو ناوە بانیگان دەکرد) خۆی نوقمی ئەدەبیات کرد: ئەدەبیاتی ئەرژەنتینی، فەرەنسی، ئەڵمانیو ئەمریکای باکور. کاتێ کەبنەماڵەی بۆرخس لەساڵی 1921

دا گەڕایەوە بۆ بۆینس ئایرس، جورجی دڵنیابوو کەدەبێتە شاعیر.

ڕووداوێکی ئوتومبێل لەساڵی 1938، کە تیایدا سەری بریندار بوو بەمەش خوێن ژەهراوی بوونەکەی کە چەند هەفتەیەک گیانی خستە مەترسیەوە، بۆرخسی بەرەو چیرۆک نووسین ڕاکێشا. ئەوکاتەی کەتازە بەرەو چاک بوونەوە دەڕۆیشت چیرۆکێکی کورتی لەسەر کابرایەک نووسی کەئێستا مردوە، بۆرخس دەیویست تەنها لەڕێگەی ئافراندنی دووبارەی دەقەوە وشە بەوشە دۆنکی شوتی سروانتس، دووبارە بنووسێتەوە.

پاش بڵاوکردنەوەی ئەو چیرۆکانە لەدوو کتێبدا - یەکەم **Ficciones** لەساڵی **1944**و دووەم **ElAleph** لە **1949**دا، نووسەر "جورجی" تێپەڕاندو بوو بە"بۆرخس" کەسایەتییەک کەبەڕاستی لەناو لاپەڕەی کتێبەکانیدا دڵخوازانە ئامادەیە، ناسیاو و برادەرەکانیشی لەوێدا ئامادەن. لێرەدا وێرانێکی نائاسایی‌و تازە لەبواری چیرۆك نووسیدا دەبینین. کەئاماژە گەلێکی تەوس ئامێزە بەخودی خۆی کەبەڕواڵەت هاومتمانەیی تیۆریی زانست کەم دەکاتەوە، واتە ڕەش بینی‌یەکی گومان ئامێزو جزوودارەو لەهەمان کاتیشدا شادی هێنەرە.

لەسەروی هەموو ئەمانەیشەوە، هەروەك یەکەم خوێنەرەکانی ئەمریکای لاتین ئەوانەی خوێنەری بۆرخس بوون - دەستنیشانیان کردبوو، ئەو زمانە ئیسپانیەی بۆرخس پێی دەنووسی هەم تازەو شەفاف‌و پوختەبوو، هەم کۆن: واتە جوانترین زمانی ئیسپانی لەسەردەمی سروانتس بەم لاوە.

ساڵانێکی پێچوو تا ئەم لایەنەی بۆرخس (واتە بۆرخسی کامڵ و یەك پارچە) دەرکەوت، واتە پێشەنگو هەروەك "جۆیس" ئافرێنەری زمانێکی ئەدەبی، نووسەرێکی سەختگیر نەك هەر تەنها گاڵتەبێژ. هەموو چیرۆکەکانی بۆرخس لەساڵانی **1935**ەوە تا **1983** لەلایەن "ئاندرۆهێرلی"یەوە بەناوی کۆمەڵە چیرۆکی پەنگویین (البطريق) بۆ ئینگلیزی وەرگێڕراوە. کۆمەڵە شیعرێکیشی وەرگێڕدراوە کە ماوەیەکی‌تر بڵاودەبێتەوە هەرچەندە وەرگێڕانەکەی "هێرلی" جێگای هەندێ ڕەخنەی بچووکی تێدایە بەڵام شایانی باسە کە سەرجەم بەرهەمەکانی دەزگای پەخشی پەنگویین بوونەتە هۆی ئەوەی کە ئینگلیزی زمانەکان چاکتر بۆرخس دەرك بکەن.

کاتێ کەلەساڵی **1940**دا بەرهەمەکانی بۆرخس وەرگێڕدرایە سەرزمانی فەرەنسی‌و لەپاریس پەخش کرایەوە، وەك ئەوە وابوو کە ئەوروپا وڵاتێکی ئەدەبیی تازەو گرنگی دۆزیبێتەوە. لەدەهەی **1950**دا "**New Novel**) هێندە لەبۆرخس نزیك ببۆوە کەزیاتر بەنووسەرێکی فەرەنسایی لەقەڵەم دەدرا تاکو ئەرژەنتینی. لەدەهەی **1960**یش دا بەرهەمەکانی لەڕێگەی وەرگێڕانی پەرت و بڵاوە وە گەیشتنە ئەمریکا.

لەساڵی **1965**دا "جۆن ئاپدەیك" ڕایگەیاند کەلەگەڵ (ناسین‌و قبوڵ کردنی هەرچەند درەنگ وەخت - خۆرخێ لویس بۆرخسی بلیمەت لەلایەن ئەمریکای باکورەوە) چیرۆك نوسین، دیدو زانستێکی وەرگرتووە کە تائێستا بەتایبەتمەندیی فەلسەفەو فیزیا لەقەڵەم دەدران.

لیستەی ئەو رەخنەکارە پایەبەرزانەی کەئەویان لەریزی گەورترین نووسەری سەدەی بیستەمدا، لەقەڵەم دەدا، روو لەزیادبوون بوو: بۆ نمونە میشل فۆکۆ، جۆرج ئیشتاینەر، هارۆڵد بلوم لەو لیستەدا بوون. بۆرخس شکۆنامەیەکی رەسمی جیهانیی لەدەست داو ئەویش خەڵاتی نۆبڵ بوو. هۆکەیشی ئەوەبوو کە لەدەهەی 1970دا بەبێ لەبەرچاوگرتنی هەندێ سەرنج، چەند بیروڕایەکی سیاسی راگەیاند. هەرچەند بۆرخس بەتەبیعەت مرۆڤێکی خۆپەرێزو دورئەندێش بوو، بەڵام جارجارە بەپشتیوانی رژێمە راستڕەوەکان دادەنرا وەك رژێمەکەی خۆی لەئەرژەنتینو رژێمی پینۆشە لەشیلیدا.

ئەو لەوەی کە نائاگاییو بەدووربوونی لەمەسەلەی سیاسییەوە پێ خۆش بوو، ئەمەیش دەبوە هۆی تورەیی چەپ رەوەکان. هەرئەمەیش بووبەهۆی لەدەست دانی خەڵاتێك کەبێگومان بۆرخس شایانی وەرگرتنی بوو.

ئەم پیاوە خۆیشی وەك نوسینەکانی پڕ لەڕازو نهێنی بوو. لەنێوان سالآنی 1924و 1961دا ناوچەی River plateی هەرگیز چۆڵ نەدەکرد، هەروەها هەندێ کێشەی کەسی هەبوو کەئاشکراترینو بەگێچەڵترینیان نەفرەت گرتن بوو لە"خوان پرۆن" دیکتاتۆری ئەرژەنتین. بۆرخس سەرەڕای کوێری بەڕێوەبەری کتێبخانەی نەتەوەیی بۆینس ئایرس بوو، دایکی تا لەساڵی 1975دا مرد هەر لەگەڵیدا دەژیا.

لەدەهەکانی 1960و 1970دا، بۆرخس ئەستێرەگەشەی ئاسمانی گوتاربێژی بوو. کەکۆڕی هەبوایە، لەماوەی چەند کاژێردا جێگە بەرنەدەکەوت. سەرەڕای ئەمانە رەفتارێکی خاکیو بێدەعیەی هەبوو، بازنەی برادەرانی بەئەمەگی بۆینس ئایرسی تادوایین رۆژی ژیانی پاراست، و هەروەها گاڵتەبێژیو دڵ ناسکیەکەیشی تا مردن لەگەڵی بوون. بەم وتەیەی جۆرج شتاینەر کۆتایی بەباسەکە دەهێنم: بۆرخس روانگەی بیرەوەرییەکانمانی فراوانتر کردەوە.

# نامەی کراوەی ڤۆڵتێر بۆ ڕۆسۆ

و: م. خالید

سەدەی هەژدەیەو چاخی ڕۆشنگەری. ڤۆڵتێر تەمەنی حەفتا ساڵەو لەجێنێف - شوێنی لەدایك بوونی ژان ژاك ڕۆسۆ - دا دەژی. ڕۆسۆ کەزانستەکانو ئەدەبیات بەمایەی خراپەکاری دەزانێ، گوتارە بەناوبانگەکەی خۆی لەو بوارەدا دەنوسێ،و ڤۆڵتێریش بەزمانێکی شیرینو تەوس ئامێزو چزوودار وەڵامی ئەو تێزەی ڕۆسۆ دەداتەوە کە لەشێوەی گفتوگۆیەکدایە بەناوی "تیمون" ئێستا ڕۆسۆ گوتارێکی تری بەناوی "سەبارەت بەنابەرابەری" نوسیوەو دەقێکیشی بۆ ڤۆڵتێر ناردوە. ڤۆڵتێر سوپاس نامەیەکی بۆ ڕۆسۆ نوسیوە کە لەڕیزی بەناوبانگترین نامە ئەدەبیەکانە لەمێژووی ئەدەبیاتی فەرەنساداو هەروەها بەرگرییەکی تابان و نایابە لەئەدەبیات.

فەرمون ئەمە دەقی نامەکەی ڤۆڵتێرە بۆ ڕۆسۆ:

**جنێڤ 30 ئابی 1755**

بەڕێز:

کتێبی تازەی دژ بەمرۆڤی جەنابتم پێگەیشت. سوپاست دەکەم، تۆ دەبیتە جێپەسەندی ئینسانەکان، چونکە حەقیقەتەکانت بۆ بەرجەستەکردوون، بەڵام نابیتە مایەی ریفۆرمو چاك بونیان. پێم وانییە بکرێ لەمە چاکترو زەقتر گەندەڵییەکانی کۆمەڵگای ئینسانی



ڤۆڵتێر

بەرجەستەبکرێ، ئەو کۆمەڵگایەی کەئێمە بەهۆی لاوازیو نەزانی خۆمانەوە بەکۆمەڵگایەکی دڵخۆشکەری دەزانین. هەرگیز ئەوەندە زیرەکی بەکارنەبراوە بۆ پیشاندانی نەزانییەکانی ئێمە. بەخوێندنەوەی کتێبەکەی تۆ، ئینسان حەزدەکا دەستەکانیش ببنەپێو وەك چوارپێ رێبکا، بەڵام چونکە نزیکەی شەست ساڵە ئەوجۆرە رۆیشتنەم تەرك کردوە، هەست دەکەم ناتوانم تازە بچمەوە سەری، کەواتە ئەو شێوە سروشتییە با بۆ ئەوانەبێ، کە لەمن و تۆ زیاتر شایستەی ئەو جۆرە رێکردنەن. ئیتر توانای ئەوەشم نەماوە سواری پاپۆرێك بمو بچمە کەنەداو لەگەڵ وەحشییەکانی ئەوێدا بژیم. یەکەم لەبەرئەوەی ئەو نەخۆشیە جۆراوجۆرانەی کەئازارم دەدەن، ناچاریان کردوم کە لەدوکتۆرە پسپۆرەکان دوورنەکەومەوە، چونکە دەزانم ئەو خزمەتگوزارییانەم لەلای "میسوری"یەکان دەست ناکەوێت. دووەم لەبەرئەوەی ئەوان خەریکی جەنگن، وڵاتەکانی ئێمەیش نەبوونەتە دەرسو پەندێك بۆئەوان کەهیچ نەبێ نەختێك لەو دڕندەخوییو شەڕەنگێزییەیان کەم بکاتەوە. کەواتە خۆم بەوە رازی دەکەم کەوەك وەحشییەکی ئاشتی خواز بمێنمەوەو لەوڵاتەکەی تۆدا – واتە ئەو وڵاتەی کەتۆیش دەبوایە تێیدا بوویتایە لەسوچێکی گۆشەگیریدا کەخۆم هەڵم بژاردوە، بژیم.

منیش لەگەڵتام کەهەندێ جار ئەدەبیاتو زانست دەبنە مایەی شەڕ. نەیاران "تاس" (1) یان بەدبەختو چارەڕەش کرد. دوژمنان زیندانەکانیان لەزایەڵەو ناڵەی "گالیلۆ" پڕکرد، کە لەتەمەنی حەفتا ساڵیدا بوو، و تەنها لەبەرئەوەی پەیبەرەوتی گۆی زەوی بردبوو لەوەیش شەرم هێنەرتر ئەوەبوو کەداوایان لێکرد لەقسەی خۆی پەژیوان بێتەوە. هەر برادەرەکانی خۆت، هەرکەویستیان "ئەسیکلۆپیدیا" یەك بنوسن، ئەو گوستاخانەی کە خەیاڵی بەربەرەکانێ یان لەسەردابوو، ئەوانیان بەخوانەناسو لەدین وەرگەڕاو و تەنانەت بە "ژانسنیست"[2] لەقەڵەم دا. ئەگەر بوێرم خۆم




لەریزی ئەوانەدا دابنێم کەپاداشی بەرهەمەکانیان جگە لەئازارو ئەشکەنجە چی تر نەبووە، کەسانێکم پێ دەناساندی کەلەرۆژی نمایش کردنی تراژیدیای "ئۆدیپ"ە کەمەوە بۆ پێستی سەرم دەگەڕن. بەئەندازەی کتێبخانەیەك قسەی سوكو جنێو لەدژم چاپ کرا. تەنانەت کەشەیەك کەرۆژی لەرۆژان "ژزوئیت – Jesuite" بوو، من لەمەرگ رزگارم کردبوو، بەجنێو نامەیەکی زۆر

ناشیرین پاداشتی دامەوە. یەکێکی‌تر، کەزۆر لەمەیان تاوانبارترە، کتێبی "سەدەی لویسی چواردەهەم"ە کەی منی بەپەراوێز نوسینەوە چاپ کردبوو کەبەیانگەری نەزانی رەهاو ئەوپەڕی ساختەچییەتی خۆی بوو. دیسان کابرایەکی تر چەند نەسک لەبەرهەمێك بەناوی "مێژووی جیهان"ی بەناوی منەوەی بەپەخش کەرەوەیەك فرۆشتبوو. کابرای پەخش کەرەوە تەماح دەیگرێ‌و ئەو تورەهاتانە بەهەموو بەرواری هەڵەو رووداو و ناوی ناراستەوە چاپ دەکاو هەندێ بێ‌ویژدانیش پەخشی ئەم "راپسودی" یەیان بەسەر مندا ساوی. هەروەها دەتوانم کەسانێکت لەم گروپە ناپاکە پیشان بدەم کەنمونەیان لەسەردەمە کۆنەکانیشدا نەبینراوە، کەسانێك کەنەیانتوانیوە تەنانەت پیشەیەکی شەریف – لەکرێکاری‌یەوە بگرە هەتا نۆکەری – پەیدا بکەن کە بەداخەوە توانای نوسین‌و خوێندنەوەشیان هەیە، خۆیان لەئەدەبیات هەڵدەقورتێنن‌و لەرێگەی سەلماندنی بەرهەمەکانی ئێمەوە نان دەخۆن. ئەمانە دەستنووسەکانی من دەدزن‌و وشتێك لەدەقەکەی زیاد و کەم دەکەن‌و پاشان دەیفرۆشنەوە. دەتوانم بۆ نمونە ناوی هەندێ بەشی ئەو تەوسانە بهێنم کە (30) سی ساڵ لەمەوبەر نوسیبووم و ئێستا بەهەموو جیهاندا بڵاوبۆتەوە، چونکە ئەو نەگبەتە خەیانەتکارو بەتەماحانە بەوپەڕی بێ‌شەرمی‌یەوە تەوسەکانی منیان لەگەڵ بێ‌شەرمی و گەوجایەتی‌و بەدزانی خۆیان ئاوێتەکردووە پاش تێپەڕبوونی سی ساڵ ئێستا وەك بەرهەمێك کەهەر شیاوی ناوی خۆیانە، بەشێوەی دەستنووس لەهەموو جێگەیەکدا بڵاویان کردووەتەوەو دەیفرۆشن، و سەرەنجام ئەوەیش بڵێم کەئەو بەڵگە نامانەی بەمەبەستی تۆمارکردنی "مێژووی جەنگی 1741" نوسیبووم، لە کاتێك دا کەمێژوونووسی فەرەنسابووم هەتا بۆ ئەرشیفی گشتی و بەشی لێکۆڵینەوەی کۆبکەمەوە ئەوانەیان لێ‌دزیم‌و بەپەخش کەرەوەیەکیان فرۆشت لەپاریس. ئەمانە وا رەفتار دەکەن وەك بڵێی من مردووم‌و ماڵم هەراج کراوە.

دەتوانم باسی بێ‌ئەمەکی‌و ساختەچییەتی‌و راو و رووتێکت بۆ بکەم کەچل ساڵە تا پێ‌دەشتەکانی کێوەکانی ئالپ‌و هەتا گوێی قەبریش، هەر بەدوامەوەن. بەڵام لەیادکردنی ئەم مەینەتیانەدا چیمان دەستگیردەبێ؟ نابێ من گازەندەبکەم، چونکە ؟پۆپ؟(3)، "دیکارت"(4)، "بەیلی"(5)، "لوکامونس"(6)و سەدانی دیکە لەپیاوانی ئەدەب، ئەم نایەکسانی‌یەو زۆر توندوتیژتر لەمانەشیان چەشتووەو ئەمە چارەنووسی زۆربەی ئەو کەسانەیە کەلەرادەبەدەرە سەرمەستی ئەوینی ئەدەبیاتن.

بەرێز، قبوڵی بفەرمون، کە ئەم جۆرە روداوانە بەدبەختی گەلێکی بچوك‌و تایبەتن کە ناکەونە بەرچاوی کۆمەڵگا. بەلای کۆمەڵگای مرۆڤەوە – تاڵان کردنی چەند شانە هەنگوین لەلایەن چەند هەنگێکەوە کەی شایەنی باسکردنە؟ ئەدەب دۆستان لەسەر ئەم جۆرە شتە بچووکانە هەراو زەنایەکی زۆر بەرپادەکەن، بەڵام خەڵکانی تر، یان بەرامبەری کەم تەرخەمن یان پێکەنینیان بەم شتانە دێت. ئەم شتانە لەبەرامبەر ئەو مەینەتییانەی مرۆڤ لەژیاندا دەیبینێ، کەم بایەخن. لەبەرامبەر ئەو هەموو بەدبەختی‌یەی کەگۆی زەوی بەردەوام تیایدا ئەتلێتەوە، نەختێك ئاوبانگ‌و چەند چقڵ‌و درووییەکی ئەدەبیات لەگوڵ کەمترنین. قبوڵی بفەرمون کەنە"سیسرۆن"، نە"دارون"، نە"لۆکرۆس" نە"ویرژیل"ونە "هوراس"، کەمترین تاوانیان لەکۆت‌و زنجیرکردنی مرۆڤدا نەبووە. "ماریوس" گەلحۆ (ابلە) بوو، "سیلا" دووره ژیار بوو، "ئانتوان"ی بۆگەن‌و "لیپید"ی گەوجیش، ئەفلاتوون‌و

سوکراتیان نەدەخوێندەوە. "ئوکتاڤیۆسپیاس"ی خوێنرێژی خوێرپی کەنازناوی نەشیاوی "ئەگۆست"ی هەڵبژارد، ئەوکاتە بێزراو بەرنەفرەتی هەموان کەوت، کە لەکۆڕی کەڵەپیاوانی ئەدەب دەرکرا.

قبوڵ بفەرموون کەهۆکاری پشێوییەکانی ئیتالیا، نە"پترارك" بونە "بوکاچیو" هەروەها، "مارۆ" مایەی کوشتاری "سەینت بارتلمی" نەبوو، و شەڕی ناوخۆی "فرۆند"یش تراژیدیاکەی "سید" هەڵی نەگیرساند. تاوانبارانی جنایەتە گەورەکان هەمیشە بێئەقڵە ناوبانگ دارەکان بوون. ئەوە کە لەئێستاو لەرابردووشدا بوونەتە مایەی نەگبەتی بۆ ئەم جیهانە، تەماحو پارە پەرەستی لەڕادەبەدەر ولەخۆباییبوونو سەرکەشی ئینسانەکان بووە. ئەدەبیات خۆراکی گیانەو زاخاوی دەداتەوەو ئارامی ئەکاتەوە. هەر جەنابت کاتێ کەدژی ئەدەبیات دەنووسی، لەخودی ئەدەبیات کەڵك وەردەگری. جەنابتان لە"ئاشیل" ئەچیت کەدژی سەروەری دەجەنگی، و دەتوانم بە"مالبرانش"ت بچووێنم کەبەیارمەتی هێزی سەرسوڕهێنەری خەیاڵ دژی هێزی خەیاڵ شتی دەنووسی.

ئەگەر بڕیار وایە کەسێك بەدەست ئەدەبیاتەوە بناڵێنێ، ئەبێ ئەو کەسە من بم، چونکە هەمیشە و لەهەموو جێگایەك بووەتە مایەی ئازارم، بەم حاڵەیشەوە دەبێ ئەدەبیاتمان خۆش بوێ، تەنانەت ئەگەر نەیاران خراپیان بەکارهێنابێت، وەك چۆن پێویستە کۆمەڵگای ئینسانیمان خۆش بوێت، هەرچەندە ئەو کەسانەی بەدزاتو ناپاکن زۆرن، و خۆشییان لەکۆمەڵگادا نەهێشتوە.

وەك چۆن، پێویستە نیشتمانمان خۆش بوێت، بالەخاکی نیشتمانیشدا بەرەو ڕووی بێعەدالەتی دەبینەوە.وەك چۆن پێویستە خوامان خۆش بوێ، هەرچەندە دەمارگیریو خورافە پەرەستی گەلێجار دەبنەهۆی سوك بوونی ئایینەکەی. کاکی شەپقەبەسەر، وەك دەڵێن باری تەندروستیت تەواو نییە، دەبێ بێیتەوەو لەئاووهەوای نیشتمانی خۆت دا تەندورستی خۆت بەدەست بهێنێتەوەو لەخاکی نیشتماندا بەشداری ئازادی بیت. وەرە لەگەڵ مندا پێکەوە شیری مانگاکانمان بخۆینەوەو کاوێژی ئالیکەکەمان بکەین.

**لەگەڵ ڕێزو سۆزی فەیلەسوفانە:**

**ڤۆڵتێر**

1- Tasse: یەکێکە لەشاعیرە بەناوبانگەکانی ئیتالیا لەنیوەی دووهەمی سەدەی شازدەدا

2- Janseniste

3- pope

4- Decartes

5- Bayle

6-(شاعیری پورتوگالی) Le Camoens

سەرچاوە: مجلە فرهنگیو هنری وبخارا شمارە 5 – فروردین واردیبهشت 1378

# ڕێزگرتن لە (ئامانوئێل بو)

ئا: شارلۆت گریگۆریان
• و: نادیا ئەمر

(ئامانوئێل بو) ئەو نووسەرەی کە "ریلکە" و "بیکێت" ئافەرینیان دەکرد و لەلایەن بڵاوکەرەکانەوە پشت گوێ خرابوو. ئێستا دیسانەوە فەرەنسا دەیهێنێتەوە ئارا.

(ئامانوئێل بو) نووسەری بەسەرهاتی ژیانی لێك هەڵوەشاو و لەناوچوو و بەباچووەکان بوو، و "ریلکە" و "بیکێت" و "هانتکە - Handke" هۆگری بوون و زۆریان بە دڵ بوو. بەڵام لە ساڵی 1998 دا لەیادی سەد ساڵەی لەدایك بوونیدا کەس جەژنی بۆ نەگرت.

کچەکەی ئامانوئێل "نۆرا دێ ماینبۆرگ - Mora de Meynbourg" دەڵێ: بەشێك لە جیهانی ئەدەبیی فەرەنسا بە ئانقەست ئەویان فەرامۆش کرد. چونکە ئەو لەچاو (سارتەر) و (کامۆ) و (ئاراگۆن) لەپێشتر بوو.

بەڵام ئێستا کاتی ئەوە هاتووەکە پەردەی فەرامۆشی سەر (ئامانوئێل بو) لابدرێ، هەرچەندە فەرەنسا، چیتر لەژێر پۆستاڵی داگیرکەراندا نییە و سەردەمی "پێتەین - Petain"ش کۆتایی پێهاتووە، بەڵام شێوازی سادە و نائومێدانەی چیرۆکەکانی ئەو، لەگەڵ گیانی خوێنەرانی ئەمڕۆدا زیاتر گونجاوە.

دەزگای پەخشی "فلاماریۆن - Flammarion" ی فەرەنسی ڕۆمانی "کەسایەتی ژن" کە "بو" لە ساڵی 1936 دا نووسیبووی بۆ یەکەم جار بڵاوکردەوە. ئەم ڕۆمانە چیرۆکی ژنێکە بەناوی کۆڵت و ئەوینی ئەو بە (ژاك)، کە ئەم بەسەرهاتە لەدوا زەمینەیەکی کوشتارەکانی جەنگی یەکەمی جیهانیدا ڕوودەدا. کۆڵت ئەوینی خۆی ژێرپێ دەخات بۆئەوەی بچێت بۆ بەرەکانی جەنگ تۆڵەی خوێنی براکەی بستێنێ. ئەم

دووکارە کامیان زۆر بێ رەحمانەیە؟ جەنگ یان چەمکی نەمانی پەیوەندیی ئینسانی، خۆویستی، سووکایەتی، تەنیایی و گۆشەگیرییەك کە کوڵت و ژاك تێیدا زیندانین و پەلەقاژە دەکەن؟

نۆرا هەروەها دەڵێ: کەسایەتییەکانی ناو چیرۆکەکانی باوکم وەك ئەتۆم گەلێکن کە لە بێ متمانەیی جیهاندا بزربوون و بەدوای پاڵ پشتێکا دەگەرێن. بەلام پاڵپشتەکان بوونەوەرێکی چەوین، کە خۆیان داوەتە دەست شەپۆلە بەخرۆشەکانی دەریا. (ئامانوئێل بو) یش ئەتۆمێکی بزربوو بوو.

ژیانی (ئامانوئێل بو) لە سەردەمێکی دژوار و تاریکدا بەسەرچوو، لەگەڵ دامەزراندنی بەرەی گەل، لەوێدا بوو بە ئەندام. پاشان جەنگی ئیسپانیا، جەنگ دژی ئەڵمانیا، داگیرکردنی فەرەنسا، و ڤیشی Vichy، هەلاتن بەرەو جەزایر لەگەڵ کچی جولەکەیەکی خاوەن بانك بەناوی لویز ئوتنزوسەر "Louise Ottensooser" (لە ساڵی 1930 دا زەماوەندی لەگەڵ کرد)، پاشانیش تووشی مالاریا بوو و بەبێ هیچ سەرنج راکێشانێك گەرانەوە بۆ فەرەنسای ئازادکراو.

ئامانوئێل بێووچان دەینووسی: بۆ رۆژنامەکانی وەك "ماری ئان - Marianne" و "پاریس سۆیر Paris-Soir" هەروەها راپۆرت و گوتاری لەمەڕ رووداوی جنایی و بابەتی تر دەنووسی کەچی کەمترین سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا.

نۆرا دەگێرێتەوە: لە ساڵی 1942 دا، ئەو کاتەی کە دۆست و دوژمن لە یەك جیانەدەکرانەوە و نەدەزانرا کە دوژمن لە کام دەمامکەدا سیمای خۆی شاردوەتەوە، (ئامانوئێل بو) کتێبی "تەڵە" ی نووسی، چیرۆکێ کە لە رووداوەکانی ڤیشی وەرگێڕابوو. سازشکارییەکانی ئەوکاتەو هاوکاریکردنی دوژمنانی تێدا ئاشکرا دەکات.

بەلام ئەوکتێبە بۆ ساڵی 1945 زوو بوو. شنەبای شکۆمەندی ئازادی لە هەوادا شەپۆلی دەدا و خواستی فەرامۆش کردن زاڵ بوو. سارتەر و کامۆ دەواری خۆیان لە هەوارگەی ئەدەبیاتی ئەو سەردەمەدا هەڵدابوو. جگە لەوەیش خۆشنما نەبوو کە خۆشی و شادی بەری ئازادی ئەوکاتە بە نووسینەکانی "بو" بێلەززەت بێت. هەر بۆیە بلاوکەرەوەکان خۆیان لە قەرەی بەرهەمەکانی ئەو نەدەدا.

نۆرا هەروەها دەڵێ:

لە ساڵی 1979 دا پاش مردنی لویز - هاوسەری ئامانوئێل - جانتایەکی بچووکی قاوەییمان لەژێر تەختەنوێنەکەی (قەرەوێڵە) دا دۆزیەوە. دەستنووسی رۆمانی "کەسایەتی ژن" و چەن وردە شتێکیتر کە هی "بو" بوون لەناو جانتاکەدا بوون.

(ئامانوئێل بو) لە ساڵی 1945 بەهۆی نەخۆشیەکی سەیرەوە کە زیاتر لەسەر رۆحی کاریگەر بوو تا جەستەی، تۆماری ژیانی پێچرایەوە.

# ئەو کەسانەی خەڵاتی پۆلیتزەری 99 یان پێ بەخشرا

و: راسان موختار

جۆزێف پولیتز ێر، لەسالانی کۆتایی سەدەی نۆزدەدا ببوە یەکێك لە بەناوبانگترین رۆژنامە نووسانی ئەمریکا. ناوبراو بە رەگەز مەجەری یە یەکێك بووە لە بە ئەزموونترین رۆژنامەگەران و بەتەواوی دژی گەندەڵی و ریاکاری دەوڵەتان وەستاوەتەوە. داهێنانەکانی لە رۆژنامە گەلی وەك ((نیویۆرك وردو، سنت لویس پۆست)) وای کرد کە رۆژنامەگەری روخسارێکی نوێ بەخۆیەوە ببینێ.

پۆلیتزەر لەساڵی 1904 بۆ یەکەمجار بەرنامە ی بەخشینی خەڵاتی پرلیتزێری دارشت. لەسەرەتادا چوار خەلاتی بۆ بەشی رۆژنامەگەری و چوار خەلاتیشی بۆ بەشی ئەدەبو یەك خەلات بۆ نووسینی دەقی شانۆیی و چوار خەلات سەفەرکردن و خەلاتێکیشی بۆ پەروەردەو خوێندن دانا.

لەدەستپێکردنی یەکەم دەورەی بەخشینی خەلاتی پولیتزێر لەساڵی 1917 هەتا ئێستا ئەنجومەنی خەلاتی پۆلتیزێر، بڕی خەلاتەکانی، بۆ 21 خەلات بۆ (21 بابەتی جیاواز) زیاد کردووەو کۆمەڵێ بابەتی وەك شیعرو مۆسیقاو وێنەگرتنی خستۆتە لیستی خەلاتەکانەوە. (هەڵبەت بە و مەرجەی پابەندی ئامانجەکانی دامەزرێنەری ئەم خەلاتە بن). ئەنجوومەنی بەخشینی خەلاتی پۆلیتزەر، لەساڵی 1997و لەیادی 152یەمین چالاکی خۆیدا. پێناسەیەکی ئاشکرای بۆ چوارچێوەی کارو چالاکییەکانی ئەم ئەنجومەنە پێشکەش کرد. بەپێی ئەم پێناسەیە




ڕێزو پێزانینێکی تەواو بۆ بایەخ و ڕۆڵی (ڕۆژنامەگەری ئیلکترۆنیکی) لەبواری ڕاگەیاندنا دانراوە.

لەماوەی 152 ساڵ چالاکیدا، گەلێ ڕەخنەی ئاراستەی ئەنجومەنی پولیتزێر کراوە ڕەخنەکانیش لەبابەت شیاوێتی کەسەکان و ئە و ڕۆژنامانەن کە خەڵاتیان پێ دەبەخشرێت یا پێیان نابەخشرێت، دیارە هەموو کاتێك بیروڕای جیاواز هەبووە، ئەمەش شتێکە بەری پێ ناگیرێت. بۆ وێنە بەشی زۆری ئەو کتێبانەی ئە و خەڵاتەیان پێ بەخشراوە (ناویان) لە لیستی پرفرۆشترین کتێبەکاندا نەبووە، یان زۆربەی شانۆکان هیچ کات لە (برادۆی) کە ناوەندی نێودەوڵەتی شانۆیە لە ئەمریکا. نەچوونە سەر مەسرەح، یان کۆمەڵێ کەس لە (ڕۆژنامەکانی) ((وال ستریت ژۆرناڵ، واشنگتن پست و نیویورك تایمز)) توانیویانە ئەم خەڵاتە بەدەست بهێنن. دیارە لەهەمان کاتیشدا ئەنجومەنی پۆلیتزەر بەرهەمە بچوك و نەناسراوەکانیشی لەبەرچاو ون نەکردووە.

هەموو ساڵێك لەمانگی ئابدا کاتژمێر 3ی پاش نیوەڕۆ بەکاتی ئەمریکا، ناوی ئەو کەسانەی خەڵاتی پولیتزێریان پێ دراوە، ئاشکرا دەکرێن. زانکۆی کۆلۆمبیای ئەمریکا لەبەڕێوەبەران و پشتیوانانی نەتەوەیی پولیتزێرە، لەبەر ئەوە هەموو ساڵێك سەرۆکی ئەم زانکۆیە خەڵاتەکانی پێشکەش دەکات.

جۆزیف پۆلیتزەر (1847–1911)

جۆزێف پولیتزێر لە 10 مانگی ئاوریلی 1847 لەشاری (ماکۆیا میکوی) مەجەرستان لە دایکبووە، باوکی بازرگانێکی دەوڵەمەندی جولەکەو دایکیشی ئەڵمانییەکی کاسۆلیك بوو. ناوبراو لەبەر کزبوونی چاو، لەخزمەتی سەربازی بەخشرا، (بەڵام) بەو حاڵەشەوە وەك جێگری کەسی سەربازی. بۆ سوپای ئەمریکا بانگهێشت کرا.

لەوکاتەی ڕێگەی سەفەری بۆ ئەمریکا دەبڕی. لەنزیك کەناری (بۆستون) لەپاپۆڕەکەی هاتەدەرو بڕیاریدا نەچێتە ناو سوپای ئەمریکاو بۆخۆی بەسەربەخۆیی بژیێت. لەماوەی چەند ساڵدا گەلێ

ئیشی گۆڕی. لە 25 ساڵیدا بوو بە ناشر، لەساڵی 1878 وەك سەرنووسەری رۆژنامەی (سنت لویس پۆست) چووە دنیای رۆژنامەگەرییەوە. پولتیزێر بە ورەیەکی تەواوەوە شەوو رۆژ کاری دەکردو بیری لەوە دەکردەوە رۆژنامەیەکی تر بەناوی (ورد) دەربکات. ئەو بە توندی دژایەتی لەگەڵ گەندەڵیماڵی ناوخۆو دەرەوە دەکرد. بەشی هەواڵ لە رۆژنامەکەی، سەرنجی هەموو کەسی بەو هەواڵە تایبەتییو سەرنج راکێشانە بۆلای خۆی رادەکێشا، شێوازی کارکردنی هێندە سەرکەوتوو بوو کە لەماوەی دە ساڵدا تیراژی رۆژنامەکەی گەیشتە 600 هەزارو بوو بە یەکێك لە پرفرۆشترین رۆژنامەکانی وڵات. لەمانگی مایسی 1904 لایەنگری دامەزراندنی قوتابخانەی رۆژنامەگەری بوو، لە م بارەشەوە نوسیویەتی: ((کۆماری ئێمە لەگەڵ بڵاوکراوەکانیدا (وەك خۆر) هەڵدێت یان ئاوا دەبێت)). ساڵی 1912 واتە ساڵێك پاش مەرگی پولیتزێر، قوتابخانەی رۆژنامەگەری کۆلۆمبیا دامەزرا، دابەشکردنی یەکەم خەڵاتی پۆلیتزەریش ساڵی 1917 لەژێر چاودێری دەستەی راوێژکارانی ئەم قوتابخانەیە ئەنجام درا.

هەڵبژاردنی خەڵاتی پۆلیتزەر: لەکاتی پێشبڕکێ کردن بۆ بەدەستهێنانی خەڵاتی پۆلیتزەر، زیاتر لە دوو هەزار بەرهەم لەهەموو وڵاتی ئەمریکاوە دەکەونە بەر لێکۆڵینەوەو تەنیا 21 دانە لە وان وەك براوە ناوزەد دەکرێن. ئەو بەرهەمانەی لەبەشی رۆژنامەگەریدا، پێشکەش دەکرێن دەکریێ رۆژنامە یان حەفتەنامەی ئەمریکایی بن.

لەسەرەتای مانگی مایسی هەمو ساڵێك 65 سەرنووسەرو ناشرو نووسەرو توێژەر، لە قوتابخانەی رۆژنامەگەری کۆلۆمبیا، بەرهەمە گەیشتووەکان لە 14 بواری جیاوازی رۆژنامەگەریدا هەڵدەسەنگێنن. دەستەیەك دادوەری تایبەت کە بریتین لە پێنج کەسو چوارده ئەندامی کۆمەڵەکەش، دوای سێ رۆژ کاری جیدیو خوێندنەوەی هەمو بەرهەمەکان، ناوی کاندیداکانی خۆیان ئەخەنە بەردەست. لەبەشەکانی خزمەتگوزاری گشتیو سکێچو کاریکاتێرو وێنەگرتن 20 بەرهەم کاندید دەکرێنو لەباقی بەشەکانی تردا، هەر بەشێك دە بەرهەم کاندید دەکرێن لە بەشی وتارنووسیندا، (سەروتار) یان باسی وتار کە زیاد لە 1500 وشەی تێدابێت، یان پێنج وتار کە لە 1500 وشە کەمتری تێدا بێت بۆ وەرگرتنی خەڵاتەکە کاندید دەکرێن. لەبەشی وێنەگرتنیشدا دەستەیەك داوەر، داوەری لەسەر وێنەی خەبەریو بەشەکانی تری وێنە دەکەن.

لەماوەی ئەو هەمو ساڵەدا، خەڵاتی پۆلیتزەر گەلێ بەشی جیاوازی رۆژنامەگەری گرتۆتەوە. ئەنجومەنی بەخشینی خەڵاتەکانیش گەلێ بەشی جیاوازی بۆ وەرگرتنی خەڵات لەکاری رۆژنامەگەریدا هەڵبژاردووە. ساڵی 1922 خەڵاتی بۆ سکێچو کاریکاتێر دانا، ساڵی 1942 خەڵاتی بۆ وێنەگرتن، خستەسەر لیستی خەڵاتەکانی پۆلیتزەر.

ئەو کاتەی کۆمپیوتەر رەخنەی کردە پیشەی وێنەگرتنەوە. ئەنجومەنی پۆلیتزەر لەساڵی 1995 دا رایگەیاند کە بەرهەمەکان بەمەرجێك جێگەی پەسەند دەبن کە ناوەرۆکەکەیان لەگەڵ ستاندەرەکانی رۆژنامەگەریو چاپەمەنیدا بێت.پاش چەند حەفتە کارو هەوڵدان، دەستەی داوەران، رۆژی 12ی ئابی هەمو ساڵێك لەژوری جیهانی پولیتزێر لە قوتابخانەی رۆژنامەگەری کۆلۆمبیا کۆدەبنەوەو لەکاتژمێر سێی پاش نیوەڕ بەکاتی ناوخۆ، لەکۆنفرانسێکی خەبەریدا، بەڕێوەبەری جیهانی پۆلیتزەر ناوی براوەکانی رادەگەیەنێت.

ئەو کەسانەی خەلاتی پۆلیتزەری 99یان وەرگرت:

خەلاتی پۆلیتزەر دابەش دەکرێتە سەر دو بەشی سەرەکی: ((رۆژنامەگەری))و ((ئەدەبو هونەر)). لەبەشی رۆژنامەگەریشدا ئەم چواردە بەشە خەلات وەردەگرن: خزمەتگوزاری گشتی، هەوالی لێکۆلینەوەییو تۆژینەوەیی، راپۆرتی راڤەیی (تەفسیری)، راپۆرتی تایبەتی، راپۆرتی ناوخۆیی، راپۆرتی نێودەولەتی، پەراوێزی چیرۆك ئامێز، راڤەکردن، رەخنە، وتارنووسین، سکێچ، وێنەی خەبەری، وێنەگرتنی تایبەتی، لەبەشی ئەدەبو هونەریشدا ئە م حەوت بەشە خەلات وەردەگرن: نوسینی چیرۆك، شانۆنامە، مێژوو، بیۆگرافی، شیعر، بەرهەمی گشتیو مۆسیقا.

خەلاتی تایبەتی پۆلیتزەریش هەمو سالێك دەدرێتە یەکێك لەهونەرمەندە ئەمریکاییەکان لەبەشی خزمەتگوزاری گشتیدا.

خەلاتی سالی 99 درایە رۆژنامەی ((واشنگتۆن پۆست)) هۆکەشی ئەوە بوو کۆمەلێ وتاری بلاوکردەوە کە باسی نامەسئولبوونی هێزی پۆلیسی ناوشاری کردبوو، ئەوکاتەی کە تەقەی کوێرانەیان کردبوو. هەروەها باسی ئەوەی کردبوو کە ئەو کەسانە ناشیاونو لێکۆلینەوەی لەسەر نەبوونی سەرپەرشتیاری لێهاتوو کردبوو.

خەلاتی پێنج هەزار دۆلاری راپۆرتی تازەترین هەوال:

ئەم خەلاتە درایە رۆژنامەی ((هارتفۆرد کورانت)). لەبەر ئەوەی بەشێوەیەکی رێکوپێك بەدوای بەسەرهاتی یەکێك لەکارمەندانی کۆمپانیای لاتاری کەوتبو، کە چوار کەس لەبەرپرسەکانی خۆی کوشتبوو هەروەها دوای ئەوە خۆشی کوشتبو.

خەلاتی راپۆرتی لێکۆلینەوەیی:

لە م سالەدا پێنج هەزار دۆلار درایە ((میامی هرالد)) لەبەر ئەوەی راپۆرتێکی تێرو تەسەلی لەسەر فێلکردن لەهەلبژاردنەکانی شارەوانی ((میامی)) ئامادە کردبوو.

خەلاتی راپۆرتی راڤەیی (راپۆرتی تەفسیری):

خەلاتی راپۆرتی راڤەیی 99 درایە ((ریچارد درید)) لە بلاوکراوەی ((ئۆرگونییان))، ناوبراو لەراپۆرتەکەیدا وێنەیەکی روونی لەکاریگەری قەیرانی ئابوری ئاسیا بۆ سەر ئابوری ئەمریکا نیشاندابوو.

خەلاتی راپۆرتی تایبەتی:

ئە م خەلاتە درایە ((چال فیلیپو مایکل هیلتزیك)) لەرۆژنامەی ((لۆس ئانجلێس تایمز)) ئەم راپۆرتە لەبارەی دزیکردن لە پیشەی بەرهەم هێنانی بەرنامە تەرفیهیەکانەوە بوو. هەروەها پەردە لەسەر فێلو تەلەکەبازیو گەندەلی ناو شانۆکانو بەرنامە خێرخوازییەکانو بلاوبوونەوەی بەرتیل بۆ بەرنامەکانی رادیۆ هەلدەداتەوە.

راپۆرتی ناوخۆیی:

لە م بەشەدا خەلاتی 99 درایە رۆژنامەی نیویورك تایمز. لەبەر ئەوەی کۆمەلێ راپۆرتی لەسەر فرۆشتنی تەکنەلۆژیای ئەمریکا بۆ چین، ئامادە کردبوو. لەم راپۆرتەدا ئاماژە بۆ ئەوە کراوە کە ئەم سەودانامەیە بەئاگاداری دەولەتی ئەمریکا کراوە. لەگەل ئەوەدا کە بۆ ئەمنی قەومی ئەمریکا زیانبارە. بلاوکردنەوەی ئەم راپۆرتە دەولەتی ناچار کرد کەسیاسەتی خۆی لەو بارەوە بگۆرێت.

خەلاتی راڤەیی:

ئەم خەلاتە درایە خاتوو ((مورین دود)) کە لە رۆژنامەی نیویورك تایمز بوو، هۆکەی ئەوە بوو کە بە جوانی پێوەندی نێوان کلینتۆنو لوینسکی شی کردبۆوە.

خەلاتی پۆلیتزەر بۆ رەخنە:

ئە م خەلاتە درایە (بلێرکامین) لە (شیکاگۆ تریبیون) لەبەر ئەوەی رەخنەیەکی وردی

لەبیناسازی ناوشارو فراوانبوونی ناوچەی زەریاچەی شیکاگۆ گرتبو.

خەڵاتی وتارنووسین:

خەڵاتی وتارنوسینی ساڵی 99 درایە بەشی وتارنووسینی رۆژنامەی دەیلی نیوز لەنیویورك. لەم وتارەدا نووسەر بەرەنگاری کێشەو گرفتی شانۆی (ئاپۆلۆی) لەهارلمی نیوێورکدا دەبێتەوە، کێشەکەش بریتیە لە نەبوونی بەڕێوەبەرێتی رێکو پێکی ماڵی.

خەڵاتی سکێچو کاریکاتێر:

خەڵاتی پۆلیتزەری 99 بۆ سکێچو کاریکاتێر درایە ((دەیوید هورسی)) لە بڵاوکراوەی (سیاتل پۆست ئینتلیجنسر.)

خەڵاتی وێنەی خەبەری:

خەڵاتی ئەمساڵی پۆلیتزەر بۆ وێنەی خەبەری درایە بەشی وێنەی هەواڵنێری ((ئاسۆ شویتێد پرێس)). هۆکەشی ئەو کۆمەڵە وێنەیە بوو کە وێنەگرانی ئاسۆ شویتێد پرێس لەکاتی تەقینەوەی باڵوێزخانەی ئەمریکا لە کینیاو تانزانیا گرتبویان. لەم وێنانەدا ئاسەواری ترسو ئازاری مرۆیی بەجوانی نیشاندراون.

خەڵاتی وێنەگرتنی تایبەتی:

خەڵاتی پۆلیتزەری ئەمساڵ بۆ بەشی وێنەی تایبەت. درایە تۆڕی راگەیاندنی (ئاسۆ شویتێد پرێس) لەبەر ئەوەی گرنگو کاریگەریان لەکاتی بەسەرهاتی کلینتۆنو لوینسکیداو کاتی بانگهێشت کردنی کلینتۆن بۆ دادگا گرتبوو.

بەشی ئەدەبو هونەر:

1-چیرۆك:

خەڵاتی 99 بۆ چیرۆکنوسین درایە ((مایکل کانینگهام)) لەسەر چیرۆکی (کاتژمێرەکان)

2-دەقی شانۆیی:

خاتوو ((مارگرێت ئەدسون)) بەهۆی نوسینی شانۆنامەی ((گاڵتە))وە خەڵاتی 99ی پۆلیتزەری وەرگرت.

3-مێژوو:

خەڵاتی 99 بۆ مێژوو درایە ((ئەدوین باروز))و ((مایك والاس)) کە لە بارەی مێژووی نیۆیۆرك تا ساڵی 1898ەوە نوسیبوویان.

4-خەڵاتی 99 بۆ بێوگرافی درایە ((سکات بێرگ)) لەبەرخاتری نوسینی کتێبی (کیندبێرگ).

5-خەڵاتی 5000 دۆلاری شیعر درایە شاعیری ئەمریکایی ((مارك سترند)) کە کتێبی شیعری ((تۆفانی یەك کەس))ی نوسی.

6-خەڵاتی بەرهەمی ئەدەبی بەشێوەیەکی گشتی:

خەڵاتی پۆلیتزەر بۆ بەرهەمی ئەدەبی بەشێوەیەکی گشتی لەساڵی 99دا درایە ((جان مەك فی)) لەبەر نوسینی کتێبی ((مێژوی دنیای پێشوو)).

خەڵاتی ئەمساڵی مۆسیقا درایە خاتوو ((ملیند واگن)). هۆکەشی پێشکەش کردنی ئەو کۆنسێرتە بوو کە بۆ فلوتو ئامێرە ژێدارو جازەکان. ناوبراو ئەم پارچە مۆسیقایەی لە 30 مایسی 1998 لە نیویۆرك پێشکەش کرد.

خەڵاتی تایبەتی پۆلیتزەر لەساڵی 99 درایە ((ئیدوارد کەنەدی)) بەهۆی سەدەمین ساڵرۆژی لەدایکبوونیەوە. ئەم خەڵاتە کە پاش مەرگی کەنەدی پێی دەبەخشرێت، بۆ رێزلێنانە لەو هەمو توانستە زۆرەی کە لە مۆسیقادا هەیبووەو لەبەر ئەو رۆڵەش کە لە مۆسیقای جازی ئەمریکادا گێڕاویەتی.

**سەرچاوە:**

روزنامەء نشاط شمارە 98

دورە جدید سال اول

# مەرگی ئایریس مۆرداك

• و: سەردەم

ئـایریش مـورداك (Iris Murdoch) ی ژنـه نووسـەری نـاوداری ئینگلـیزی لەتەمـەنی (79) ساڵیدا لەشاری ئوکسفورد کۆچی دوایی کـرد، مورداك خاوەنی 26 رۆمان، ژمارەیەك شانۆگەریو چەند کـارێکی فەلسـەفیو کۆمەڵـه شـیعرێکە، یەکێکە لەژنە نووسـەرە گـەورەکانی ئـەدەبیاتی ئـەم سـەردەمەی ئینگلـیز کەبەرهەمـەکانی وەرگێڕراونەتە سەر زۆربەی زمانەکانی دنیا.

مورداك لـە15ی ژوییـەی سـاڵی 1919 لـەدبلن، لەدایكو بـاوکێکی ئینگلـیزی – ئیرلـەندی لـەدایك بـووە، سـاڵانی منداڵـی لەلـەندەن بەسـەربردوە، خوێندنـی لـەدەزگای فروبل لەلـەندەنو پاشـان لەقوتابخانەی کیژانی بدمیتون تەواوکردوە.

پاشـان لەبەشـی زمـانو ئـەدەبیاتی یۆنـانیو لاتینی لەزانکۆی ئوکسفۆرد خوێندویەتی، مورداك تـا کۆتـایی تەمـەنی بێجگـە لەچـەند ماوەیـەکی کـورت لەئوکسـفۆردا مایـەوەو هـەر لـەوێ شـووی بـەجان بیلـی (Jahn Bayley) کـرد. بیلـی مامۆسـتای زمـانو دیـارترین رەخنـە نووسـی ئەدەبی ئینگلیزیە.

مـۆرداك هـەر لـەدەوری زانکـۆدا دەسـتی بەنووسـین کـرد، لەگـەڵ ئـەوەدا کەجێگایـەکی دیاری لەپلەیەکـەکانی رۆمـان نووسیدا پـەیداکرد هەروەها کەوتە لێکۆڵینەوەو توێژینـەوەی بواری فەلسەفەو هونەر، نێوان خـێرو شـەڕ، حەقیقـەتو درۆ، مەرگو نەمری.

مـۆرداك لـەدەوری زانکـۆدا یـەکێك بـوو لەکۆمۆنیستە هەرە چالاکەکان، بەڵام زوو تووشی بـێزاری هـاتو وازی لـەحیزبی کۆمۆنیسـتی ئینگلیزی هێنا. ساڵی 1944 لـەوەزارەتی دارایـی دەست بەکارو پاشان کەوتە نێو کاری کۆمەڵـەی نەتەوەکانـەوە. دوو سـاڵ کـارکردنی لەبەشـی

فریاکەوتنی کۆمەڵەی نەتەوەکاندا لەئۆردوگای ئاوارەکان لەبەلژیکاو نەمسا زۆریان کارتێکرد، وەك خۆی دەڵێت ئەو شایەتی: (ئاش بەتاڵی تەواوی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی) بوو. بەبروای ئەوکاری فەلسەفە هاوکاری کردنی مرۆڤە بۆ چاك بوونی،پێوانەیشەخسی ئەو بۆچاکە ئەوەیە کە (ئەوەی مرۆڤێك هان دەدات تابێ خۆویستی لەئۆردوگای کاری بەزۆردا کاریکات)

یەکەمین رۆمانی چاپکراوی بەناوی "لەژێر تۆڕدا"یە کەساڵی 1954 بلاوبۆتەوە. لەم رۆمانەدا مۆرداك زۆر لەژێر کاریگەری ژان پۆل سارتەردایە کە لەپاریس دیبوی، ئەم رۆمانە بۆچوونو پەیوەندی نووسەرەکەی بەبیری تازەی فەرەنسیەکانەوە دەردەخات.

چاکترین رۆمان لەبەرهەمە بەراییەکانی موورداك رۆمانی (زەنگ) ە کەساڵی 1958 نوسیویە، چیرۆکی نێو ئەم رۆمانە لەکۆمەڵگایەکی داخراوی مەزهەبیدا روودەدات. ساڵی 1960 رۆمانی سەربڕاوەکەی نووسی کەلەبەرهەمە ناوادارەکانیەتیو باس لەپەیوەندی بێ رەوشتیانەی ژیانی خەڵکی لەندەن دەکات. ئەگەرچی هەندێك لەرەخنەگران ئەم رۆمانەیان بەفاسید دایە قەڵەم، سەرەتا وەك شانۆ نامەو، پاشان وەك فیلم کەوتە بەرچاوی بینەران.

لای زۆر لەرەخنەگرانی ئەدەبیات شاکاری مۆرداك بریتیە لەرۆمانی (شازادەی رەش) کەساڵی 1973 بلاویکردەوە، هەندێکیتر رایان وایە کەرۆمانی دەریا.. دەریا لەشاکارەکانیەتی. ئەم رۆمانە کەچیرۆکی خۆشەویستیەکی شێت ئامێزە خەڵاتی - بۆکر - ی ساڵی 1978 ی لەسەروەرگرت.

مۆرداك لەساڵی 1974یشدا لەسەر رۆمانی - ماشینی خۆشەویستی پیرۆزو نەفرەتی - خەڵاتی - ویت برد -ی پێدرا. لەبەرهەمە ناودارەکانیتری موورداك هەڵاتن لە ئەفسونگەر (1956)و یەك قۆچ (1965)ە.

مۆرداك لەچیرۆکەکانیدا کەڵکی لەزۆر شێوەی جیاواز وەرگرتوە.

رۆمانەکانی پڕن لەو ئەفسانە جوانانەی وەك رەمز بەکاری هێناون، بیرو ئەو دەست هاوردە فەلسەفیانەی کە لەگەڵ چیرۆکی ترسناکی پڕ لەرووداودا یەکیخستون، پاشانیش ئەو کردەوە قەشمەر جارانەی کە لەگەڵ لێکدانەوەی جیدی هەستە مرۆڤایەتیەکاندا بەرانبەری پێکردوون. ئەوتا کۆتایی تەمەنی لەسەر لێکۆڵینەوە فەلسەفیەکانی بەردەوام بوو، تا لەساڵی 1992دا کتێبێکی پێنج سەد لاپەڕەیی بەناوی - میتافیزیك وەك رێنمایی رەوشت - بلاوکردەوە.

موورداك لەدوا ساڵانی تەمەنیدا زۆر بایەخ بەچالاکیە ئەدەبیەکانی نەدەدرا، دوا رۆمانی "موعەمای جەکسن" کە ساڵی 1965 بلاوکرایەوە روو بەرووی گەلێك رەخنەی جیاواز بوەوە. دوا ساڵانی تەمەنی موورداك زۆر خەمهێنو پڕ لەکەسەرن، چونکە تووشی نەخۆشی لەبیرکردن - ئالزایمر - بوو، ئەم حاڵەتە بۆ یەکێك کەزۆر پشت ئەستورانە لەسەر بیرەوەریو لەیادنەکردن کاری کردبێت رووداوێکی ناجۆرو مایەی ناخۆشی بوو. لەتۆمارکردنی ناوی خۆیدا بۆ کتێبی ناودارانی دنیا شتێك کەپێی خۆش بووبێت لەو تۆمارەدا فێربوونی زمانە نوێکانە، مێردەکەی لەهەموو ماوەی نەخۆشیەکەیدا چاودێریەکی دڵسۆزانەی لێدەکرد.

بیلی لەچاوپێکەوتنێکی گۆڤاری نیویورکەردا راست گۆیانەو زۆر بەحەسرەتەوە کە باس لەو حاڵەتە دەکات. لەو وتارەدا ئەو یادەوەریە بەرجەستە دەکات کەچۆن هاوسەرەکەی :

(ئەوەی لەیاد نەماوە کە(26) ڕۆمان‌و چەندان کتێبی فەلسەفی نووسیوەو دوکتۆرای فەخری لەناودارترین زانکۆ وەرگرتوە، هەروەها کراوەتە خانمی ئیمپراتۆریەتی بەریتانیا).

مورداك‌و بیلی مێردی هەر لەسەرەتای ئەم نەخۆشیەوە پێکەوە بڕیاریاندا بوو کەدەبێت لەو بارەیەوە بێ‌پەردە قسەبکەن تا خەڵکی دەرکی ئەوەیان زیاتر بێت کەهێشتا نەخۆشیەکی وای بێ‌چارەسەر هەیە. بیلی نووسی: (ئێمە هەموو ڕۆژێك لەیەکدی نزیکتر دەبینەوە، ئەو بەرەو تاریکی سەفەر ناکات، سەفەر تەواو بوەو، لەگەڵ تاریکی ئالزایمردا بەشوێنێك گەیشتوە و منیش بەجێگایەك گەیشتووم)

دوای مەرگی مورداك. مالکوم برادبری – ڕۆمان نووسی ئینگلیزی مورداکی بەنووسەرێکی گەورەی ئەدەبیات ناوزەدکرد لەبابەتی ئانتونی برجس‌و ویلیام گولدینگ.

–روت دیچ – بەڕێوەبەری کۆلیژی سنت ئان لەئوکسفورد کەساڵی 1948 مورداك لەوێ وانەی فەلسەفەی وتۆتەوە لەبارەیەوە وتی:

" ئەو یەکێك بوو لەگەورەترین مامۆستای سنت ئان، وەك ڕۆمان نووس‌و فەیلەسووف کەسێکی تەواو دیاربوو، بەڕای من بەرهەمی ئەو تا ئەندازەیەکی زۆر سەرنج ڕاکێش ئەدەب‌و فەلسەفەی ئینگلیزی دەوڵەمەند کردوە. کۆچی مورداك زیانێکی گەورەبوو بۆ ئێمە"

مورداك بەدەگمەن دەی هێشت دیمانەی لەگەڵدا سازبکرێت. بەڵام لەیەکێك لەو چاوپێکەوتنە دەگمەنانەدا دانی بەوە دانا کەیەکێکە لەوانەی پەرۆشی بەرنامەکانی تەلەفزیۆنی منداڵان‌و زمانەکەیانە. هەروەها لەگفتوگۆیەکی تری ساڵی 1988دا وتی: کتێبەکانی من زیاتر لەسەمفونیا یان لەپەرەسەندنێکی جوان دەچن. داخی من ئەوەیە کەنووسەرێکی گەورە نیم، من لەپلە دووی نووسەراندام. لەڕیزی نووسەرە مەزنەکانی وەك جین ئاستین، هنری جیمس‌و تۆلستۆی نیم، کەسانی چیرۆکی من وەك کەسانی ڕۆمانەکانی ئەوان لەیادا نامێننەوە.

# یادی سەدەمین ساڵەی لەدایکبوونی هەمەنگوای

• ئا: سەردەم

یەکێك لەناوە گەورەکانی دنیای ڕۆمانی سەدەی بیستەم "ئەرنست هەمەنگوای"ە، کەلەبیستو یەکی ژوییەی ساڵی 1899 لەویلایەتی – ئەلینو – لەدایك بوەو ساڵی 1960 خۆی کوشتوە. لەیادی سەد ساڵەی لەدایك بوونی ئەم نووسەرە مەزنەدا، لەشاری "بۆستن"ی ئەمریکا بۆ ماوەی دوو ڕۆژ گەورەترین ئاهەنگ سازکرا کەبێجگە لەسێ کوڕی خۆی گەلێك لە نووسەرەکانی دنیا بەشداریان تیاکرد، لەوانە چوار نووسەری بەرندەی خەلاتی نۆبڵو حەوت بەرندەی خەلاتی ئەدەبیاتی پولتیزەر، بۆئەوەی یادی نووسەرێك بکەنەوە کەپەخشانەڕەوانو جوانەکانی بوونە سەر مەشقی گەلێك لەنووسەرە داهێنەرەکانی ئەم سەدەیەو، لەسەر سەختیو



هەمەنگوای

سەرکێشیشدا کەم نووسەر تائێستا شانی لەشانی داوە.

نیدین گوردیمەر: بەرندەی خەڵاتی نۆبڵی ئەدەبیات لەئاهەنگەکەدا وتی: "هەمیشە سوپاس گوزاری ئەو بەهرەمەندیانەم کە لەوەوە فێربووم" هەروەها دەربارەی نوێترین کتێبی خۆی کەباس لەئەفریقای باشووری دایک زای دەکات وتی: "لەچیرۆکەکانی هەمەنگوایەوە فێری ئەوەبووم کەئەوەی پاڵەوانی رۆمان نایڵێت گوێی لێبگرم"

لەو ئاهەنگەدا زیاد لەچوار سەد کەس، لەوانە چەند ریش سپیەکی وەك هەمەنگوای، لەچەند دانیشتنێکدا لەگەڵ نووسەرەکاندا بەشداری باسەکانیان کرد، لەو نووسەرە ناودارانەی خەڵاتی نۆبڵیان وەرگرتووەو بەشداریان لەو یادەوەریەدا کرد: ساول بلو، دریك ولکات، کنزا بورو. هەروەها لەرۆمان نووسە گەورەکانی وەك: جاستینی کاپلان، فرانس فیتزجیرالد، ئی. ئانی پرولکس، رابرت ئستسۆن بەشداریان کرد.

ئەم نووسەرانە لەگەلێك لایەنی ژیان و ئەدەبی هەمەنگوای دوان، جیمزکارول -ی رۆمان نووس لەبارەیەوە وتی: "هەمەنگوای نووسەرێکی زۆر گەورەیە، بێجگە لەوەی کەیەکەمین نووسەری خاوەن کەسایەتێکی تایبەتی بەناوبانگە، چیرۆکی ژیانی ئەو وەك کۆچەرو سەرکێشیش لەگەڵ بەرهەمەکانیا تەبان"

بەرهەمی هەمەنگوای زیاد لەهەر نووسەرێکیتری ئینگلیزی زمان - بێجگە لەئاگاساکریستی - بۆ هەموو زمانەکانی تر وەرگێڕاوە. شاکارەکانی وەك: جارێکیتر خۆرهەڵدێت، زەنگەکان بۆکێ لێدەدرێن، ماڵئاوا چەك و پیرەمێردو زەریاو پاشانیش خەڵاتی نۆبڵی پێدرا.

# کورد لەبەردەم رێژنە گوللەی دوژمنانیدا

شوان ئەحمەد

کتێب: سیو سێ گولله

نووسەر: ئیسماعیل بێشکچی

وەرگێر:ئاسۆس هەردی

لەبڵاوکارەکانی. دەزگای چاپو پەخش سەردەم

چاپی یەکەم: 382 لاپەڕە

با سەرەتا بەو پرسیارە دەست پێ بکەین کە ناونیشان کتێبێکی خاتوو (Jacqueline Sammali)ەو دەڵێت: (تاوانە ئەگەر کوردبیت؟)[1]. ئەڵبەتە گەر چاوێکی خێرا بەمێژووی کوردو ئەو نەتەوە سەردەستانەدا بگێڕین کە لەچارەکی یەکەمی ئەم سەدەیەوە خاکی کوردانیان بەسەردا بەش بەش کراوە، (بەڵێ)دروسترین وەڵامێکە بەوەها پرسیارێك.. بەدەر لەهەموو ئەو پاساوو بەهانانەی برا گورگەکانمان لەدەوڵەتانی چوار دەوردا بۆ تاوانو خوێنڕێژیەکانیان دەرهەق بەکورد هێناویانەتەوە، هەر لەتۆمەتو تاوانی بارکردنی کوردی بەهەڵایسانی شۆڕشو یاخی بوونو جوداخوازیو مەقاشی دەستی بێگانەو جێبەجێکەری پلانەکانی ئیمپریالزم لەناوچەکەدا، ئەو راستیە ناشاردنەوە کە کوردی لە روانگەی ئایدۆلۆژیای رەسمی ئەو دەوڵەتە سەر دەستانەوە بەر لەوە بەهیچ یەك لەوکارانە تاوانبار بێت، تاوانباریو گوناهی گەورەو یەکەمی ئەوەیە کە ئەوی دیە (واتە کوردیە) نەك شتێکی دی.

ناوەڕۆکی ئەم کتێبەی ڕۆشنفکری ئازادیخواز (ئیسماعیل بێشکچی) شایەدی ئەم ڕاستیەیە.

ئەو دەیەوێت لەڕێگای ڕووداوێکەوە، ڕووداوێکی جەرگ بڕ، کە ڕۆژانە ئەگەری دووبارە بوونەوەی لە پارچە جیاجیاکانی کوردستاندا لەئارادایە، ئەوە ئاشکرا بکات کە لە سیاسەتو ڕوانگەی ئایدۆلۆژی ئەو دەوڵەتانەی کورد بۆتە ژێر دەستەیان، بەتەنها (کوردبوون) بۆ خۆی تاوانێکەو شایەنی قورسترین سزایە کە ئەویش مەرگە.

(بێشکچی) کە تاقانە دەنگێکە لەژێر سایەی حوکمڕانی ژەنەراڵەکاندا لەتورکیا بەجورئەتەوە گەوهەری مەسەلەی کورد دەست نیشان دەکاتو خەباتێکی بەردەوام لەو پێناوەدا درێژە پێ دەدات، لە (سیو سیگوللە)دا سەرنج بۆ لای ڕووداوێکی پەردە پۆشکراو ڕادەکێشێت. گرنگی ئەم هەوڵەش تەنها لەوەدا نییە کە باس لە کوژرانی سیو سێ گوندنشینی هەژاری کورد دەکات لەناوچەی واندا، ئەوەندەی لەپشت ئەنجامدانی ئەم تاوانەوە ئەو سیاسەتە شۆفێنیو ڕەگەز پەرستانەمان بۆ دەخاتەڕوو کە کەمالیزم وەك سیستمێکی ئایدۆلۆژی بالادەستی ناو کۆمەڵگەی تورکی بەدرێژایی ئەم سێ چارەکە سەدەیە کاری پێ کردووە.

ئەوانەی لەم ڕووداوەدا گوللەباران دەکرێنو دەکەونە بەر ڕێژنە گوللەی پیاوەکانی (مستەفا موغلالی)یەوە، نەکاری سیاسیان کردووەو نە لە یاسا دەرچوونو نە لە چیاکاندا یاخی بوونو نەسەر گەرمی کاری شۆڕشگێڕانەش بوون.

ئەو قۆناغە مێژوویەیی ئەم ڕووداوە ترسناکەی تیا ڕوودەدات ساڵی 1943یەو گەرمەی جەنگی دووەمی جیهانیو دەست تێکەڵکردنو هاوپەیمانێتیو پەیوەندی بەستنی ژێربەژێری عیسمەت ئینۆنۆی ڕابەی میللیو نەتەوەیی تورکە لەگەڵ هەریەك لەڕابەرانی فاشیزمو نازیزم لە ئیتالیاو ئەڵەمانیادا، واتە ئەدۆلف هتلەرو مۆسۆلۆنی.

قۆناغێکی کە کوردان حەسرەت بارانە بەدیار ئاگری کوژاوەی سێ شۆڕشی بەئاکام نەگەیشتووەوە دۆش داماون: شۆڕشی شێخ سەعیدی پیرانو، شۆڕشی چیای ئاراراتی ئیحسان نوری پاشاو، شۆڕشی دەرسیم.

قۆناغێکە نە شۆڕش هەیەو نەشۆڕشگێڕان لەچیاکانن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەگەرمای هاوینی ئەو ساڵەدا (1943) سیوسێ جوتیار قۆل بەستو چاوبەست دەکرێنو لەناوچەیەکی




چەپەڵو دوورە دەستدا دەدرێنە بەر ڕێژنەی گوللە. سەیری گەورەش وەکی (بێشکچی) لە کتێبەکەیدا بۆمان باس دەکات، لەلایەك لەوەدایە ئەوانەی ئەرکی گوللەباران کردنەکەیان بەجێ هێناوە دوای تەواوکردنی کارە قێزەونەکەیان بەسرودی (دوکەڵ لوتکەی چیای گرتووە) گەڕاونەتەوە بنکەکانیان، وەك ئەوەی ئەرکێکی

نەتەوەییان بەجێ هێنابێ. لەلایەکی دیش پەیوەندی بەو بێ دەنگیەوە هەیە کە لەسەر تاوانەکە دەکرێ. تاوانێکی وەها دوای پێنج ساڵ واتە لە (1948)دا هەندێ شتی لێ باس دەکرێو پاش سیانزە ساڵی رەبەق واتە لە (1956)دا تەواوی هێڵە گشتی‌یەکانی ئە رووداوە ئاشکرا دەبن. (بێشکچی) دەرهەق بەو تاوانانەی رۆژانە بەرامبەر بە نەتەوەیی کورد دەکرێن، نەتەوەیەك کە خۆی بەنەتەوەیی چەوساوەی بێبەش لە مافە نەتەوەیی‌و دیموکراسیەکان ناوی دەبات، وای لێ دەکات لەپاڵ ئیدانەکردنی سیاسەتی عەسکەرتاریانەی دەوڵەتو ئایدۆلۆژیای کەمالیزمدا، رەخنەی توندیش ئاراستەی بێدەنگی‌و هەڵوێستی نامەسئولانەی زانکۆی تورکی‌و چەپی تورکو بزوتنەوەی سۆسیالیستی تورکی بکات، لەبەرامبەر کێشەی کوردو شۆرشەکانی گەلی کورددا.. وەك لەسەرەتادا ئاماژەمان بۆ کرد ناوەرۆکی ئەم کتێبە تراژیدیای بەکۆمەڵ کوشتنی سی‌و سێ جوتیاری بێ گوناهی کوردە، بەفەرمانی راستەو خۆی بالآترین دەسەلآتی سیاسی‌و عەسکەری لەتورکیای سەردەمی تاك حیزبی‌دا، بەبێ ئەوەی هیچ تاوانێکیان ئەنجام دابێت جگە لەوەی کە کوردن... ئاوردانەوەی ئەم قەڵەمە جوامێرە لەیەك بەیەکی رووداوەکانی مێژووی خوێناوی کوردو مەسەلەکەی‌و، خەباتکردنێکی سەخت لە زینداندا لەو پێناوەدا بەدرێژایی ئەم بیست هەشت ساڵە (1971–1999)، ئێمەی قەرزاربار کردووە. رەنگە (ئاسۆس هەردی) بەم هەوڵەی لەئێمە خۆش بەختر بێت کە توانیویەتی لەرێگەی ئەم وەرگێرانەیەوە بەشێکی بچوکی ئەو قەرزەی دابێتەوەو، ئەم هەوڵە مرۆڤ دۆستانەی (بێشکچی) دەرهەق بەمەسەلەی گەلەکەمان خستبێتە بەردەم خوێنەرانی کورد. بەو هیوایەی لە نزیك ترین دەرفەتدا کتێبی (تێزی مێژوی تورك: تیۆری زمانی خۆرو کێشەی کورد)و تەواوی دانراوەکانی (بێشکچی) بە کوردی ببینین. چونکە گەورەترین بەدبەختی‌یە رۆشنفکرێك نیوەی تەمەنی خۆی لەو دیو دەرگا ئاسنینەکانی زیندانی فاشیەکانەوە بەسەربردبێت لەسەر هەڵوێست نواندنی مرۆڤایەتی بەرامبەر کێشەی کورد، بەلآم لەبەرامبەردا وەکی (ئاسۆس) لە پێشەکی کتێبەکەی‌دا دەنووسێت: (تاکو ئێستا نە خوێندەواری کورد بێشکچی دەناسێتو نە رۆشنفکرانیشی ئاورێکی جدیان لەبەرهەمەکانی داوەتەوە).

* * *

## پەراوێز:

1–جورج طرابیشی: الدیموقراطیة والقومیة والاقلیات (المسألة الکردیة نموذجا) –معلومات، العدد (27) کانون الاول، 1996.

# جیهانی نغرۆ لە گۆشەگیریدا

• عەتا محەمەد

ناوی کتێب: پیدرۆپارامۆ- ڕۆمان

ناوی نوسەر: خوان ڕۆڵفۆ

و: ئازاد بەرزنجیو ڕێبوار سیوەیلی

ژمارەی لاپەڕە: 195

لەبڵاوکراوەکانی دەزگای چاپو پەخشی سەردەم

پێش قسەکردن لەرۆمانی پیدرۆپارامۆ، دەکرێت هەڵوێستەیەك لەبەردەم خەلاتێکی جیهانی ئەدەبی ئەمریکای لاتیندا بکەین کە ناوی (خەلاتی ئەدەبی خوان ڕۆڵفۆ)یەو بریتیە لەبڕوانامەیەکی فەخریو مەدالیایەکو سەد هەزار دۆلاری کاش کە بە باشترین نووسەری ئەمریکای لاتین دەدرێ، ساڵی پاریش ئەم خەلاتە درا بە ئۆلگا ئۆرۆزکۆ لەسەر دوو کتێبی کە بەناوی (مردنەکان)و (ڕۆشنایی لە قوولایی چاڵەکەدا) بوون. دەکرێت بپرسین خوان ڕۆڵفۆ کێیەو شوێنی لەمێژوی ڕۆمانی ئەمریکای لاتیندا چییەو.. چەند پرسیاری تریش تا لەوێوە ئەگەر بەخێرایش بێت چاوێك بەرۆمانی پیدرۆ پارامۆدا بخشێنین کە کەسانێك هەن وەك موعجیزەیەکی ئەدەبی سەیری دەکەن، ئەم کارەش دابڕاو نیە لەژیانی نوسەرەکەی کە دوای ئەو ڕۆمانە ئیدی بێدەنگ بوو وەك ئەوەی هەموو ئەو شتانەی وتبێت کە ویستویەتی بیڵێت.

خوان ڕۆڵفۆ لە مایسی 1918 لە ئەبولکو لەدایك بووە، پاش ماوەیەکی کەم خێزانەکەی دەچنە گوندی سان غابرییل. لە منداڵیدا یاخی بوونی کریستیووس دەبینێت کە جەنگێك بوو لەنێوان کڵێساو دەوڵەتداو سیمایەکی ئاینی هەبوو، پاشان مردنی باوکیو باپیریو دواتر دایکیشی گۆشەگیریان کردو بۆ ماوەیەك لای نەنکی ژیا، پاش ئەوە چوار ساڵ لە تەمەنی

دەساڵیەوە چووە هەتیوخانە. لە 15 ساڵیدا دەچێتە مەکسیکی پایەتەخت بۆ خوێندن ئەگەرچی ناتوانێت ئەم مەرامە بەدی بێنێت بەڵام بڕیاری مانەوە دەداتو ناگەڕێتەوە شوێنی منداڵی.

لەساڵی 1938دا دەست بە نوسینی ڕۆمانێك دەكاتو دواتر دەیدڕێنێت پاشان لە چلەكاندا كۆمەڵێك چیرۆك دەنوسێت كە هەموویان كۆدەكاتەوەو لەژێر ناوی ((پێدەشتی گڕگرتوو)) لە ساڵی 1952 بڵاوی دەكاتەوە. لەساڵی 1953 بەدواوە دەستی بەنوسینی (پیدرۆپارامۆ) كردو لەساڵی 1955 بڵاوی كردەوە. لەو كۆمەڵە چیرۆكەیدا ڕۆلفۆ زۆر پەیوەستە بە گوندنشینو كاری سەختو ئەو نەهامەتیانەی بەردەوام تیای دەژین، لەم كۆمەڵە چیرۆكەدا ڕۆلفۆ یاداشتنامەی گەلێك دەنوسێتەوە، واقعی مێژوییو ڕاستەقینەی مەكسیك لە قۆناغێكی دیاری كراودا تۆمار دەكات، ئەویش لەڕێگای مۆنۆلۆجی پاڵەوانە پەراوێزیەكانیەوە كە حیكایەتی نەداریو گۆشەگیریان دەگێڕنەوە. ڕوداوی هەموو چیرۆكەكانیش لەناوچە گوندنشینە هەژارەكانی خالیسكۆ كە نوسەر خۆی تیایدا پەروەردە بووە، ڕودەدەن..

دەتوانین لێرەوە بچینە ناو ڕۆمانی پیدرۆپارامۆ وە لە پەیوەست بوونی مرۆڤ بەشوێنەوە كە گوندە لەبیر كراوەكانەو مرۆڤەكانی لەژێر باری قورسو وشكی ساڵەكاندا دەناڵێنو تایبەت مەندی ئەم شوێنانەش ئەوەیە كە ئەگەر زیندوەكان شتێكیان مابێت ئەوەیە لەگەڵ مردوەكاندا جیاوازیان نیە. ئەم ڕۆمانە لەمێشكی ڕۆلفۆدا بووە (وەك دەڵێ) بەڵام سەفەرێكی قەدەریانە وای لێ دەكات بینوسێتەوە كە پاش سێ ساڵ دەگەڕێتەوە بۆ ئەو دێیەی تیای ژیاوەو دەبینێ چۆڵ كراوە.. ئەمەش كلیلی ئەو ڕۆمانەی دەداتە دەست.

ڕۆمانی پیدرۆپارامۆ كە بە تەكنیكێك نوسراوە ناتوانین پێی بڵێین بەش بەڵكو دەكرێ بەبڕگە ناو ببرێت، ئەم بڕگانەش لەپارچەكانی ئاوێنەیەكی شكاو دەكەن كە دەبێت یەك یەك كۆیان كەینەوە بۆ ئەوەنا وێنەی ناو ئاوێنەكە






تەواوكەین، بەڵكو چیرۆكی ئەو بونەوەرانە تەواوكەین كە هەر بەسێبەر یاخود تارمایی دەچن. ئەم ڕۆمانە باس لەگەڕانەوەی كوڕێكی پیدرۆپارامۆ دەكات بەرەو زەویەكانی باوكی ئەویش لەسەر وەسێتی دایكی كە لەسەرەمەرگدا پێی دەڵێ: هەر دەبێ بچیت بۆ لای.. لەیەكەم بڕگەدا تێدەگەین پیدرۆپارامۆ ئەم كوڕەی كە ناوی (خوان پریسیادۆ)یەو دایكی لەمێژە جێهێشتووە.. ئیدی ئەم كوڕە سەفەربەرەو كۆمالا دەكات بەو نیازەی داوای ئەو شتانە لەباوكی بكات كە دەبوو بیانداتێ.. كاتێك خوان پریسیادۆ لەكۆمالا نزیك دەبێتەوە وا دێتەبەرچاوی كە چۆڵ كرابێت.. ئەو كەسەش كە

لە ڕێگا دەیبینێتو بەرەو کۆمالا دەچێت (دواتر دەزانێ کە ئەمیش کوڕی پیدرۆپارامۆیە) جەخت لەوە دەکات کە کۆمالا لەسەر پشکۆ بیناکراوەو کاتێك یەکێکی لێ دەمرێو بەرەو دۆزەخ دەچێت ئەوا دەگەڕێتەوەو پەتۆیەك لەگەڵ خۆی دەبات.. ئەمە کۆمالایە کە زەوی‌یەکانی پیدرۆ پارامۆی تیایەو هەر بە شوێنێکی نەفرەت لێ کراو دەچێت.. هەر لەسەرەتای ڕۆمانەکەدا دەزانین کە پیدرۆپارامۆ مردوە بەڵام دواتر پیدرۆپارامۆ دەبینین هەر لە منداڵیەوە تا پیر بوونو مردنی.. چیرۆکی ژیانی پڕ لە ڕقو کینەی دەخوێنینەوە..

پێدەچێت ئەم ئالۆزیە لەگێڕانەوەدا کە سیمایەکی ئاشکرای ڕۆمانەکەیە (چونکە هەر بڕگەیەکی لەشوێنێکدایەو دەبێت لەخوێندنەوەدا جارێکی تر لەسەر ئاستی زەمەن ڕێکیان بخەینەوە) بەپێی ئارەزویەکی هونەری نەبێت ئەوەندەی جەوهەری ڕۆمانەکەیەو شێوەیەکی گونجاوی نیشان دانی ئەو جیهانە بێت کە لەناو دەچێت یاخود لەناوچووە.

ڕۆڵفۆ دەیەوێت پێمان بڵێت ((پێدەچێ ئەو ڕۆحیانەتانەی دەگەڕێنەوە زەوی، ڕۆحیانەتی ئەوانە بن کە بەهۆی گوناهەوە مردون)) لێرەوە سنورەکانی نێوان ژیانو مردن تێکەڵ دەبنو لێرەشەوە ڕەشبینی ڕۆڵفۆ بەدەردەکەوێت چونکە ئەگەر کەسایەتیەکانی هیوایان بەژیان بڕابێت ئەوا مردنیش نابێتە شوێنی دڵنیاییانو بەڵکو دەبنە ئەو ڕۆحە عەزاب کێشانەی هەرگیز ئارامی نادۆزنەوە. بۆ ئەمەش ڕۆڵفۆ بەگەشتێکدا دەمان بات بۆ کۆمالا ئەو کۆمالایەی لەیادەوەری کەسەکاندا هەیەو زیاتر لەسەر وێنەی بەهەشت وێنای دەکەن، ئەو کۆمالایەش کە خوان پریسیادۆ دەبینێتو هیچی لەدۆزەخ کەمتر نیە.. دەشێت کۆمالای یەکەم نوێنەری خێرو دوهەمیش هی شەڕ بێت بەڵام ڕۆڵفۆ لە نێوان ئەم دوانەدا کۆمالایەکی تری بیناکردوە ئەویش ئەو کۆمالایەیە کە ڕوداوەکانی پیدرۆپارامۆی تیا ڕوودەدات.

دەکرێت قسەکردن بۆ نیشان دانی جوانیو قوڵی ئەم ڕۆمانە وەك ئاماژە کردن بێت بۆ مرواری ناو گۆمێك کە خوێنەر تەنها پەنجەی ئاماژەکار دەبینێت، بۆ بینینی ئەو مرواریەش دەبێت خوێنەر دابەزێتە ناو ئەو گۆمەوەو بەدوای ئەو مرواریەدا بگەڕێت.. خوێندنەوەی پیدرۆپارامۆ هەر بە گەڕانی ئەو کەسە دەچێت بەدوای مرواریداو دەشبێت تەنها خۆی بەم کارە هەستێت، لەقورسی ئەم ڕۆمانەوە بگاتە ئەو بەها پڕ لەجوانیانەی لەجیهانی ڕۆماندا بەرهەمی دەهێنێت.. بەئازاری کەسەکاندا ڕۆچێتو بەشێوەیەکی تر مێژوی عەزابو گۆشەگیری ئەو ناوچەیە بخوێنێتەوە کە ڕۆڵفۆ لەوپەری خەیاڵەوە واقعێکی کارەساتاویمان بۆ دەگێڕێتەوە...

ئەگەر قسەیەك مابێت ئەوا تەنها لەسەر وەرگێڕانی دەقەکەیە کە وەرگێڕەکان هەوڵیان داوە ئەو زمانە پڕ لە ئازارو تەنیاییە بپارێزنو خوێنەر پەلکێش کەنە ناو ڕۆمانەکەوە.. هەر بۆیە جێگای سوپاسە کە بیریان لە وەرگێڕانی ئەم ڕۆمانە دانسقەیە کردۆتەوە.

# کیژی کاپیتان

سیامەند هادی



کیژی کاپیتان (رۆمان)

پوشکین

وەرگێڕانی لە ئینگلیزیەوە: محەمەد حەمە ساڵح

لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

بێگومان رۆمان وەك چۆن لەنێو خۆیدا خاوەنی چەند ئەدگارێکی هونەریو تەکنیکی تایبەتی خۆیەتی، بەهەمان شێوە لەدەرەوەش ئەم ژانرە باڵایەی ئەدەب بەسەر چەند جۆرێکدا دابەشکراوە. واتە رۆمان جگەلەوەی کە لەرێگەی چەند هونەرێکەوە بەرێوە دەچێت، لەهەمان کاتدا زۆربەی کات چوارچێوەیەك بە باڵای ئەم ژانرەدا کراوە.

رۆماننووسەکانیش لەگەڵ ئەوەی کە گرنگییەکی تەواویان بە ((کەسێتیو کاتو شوێنو پەیڤینو سیمبولو وێنەو..)) داوە، دوای تەواوبوونی بابەتەکەش چوارچێوەیەکیان بەخششیوەتە شێوازەکەی خۆیان.. ئەو جۆرانەش وەك ((رۆمانی مێژوویی- رۆمانی نامەیی- رۆمانی خەیاڵی زانستی- رۆمانی ناوچەیی- رۆمانی رووبارو..)). بەڵام ئەو مۆرکی جۆرو شێوازانە ئێستا لە رۆمانی نوێدا ئەو رۆڵەی ئەوسای نابینیێو، رۆمانی نوێ لەو چوارچێوانە خۆی قوتار کردووە.. دەبینین رۆمانی مێژوویی زۆر لە کۆنەوە برەوی خۆی هەبووە، کە لەم جۆرە رۆمانەدا شوێنو کاتو رووداو بوونی واقیعی خۆیان هەیەو، دەبێت رۆماننووس ئەو رووداوە مێژووییەی مەبەستێتی لەکارێکی هونەریدا بیخاتەروو. رەنگە بتوانێت هەندێ جار ناوی شوێنێ یان کەسێك بگۆڕێت، بەڵام ناتوانێت بەئارەزووی خۆی دەستکاری رووداوەکان بکات،

چونکە ئەو رووداوەی کە ئەو هەڵیدەبژێرێت لەدەرەوەی کارە هونەرییەکەی ئەو بوونی واقیعی هەیەو خەڵکی ئاگاداری رووداوەکەیە. هەر بۆیە رۆماننوس لێرەشەوە پابەند دەبێت بەچوارچێوەیەکەوەو، ناتوانێت بەئازادی کار لە بابەتەکەدا بکات، لەبەر ئەوەی ئەو کارەی دەبێت بەشێوەیەکی دیکەی مێژووی ئەو سەردەمە بەشێوەیەکی ئەدەبی..

ئەلێکساندەر پوشکین ((1799—1837)) یەکێکە لەو نووسەرانەی کە بە پابەندبوون بەشێوازی رۆمانی مێژوویی لەئەوروپا، توانی رۆمانی ((کیژی کاپیتان)) بنووسێت. کە لە دابەشکردنی بەرهەمەکەیدا بەشێوەی نامەیی کاریگەری ((واڵتەر سکوت))ی بەسەرەوەیە. لەرۆمانەکەدا دادەبینین ((پێتەر)) لاوێکی تەمەن شانزە ساڵە، باوکی بۆ خزمەتی سەربازیو بەرگری کردن لە نیشتمان کوڕەکەی دەنێرێت بۆ نێو ریزەکانی سوپا. پێتەر لەگەڵ ((ساڤیلیچ))ی چاودێریدا دەچێت بۆ قەڵای ((بێلۆرسک))و لەژێر چاودێری کاپیتان ((میرۆنۆف))دا دەبێت. لەوێ دڵی بە ((ماریا ئیڤانۆڤنا))ی کیژی کاپیتاندا دەچێتو، ئەم عەشقە بێزاریو بێتاقەتی ئەو شوێنەی لەبیر دەباتەوە. دوای ئەوە جەنگ لەنێوان قەوزاقەکانو سوپای ئیمپراتۆردا دەست پێدەکات، قەوزاقەکان بەسەرۆکایەتی ((پوگاچیۆف)) زۆربەی قەڵاو ناوچەکان داگیردەکەن، دواجار قەڵای بێلۆرسکیش دەگرنو ناوچەکە تاڵان دەکەنو چەند کەسێك دەکوژنو، دایكو باوکی ماریاش لە سێدارە دەدەن. بەڵام پێتەر لەلایەن پوگاچیۆڤەوە ئازاد دەکرێت، لەبەر ئەوەی لەکاتی هاتنی پێتەر بۆکاری سەربازی لەرێگە بە رێکەوت تووشی پوگاچیۆف بوو بوو، پێتەریش یارمەتی دابوو. پوگاچیۆڤیش ئەو یارمەتییەی لەبەرچاو دەبێت و پێتەر ئازاد دەکات. ماریا لەماڵی قەشەی ناوچەکە خۆی دەشارێتەوە. پێتەر دوای ئازادبوون دەچێتەوە نێو سوپاکەی خۆیو داوایان لێدەکات کە پەلاماری هێزەکانی دوژمن بدەن، بەڵام ئەوان بەقسەی ناکەن. ناچار دەبێت بۆ رزگارکردنی ماریا، لەگەڵ -ساڤیلیچ-دا دەچێت بۆ نێو هێزەکانی پوگاچیۆڤ. دیسان پوگاچیۆڤ یارمەتی دەداو ماریای بۆ رزگار دەکاتو رێگەی پێدەدات بەهەموو ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی ئەودا تێپەڕێت، پێتەر دوای ئەوەی کە ماریا دەنێرێتە ماڵی خۆیان، خۆیشی دوای تێکشکاندنی هێزەکانی پوگاچیۆڤ دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە.. پوشکین لێرەدا بەتەواوی پشتی بەو بابەتە مێژووییە نەبەستووە کە هەیەو، پابەندیش نەبووە بەو بەڵگەنامانەی کە تایبەتن بە پوگاچیۆڤو راپەڕینەکەیەوە. بەڵکو پشتی بەپاشماوەی قسەی خەڵکی بەستووە، دەربارەی کەسێتی پوگاچیۆڤو راپەڕینەکەی.

ئەم رۆمانە بەراناوی کەسی یەکەم نووسراوەو راوی دەقەکە پێتەرە، کە هەموو رووداوەکان وەك یادداشتێك لەسەردەمی ئەوەوە دەگێڕێتەوە. ئەگەرچی پوگاچیۆڤ رابەری بزوتنەوەی جوتیارانەو دژی ئیمپراتۆر هەستاوە بەراپەڕین، بەڵام پوشکین هەموو ئەو تاڵانیو کوشتنو ناڕەواییەمان بۆ ئاشکرا دەکات کە لەسەردەستی بزوتنەوەی جوتیارانەوە سەر هەڵدەدا. هەربۆیە دەتوانین بڵێین کە پوشکین لەم دەقەدا دەیەوێت وێنەیەکی راستەقینەی گەلی رووسیمان نیشان بدات، بەهەموو ناتەباییو ململانێو ناتەواوییەکانیەوە.. ئەگەر ئێمە لێرەدا لەرووی هونەرییەوە لەم دەقە بڕوانین، ئەوا دەبێت ئەوە لەبەرچاو بگرین کە ئەم رۆمانە لە ساڵی 1836دا نووسراوە. کە ئەوکاتە هونەری رۆمان پێشکەوتنی ئەوتۆی بەخۆوە نەدیبوو. هەر بۆیە ((کیژی کاپیتان))ی پوشکین بەکارێکی گەورەی بواری رۆمان دادەنرێت لەئەدەبی

رووسیدا. پوشکین لە ڕۆمانەکەدا تەنها وەك مێژوو بابەت ڕووداوەکانی پێکەوە گرێنەداوە، بەڵکو توانیویەتی پەیوەندییەکی خۆشەویستی لەنێوان پێتەری پاڵەوانی ڕۆمانەکەو ماریای کیژی کاپیتاندا بخولقێنێ، کە ئەمەش وا لەخوێنەر دەکات بەهۆی بەدووکەوتنی چارەنووسی ئەو دوو عاشقەوە، سەردەمی ڕووداوە مێژووییەکانو باری سیاسیو کۆمەڵایەتی ئەو سەردەمەی لا ئاشکرا ببێت.. هەر بۆیە ئەم دەقە بەتەنها چیرۆکێکی خۆشەویستی نێوان دوولاو نییە، یان دەقێکی بەڵگەنامەیی نییە دەربارەی پوگاچیۆفو ڕاپەڕینی جوتیارەکان. بەڵکو هەردوو بابەتەکە وەك تەواوکەری یەکدی پێکەوە گرێدراون.. پوشکین لە هەڵبژاردنی کەسێتیدا بە تەواوی توانیویەتی بەپێی مەبەستو پێداویستی دەقەکە دایان بنێت. لاوێکی وەك پێتەر لەدەقەکەدا خۆی داوەتە دەست قەدەرو ڕێکەوتو بەپێی ڕووبەڕووبوونەوە بڕیار لەسەر شتەکان دەدات. پێتەر لەگەڵ تێکەڵبوونی بەسوپاو خزمەتی سەربازییەوە لەو تەمەنەدا ماریای کچە شۆخ و هەست ناسك دەناسێتو دەبێتە هۆکارێك بۆ ڕێگرتن لەبەردەم ڕۆیشتن بەرەو دڕندەییو بێبەزەیی. هەروەك کاتێك پێتەرو سەربازێکی دیکە دەکەونە ململانێو شەڕە شیرەوە، ماریا بەپێتەر دەڵێت ((پیاوان چەند سەیرن! ئەوان بەهۆی قسەیەکەوە کە بێگومان پاش حەفتەیەك لەبیریان دەچێتەوە، ئامادەن یەکتر بکوژن- ل42-43)). لێرەشەوە دەبینین پوشکین دوو کەسێتی زۆر بێگەردی دیاریکردووە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی کێشەکانو، هەموو کەسێتییەکانی دیکەش بەهەمان شێوە بەپێی سروشتی تایبەتی خۆیان دیاریکراون.. جگە لەمانەش ڕۆماننوس لەم دەقەدا زۆر بە ئاشکرایی لەنەهامەتی شەڕو تاڵانکردنو سوکایەتیو دوورخستنەوەی عاشقەکان لەیەکدی بەهۆی شەڕەوە دەدوێت. چونکە زۆر جار وایلێدێت بەهۆی شەڕەوە خەڵکی لەژیان بێزار دەبنو دادەماڵرێن لەهەموو سۆزو خۆشەویستییەکو، شەڕ دەبێتە هۆی نائومێدبوونی خەڵکو، بێزاریو نائارامیش لە بەر ئەنجامی شەڕەوە سەرچاوە دەگرێت. وەك لەو دەقەدا هاتووە ((خەڵکەکە ڕاهاتبوون بەگرمو هوڕی گولله تۆپ لەپەنای ماڵەکانیاندا. تەنانەت هێرشەکانی پوگاچیۆڤیش وای لێ هاتبوو لەلایەن ڕەشە خەڵکەکەوە بایەخێکی ئەوتۆی پێ نەدەدرا. تووشی وەڕسیو بێزارییەکی کوشندە بوو بووم- ل93)).

هەروەها خەڵکی بەهۆی زنجیرەی سەرکەوتن وشکاندنی هێزەکان، نەیاندەزانی ستایشی کام هێزو دەسەڵات بکەنو ملکەچی کێ بن. چونکە هێرشو شەڕەکان بەدووی یەکدا چەند جارێك دەسەڵاتی دەگۆڕی هەروەك پێتەر دەڵێت ((کە بەناو ئەو گوندانەدا گوزەرمان کرد کەوا پیاوەکانی پوگاچیۆف کاولو وێرانیان کردبوونو، ئەوەی لەپاش تاڵانو بڕۆی دزەکان بۆ خەڵکە کڵۆڵو بێچارەکەی مابۆوە، ئێمە چ بەزۆرو چ بەخوایشت لێمان سەندن. نەیاندەزانی ملکەچی کێ بن. کارگێڕێتی لەهیچ شوێنێك نەمابوو- ل151))..

سەرەڕای ئەمانەش پوگاچیۆف وەك ڕابەری بزوتنەوەی جوتیاران بە بەردەوامی گومانی هەیەو، جڵەوی تەواو بۆ پیاوەکانی بەرنادات‌و، بەتوندوتیژیو بێبەزەیی ڕووبەڕوی ڕوداوەکان دەبێتەوە.

هەروەك دەبینین بەپێتەر دەڵێت ((پیاوەکانم دزنو، مەراییو کلکە لەقێ دەکەنو، دەبێ ئاگام لەخۆم بێ، چونکە ئەوان لەیەکەم نوچداندا سەرم لەپێناوی ڕزگاربوونی خۆیاندا دەفرۆشن- 109)). جگە لەمانەش کە ئاماژەمان پێدا، دەبینین پێتەر بەهۆی چەند پەیوەندییەکی ڕێکەوتەوە،

لەزۆربەی کێشەو گرفتەکانی قوتاری دەبێت، کە ئەمەش کەسێتی پێتەری هێشتۆتەوە لەدەقەکەدا. پێتەر ((ئیڤان زورین)) بەهۆی ئەوەوە دەناسێت کە جارێك یارییەکی بلیاردی پێ دۆڕاند. بەڵام دواتر کاتێك پێتەرو مارییا دەچنە قەڵایەکی ژێر دەسەڵاتی هێزەکانی پوگاچیۆڤەوە، دەبینین ((زورین)) لێپرسراوی قەڵاکەیە. هەر بۆیە بەهۆی ئەوەوە رزگاریان دەبێت. یان هەر بەهۆی رێکەوتەوە شەوێك لەگەردەلولێکی بەفردا پوگاچیۆڤ دەبینێو، لەگەڵ خۆیان هەڵیدەگرنو دواتر پاڵتۆکەو کەروێشکێکیشی دەداتێ.

دواتر کاتێك جوتیاران قەڵای بێلۆرسك دەگرنو خەڵکی لەسێدارە دەدەن، بەباوكو دایکی مارییاشەوە، پێتەر کە ئەفسەرێکی سوپایە ئازاد دەکرێت، چونکە لێپرسراوی بزووتنەوەکە پوگاچیۆڤ دەبێت. دواتر یارمەتییەکی زۆری پێتەر دەداتو مارییاشی بۆ رزگار دەکاتو، رێگەی پێدەدات بەئارەزووی خۆی بەناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆیدا گوزەر بکات. بەڵام ئەوەی کە لە دەقەکەدا جێگەی سەرنجە، پەیوەندی نێوان ((پێتەرو پوگاچیۆڤ))ە. کە پوشکین توانیویەتی هەموو مەبەست دەلالەتێکی ئەو پەیوەندییە پێکەوە گرێبدات.

دەبینین پێتەر لەگەردەلولێکی بەفردا بەشێوەیەکی رێکەوت پوگاچیۆڤ دەبینێ، کە ئەم گەردەلولەش دەلالەتە بۆ هەڵگیرساندنی گەردەلولی شۆڕش. دواتریش پوگاچیۆڤ دوای شکاندن ون دەبێتو دیارنامێنێو دەمێنێتەوە، کە ئەمەش دەلالەتە بۆمانەوەو بەردەوامبوونی شۆڕش. رەنگە خوێنەر ئەو پەیوەندییەی زۆر لاسەیربێت، چونکە پوگاچیۆڤ لەبەردەم خەڵکیدا زۆر دڵ رەقەو، بۆ پێتەریش نەرمییەکی زۆر دەنوێنێ. پوگاچیۆڤ لەگەڵ ئەوەی لەو یەکترناسینە رێکەوتەدا یارمەتی پێتەر دەدات، دواتریش پێتەر هیچ فرۆفێڵێکی لێناکاتو هەموو کاتێك بەراستی وەڵامی دەداتەوە. هەر بۆیە پوگاچیۆڤ ئەو راستگۆییەی پێتەری زۆر پێ خۆشدەبێت. هەر بۆیە بە هیچ شێوەیەك بیر لە ئازاردانو زیان پێگەیاندنی پێتەر ناکاتەوە، چونکە نابێتە هۆی جێگەی مەترسی بۆ پوگاچیۆڤو راپەڕینەکەی. لەلایەکی دیکەشەوە پێتەر دوای ئەوەی کە پوگاچیۆڤ دەناسێتەوە هاوکاریشی دەکات، بەهیچ شێوەیەك بەخەیاڵیدا نایەت کە بیر لەزیان پێگەیاندنی بکاتەوە، چونکە پوگاچیۆڤ لەهەموو گرفتو کێشەکان رزگاری دەکات.

هەر بۆیە دەبینین پوگاچیۆڤ پاش ئەوەی بۆی دەردەکەوێت کە پێتەر ئەفسەری سوپاشە، ناتوانێت دەست بەرداری ئەو پەیوەندییە بێت، لەلایەکی دیکەشەوە پاش ئەوەی پوگاچیۆڤ بڕیاری کوشتنی ئەو هەموو کەسە دەداتو دژی سوپاو دەسەڵات دەجەنگێ، بەهەمان شێوە ناتوانێت دەست بەرداری ئەو پەیوەندییە بێت.

کە ئەمەش دەلالەتە بۆ ئەوەی کە نووسەر پێی وایە چارەنووسی هەموو گەلی رووسی وەك یەك وایە..

لێرەشەوە دەبینین کە پوشکین لەم رۆمانەدا توانیویەتی بەشێوەیەکی ریالیزمی مێژووی ماوەیەکی رەوشی رووسیا وەك ئاوێنەیەك بخاتە بەرچاو، کە هەڵگری ئاشکراکردنی باری ئابووریو سیاسیو کۆمەڵایەتی گەلی رووسیایە..

ئەوەی لێرەدا ماوەتەوە بیڵێین ئەوەیە کە وەرگێڕانی ئەم شاکارەی پوشکین کارێکی پێویستەو ((محمد حمە صالح توفیق)) توانیویەتی بەشێوەیەکی باش ئەم رۆمانە وەرگێڕێتە سەر زمانی کوردی.

هەر بۆیە دەست خۆشی لێدەکەینو هیوای بەردەوامی بۆ دەخوازین..

# بەرەو بەدیهێنانی ئەفسانەی خود



ناوی کتێب: کیمیاگەر – ڕۆمان

ناوی نوسەر: پاولو کوئیلو

وەرگێڕ: ئەبوبەکر خۆشناو

ژمارەی لاپەڕە: 138

لەبڵاوکراوەکانی دەزگای چاپو پەخشی سەردەم

بەرەو ڕۆژهەڵات... بەرەو ئەو ناوچە سیحر ئامێزو نائاشکرایانەی بەکانگای ئاینو ئەفسانەو جادوو دادەنرێت.. بەرەو ئەو ناوچانە.. دەشێت ئەمە خەونی ڕۆمانتیکەکان بێتو هەرگیز لەخۆرئاوا نەبێتەوە ئەگەرچی لای هەریەکێك لەرۆژئاواییەکان دیدگایەکی جیاواز هەیە بۆ سەیرکردنی؛ هیگڵ کەگەشتی ڕۆح دەنوسێتەوە لەرۆژهەڵاتەوە دەیهێنێت تا لەخۆرئاوا کۆتایی بێت.. هێرمان هیسەش دەگەڕێتەوە ناو دیدگای سۆفیانەیی بوزیو براهماکان..

بۆرخیسیش بەقوڵی گەڕایەوە سەر شێوە حیکایەتەکانی ڕۆژهەڵاتو تێڕوانینە ناواقعیەکانی بۆ ژیان. ئەو کەنیزەکو بازاڕە بۆن خۆشەکانیو ئاوریشمو جادوگەرەکانی.. مافورە سەیرەکانو ئەفسانەکانی.. شەوانی بێکۆتایی حیکایەتەکانی زۆرێك لەرۆمانسیەکانی پەلکێش کردو پەلکێشیان دەکات..

ئەوە ڕۆژهەڵاتە کەهێشتا خەون بەکاروانەکانی ئاوریشمو عاجو گەنجە شاراوەکانیەوە دەبینرێ..

لەم ساڵانەی دوایدا گەڕانەوەیەکی نامۆو قوڵ هەیە بەرەو ئەو کەلتورە سەرسوڕهێنەی نوسین، یاخود ڕاستتر کەکتێبێك دروستی کردووە، بەتایبەت لەناو ئەو نوسەرانەی لەڕێگای زمانی ئیسپانیەوە پێی ئاشنا دەبنو دەگەڕێنەوە ناو هەزارو یەك شەوەو ابن عربیو دومیریو.. دەشێت ئیسپانی زانەکانیش یەکێك بن لەوانەی

کەبەقوڵی لەم کەلتورە تێبگەن چونکە ناتوانرێ ئەو چەند سەدەیە بەهەند وەرنەگیرێت کە ئەندەلوس لەدرەوشانەوەدا بوو و کەلتوری ئیسلامی و رۆژهەلاتیش لەو دەروازەیەوە سەفەریان بۆ دەرەوە دەکرد.

ئەم گەڕانەوانە جوانی و سیحری خۆی هەیە ئەوەتا کیمیاگەر کەلەساڵی 1998 لەسەرەوەی لیستی ئەو کتێبانە بووە زۆرترین فرۆشتنی هەبووەو یەکێکە لەو گەڕانەوانەی بەسادەیی و قوڵیەکی نامۆوە دێتەوە ناو ئەفسانەو رۆحانیەتی رۆژهەلاتەوە.

ئەم رۆمانە باس لەبەدیهێنانی ئەفسانەی خود دەکات ئەویش بەڕامانێکی قووڵەوە. ئەوەتا "سانتیاگۆ" پاڵەوانی رۆمانەکە شوانەو سەر لەئێوارەیەك لای کڵێسایەکی چۆڵ لەگەڵ مێگەلەکەی دەمێنێتەوە تاشەوی تیا بگوزەرێنێت پاش ئەوەی تێدەگەین کەکتێبێکی پێیە ناوی کیمیاگەرەو و لەنوسینی ئۆسکارواێلدە، سەرەتای رۆمانەکە بەچیرۆکێکی کورتی ئەم کتێبە دەست پێدەکات کەباس لەئەفسانەی نێرگز دەکات. شوانەکە لەنزیك ئەسپیندارێکەوە دەنوێت و خەونێك دەبینێت کەجارێکی تریش بینیویەتی. بەدوای ئەم خەونەدا دەچێتە لای پیرەژنێك تا بۆی لێك بداتەوە. سانتیاگۆ لەخەونیدا منداڵێك دەبینێت دێتە لای مێگەلەکەی و یاریان لەگەڵ دەکات پاشان دێت دەستی ئەم دەگرێت و پێی دەڵێ ئەگەر گەشتیتە ئەهرامەکانی میسر ئەوا لەوێ گەنجینەیەکی لێیە چاوەڕوانتە بەڵام هەر کاتێك دەیەوێت شوێنی گەنجینەکەی نیشان بدات بەخەبەر دێت..

پیرێژنەکە پێی دەڵێ: دەبێ بچیتە ئەهرامەکانی میسر..

ئیدی هەموو رۆمانەکە باس لەو گەشتە دەکات کەسانتیاگۆ پێی هەڵدەستێت تا خەونەکەی بێنێتەدی.. مێگەلەکە دەفرۆشێ و بەپاپۆڕ دەپەڕێتەوە بەری ئەفریقیا ئیدی بەناو ئەفسانەو سیحردا گەشتەکەی دەکات، بەبیابان و مێرگەکاندا، بەخۆشەویستیە ئەفسانەکەی فاتیمە.. بەخودی جادوودا سەفەر دەکات تا دەگاتە ئەهرامەکانی میسر لەوێدا خەریکی هەڵکەندنی شوێنێك دەبێت بەو نیازەی گەنجەکەی تیا شارابێتەوە. هیلاك و ماندوو.. لەناکاو چەند کەسێك دەدەن بەسەریدا و گومانی لێدەکەن کەشتێکی پێیەو دەیشارێتەوە پاش لێدانێکی زۆر سانتیاگۆ پێیان دەڵێ:

- من بەدوای گەنجینەدا دەگەڕێم. دووجار خەونم دیوەکە گەنجینەیەك لەنزیك ئەهرامەکانی میسر شاردراوەتەوە. ئیتر وازی لێدەهێنن و دەڕۆن بەڵام سەرۆکەکەیان ئاوڕی دایەوەو وتی:

- نامری، زیندوو دەمێنی، تێدەگەی کەمرۆڤ نابێ ئەوەندە گێل بێ. لەو جێگایەی تۆ لێی کەوتووی، رێك پێش دوو ساڵ خەونێکم بینی و دووبارەش بوەوە. خەونم بینی کەدەبێ بچمە ئیسپانیاو کلێسای گوندێك بدۆزمەوە کەوێران بووەو شوێنی شوانانە، دار ئەسپێندارێکی گەورە لە کۆگای کلێساکەدا رواوەو ژێر دارەکە هەڵکەنم تا گەنجینەیەکی تێدا بدۆزمەوە. بەڵام من ئەوەندە گێل نیم لەبەر خاتری خەونێ کەدووجارم دیوە ئەو بیابانە گەورەیە بدەمەبەر.

لێرەدا تەلیسمی گەشتەکە دەکرێتەوە چونکە ئەو کلێساو دارە هەر ئەوەیە کە لەسەرەتای رۆمانەکەدا سانتیاگۆ خەونەکەی لێ‌بینی.. دەگەڕێتەوەو گەنجەکە لەژێر دارەکەدا دەدۆزێتەوە.. ئەمەش پاش ئەوەی کە ئەو

جیاوازیە گەورەیەمان نیشان دەدا لەنێوان سانتیاگۆ کەبەدوای بەدیهێنانی ئەفسانەکەیدا رۆشت و دواجار پێی گەیشت هەروەها ئەو پیاوەی کە ئەمەی بەگێلێتی دادەنا.

کاتێك دەگەیتە کۆتایی رۆمانەکە هەست دەکەیت حیکایەتێك خۆی دەکاتەوە بەیادەوەریتدا کە ئەویش حیکایەتی "حەمالی بەغدا" یە کە شەهزاد دەیگێڕێتەوە. لەم حیکایەتەدا کەسێك خەو بەوەوە دەبینێت کەلەمیسرداو لەماڵێکدا گەنجێك هەیە ئیدی بەدوای ئەو خەونەدا دەڕوات بەڵام لەو ماڵەدا کابرای خاوەن ماڵ پێی پێدەکەنێو دەڵێ منیش چەند جارێك خەونم دیوە کە لەبەغداو لەفلان شوێندا گەنجێك هەیە بەڵام ئەمە خەونە.. ئەو ماڵەی بەغدا ماڵی ئەو کابرایەیە کە هەموو ئەو رێگایەی بڕی تا میسر، دەگەڕێتەوە تا لەماڵەکەی خۆیدا گەنجەکە بدۆزێتەوە. بەڵام پاولوکویلو جارێکی ترو بەقوڵیەکی ئارەزوو بەخشەوە دەمان باتەوە ناو ئەفسانەی خودو تێڕوانینی سۆفیانە بۆ جیهان کەوەك یەکێتییەکی تۆکمە سەیریان دەکاتو ئەمەش وادەکات کەمرۆڤەکانی بتوانن دیاردە سروشتیەکان بخوێننەوە یاخود دەمان باتە ئەو رێکەوتانەوە کەپێدەچێت پێشتر بڕیار لەڕودانیان درابێت..

ئەم رۆمانە پڕ بایەخو گرنگە دەشێت بەکارێکی جدیو سەرکەوتوو دابنرێت بۆ کتێبخانەی کوردی وئەگەرچی لەهەندێك شوێندا زمانە کوردیەکەی یارمەتی گەیاندنی ئەو سیحرو و جوانیە نادات کە رۆمانەکە لەخۆیدا هەڵیگرتووە.

بۆ زیاتر ئاشناکردنی پاولوکویلو و رۆمانەکەی وا باشترە ئەم چاوپێکەوتنەی بخوێنینەوە کە گۆڤاری (نصف الدنیا) لەژمارە 486 ئەم ساڵدا لەگەڵی سازداوە.

* دەمانەوێت لەبارەی پەروەردەت.. خێزانو خوێندنت.. خولیا تایبەتمەندیەکانتەوە بزانین کەکاتێ منداڵ بوویت.

– لەخێزانێکی مام ناوەندی لەدایك بووم کەدەیویست کوڕە گەورەکەی ئەندازیاری بخوێنێت بەڵام من هەر لەمنداڵیەوە خەونی ئەوەم هەبووە ببم بەنوسەر. لەسەرەتادا بەدیهێنانی ئەمە ئاستەم بوو چونکە کاتێك بەدایکم وت کەئارەزومە نوسین بکەمە پیشەم کەچی ئەو پێی وتم ئەم پیشەیە مەرجی قورسی هەیە کە لەتۆدا نیە.. پاشان ئەگەر من ببمە نوسەر ئەوا نوسەرێکی سەرکەوتوو نابم.. ئەمە لەدیدگای دایکمەوە بوو کەئامۆژگاری کردم حقوق بخوێنم پاش ئەوەی لەئەندازیاری سەرنەکەوتمو منیش پەیوەندیم بەکۆلیژی حقوقەوە کرد.

* ئایا زانکۆ هەنگاوێکی گەورەبوو لەژیانتدا – کەدەزانم خوێندنت تەواو نەکرد – ئەی بۆچی پاش ماوەیەکی کەم جێت هێشت.

- لەناوەڕاستی شەستەکاندا پەیوەندیم بەزانکۆوە کرد ئەمەش هەنگاوێکی زۆر گرنگ بوو لەژیانمدا چونکە لەم کاتەدا لەهەموو زانکۆکاندا "بزوتنەوەی هیپی" لەگەشەدا بوو.. منیش چوومە ریزی و باوەڕم بەفەلسەفە ئەنارشیزمەکەی هێناو هەموو باوەڕو خەونو هەنگاوەکانی داهاتووم تورڕدا. ئیدی گرنگیم بەسەفەرو گەڕان دەدا لەناوەوەو دەرەوەی بەرازیل هەروەها گرنگیم بەبینینو چاوپێکەوتنی خەڵك دەدا

لەهەموو شوێنێکدا.. لەم ماوەیەدا ئەو شتەی روونو ئاشکرابوو لەژیانمدا ئەوەبوو کەئارەزوو ناکەم لەکردنی. بەڵام تەمومژ ئەوەی داپۆشی بوو کەدەبێت بیکەم یاخود وردتر ئەوەی کەدەمەوێت بیکەم بەدرێژای ئەوکاتەش لەو باوەڕەدا بووم کەپێویستە لەسەر مرۆڤ خەونی خۆی دیاری بکاتو لەپێناویشیدا بجەنگێت بەچاوپۆشی کردن لەو باجەی لەپێناو بەدیهێنانی ئەم خەونە دەیدات.

*سەفەرەکەت بۆ کوێ بوو؟

– سەردانی هەموو وڵاتانی ئەمریکای لاتینم کرد هەروەها وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو هۆڵنداش کەپایتەختی هیپیەکان بوو لەوکاتەدا.. من ئامرازە هەرزانەکانم بۆ سەفەر هەڵدەبژراد چونکە شارەزایی زۆرتری تیابوو ئەویش بەهۆی بەریەك کەوتن لەگەڵ مرۆڤە جۆراوجۆرەکاندا بۆ نمونە لەیادمە کەلەوڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاوە چووم بۆ مەکسکیك کەمتر لە200 دۆلار لەگیرفانمدا بوو.

*ئەی کەی گەڕایتەوە بەرازیل؟

– لەسەرەتای حەفتاکاندا گەڕامەوە بەرازیلو دەستم کرد بەو کارەی کەخۆشم دەویست (هونەرو نوسین) کارم لەرۆژنامەیەکی بەرازیلیدا کرد پاشان گۆرانی بێژێكو بەرهەم هێنێکی هونەریم ناسی و دەستم کرد بەنوسینی گۆرانی بۆ ئەم گۆرانی بێژە.. یەکەم گۆرانیش کەنوسیم جەماوەرێکی زۆرو نائاسایی بەدەست هێنا بەڵام حکومەت ئەم گۆرانیەی دژ بەڕژێم داناو پێی وابوو هانی شۆڕش دەداتو توندوتیژیشی تیایە. لەبەرئەوە خرامە زیندانەوە (بەو بۆنەیەوە سێ جار دەست بەسەرکرام لەسەر ئەو گۆرانیە.. چونکە ئێمە لەوکاتەدا لەبارودۆخێکی نادیموکراتیدا دەژیاین).

*ئایا زیندان هیچ لەخەونو خولیا تایبەتیەکانی گۆڕیت؟

– پاش ئەوەی جاری سێیەم لەزیندان هاتمە دەرەوە وتم ئەوەندە شێتی بەسەو ممارسەی هەموو جۆرە شێتیەکم کرد کەمرۆڤ بتوانێت بەدرێژای ژیانی بیکات.. لەماوەی تەمەنێکی زۆر کورت دا ممارسەی هەموو شتێکی رێگەپێدراوو قەدەغەم کرد. ئیتر بڕیارم دا ببمە مرۆڤێکی ئاساییو بەدوای کاردا گەڕام. لەسەرەتادا پەیوەندیم بەکۆمپانیای (بولی گرام)ەوە کرد بۆ کارکردن (ئەمەش گەورەترین کۆمپانیای کاسێتە لەبەرازیل) پاشان وازم لەم کارە هێناو پەیوەندیم بەکۆمپانیای (CPS) ەوە کردو بووم بەبەڕێوەبەری جێبەجێکەری.

*ئەی سەبارەت بەخەونە کۆنەکەت کەسەبارەت بەنوسین بوو؟

–بەدرێژایی ئەم ماوەیە خەونە کۆنەکەم کەسەبارەت بەنوسین بوو لێم جیانەبوەوە بەڵام لەبەرئەوەی دایکم زۆر خۆش دەویست خۆم لەو خولیایە رزگاردەکرد چونکە ئەو باوەڕی وابوو کەمن دەبمە نوسەرێکی فاشل بەڵام کاتێك وازم لەکارکردن هێنا لەکۆمپانیای (CPS) بڕیارم دا کە فرسەتێك بەخەونە کۆنەکەم بدەمو پێشنیازم بۆ ژنەکەم کرد سەفەر بکەین، جارێکی تر گەڕامەوە بۆ سەفەرو کۆچ کردن.. پارەی زۆریشم هەبوو بەهۆی نوسینی گۆرانیەوە بەڵام بەختیار نەبووم.. چونکە بەردەوام خولیای نوسین بەدوامەوە بوو.. هەر بۆیە بڕیارمدا پاتریە

مرۆڤایەتیەکەم شەحن کەمەوە ئەویش بەسەفەرکردن بۆ ئەو شوێنانەی پێش دە ساڵ سەفەرم بۆ کردبوو.

ساڵی 1982 گەڕامەوە بەرازیل‌و دوا بڕیارم دا کەنوسین بکەمە پیشەم. لەکۆتایی 1986دا خوێندنی ڕێزمان‌و بنچینە جوانناسیەکانم تەواوکردو یەکەم ڕۆمانم نوسی (مسافر) کەسەرکەوتنێکی باشی لەبەرازیل بەدەست هێنا بەڵام ئەو سەرکەوتنە نا کە (جادوگەری بیابان – واتا کیمیاگەر – ) بەدەستی هێنا کە لەکۆتایی 1986 بڵاوم کردەوەو وەك خاڵی وەرچەرخان‌و گۆڕان وابوو لەژیانمدا.

*بەشێکی زۆری روداوی ڕۆمانەکەت (جادوگەری بیابان) لەمیسرداو بەتەنیشت ئەهرامەکان‌و بیابان‌و بەهاوەڵی ئەو پیاوانەی کەخێڵە کۆچەریەکانن، روودەدات.. من دەزانم تۆ پێش ئەوەی نوسین بکەیتە پیشە وەك گەشتیارێك سەردانی قاهیرەت کردوە" ئایا سەردانی ئەم ناوچەیەت کردوەو لێکۆڵینەوەت لەسەر بەرزو نزمی خاکەکەی‌و مرۆڤەکانی کردوە – وەك ئەوەی لەڕۆمانەکەتدا باست کردووە – یاخود سەردانەکەت سەرپێی بووە یاخود لەڕێی ئەرشیفی خوێندنەوەوە نوسیوتە..؟

– پێش ئەوەی "جادوگەری بیابان" بنوسم هەستام بەسەردانێکی قاهیرە.. بەمەش شارەزاییەکی دەرونی‌و روحی‌و بەختیاریم دەست کەوت پێشتر پێی نەگەشتبووم، ئەوکاتەی سەرەتای هەشتاکان کەدوو هەفتە لەقاهیرە بووم.. بەتەنیا چووم بۆئەوێ بێئەوەی تەنیا کەسێك بناسم.

چاوم بەلاوێك کەوت ناوی (حسان) بوو داوام لێکرد لەم گەشتەمدا ڕێبەرم بێت. ئیتر لەناو قاهیرەوە پێشڕەوی دەکردم‌و دەیبردمە شوێنی وا کەناویم نەبیستبوو.. لەڕۆژی یەکەم دا چووم بۆ ناوچەی ئەهرامەکان‌و بینیم زۆر قەرەباڵغە ئەم قەرەباڵغیەش نایەڵێت دەست لەجوانی شوێنەکە بدەم.. بە(حسان) م وت دەمەوێت بچم بۆ بیابان.. ئیتر بەحوشتر چووین بۆ بیابان ماوەیەکی درێژ بەبیاندا ڕۆیشتین تا گەشتینە گردێکی بەرز.. لەسەر گردەکە وەستام‌و ئەهرامەکانم لەدیمەنێکی گشتیدا بینی.. ئەمەش لەشەوێکی مانگەشەودا رویدا کەتریفەی مانگ ناوچەکەی داپۆشیبوو لەپشت ئەهرامەکانیشەوە روناکی قاهیرە دەدرەوشایەوە..

*ئایا دەتوانیت پێم بڵێی کە ئەو ساتە هەستت بەچی دەکرد؟

– لەسیحری دیمەنەکە خەریك بوو لەهۆش خۆم بچم.. هەستم بەسەر سوڕمانی تەواو کردو دەمویست لەیەك کاتدا پێکەنم‌و بگریم‌و گۆرانی بڵێم. لەیادمە لەسەر چۆك دانیشتم و دەستم خستە سەرزەوی.. ساتێکی پڕ سام بوو لەژیانمداو هەرچ کاتێك بیری لێدەکەمەوە موچرکە بەلەشمدا دێت..

لەساڵی دواتردا گرنگترین ڕۆمانم نوسی (جادوگەری بیابان) و ئەم دیمەنەشم بەوردی تیانوسی‌و شوانەکە کەپاڵەوانی ڕۆمانەکەیە خستمە جێگای خۆم.

*ئایا دەتوانم ئەو سەردانەی قاهیرەت بەسەردانێکی قەدەری دانێم کەدەرگای لێکردیتەوە هەتا خەونێکی کۆن بەدیبهێنێت؟

– بەڵێ لەساتێکی قەدەریدا سەردانی قاهیرەم کرد کەلێیەوە ئەو هێزە ڕۆحییەم دەست کەوت کە لە(جادوگەری بیاباندا) بەدەرم

خستوه.. پێم وایە من ڕۆحیانە پەیوەست بووم
بە(حسان) ی ڕێبەرمەوە.. لەڕۆلێکی تردا کە
لەسەر گردەکە بوین پێم وت وەرە بابەپێ بچین
بۆ ئەهرامەکان.. لەڕێگا داوام لێکرد کەقورئان
بەدەنگی بەرز بخوێنێتەوە بەوشێوەیەی کە
لەمیسر گوێم لێگرتووە کە وەك گۆرانی وتن
بوو.. ئەویش (فاتحە)ی بۆ خوێندمەوە کەپێشم
وت ماناکەیم بۆ وەرگێڕێت. گریام کاتێك بینیم
داوا لە خوا دەکات (اهدنا الصراط المستقیم )
کەڕێگای ئەوانەیە (أنعم الله علیهم) واتا ئەو
ڕێگایەی ئەوانە لەسەری دەڕۆن کەخوا خۆشی
دەوێن.

ڕۆمانەکە سەرکەوتوو بوو چونکە خۆم
پاڵەوانی بووم یاخود بەلایەنی کەمەوە لەزۆر
شتدا لەشوانەکە دەچم.. گرنگترینیان ئەو شعورە
بەردەوامەیەتی بەخەونێکی کۆن کەدەبێ
بەدییهێنێت. بەدیشی دەهێنێت لەگەڵ ئەوەی
هەموو جارێك هەنگاوێك بەرەو بەدیهێنانی
خەونەکەی دەڕوا دنیا بەرەو ڕێگای لاوەکی تری
دەبات بەڵام پاش ماوەیەك دەگەڕێتەوە سەر
ڕێگا سەرەکیەکەی. هەمان ئەو فەلسەفەیەی
ئایەتەکە بانگی بۆ دەکات (اهدنا صراط
المستقیم).. ئەم ئایەتەش بووە بەباشترین
دوعای ڕۆژانەم.

*چۆن ڕۆمانەکەت بڵاوکردەوە؟ چۆنیش
توانیت چاودێری ئەو سەرکەوتنەی بکەی
لەزۆربەی وڵاتانی جیهاندا؟

—پاش ساڵێك لەبڵاوبوونەوەی ڕۆمانەکە
سەرسام بووم لەوەی کەژمارەی نسخە
فرۆشراوەکان لەبەرازیلدا 900 دانەی
تێنەپەڕاندووە.. هەستم کرد دەبێت جەنگێك
بکەم تا بەشێوەیەکی باشتر بڵاوبێتەوە..
بڵاوکەرەوەیەکم دۆزییەوە کە بۆ یەکەم جار کاری
دەکرد و مافی لەچاپدانەوەی ڕۆمانەکەم دایە.
ئەم جارەیان سەرکەوتنی ڕۆمانەکە لەناو
بەرازیلدا دەنگی دایەوە.. پاشان ڕۆمانەکە
لەڕێگای کچە هاوڕێیەکەوە کەئەسڵی تونسیە
گەشتە ئەوروپا پاش ئەوەی داوای لێکردم کە
وەریگێڕێ بۆ زمانی فەرەنسی، لەوێش
سەرکەوتنی بەدەست هێنا .. پاش ئەوە بۆ زیاتر
لە22 زمان وەرگێڕاو بەباشترین دووەم کتێبی
داهێنان دادەنرێ لەجیهاندا (دوای کتێبی
فەیلەسوفی ئەمریکی بل جریشام) ئێستاش کۆی
فرۆشراوی ڕۆمانەکە لە22 زماندا گەشتۆتە 23
ملیۆن دانە.

*دەزانین ساڵانێکی زۆر خەریکی سیحر
بوویتو ئەندامی یەکێ لەو دەستانە بوویت
کەگرنگی بەروحانیاتو فەلەك دەدا.. ئایا
دەتوانین ئاشنای ئەزمونت بین لەم بوارەدا؟

—لەو ماوەیەی پەیوەست بووم
بەهیپپەکانەوە بیروباوەڕیان بەدەوری (مادە
بێهۆش کەرەکانو سێکسو مۆسیقاو لێکۆڵینەوە
روحیەکان)دا دەسوڕایەوە، ئەمەی دوایشیان
ئامانج لێی زانینی مانای مردنو ژیان بوو. وازم
لە هەموو بیروباوەڕی هیپپەکان هێنا جگە لەمەی
دواییان.

لەم ماوەیەدا شڵەژاوبووم.. وازم لەڕۆشنبیریە
کاسۆلیکیەکەم هێناو هەستم دەکرد شتێکی
ئاڵۆزە... هەوڵیشم دەدا بۆ خۆم ئەو وەڵامە
سادانەم بدۆزمەوە کەلەپرسیاری ئاڵۆزەوە دێنو
ناوەویان داگیرکردوم. دەستم کرد بەلیکۆڵینەوە
لەسیحرو روحانیەت.. دوای ئەم ماوە سەختەش
بڕیارم دا واز لەهەموو شتێك بهێنمو بگەڕێمەوە بۆ
ژیانێکی ساکار، تا چوومە زیندانەوە جارێکی تر

گەڕامەوە سەر بیرکردنەوە لەهەمان ئەو پرسیارانە.

*ئەو پرسیارانە چین کەمێشکیان داگیرکردوی؟

– پرسیاری سەرەکی ئەوەبوو کەمن کێم؟ لەپێش ماوەیەکی زۆرەوە بڕیارم دا بگەڕێمەوە سەرشارەزاییە دینیەکەم؟ یەکەم جار لەهەموو ئاینەکان دەمخوێندەوە.. ئەوەم دۆزیەوە کەهەموویان دەگەڕێنەوە بۆ یەك خوا (اللـه)و خواش بنچینەی ئەم ژیانەیە. پاشان دڵم ئارامی گرتو دڵنیابوو لەو دینەی لەسەری پەروەردەکرام، بەڵام لێکۆڵینەوەی روحانیەتم لەخۆم قەدەغەکردو ئێستا من سەربەگروپێکی دینی کاثولیکیم کە پەیوەستە بەم کارانەوەو ئێستا وام لێ‌هاتوە رێز لەهەموو شتێك بگرم کەپەیوەستە بەئاینەکان‌و پەرستنەوەو خۆشم بوێت زیاد لەهەر کاتێکی رابردوو.

*بەو پێیەی تۆ رۆچویتەتە خوێندنەوەی ئاینەکانەوە – رات چیە بەتێڕوانینی رۆژئاوا بۆ ئاینی ئیسلام‌و وا وەسفی دەکات کەدینی توندوتیژیە؟

- لەڕێگای خوێندنەوەو مامەڵەکردنەوە بۆم ئاشکرابوو کەئەو توندوتیژیەی رۆژئاوا پەیوەستی دەکات بەئاینی ئیسلامەوە تەنها ساختەو دورست کراوە.. لەوانەیە کەسایەتی توندهەبێت کەبەناوی ئەم ئاینە جوانەوە قسە دەکات بەڵام ئەوانە پەیوەندیەکی رەسەن‌و قوڵیان نیە بەو ئاینەوە. ئەو ئاینە پڕە لەخۆشەویستی‌و لێبوردن‌و دادپەروەری.

*با بگەڕێینەوە بۆ رۆمانەکەت کەهەردەم پڕ لەئەندێشەو ئەفسانەو حیکمەتە. لەهەمان کاتدا ئەو دوورە لەنیشان دانی بارودۆخی رامیاری یاخود کۆمەڵایەتی ناو کۆمەڵگاکەت.. ئەم ماوە دوورەی کەبڕیت تا دوور لەواقع بنوسیت ئایا ئەمە جۆرێکە لەڕەتکردنەوەی واقیع؟

– ئەمە ئەو رێگایەیە کەگوزارشتی لەخۆم پێ‌دەکەم‌و ئەو رێگایەشە کەلێیەوە لەگەڵ ئەو منداڵەی ناوەوەمدا دەدوێم‌و من باوەڕم وایە کە ئەم زمانە (ئەندێشە ئەفسانەییە) بەهێزترە لەزمانی واقیع هەروەها کاریگەری ئەم زمانەش زیاترە وەك لەکاریگەری رستەیەکی خەبەری. کاتێك لەنیویۆرکەوە سەفەرم کرد بۆ مەکسیك نەمدەتوانی بەئینگلیزی قسە بکەم بەڵام سەفەرێکی سەرکەوتووم کرد بەهۆی بوونی زمانی هەستەوە لەنێوان خەڵکیدا کەبەهێزترە لەزمانی گفتوگۆی ئاسایی. ئەم زمانەم خۆش دەوێ چونکە زمانێکی میللیە. لەو باوەڕەشدام کەخوا هونەرمەندانی لەپێناوی ئەوەدا دروست کردوە تا کار بۆ خوڵقاندنی زمانێك بکەن کەهاوبەشبێت لەنێوان هەموو میللەتەکاندا. لەهەوڵدانێکدا بۆ دواندنی رۆح (رۆحی خۆم پێش رۆحی ئەوانی‌تر) ئەم زمانەم خۆش ویست.. لەبەرئەوە کاتێك دەنوسم لەخۆم تێ‌دەگەم پێش ئەوەی لەدەراوەردەو بەخشینەکانی ژیان بگەم. کاتێکیش دەنوسم هەوڵ دەدەم سادەو راستەوخۆبم بێ‌ئەوەی جوانی زمان‌و سەنگینی‌و بەهای ون بکەم بۆنمونە کاتێك دەڵێم لەناکاو خۆم لەبیاباندا دۆزییەوە وا لەخوێنەر دەکەم کە لەئەندێشەیدا وێنەی بیابان بکێشێت، من دڵنیام کەئەو بیابانە جیاوازە لەبیابانێك کە لەئەندێشەی خوێنەرێکی تردایە.. لەبەرئەوە من هەست دەکەم نوسین گەمەیەو خوێنەریش لەگەڵتا بەشداری

دەکات. بەشێوەیەکی خۆپەرستانە دەنوسم تا لەخۆم بگەمو خۆشم بدوێنم.. کاتێکیش خوێنەر لەگەڵتدا بەشداری ئەم گەمەیە دەکات ئەوا بەهەمان فەلسەفەوە مامەڵەی لەگەڵ دەکات.. بەوپێیەش گەمەکە زۆر کاریگەرو زۆر سەرکەوتووش دەبێت.

*لەرۆمانی (گریان لەنزیك روباری بیدرا) کە بەم نزیکانە وەرگێڕانە عەرەبیەکەی لەمیسر دەردەچێت. نمونەیەکت پیشان داوە کەجەخت لەوە دەکات هێشتا خۆشەویستی لەجیهاندا بوونی هەیەو هێشتا رۆمانسیەتیش لەسەر تەختی شانشینی هەستەکان دانیشتووە.. ئایا لەو باوەڕەدای کە ئەم جۆرە لە خۆشەویستی لەواقیعی ئەم رۆماندا دەژی؟

– من زۆر دڵنیام لەبوونی.. خۆشەویستی خەڵکی منیان لەشێت بوونو داڕزان و خۆکوشتن لەیەکێك لەجارەکاندا رزگارکرد.. ئەوەم بۆ دەرکەوت کەرۆماننوس کەسێکی زۆر تەنیایە.. لەگەڵ ئەوەی من لەلایەن 80 ملیۆن خوێنەرەوە لەهەموو جیهاندا ناسراوم کەچی ژمارەی هاورێکانم نەگۆڕا بەڵکو لەکەم بوونەوەیەکی بەردەوامدایە بەهۆی مردنەوە.. بەتەنیا خۆم بینیەوە دەچم بۆ نان خواردن لەچێشتخانەیەکی بچوكو سەیر دەکەم ئەو گفتوگۆیەی لەسەر مێزەکەی تەنیشتمە دەربارەی کتێبی "جادوگەری بیابان"ە.. بەزۆر رێگا لەخۆم دەگرم تانەچمە سەر ئەو مێزەو خۆم بەدانیشتوانی بناسێنمو بەشداری گفتوگۆکەیان بکەم لەبەرئەوە ناونیشانی خۆم لەسەر هەموو چاپکراوەکانم نوسی تا نامە لەخوێنەرەکانەوە وەرگرم.. بەفعلیش نامەی پڕ لەخۆشەویستیو رۆمانسیم پێگەیشت کەژیانی دەرونیم دەپارێزێت.

رەگەزی مرۆڤیش بەگشتی خاوەن هەستێکی بەرزە کەبەخۆشەویستی نەبێت ناتوانی بیدۆزیتەوە.. خوا خۆشیبەبەزەییە کەخۆشەویستی پێبەخشین تا ئەو گەردونەی لەدەورمانە جوان کەین.. خۆشەویستی پێبەخشین تا بەخۆمان ئەوە بکەینو بەهای ئەوە بزانین کەکردومانە.. گرفتەکە ئەوەیە کەهەندێك کەس هەیە کەگرنگی ئەم نیعمەتە نازانن..

*پرسیاری کۆتایی سەبارەت بەپەیوەندیتە بەئەدەبەوە لەمیسردا؟

– بەداخەوە زۆر بەهێز نیە.. تەنها سێ رۆمانی نجیب محفوظم خوێندۆتەوە کەزۆر ئارەزوی چاپێکەوتنی دەکەم لەبەرئەوەی من زۆر هۆگریم. چونکە ئەوەی ئەو دەینوسێت نزیك دەبێتەوە لەئەدەبی میللی ئەفسانەیی.

**

ژیانی پاولو کویلهو:

- لەدایك بووی (ریودی جانیرو)یە لەساڵی 1942.

- پەیوەندی بەکۆلیژی مافەوە کردوە بەڵام تەواوی نەکردووە.

- ژیانی هونەری بەنوسینی گۆرانی رامیاری دەست پێکردووە و بەهۆیەوە توشی زیندانی کردن بووە.

- یەکەم رۆمانی لەساڵی 1985 لەژێر ناوی (گەشتی حەج) نوسیو سەرکەوتنێکی وای بەدەست نەهێنا.

- لەساڵی 1986 رۆمانی (جادوگەری بیابان) ی بڵاوکردەوە.. لەساڵی 1987 سەرلەنوێ

چاپی‌کردەوە چونکە لەساڵی یەکەمدا فرۆشتنی کەمی هەبوو.

- لەساڵی 1990 (بیدرا)ی نوسی.. لەساڵی 1992 (فالکیزین)ی نوسی‌و لەساڵی 1994 (گریان لەنزیك روباری بیدرا)ی نوسی.

- دوا رۆمانی (شاخی پێنجەمە) کە لەچیرۆکی ژیانی (ئەلیشع)ەوە وەرگیراوە کەیەکێکە لەقوتابیەکانی مەسیح،

- هێشتا لەشوقە کۆنەکەی دەژی کەلە(ریودی جانیرو)یەو ئۆتۆمبیلی (رینو19)ی هەیە.

- چوار جار ژنی هێناوەو دوایەمینیشیان هونەرمەندێکی شێوەکارە کەناوی (کریستین)ەو (20) ساڵە، بەلام منداڵی نیە.

- پێی باشترە کە لەشوقە بچوکەکەیدا بنوسێت چونکە ژاوەژاوو قەرەباڵغی هەیە وەك خۆی دەڵێ.. چونکە خانویەکی بچوکی لەدورگەیەکی بچوك کری تاتیایدا بنوسێت کەچی وەك بۆی دەرکەوت رۆمانێکی خراپی نوسی ناچار خانوەکەی فرۆشت‌و گەڕایەوە شوقەکەی.

- رۆمانی (گریان لەنزیك روباری بیدرا) کچە ئەکتەری فەرەنسی ئیزابیل ئیدجانی لێی کری

- رۆمانی (جادوگەری بیابان) کۆمپانیای (وارنر) کری تا بیکاتە فیلمی سینەماو چەند سیناریۆیەکی ئەو رۆمانەی بۆ نێراوە بەلام هەموویانی رەت کردۆتەوە.

- رۆژانە پۆستە ئەلکترۆنیەکەی زیاد لە3000 نامە لەهەموو جیهانەوە وەردەگرێت هەروەها رۆژانە زیاد لە100 نامەی پێدەگات.

- دوای بڵاوبوونەوەی (جادوگەری بیابان) نوسەری بەرازیلی جۆرج ئەمادۆ نامەیەکی بۆنارد کەتیایدا دەڵێ (بەرازیل چاوەڕوانی نۆبڵێکی ترە).

- نەخشەی ژیانی کویلهو بریتیە لەسەفەرکردن بۆ ماوەی شەش مانگ لەدەرەوەی بەرازیل‌و نوسینی رۆمانێك لەماوەی دوو ساڵدا.

- لەراڕەوە تایبەتەکەیدا وێنەیەکی گەورە هەیە کەیەکێك لەهاوڕێکانی گرتوویەتی کاتێ لەقاهیرە بووەو وێنەکەش وێنەی کوڕێکی گەنجە کە (دشداشەی) لەبەردایەو لەتەنیشت ئەهرامەکانەوە دانیشتووەو وەرگێڕانە فەرەنسیەکەی (جادوگەری بیابان)ی گرتووە بەدەستەوە.

- شوقە بچوکەکەی دەکەوێتە قاتی کۆتایی‌و کامێرای چاودێری کردنی تیایەو جگە لەو ئافرەتە کە بەڕێوەبەری ماڵەکەیەتی‌و پاسەوانە تایبەتەکەی کە وەك شۆفێریش لەلای کاردەکات کەسی تر ناچێتە لای.

